# مام جەلال تاڵەبانی

## سەرۆك كۆماری پێشووی عێراق

مـام جـەلال ئەوهـا باسـی هۆمـەر دزەیـی دەكات كـە بـۆ یـەكـەم جـار سـاڵی 1948 لـە كۆیـە چـاوی پێـی دەكـەوێ:

"نـەورۆزی حشـع لـە هەولێـرەوە وەفدێكیـان بـۆ هێنابـوو. یەكێكیـان لاوێكـی ژیكەڵـەی ئێسـك سـووك و دەنـگ خـۆش و بـە تەمـەن بچـووك، كـە دوو لـە براكانـی شـیوعی بـوون و لەگـەڵ خۆیـان هێنابوو: ئەویـش بولبولی خـۆش ئـاواز و دەنـگ زێرین، كاكە هۆمـەری دزەیـی بـوو.... سەیر ئەوەبـوو ناودارانـی وەفدەكـەی هەولێری (حشع)، كـورە ئاغاكانـی دزەیـی بـوون نـەک كرێـكاران و جووتیارانـی هەولێـر..... بـەڵام كاكە هۆمـەر لەوانـە نەبوو ، نـە ئەوسا شـیوعی و نـە پاشـانیش دژیـان بـوو. بەڵكـو هەتـا دەهـات ژیرتـر و هوشـیارتر دەبـوو، تـا بـووە لاوێكـی كوردپـەروەری پێشكەوتنخوازی مۆدێـرن، كـە نـەک هـەر لە چالاكییەكانی دەرەوەی وڵات و لـە هەردوو فێسـتیڤاڵی لاوان و خوێندكارانـی دنیـا لـە ڤارسـۆڤیا و مۆسـكۆ شۆڕەسـوارێكی گۆڕەپانـی لاوانـی كوردسـتان بـوو، پاشـان لـە بـواری سیاسـەت و خوێنـدەواری و ئـەدەب و مۆسیقا و گۆرانیـش شۆڕەسوارێكی ئەوتـۆی لێ دەرچـوو، گـەر كوردسـتان جـۆری فیـدڕاڵ یـان سـەربەخۆیی هەبا، ئێسـتا ئەویـش یەكێـک دەبـوو لـە ئەسـتێرە پرشنگدارەكانی ئاسمانی دنیـای هونـەر و گۆرانـی و سـینەمای جیهانـی. هـەر وەک ئێسـتاش ئەسـتێرەیەكی گەشـی هونـەر و گۆرانـی و مۆسـیقای ئاسـمانی كـوردەواری و كوردسـتانی گەورەیـە".

كۆڤاری خاک، ژمارە 13 ساڵی دووەم 10/تەمموز/ 1998، لاپەڕە 8.

# دکتۆر بەرهەم ساڵح

## سەرۆك کۆماری عێراق

یادەوەرییەکانی هۆمەری دزەیی تۆمارێکی گرنگی خەباتی سیاسی و گەشەکردنی هونەر و ڕۆشنبیریی کوردە و وێنای چەندین کەڵەمێردی ئەو سەردەمە و چیرۆکی دڵداریی بە سۆزن. هۆمەر ڕاشکاوانە وەک خۆی باسەکان ئەکات، تەنانەت لەسەر خودی خۆیشی ناپۆشێ و نایشارێتەوە. دیارە لەم یادگارانەدا هۆمەر گەڕۆک و دونیا دیدەیە، بەڵام هەر شەیدای کوردستان و دووگردکانە! مەگەر هەر هۆمەری دزەیی بزانێ ئاوا بە زمانێکی پاراو و بە چێژەوە ئەو بەسەرهاتانە بگێڕێتەوە!

## حەمەدەمین پێنجوێنی

### شاعیر و نووسەر و توێژەری سیاسی

کاک هۆمەر جگە لەوەی هونەرمەندێکی گەورەیە، شۆڕشێکیشی بەرپا کرد لە ساز و ئاوازی ڕەسەنی کوردیدا، زمانزان و مێژووزان و سیاسەتوانێکی لێزانە، ئەو زاراوەکانی کرمانجیی سەروو و خوارووی زمانی کوردی بە باشی دەزانێت.

زمانەکانی عەرەبی، فارسی، تورکی و ئازەری جگە لە زمانە رۆژئاواییەکانی وەك ئینگلیزی، فەرەنسی، ئەڵمانی و ئیسپانی بە ڕەوانی دەزانێت، ئاخر هەر کەسێ ئەم زمانانە نەزانێ، ناتوانێ پسپۆڕیی لە زمانی کوردیدا پەیدا بکات.

هۆمەر بە زۆربەی ئەو زمانانەش ئەتوانێ گۆرانی و ئاواز بچڕێ.

بۆیە بە لای منەوە هۆمەری دزەیی، سامانێکی کوردستانییە.

سلێمانی 2020

# غەریب پشدەری

**شاعیر و نووسەر و وەرگێڕ**

بۆ هونەرمەندی ناوازە و جوان کاکە هۆمەری دزەیی

کە چووی ...شلکە نەمامێکی تازە چرۆکردووی بەهاری تەمەنت بوو...
دەگەڵ هەر شنەبایەکی حەز و ئارەزوو و تەزوو و موچڕکەی هیوا
و ئومێدە چڕ و پڕەکانتدا دەشنایتەوە و دەکەوتیە سەما. بەرەو
هەندەران ... بەرەو دیاری غوربەت و ونبوون...
ئەسپی سەرکێشی لاوەتی جڵەوی لە دەست دەرێنای و نەتزانی بۆ
کوێی هەڵگرتووی و بۆ کوێت دەبا. ئەوەی جێ دەما تەنیا شوێن
پێیە کەرویشکییەکان بوون هەزارەیان کردبوو.
کە هاتیەوە... پیرەدارێکی بێزار لە سێبەری خۆت.
نە لاوەتی و نە حەز و ئارەزوو و نە تەزوو و موچڕکە و نە ئۆخژنێک...
تەنیا و تەنیا مشتێک بیرەوەری و یاد و یادگاریی پڕ حەسرەت و
کوانووی تەمەنێکی ساردوسڕ و بێ ئەنوا...
نە دوێنێ ما، نە شوێن پێ،
نە خۆشیی ڕۆژ و مانگ و ساڵانی پڕ کەفوکوڵ، هەمووی سڕابوونەوە
و هەروەک نەبووبن...
ئەوەندە ماوە پێکەوە بڵێین:
بەخێرچی سەردەمی لاوی و
خوریەی دڵی بێ وچانم،
بەخێربێی وەرزی پاییزی...
لەرزۆکی دەست و گۆچانم.

لە تەمەن فێر بووم
ئاوی ڕووبار بم
نەك زۆنگاوی مەنگ
ئاوی وەستاوی قەوزاویی
پێرار و بەسترپێرار بم

**هۆمەر دزەیی**

# چیرۆکی ئەویندارییم

ئەرێ ئەی کوردی پەنابەر
ئەی لە هەندەران دەربەدەر
هۆ کوڕ و کچ ، خانمینه
بەخۆڕایی نەگوتراوه
بەرد هەر لە جێی خۆی سەنگینه
ئەمن بەم هەموو ئەزموونه
بەم ئاموشۆ و بەم قاڵبوونه
بەو هەموو گەشت و گەڕانه
بۆم دەرکەوت و بوو بە وانه
نە رۆژئاوا ، نە رۆژهەڵات
قەت نابێته پیره وڵات
هەر سوارێ مەیدانی خۆی
هەر کلچووکێ کلدانی خۆی
جیهان با هەر بۆ خۆی خۆش بێ
پیرۆزی میللەتانی خۆی
منیش وەک ئا.....ئەو خەڵکانه
خۆشیم وڵاتی کوردانه
من کۆرپەم و کۆرپەی ساواش
لەناو ژنی ئەم جیهانه
هەر دایکی خۆی لەلا جوانه.

**هۆمەر دزەیی**

## ناوەڕۆك

### بەشی 12



### بەشی 13

## بەشی 14



## بەشی 15



## بەشی 16



## بەشی 17



## بەشی 18



## بەشی 19



## بەشی 20



## بەشی 21



## بەشی 22

## بەشی 23



## بەشی 24



## بەشی 25



## بەشی 26



## بەشی 27



## بەشی 28

## بەشی 29



## بەشی 30



## بەشی 31

## بەشی 32

ئێران و کوردستانی ئێران



## بەشی 33



## بەشی 34



## بەشی 35

# بەشی 12

## دوا جار، ڤیەننا خۆت بگرە هاتم

"ئۆغرم لە بەغداوە تا ڤیەننا"
هۆمەر

### 1. بەغدا: 19.4.957

رۆژی هەینی بۆ کاتژمێر 1،30 لە ئۆتێلەوە چووینە ئێستگەی "نێرن". ئەوانەی لەوێ بوون: کاکم [ئەحمەد حەمەدەمین]، موحسین [موحسین دزەیی برام]، کاک زەید [زەید ئەحمەد عوسمانی پوورزام]، سەمەد [سەمەد بەننای قسەخۆشی کۆیی]، مەحمود و هوشیار [کوڕانی کاکەزیادی کۆیە]، دکتۆر خالید [ دکتۆر خالید دەباغی کۆیی]، نەوزاد [نەوزادی پوورزام برای کاک زەید]، ئەمیر [ ئەمیر حەوێزی کۆیی]، شەمسی [ شەمسەدین موفتی]، جەمال شالی، مارف و سائیب [مارف شێخ ڕەووف و محەمەد سائیب نەقشبەندی]، کاکەنوەر [ شێخ ئەنوەر شێ عەزیزی خالۆزام]، عەبد[ عەبد مەتی خاوەنی ئۆتێل ترۆکادێرۆ کە لەوێ دابەزیبووین]، مەزهەر [ مەزهەری شێخ سەدری ئامۆزای دایکم، ئەویش هەر کۆیی[، مەجید [ مەجیدی کاکەی حاجی مەحمودی کۆیە].

کەژمێر..،2 بەڕێ کەتین، ژمارەی جێگەم 12بوو، زۆر زۆر گەرما بوو، لە فرۆکەخانەی بەغدا 2 دەقیقە راوەستاین پاسپۆرتیان مۆر کرد کاتژمێر ..،3 گەیشتینە (فەلووجە) لەوێ گیر نەبووین، کاتژمێر 4:15

گەیشتینە (رەمادی) شارەکی زۆر چۆل و ناخۆشە، نیو سەعات گیر بووین لە کازینۆی شەریکە چایەیان دەرخوارد داین (کازینۆ & ریستۆرانت سەمیرامیس). لەپاشان دەستی بە بارانی کرد زۆر باران باری بەلام جادەکە زۆر خۆش بوو، هەمووی قیرتاو بوو جارجار کۆسپەی تێدا دەبوو، شەوێ نزیکەی 11 گەیشتینە "روتبە".

لە روتبە جێگای پشکنینە چونکە سەر سنوورە، کاک بەتوو سەلامەتدار بی زۆر پوختە ئەمنیان دابەزاند، چییە وەلّلا ئەتوو پاسپۆرتت مۆری پۆلیسی پێوە نییە. گۆتیان ئەمشەو دەبی لێرە بی هەتاکو تەلەفۆن بۆ بەغدا دەکەین، ئەمن هەر وەخت بوو بگریێم، زۆر ناخۆش بوو لەو شارە سەیانییەی بەتاقی تەنێ، کەس نەناسی، سەرت نەهێشینم جەنتاکانم هێنا خوارێ لەسەر جادەی نێرنیش لێدا رۆیی، کەژمێر بووە 12 ئەمن هەر لەسەر جادەی راوەستایمە زۆر سەرمایە ساقۆم لەبەر کردییە وە گوومروک زۆر لە شاری دوورە. لە پۆلیسان پرسیم گۆتیان کە (رێست هاوس) هەیە بۆ نووستن، گۆتیان دوو قوتابی دیکەش ئەوانیش پێشی من هاتینە خوارێ. ئەمنیش چبکەم هەشت پارچە شمەکم پێیە نە هەلگر هەیە نە تاکسی، لەپاشان لۆرییەکی پۆلیسانم بە 250 فلس گرت هەتا (رێست هاوس) و لێی نووستم بە دلێکی پڕ بە خەم.

**روتبە: 20.4.57**

ئەمرۆ شەمووە کەژمێر 8 لەخەو هەستام و نانم خوارد چوومە پۆلیسخانە، لەوێ قوتابییەکانیشم دیت و بووینە هاوڕێ، تەلەفۆن تێکچووە رەنگبێ 10 تەلگرافیان لێدابێ هیچ وەرام نەبوو لە بەغدایێ، ئەمە وەخت [ئێمە وەخت بوو] تاکسی بگرین و بچینەوە بەغدا، نیوڕانێ چووینەوە ئۆتێل بۆ نانخواردن، پاشی نان چووینەوە پۆلیسخانە، دیسان دانیشە دانیشە هیچ وەرام نەبوو هەتا رۆژ ئاوا بوو، ئینجا تەلەفۆن

چابۆوە وە لە بەغدا گۆتییان ڕێیان بدەنێ با بڕۆن، وەڵڵا ئێمە خەنی سەد خەنی چوومە ئۆتێلی جانتاو مانتام هێنا، 250, 1 فلس مافی ئۆتێل بوو. هێواریێ سەربازەکی کورد هەبوو ئەو چێشتی بۆ کردین، لەپاشان کەژمێر 30, 10 نێرن دەرەجە 1 هات، وەڵڵا کاکت زۆر پوختە سوار بوو. ئەوان بەجێ مان چوونکە بە رافدێن هاتبوون، ئەوێ شەوێ لە خۆشییان خەوم لێ نەکەت، نێرن بەمنڕا هەر پێنچ کەسی تێدابوو.

**21.4.57**

یەکشەم کەژمێر 30, 6 ی سبەینێ گەیشتینە "ابوالشامات" لە سوریە، لێرە هاتینە خواریێ لە کازینۆ چای و پسکیتمان خوارد. زۆر سەرما بوو، بەرەو شام کەتینە ڕێ، ئەو بەینەی زۆر خۆشمان ڕابوارد، لەگەڵ ئارتێستەکی سووری لە ئێراق دەچۆوە، زۆری گۆرانی بۆ گۆتین، کەژمێر 30, 8ی سبەینێ گەیشتینە شام.

## 2. شام 21.4.957

لە ئێستگەی تاکسیم گرت بە 30, 1 لیرە هەتاکوو (ئوتێل بیروت الکبیر) خاوەندەکەی کەرکووکییە. لەوێ 2 دینارم خورت کردەوە بۆ لیرەی سووری یەکی بە 35, 9، ئینجا راست تەلەفۆنم بۆ خانم کرد [رەوشەن خانی بەدرخان] بۆ ئەوەی ئادرەسی عەلیم بدەنێ [عەلی فەتاح دزەیی ئامۆزام] چونکی یەکشەم بوو وە جەژنە بوو جامیعە نەبوو. پاش سەعاتەکی کاک جەمشید [جەمشیدی کوڕی رەوشەن خان و میر جەلادەت بەدرخان] هاتە لام وە پێکەوە چووینە ماڵی عەلی. سەرت نێشینم ئەوێ رۆژێ لۆ هێوارێ لە قاوەخانەی هاڤانا Havana هەموو هەڤاڵەکانم دیت، شەو لە ماڵی ق. پاشا [قەدری جەمیل پاشا] زۆر خۆشمان رابوارد.

### 22.4.57

دووشەم بوو هەر لە شام بووم، چوومە قونسولخانەی ئەوستریا و (ڤیزا)م وەرگرت، لەپاشان چووینە سەر گۆڕی (سەلاحەدین). پاش نیوەڕۆیێ دیسان لە ماڵی ق . پاشا رامانبوارد. شەوێ لە ماڵی خانم.

### 23.4.57

سێشەم هەتاکو کەژمێر 5 ی ئێوارێ هەر لە شام بووم، فۆتۆمان گرت. کەژمێر 5 ی دەق بە ترومبێلی لەگەل کاک رەمۆ [رەمەزان حوسێن کە کوردێکی سوریا بوو] بەرەو بەیروت کەتینە رێ. مافی ترومبێلی هەر یەکی (7) لیرەی سووری.

[ئا لێرە خەتم بەسەر نیو دێڕا کێشاوە کە بە ئاسانی بۆم

خوێندرایەوە و نووسیبووم: "هەر کە لە شام دەچییە دەر" دیارە بۆیە ئەوەم کوژاندبۆوە کە هاتبۆوە بیرم چۆن دەبێ باسی ناو شاری شامم بەسەرا تێپەڕێت نەیکەم. هەڵبەت ئەمە تێبینیی ئێستامە -هۆمەر]

شام بە کورتی شارەکی ناخۆش نییە، زۆر پاکو تەمیزە، زۆر قەرەبالغ وەکوو بەغدا نییە، هەروەها ئاپارتمانی زۆر رێک و جوانی تیایە، جادەکان زۆرترینی ئەملاو ئەولای بەدارە.

هەر کە لە شام دەچییە دەرێ دیمەنی ئێجگار نایاب دەبینی، پاشی 3 چارێک گەیشتینە سنووری (لوبنان). ئیتر لێرەوە هەتا دەگەیە بەیروت وەکوو بەهەشت وایە. شاخی زۆر نایاب و پڕ دار، جادەی زۆر پان و فۆسفۆردار، گوندی زۆر خاوێن و هەمووی بە ئەلەکتریک لەپاڵ شاخەکان کەوتوون، دیمەنی زەریا هەرچەند بڵێی جوانە. سەعات7 گەیشتینە بەیروت.

### 3. بەیروت 23.4.957

راست چووینە ئوتێلی (سان رافائیل) ئێواریٚ چووینە (مەنسوور) وە شەویٚ چووینە (سالەی عەجرەم)، سەمیرە تۆفیق لەویٚ بوو هەرچەند بڵێی جوانە، لەپاشان (ئەنتوانێت نەحاس)م دیت تۆقەم لەگەڵ کرد ئەویش گەلەک جوانە.

### 24.4.57

ئیمرۆ (چارشەم) سبەینیٚ چوومە (تۆماس کووک) لەپاشان چووینە (American University) هەر چەندی بڵێی جوانە، پاشان چووینە سەر زەریایێ وە فۆتۆگرافمان وەرگرت. کەژمێر 3 چوومە (مینا)ی و لە 30, 5دا پاپۆڕ بەڕیٚ کەت. پاپۆرەکە ناوەنجی بوو، خەرکی زۆر تێدابوو، کابینی من لە بنەوە بوو بەڵام خۆش بوو، 5 کەسی لێدا بوو، ئەمن، قوتابییەکی لوبنانی، قەشەکی ئیتالی، یێکی سپانی، لەگەڵ منالێکی ئەرجەنتینی. [قەشە ئیتاڵییەکە هەر خۆی لە ئێمە نزیک دەکردەوە، دەرکەوت کە نێرخوازە - ئەمە قسەی ئێستامە - هۆمەر] پاش 2 شەوان قوتابییەکی ئەمەریکیش هاتە لامان.

ئەوەلی کە پاپۆڕ بەڕیٚ کەت دڵم زۆر گوشرا لەپاشان لەگەڵ کوڕە ئەمەریکییەکە و لوبنانییەکەی بووینە هاوڕیٚ زۆر خۆشمان رادەبوارد، ئەوەلی هەوا زۆر خۆش بوو هەتا رۆژی دوایێش بەڵام 2 کەژمێر مابوو بۆ ئەسکەندەرییە زەریاکە نەختێک دژ بوو.

## 4. ئەسکەندەرییە 25.4.957

پێش ئەوەی بگەینە ئەسکەندەرییە با هەندەک باسی پاپۆڕ بکەم، پاپۆڕ هەرچەندە ئێمە جەماعەتەکی زۆر خۆش بووین وە زۆرترین کاتمان بە قاقەز و فشە رادەبوارد بەلام خەلک هەر حەز دەکا سەعاتەک زووتر بگاتێ، چونکە ناخۆش [ناخۆشە] هەر لەناو ئاوێ هیچ ئەردت لێ دیار نەبی، سبەینان هەتا 10 هەقت هەیە بۆ نانخواردن، نیوەڕۆیان کا. 1 زەنگولە لێ دەدا بۆ خواردن، هەروەها کا.4 لێ دەدا بۆ چایە و کێک، ئێواران 30, 7. خواردنیان باشە بەلام ئینسان لێ بێزار دەبی، سوبەینان و ئێواران مۆزیقای زۆر خۆش لێ دەدەن.

کات. , 4 گەیشتینە ئەسکەندەرییە شارەکی خۆشە و بینای زۆر گەوەی تێدایە. پاپۆڕەکەمان 3 رۆژ لێرە دەمێنی لەبەر ئەوە هەموو عالەمەکە چوونە قاهیرە. ئێمەش هەرسێکمان رێک کەتین بچین، هەر ئەوێ دەمێ بە تاکسی بە (20 ساغ) چووینە ئیستگە وە بلیت یەکی بە 95 ساغ دەرەجە دوو (ئێکسپرێس) کا. 30 /5 بەرێ کەتین و 30 /8 گەیشتینە قاهیرە.

## 5. قاهیره

لوبنانییەکە چووە ماڵی خزمی، ئەمەش [ئێمەش] چووینە (دوئی) [دقی] هەرچەندی لە ماڵی (حەمە) [حەمەی حوسێنی مەلای ئامۆزام کە لە قاهیرە دەیخوێند] گەڕاین دیتمانەوە بەڵام لەوێ نەمابوو. چووینە (ئۆتێل Des Roses) لە شەقامی (سولەیمان پاشا). قاهیرە شارەکی ئێجگار خۆشە بەتایبەتی کچی گەلەک جوانە.

**26.4.57**

بەیانی کا. 30 ,8 چووینە (گیزە) هەتا 30 ,1 لەوێ بووین چووینە ناو ئەهرام و چووینە کن سفینکس و سواری حوشتر بووین. بەراستی زۆر عەجایەب بوو، پاشان گەڕاینەوە قاهیرە و راست چووینە (ئەنتیکەخانە)ی قاهیرە کە لە (میدان التحریر ) دەکەوی، ئێجگار خۆش بوو، ئەمن زۆر ماندوو بووم چونکە بەڕۆژی بووم. ئێوارە چووینە ئیستگە و بلیتمان بری بۆ سبەینێ (27). شەوێ باسیلم دیت [باسل کامل الچادرچی] جێگای (حەمە)ی پێ گۆتم، کوڕەکە چووە سینەمەی، ئەمنیش چوومە ماڵی حەمە بەڵام دیسان نەمدیت، لەپاشان چووم هەندەک گەڕام.

**27.4.57**

ئیمڕۆ سوبەینێ زوو کە. 45, 5 لەخەو هەستاین و چووینە ئێستگە. لە 7:00 بەرێ کەتین بۆ ئەسکەندەرییە، 10:10 گەیشتین، عارەبانەکمان گرت جادەکانی شارمان هەموو کرد بەتایبەتی

کۆرنیـش، لەپاشـان چووینـە (قەسـری فـاروق) (راس التیـن) ئێجـگار خۆشـە. کا. 40, 2 چووینـەوە (مینـا) لـە 20, 3دا بـەڕێ کەتیـن. هـەوا زۆر خـۆش بـوو.

28.4.57

ئیمـڕۆ کا. , 12ی نیوڕانـێ گەیشـتینە دووگـەی (کریـت) هەتـا عەسـرێکی درەنـگ هـەر بـە تەنیشـتیدا تێپەڕیـن زۆر درێـژ بوو بـەڵام لامان نـەدا، عەسـرێ گەیشـتینە (کاندیا) پایتەختـی (کریـت) دیسـان لامـان نـەدا. کریـت دووگەکـی هەمـوو چیایـە و پـڕ دارە بـەڵام ئاوەدانـی کەمـە.

29.4.57

ئیمـڕۆ کا. 30, 9 ی بەیانـی گەیشـتینە دووگەکانـی (یۆنـان) زۆر پارچـە پارچـە بـوو هەتـا شـەوێش هـەر دیـار بـوو بەناویـا تێدەپەڕیـن بـەڵام هیـچ لامـان نـەدا. ئـەو دووگانـەش هەمـووی شـاخاوی و زۆر پـڕدار بـوون.

30.4.57

سـوبەینێ زوو 30, 5 گەیشـتینە (بـاری) لـە ئیتالیـا لەسـەر زەریـای ئەدریاتیـکا، شـارەکی زۆر جـوان دیـار بـوو بـەڵام نەیانهێشـت دابەزیـن، لـە 9, لە بـاری دەرچوویـن بـۆ ڤینیسـیا، ئیتـر لـە بارییـەوە دەرچوویـن ڕۆژمـان هێشـتان لـێ بـەدەر نەکەتییـە، هەندەکیـش بـاران بـاری.

## 6. ڤینیسیا: 1.5.957

[ئەم چەند لاپەڕەیە لە یادداشتە دەسنووسەکانم، کە ئێستاش هەر ماومن لێرەدا بەکۆتایی هاتووە نازانم بۆچی لێرەوە ئیتر دەستم لە نووسین هەڵگرتووە و باسی ڤینیسیا و دواتریشم نەکردووە.]

من کە ئێستا وا لەم چەند لاپەڕە دەسنووسەی خۆم رادەمێنم هەستێکی شانازیی بەخۆمەوە دامدەگرێت کە دیارە هەر لەو تەمەنەمدا حەزم لە نووسین بووە و تێڕامانی وردوقووڵم کردووە لە دەوروبەری خۆم کە ئەمەش تایبەتمەندییەکی سروشتانەی هونەرمەندان و شاعیرانە.

ئەو رۆژەی پاپۆرەکەمان گەیشتە شاری ڤینیسیای ئیتالی رۆژی یەکی ئەیار، رۆژی کرێکارانی جیهان بوو و پشوو بوو. هاتوچۆکردن بەناو شاری ڤینیسیادا بەزۆری دەبێ بە رێگای جۆرە بەلەمێکەوە بێت کە لە ئیتالیا پێی دەڵێن گوندۆلا (Gondola). لەگەڵ چەند سوارێکی تری پاپۆرەکەم کە گشتیان خوێندکاری میسری بوون لە ڤیەننا، گوندۆلێکمان بەکرێ گرت بمانبات بۆ مەیدانی سان مارکوس لە ناوشار. کرێکە یان دوو ملیۆن و نیو یان بیستوپێنج ملیۆن لیرەی ئیتالی بوو، چاکم لەبیر نەماوە و زۆر بەلامەوە سەیر بوو کە کرێیەک بۆ شتێکی وەک تاکسی کەم بە ملیۆنان بێ. مەیدانەکە کە کاتێدراڵی سان مارکوسی لێیە جمەی دەهات لە خەڵکی خۆجێیی و توریستیش. جگە لە خەڵک ئەو مەیدانە بە کۆتریش بەناوبانگە کە خەڵکەکە دانیان بۆ دەرێژن یان هەر لەناو لەپی خۆت پێشکەشیان دەکەیت کۆترەکانیش دێنە سەر دەست و شانت بۆ خواردنی دانەکە و خەڵک وێنەیان لەگەڵا دەگرێ. دانەکەش هەر لە مەیدانەکە لای دوکانداران بۆ فرۆشتن دەست دەکەوێ.

ترێنەکەمان بۆ ڤیەننا هەشتی ئێوارە لە ڤینیسیا دەردەچوو و هەشتی

بەیانیی رۆژی دواتر دەگەیشتە ڤیەننا. منیش لەگەڵ میسرییەکان ئەو رۆژەمان تا ئێوارە لە سان مارکوس و لە هەندێ شوێنی ترا بەسەر برد و کۆڵێک وێنەمان گرت کە هەموویم ماوە.

بۆ ئێوارە بەرێ کەوتین و بەیانی دووی مایس1957/5/2 گەیشتینە ئێزگەی شەمەندەفەری باشووری ڤیەننا (سوود بانهۆف Wien,Sued Bahnhof ).

هۆمەر لەبەردەم کۆشکی مەلیک فاروق (قصر رأس التین) لە ئەسکەندەرییە

هۆمەر و ڕەمەزان حوسێن، بەیروت کەناری دەریای ناوەڕاست

مەیدانی سان مارکۆس لە ڤینیسیا، ئیتاڵیا 1/ 5/ 1957 هۆمەر لەگەڵ هاوڕێ میسرییەکانی ناو پاپۆڕ
کە لە ڤیەننا دەیانخوێند

کەسایەتی قسەخۆش و
خۆشەویست سەمەد بەننا
کۆیی (1913 - 1968)

مەجیدی کاکەی حاجی
مەحموودی کۆیی
1930 -

شەمسەدین موفتی
1933 - 2012

مەزهەری شێخ سەدری کۆیە (ئامۆزای دایکی
هۆمەر) 1935 - 1993

مەحموودی کاکەزیادی حەمە ئاغای کۆیە
1930 - 2012

# بەشی 13

## ڤیەننا هەوارگەی بەختەوەری و بەخترەشیم

دووی مایس بۆ من بوو بە وەرچەرخانێکی مێژوویی ئەرێنی و نەرێنی لە ژیانمدا. ئەرێنی چونکە خەونی شادبوونم بە ڤیەننا هاتە دی، نەرێنیش چونکە ئا لەوێوە ئیتر ڕێڕەوی ژیانم تێ کردمەوە بۆ لایەکی دنیایەک دوور لە خەون و وێنا کردنەکانم.

دەڵێن بیری منداڵی تیژە، ئەوە زۆر راستە. من کە گەیشتمە ڤیەننا تەمەنم بووبوو بە بیست ساڵ. ئەو وردەکارییانەی ڕێچکەی ژیانی منداڵیم کە لە بەشەکانی پێشووی ئەم بیرەوەریانەمدا باسم کردوون لێرەوە ئیتر وا خەریکە تەمی تەمەنیان بەسەردا بکشێت و هەموو شتێکم بە وردیەکەی جاران نایەتەوە بیر. هەر بۆ نموونە چۆنیەتیی بەسەر بردنی ئەو شەوەی ترێنم لە ڤینیسیا بۆ ڤیەننا لەبیر نەماوە. ئەوەندەم لەبیرە کە خوێندکارە میسرییەکان پێیان گوتم کە قاوەخانەیەک هەیە لە نزیک زانکۆی ڤیەننا و گوتیان خوێندکارە عیراقییەکان زۆریان لەوێ دادەنیشن و باشترە بۆم لە ئوتێلێکی نزیک ئەو قاوەخانەیە دابەزم، هەر واشی لێ هات و منیان برد بۆ ئوتێلێکی نزیک قاوەخانەکە. کوڕێکی میسریش هەر لەوێ دابەزی.

کە لە بەغدا بووم ناونیشان و ژمارەی تەلەفۆنی وریای ئەمین ڕەواندزیم وەرگرتبوو کە لە ڤیەننا پزیشکیی دەخوێند و دۆستایەتیی بنەماڵەیی کۆنمان لەگەڵ یەکدا هەبوو. جا کە لە ڤیەننا چووم بۆ قاوەخانەکەی خوێندکارانی عێراقی لێی دادەنیشتن، قاوەخانەی

(شڤارتسشپانییەر Schwarzspanier) لە شەقامێکی بە هەمان ناو لە گەڕەکی 9ی ڤیەننا هەندێ عێراقیی لێ بوو و منیش خۆم پێشکەش کردن کە کوردێکی عێراقیم و تازە گەیشتوومەتە ڤیەننا. پرسیاری وریام لێ کردن گوتیان: بەڵێ دەیناسین بەڵام ئەو زۆر کەم دێتە ئەم قاوەخانەیە. گوتیشیان کچە کوردێکی تر هەیە لە ڤیەننا کە زیاتر هاتوچۆی ئێرە دەکات ناوی (پەروین مەحمود جەودەت)ە. دڵم زۆر خۆش بوو کە زانیم پەروینیش لەوێ یە چونکە دەمناسی و پێشتر باسی بنەماڵەکەیم کردووە کە چەند لە ئێمەوە نزیک بوون. هەر چۆنێکی بێ پەیوەندیم بە وریا ڕەواندزییەوە کرد و چوومە ماڵی لە گەڕەکی یەکەمی ڤیەننا لە کۆڵانێک بە ناوی (گۆنتزاگا گاسە Gonzaga Gasse) لەسەر کەناڵێکی ڕووباری دانووب کە پێی دەڵێن (دۆناو کەناڵ Donau Kanal). وریا کە ژوورێکی لە ماڵی ژن و مێردێک بەکرێ گرتبوو دڵی زۆر خۆش بوو بە دیدەنیم و ئامۆژگارییەکی زۆری کردم لەم وڵاتە بۆ من نامۆیە. گوتیشی بەر لە هەموو شتێک دەبێ ژوورێکت بۆ بگرم خۆ نابێ هەر لە ئوتێل بیت و مامۆستای زمانی ئاڵمانیشت بۆ دەگرم تاوەکوو پایز زانکۆ دەکرێتەوە بتوانی خۆت تۆمار بکەیت و لە وانەکان بگەیت. وریا بەڕاستی وەک برا گەورەیەک بوو بۆ من. وریا لە ژیانیا لە هەموو ڕوویێکەوە زۆر جددی بوو، زۆر بەسادەیی دەژیا و، بە پێچەوانەی بێ سەروبەریی من لە ڕووی داراییەوە، ئەو زۆر ئاگای لە پارەی خۆی بوو و هەر شتێکی بیکردایە لە ئەنجامی حیساب و لێکدانەوەیەکی ورد و قووڵەوە دەبوو. وریا بەرنامەی ڕۆژانەی خۆی زۆر بەوردی دادەڕشت و ئەگەر بەڵێنی بینینی لەگەڵ یەکێکدا هەبوا پێنج چرکەسات درەنگ بچووبایت لێت تووڕە دەبوو. ئەمین ڕەواندزی باوکی وریا ئەفسەرێکی سوپای عێراق بوو و یەکێک بوو لە کوردە چالاکوانە ناسیۆنالیستەکانی سەردەمی تەوژمی بزووتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی لە بیستەکان و سییەکان و چلەکانی سەدەی رابردوو. دیارە وریای کوڕیشی هەم کوردایەتییەکە

و هەم زەپت و ڕەپتی سەربازی لە باوکییەوە هەڵگرتبۆوە. لەگەڵ وریا چووین بۆ نووسینگەیەکی کرێ و فرۆشتنی خانووبەرە. ئێستاش ناوی کۆمپانیاکە (هڕاباک Hraback)م لەبیر ماوە کە لە نزیک ئۆپێرای ڤیەننا بوو. ژوورێکیان بۆ دۆزیمەوە لای ژنێکی ناو (فراو بێرگەر Frau Berger) پێم وایە مانگی بە 450 شلنی نەمساوی کە دەیکرد کەمێک پتر لە شەش دیناری عێراقیی ئەو سەردەمە. هەینێ دینارێکی عێراقی یەکسان بوو بە پاوەنێکی ستەرلینی هەر پاوەنێکیش 72 شلنی نەمساوی بوو. ژوورەکەم زۆر گەورە بوو بەڵام مۆبیلیاتی کەم تێدا بوو. کوڕێکی تریش کە نەمساوی بوو ژوورێکی لەتەنیشت ژوورەکەی من بەکرێ گرتبوو ناوی (گێیۆرگ Georg) بوو لە ئۆرکێسترای سیمفۆنیی ڤیەننا ڤیۆلۆنژەن بوو و هەر جارێکی بمویستایە بچم بۆ ئۆپێرا بلیتی بە داشکاندنێکی باش بۆ دەهێنام. خاوەن ماڵەکەم فراو بێرگەر قەیرەژنێکی ناوەڕاست پەنجاکانی تەمەنی دەبوو، بە تەنیا دەژیا، جوان نەبوو و چەند تەڵموویەکی سپیش بە چەناگەیەوە دیار بوو. ژوورەکەی ئەویش بەتەنیشت ئەوەی من بوو و هەر جارێکی بۆیفرێندەکەی (دۆستەکەی) بهاتایە لای و شەو لای بمابایەوە ئەمن گوێم لە هەموو ئاخوئۆفەکانی فراو بێرگەر و جیرەجیرِی تەختەکەی دەبوو.

ماڵەکەم لە شوێنێکی زۆر باش کەوتبوو. بە پیادەیی دەگەیشتمە ناوەڕاستی شار و زانکۆ و ماڵی وریا و ئۆپێراو کۆنسێرت هاوس و (موزیک فێرئاین Musik Verein) و (بورگ تیاتەر Burg Theater) و دانسخانە بەناوبانگەکانی ڤیەننا (فۆلکسگارتن Volksgarten) و (ئادێ بار Ade Bar) و پارکە بەناوبانگەکەی شار (شتات پارک Stadt Park).

مەیدانی (شڤارتسنبێرگپلاتس Schwarzenbergplatz)ی ناودار کە پەیکەری میرێکی قارەمانی مێژوویی لێیە لەگەڵ پەیکەری سەربازی نەناسراوی رووس هی سەردەمی دووەم جەنگی جیهان ئەوەش هەر دوو

خولەک لە ماڵەکەم دوور بوو. ئەو شەقامەی کە ماڵەکەی منی لێ بوو ناوی (شڤیند گاسە Schwindgasse) بوو بەناوی بۆیەکارێکی ناوداری نەمساوی سەدەی نۆزدەی رۆمانتیک کرابوو ( Moritz von Schwind) کە ئەندامێکی هەمیشەی بازنە (شوبێرتیاد Schubertiad)ەکانی کۆمپۆزەری رۆمانتیک فرانتس شووبیرت بوو.

وریا، سەت جار یادی بەخێر، مامۆستایەکی زمانی ئاڵمانیشی بۆ گرتم (ئێڤا Eva) هەفتەی دوو جار دەهاتە لام. ئێڤا زۆر جوان بوو بەڵام بەمێرد بوو، رۆبێرتی مێردیشی جووەکی نەمساوی برادەری وریا بوو بەڵام ئێڤا خۆی کاتۆلیک بوو.

کە گەیشتمە ڤیەننا سەرکۆماری ئەو وڵاتە (تیۆدۆر کۆرنەر Koerner) تازە کۆچی دوایی کردبوو و دیوارەکانی شار بە پۆستەری گەورەی دوو کاندیدی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی (شێرف Schaerf)ی پارتی سۆسیالیست و(دێنک Denk)ی پارتی گەل رازابوونەوە.

جارێ هێشتا زوو بوو بۆ خۆتۆمارکردن لە زانکۆ. بە وریام گوت کە نیازی سەفەری مۆسکۆم هەیە بۆ بەشداریکردن لە فیستڤاڵی لاوان و قوتابیانی جیهانی و نامەیەکم لە یەکیەتیی قوتابیانی کوردستانەوە بۆ یەکیەتیی قوتابیانی نەمسای سەر بە پارتی کۆمونیست هێناوە کە کاروباری سەفەرەکەم بۆ جێبەجێ بکەن. وریا گوتی باشترە هەر راستەوخۆ بچین بۆ بارەگای پارتی کۆمونیستی نەمسا ئەوان خۆیان رێوشوێنت بۆ دادەنێن.

ڤیەننام چۆن بەچاوی زەینی دەهاتە بەرچاو هەر ئەوهاشم بە چاوی عەینی بینی، شارێکی پڕ لە مێژووی ئیمپراتۆراتی ئەوسترۆ -هەنگاری و هێشتا چەند ئاسەوارێکی عوسمانی. کە بەلای باڵاخانە و کاتیدرال و کلیساکانا رەت دەبوویت رەنگ و بۆی هونەری ئارکیتێکتوری گۆتیک و رۆمان و بارۆک یەکسەر دەیانگەڕاندیەوە بۆ رۆژگارانی خانەدانی هاپسبورگ Hapsburg و تراژیدیا رۆمانسییەکەی مایەرلینگ Mayerling.

لـە ماوەیەکـی زۆر کورتـی دوای گەیشـتنم بـۆ ڤیەنـا تینوویەتیـم شـکاند بـە سـەردانی موزەخانـەکان، هەوارگـە مێژوویـیـەکان، ناوەنـدە موزیکالیـیـەکان، مەیخانـە بەناوبانگـەکان و هەسـت و دڵ و دەروونـم لێوڕێـژ کـرد بـە تاموبـۆی شـاری م م م (مـەی، مـێ، موزیـک , Wein , Weib , und Gesang).

ئەمـن لـە بەندێکـی درێـژی نزیکـەی 1200بەیتـدا کـە بـە دەیـان سـاڵ درەنگتـر بـە نـاوی (چیرۆکـی ئەوینداریـم) لـە ئەمەریـکا دامنـاو دووجـار لەچـاپ دراوە بەشـێکیم تەرخـان کـردووە بـۆ ئـەو شـارە مێژووییانـەی ئەورووپـا و هـەر بـە تایبەتیـش بیـرم لەڤیەنـا دەکـردەوە کـە بەندەکـەم دادەنـاو دەمنووسـیەوە. زیانـی بـۆ پـەز نابـێ ئەگـەر چەنـد بەیتێکـی ئـەو بەنـدە پەیوەندیـدار بـەم بابەتەمـەوە بخەمـە ئێـرە*:

گەڕام گەڕام
گەڕام گەڕام
بە هەرچوار سووچی جیهانا
بەناو کێو و بیابانا
بەناو گشت کووچە و کۆلانا
جوانیم لەوێدا بەسەر برد
ریشم لەوێدا سپی کرد
کون نەما سەرمی پیا نەکەم
شوێن نەما بەزمی تیا نەکەم
شار نەما نەزانم چۆنە
ئەمیان نوێ، ئەویان کۆنە

***

با بچینە ناو کۆنە شاران
بەیادی رۆمانسی جاران
تەمەنەکانی ناوەندی
سەردەمی سوارچاکی و تیرو

شمشیرو گورزو کەمەندی
سەردەمی سوارانی دڵدار
سەرتا بەپایان زرێدار
چەند تەخت و تاراجیان دەگرت
لەپێناو دولبەری نازدار

***

ئەدی رێنیسانس و تابلۆی
داڤینچی و مایکل ئەنجلۆی!
هونەر لێرە خۆی دەنوێنێ
هەستی مرۆڤ دەبزوێنێ
بیر دەتبا بۆلای نەپۆلیۆن
بۆ لای هەپسبورگ و بوربۆن
بۆ بەزم و موزیکە و جوانیی
رۆژگارانی خانەدانی

***

ئەو کۆشک و سەراو دیوانە
نەخشی دیواریان بارۆکە
ئەو سورەییا و چراخانە
تێکڕا پرشنگ دەپرژێنن
بەناو ئەو میناو نەینۆکە
هەرچوار دیوار سەرتا بەخوار
بە مەخمەڵی سوور گیراوە
تابلۆی خێزانی شەهریار
یەکە یەکە هەڵواسراوە
زۆپایەکی فەخفووری سەیر
لە ژووری خاوەن شکۆیە
لەگەڵ نەخشی تەخت و تاخم

شاکارێکی رۆکۆکۆیە
جێ و بالینگان قەدیفەی سوور
کورسی و مێزی ئیمپراتۆری
لەسەریان رادەکشان جاران
میرزادەی خرپن و حۆری
بن دالان، دەروازەی دەربار
چەند شازادە، چەند شۆڕە سوار
ئەسپی رەسەن و گالیسکە
پێیدا دەچوون بە نەرمەغار
هەیکەلی جوان لە بەردی لووس
لە ناوەندی هەر مەیدانێک
لەبەر هەر دەرگا و هەیوانێک
گشت پەنجەرە و کون و دیوار
هەیکەلی شۆخێکی سنگ پڕ
پەل و پۆ خڕ، مەمک هەنار
لەشوێن ستوونی ژێر تارمە
پالەوانێک ئەو هەیوانەی
لە ئەستۆی خۆی کردۆتە بار

***

دیوار رەشە بە دومانە
هونەری ئارکیتێکتی دێر
یان گۆتیکە یان رۆمانە
کووچە و کۆلان وەک خۆی ماون
بە بەردی داتاشراوی خنج
وەکو حەسیر هەلچنراون
کەس نابێ دەسیان لێ بدا
تەرزی خانووەکان تێک بدا

گشتیان بە یاسای تایبەتی
زۆر بە جوانی پارێزراون

***

بۆ هونەرمەند، بۆ خاوەن چێژ
بۆ رۆشەنبیر و بۆ بوێژ
بۆ ئەو کەسەی کە بریندارى موزیکەی کلاسیکە
بۆ ئەو کەسەی ئەویندارى سروشتێکی رۆمانتیکە
بۆ ئەو کەسەی سەرمەستی پێچە ڤاڵسێکی ڤیەننایە
بۆ ئەو کەسەی مەبەستی چوونە ئۆپەرێت و ئۆپرایە
بۆ ئەو کەسەی مێژووی کۆنی لاگرنگ و بە بەهایە
بۆ ئەو کەسەی مەراقی تابلۆی رەسەن و
شوێنەوارى بێ هاوتایە
سەردانێکی ئەم شارانە
وات لێ دەکا هەست پێ بکەیت
کە رۆژگار جاری جارانە

*** (هۆمەر دزەیی، چیرۆکی ئەوینداریم، چاپی دووەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی 2006).**

ورده ورده شـارەزای کووچـەو کۆڵانـە کۆنەکانـی شـارەکە بـووم و نزیکـەی رۆژانـەش سـەرێکی کافـێ شڤارتسشپانیەرم دەدا کـە خوێنـدکارە عیراقییەکانـی لـێ دادەنیشـتن. راسـتیەکەی دوو کافـێ هەبـوون کـە خوێنـدکاری عیراقـی لـێ دادەنیشـت و لـە پشـت زانکـۆی ڤیەننـا بـوون. کافـێ شڤارتسـشپانیەر خوێنـدکارە چەپـڕەو و کۆمونیسـتەکانی لـێ دادەنیشـتن، کافـێ گلۆریـا Gloriaش عیراقـی و عەرەبـە قەومـی و بەعسـییەکان.

رێکەوتێکـی بـۆ مـن خـۆش لـەوەش دابـوو کـە نهۆمـی یەکەمـی سـەر کافـێ شڤارتسـشپانیەر ئـەو ماڵـەی لـێ بـوو کـە بێتهۆڤـن لـە 1827/3/26 کۆچـی دوایـی لـێ کـرد. شـارەوانیی ڤیەننـا پەیکەرێکـی برۆنـزی سـەلکی

ئەو هونەرمەندە بلیمەتەی لە لادیوارێکی ئەو باڵاخانەیە داکوتاوە.

کاتی ئەوە هات خۆم ئامادە بکەم بۆ سەفەری مۆسکۆم. فێستڤاڵی لاوان و قوتابیانی جیهان کە یەکیەتیی سۆڤیەت سپۆنسەراتیی دەکرد هەر دوو ساڵ جارێک لە یەکێک لە پایتەختەکانی وڵاتێکی کامپی سۆسیالیستدا بۆ ماوەی دوو هەفتە بەڕێوە دەچوو. پێش مۆسکۆ، لە وارشۆ و بوخارێست و پەکین و پێموایە لە سۆفیا یان لە بوداپێست کرابوو و ئەو هاوینەش (1957) شەشەمین فێستڤاڵ بوو و لە 26ی مانگی حەوتەوە تا وابزانم 8 ی مانگی هەشت لە مۆسکۆ ئەنجام دەدرا.

نەوەکوو باڵیۆزخانەی عێراق لە ڤیەننا پێ بزانێ ئەمن لای خوێندکارە عێراقیەکانی کە لە کافێ شڤارتسشپانیەر بووبوون بە برادەر و ئاشنام باسی ئەو سەفەرەم نەدەکرد و ئەوانەی کە نیازی بەشداربوونی فێستڤاڵەکەیان هەبوو ئەوانیش جارێ لای کەس باسیان نەدەکرد. لەبەر ئەوەی کە من هەر دوو مانگێک دەبوو گەیشتبوومە نەمسا و زمانە ئاڵمانیەکەم هێشتا هی ئەوە نەبوو بتوانم لەگەڵ خەڵکا بە چاکی تێک بگەین وریا لەگەڵم هات چووین بۆ بارەگای پارتی کۆمونیستی نەمسا کە لە باڵاخانەیەکی زۆر گەورەی مولکی خۆیان بوو بە ناوی گلۆبوس Globus و پێموایە لە گەڕەکی 21 ی بە گشتی چینی کرێکارانی شاری ڤیەننا بوو کە فلۆریدسدۆرف Floriedsdorf یشی پێ دەڵێن و ئێستاش هەر وایە.

چووین لەوێ لەگەڵ سەرپەرشتیاری ئۆفیسی پەیوەندیدار قسەمان کرد و نامەکەی یەکیەتیی قوتابیانی کوردستانم دایێ کە بە ئینگلیزی بوو و مام جەلال لە بەغدا دایبوومێ. منیان ناونووس کرد و پێیان گوتم کە دەلەگاسیۆنێکی خوێندکارانی عێراقیی زانکۆی ڤیەننا لێرەوە ئەڕوات بۆ فێستڤاڵەکە تۆش لەگەڵ ئەوان دەچیت و ئێمە خۆمان پەیوەندییان پێوە دەکەین و ناوی تۆیان دەدەینێ.

دەرکەوت ئێمە هەشت کەس بووین لە ڤیەنناوە دەچووین بۆ

مۆسکۆ کە لەوێش بەگەڵ دەلەگاسیۆنی عێراقی بکەوین کە لە عێراقییەکانی ناو عێراق و ئەو عێراقیانەی کە لە دەرەوەش دەیانخوێند پێک دەهات. لەو هەشت کەسە پەروینی مەحمود جەودەت و من کورد بووین. من سەر بە پارتی بووم (بەڵام ئەندام نەبووم) و پەروینیش سەر بە حیزبی شیوعیی عیراقی بوو ئینجا نازانم ئەندام بوو یان نا. ئەوانەی تریش هەموویان کوڕی باشی یان شیوعی یان هەر چەپڕەو بوون لەناویانا: مالك عبدالحميد الياسري، قحطان كمال الدين، علي حمود، عبدالرزاق الموعيني، محمود خالد و یەکێکی تریش یان سعد الامين یان غازي يعقوب بوو، چاکم لەبیر نەماوە.

ئیتر لەگەڵ ئەو عیراقیانە لێک ئاشکرا بووین و لەوێ بەدوا رێز و خۆشەویستی تایبەتیان بەرامبەر بە من دەنواند. بەڵام لە کۆبوونەوەیەکی خۆئامادەکردن بۆ سەفەرەکە لەگەڵ مەحمود خالدا لێم بوو بە کەمێک ناکۆکی کە من پێم راگەیاندن ئەگەر بێتوو دەلەگاسیۆنێکی کوردستانی سەربەخۆ بڕیاری لەسەرا بدرێ لە مۆسکۆ، وەک کە مام جەلال لە بەغدا پێی گوتبووم هەوڵ بۆ ئەوە دەدات، گوتم ئەوسا ئەمن بەداخەوە دەبێ لە مۆسکۆ بەجێتان بێڵم و بەگەڵ دەلەگاسیۆنە کوردستانییەکە بکەوم. هەڤاڵە عێراقییەکانی تر هیچ یەکێکیان لارییان پیشان نەدا مەحمود خالید نەبێت و لەسەر ئەوە لێمان بوو بە دەمەقاڵێ کە دوای کۆبوونەوەکە ئاشتیان کردینەوە.

کە هێشتا لە بەغدا بووم مام جەلال داوای لێ کردم لە ڤیەننا چەند هەزار ئاڵایەکی چکۆلانەی کوردستان هەم وەک دەمبوس و هەم لە پەڕۆش دروستکراو بە رادان بدەم بۆ ئەوەی لە مۆسکۆ بە دیاری پێشکەشی ئەندامانی دەلەگاسیۆنەکانی میللەتانی تری جیهانیان بکەین. گوتیشی لە مۆسکۆ پارەکەیت دەدەینەوە. شوێنێک هەبوو لە ناوچەی فرەیونگ Freyung لە ناوشار لە گەڕەکی یەکەمی ڤیەننا ئەم جۆرە شتانەی وەک دەمبووسی بەرۆک دروست دەکرد. چووم لەگەڵیانا رێک کەوتم، ئاڵای کوردستانم بە پێنووسی رەنگاوڕەنگ

بـۆ کێشـان کـە 1500 دانـەم بـۆ بکـەن بـە نزیکـەی 3000 شـلنێکی نەمسـاوی. لـە هەمـان کاتـدا چەنـد مەترێـک کوتاڵـی سـوور و سـپی و سـەوز و زەردیشـم کـڕی لەگـەڵ دەرزی و داو و مقەسـت لەگـەڵ پەرویـن مەحمـود جـەودەت لـە ژوورەکـەی مـن شـەو و ڕۆژمـان لێـک دەدا، مـن دەمبـڕی و پەرویـن دەیـدروو.

چەنـد هـەزار دانەشـمان لـەو ئاڵا پەڕۆیینانـە دروسـت کـرد و خۆمـان ئامـادە کـرد بـۆ مانگـی تیرمەهـێ بچیـن بـۆ مۆسـکۆ.

لـە مـاوەی ئـەو دووسـێ مانگـەی پێـش سـەفەرم بـۆ مۆسـکۆ نـاوە نـاوە میوانـی کـورد بـۆ گەشـتوگوزار یـان بـۆ سـەر دکتـۆر دەهاتنـە ڤیەننـا و منیـش ئـەوەی لـە توانامـدا بوایـە یارمەتیـم دەدان. توریسـتی هەمیشـەی هاوینـان مـام ڕەشـید عارفـی کۆیـی بـوو کـە بەڵێندەرێکـی دەوڵەمەنـدی دانشـتووی بەغدابـوو و لـە بەشـەکاني پێشـتر باسـم لـەو کـردووە. یەکێـک لـە توریسـتە بەڕێزەکانیـش کاک یـەدوڵا سـادق وەزیـری بـوو لـە بنەماڵـەی ناسـراوی وەزیـری لـە شـاری سـنەی ڕۆژهەڵاتـی کوردسـتان. ئـەو لـە سویسـراوە هاتبـوو و ماوەیـەک لـە ڤیەننـا مایـەوە و ئـەو ماوەیەمـان پێکـەوە بـە یادگاریـی خۆشـەوە بەسـەر بـرد. هـەر ئـەو هاوینـەش کوڕێکـی خەڵکـی سلێمانی (حسێنی مـەلا) ئەویـش بـۆ تیمارکردنـی چـاوی هاتبـوو و هەمیشـە لەگەڵیـا بـووم تـا گەڕایـەوە. خوسـرەوی ڕەشـید جـەودەت ئامـۆزای پەرویـن مەحمـود جـەودەت ئەویـش وەک توریسـت هاتـە ڤیەننـا و چـوون دۆسـتایەتیی کۆنـی بنەماڵەیمـان هەبـوو نەمهێشـت لـە ئوتێـل دابەزێـت و بـردم بـۆ ژوورەکـەی خـۆم کـە لا قەنەفەیەکـی دەشـکایەوە دەبـوو بـە تەختـی نووسـتن. کاک خوسـرەویش چەندیـن هەفتـە مایـەوە و هەمـوو ڤیەننـا و دەوروپشتیشـیم لەگـەلا دەکـرد.

هـەر لـەم ماوەیـەدا چەندیـن کچـی جـوان جوانـی نەمساویشـم ناسـی کـە لەگـەڵ هەندێکیـان مـاوەی کـورت و هەندێکیـش زیاتـر دەمامـەوە. بـەلام ئـی واش هەبـوو کـە خۆیـان لـە مـن بێـزار دەبـوون چونکـە نـە مـن ئاڵمانییەکـەم بـاش بـوو دوو قسـەی خۆشـیان بـۆ بکـەم نـە ئەوانیـش

ئینگلیزییان دەزانی کە باش تێک بگەین. ڕاستییەکەی ئێمەی موسڵمانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی هی ئەو زەمانە هەر ڕاش نەهاتبووین بە تەنیا لەگەڵ کچێکی خۆشەویستمان دابنیشین و قسە بکەین. لە ڤیەننا کە لەگەڵ کچێکا ژوانم دەبوو و لە کافێیەک دادەنیشتین نەمدەزانی باسی چیی بۆ بکەم. کە کچەش سەیری مێزەکانی ئەملاو ئەولای خۆی دەکرد هەر جووتە گراون و بەردەوام لە قسەکردندان و حیتەی پێکەنینیان دێ و منیش لە دڵی خۆما دەمگوت باشە ئەم هەتیوە سەگبابە دەبێ چی بۆ دەنکەکەی خۆی بگێڕێتەوە کە ئەوها بە پێکەنینی هێناوە و زۆر هەستم بە گرێی ڕەوانی دەکرد. ئیتر سروشتانە تۆ ئەگەر لەگەڵ کچێکا بە قوڕقەپی دابنیشیت بێ گومان دوای ماوەیەکی کورت کچە لێت بێزار دەبێت و جارێکی تر لەگەڵتا ناچێتە دەرەوە. کە لەگەڵ هەر کچێکی زانکۆیی یان ڕۆشەنبیر دادەنیشیت هەست دەکەیت حەز دەکا تۆ زانیاریی وات هەبێ کە بۆ ئەو تازە بن. ئاستی ڕۆشەنبیریت ڕاتدەکێشێ بۆ ژنی زیرەک. کەسایەتیی پیاو لای ژن زیاتر بە زانیاری و ڕۆشەنبیری و شێوازی قسەکردنییەوە سەنگ و کاریگەریی دەبێ تا بە جوانیی بەژن و باڵای و قۆزییەوەی. بەڵام کیژۆڵە نەوجوانە تازە پێگەیشتووەکان ئەوان ئەمەیان لا مەبەست نەبوو، بۆ ئەوان گرنگ ئەوە بوو چەند گۆرانیی ڕۆکن ڕۆڵی ئەڵڤیس پریسلی و هاری بێلێفۆنتێ و پۆل ئانکا و پێتەر کراوس و کۆنی فرۆبێس دەزانیت و چەند فیلمی سینەمایی نوێت بینیوە و لە کاتی دانسکردنا چۆن چۆنی خۆت با دەدەیت، لای ئەمانە زانیاریی گشتی و ڕۆشەنبیری ئەوەندە بایەخی نەبوو.

## کافی شڤارتسشپانیەر

**Schwarzspanier Cafe**

کافێ شڤارتسشپانیەر بۆ هەر عیراقییەکی هەستی بە تەنیایی و غوربەت بکردایە شوێنێکی فەرامۆشی بوو. خاوەنەکەی ژن و مێردێکی زۆر رووخۆش و ئێسک سووک بوون (هێر سۆنتاگ و هاوسەرەکەی فراو سۆنتاگ Herr & Frau Sonntag ). کچێکی زۆر جوانیشیان هەبوو (هایدی Heidi) کە هەرسێکیان کافێکەیان بەڕێوە دەبرد و سێ گارسۆنیش هێر هانس و هێر فرانس و هێر ڤیللی خزمەتیان دەکرد. ژوورێکی گەورە لە بنەبانی کافێکەدا هەبوو کە بەزۆری عیراقییەکانی لێ دادەنیشتن و زۆر جار شەوان دەبوو بە گۆرانیی عێراقی و منیش گۆرانیی کوردی و عەرەبیم بۆ دەگوتن. جارێکیان کچێکی ئاشووریی بەغدایش (ئایلین) بۆ تیمارکردنی چاوی ماوەیەک لە ڤیەننا مایەوە و رەقسی زۆر جوانی دەکرد. زۆر شەو لەو کافێیە بە رەقس و گۆرانی زۆر خۆشمان رادەبوارد. زۆرێک لە عێراقییەکانی کە لە ڤیەننا هاوسەرگیرییان دەکرد ئاهەنگی شاییەکەیان هەر لەو کافێیەدا دەگێڕا و هەندێکیان پارەشیان لە خاوەنەکەی بە قەرز وەردەگرت ئەوەندە خێزانێکی باش بوون.

بەکورتی کافێ شڤارتسشپانیەر لە شەقامی شڤارتسشپانیەر لە گەڕەکی نۆیەمی ڤیەننا مێژوویەک بوو بۆ عیراقییەکانی ئەو شارە کە بەداخەوە ئێستا نەماوە بووەتە کتێبفرۆشی.

## دیسان دڵ ساردبوونەوەم

ستوونە ئەستوورەکانی تایبەت بە ڕێکلامکردن لەسەر شۆستەکانی شار بە پۆستەری ڕەنگاوڕەنگی ڕێکلام بۆ چالاکیە هونەری و کولتوورییەکانی حەفتانە و مانگانە لە ڤیەننا دادەپۆشران. ڕۆژێکیان پۆستەرێکم خوێندەوە کە تێستی دەنگ بۆ دەنگخۆشان هەیە. یەکسەر شوێن و ڕۆژەکەم لای خۆم نووسی و فۆرمم پڕ کردەوە و بۆم ناردن. شوێنەکە لە باڵاخانەیەکی مێژوویی زۆر جوان بوو بۆ چالاکیی هونەری، باڵاخانەی ئەکادیمی هونەرە جوانەکان لە مەیدانی شیللەر، گەڕەکی ژمارە یەکی ڤیەننا Akademie der bildenden Kuenste ڕۆژی دیاریکراو چووم و بینیم دە دوانزدە کەسێک لە هۆڵێکا وەستاون هەر یەکە دەفتەرێکی نۆتی موزیکی لەبن هەنگڵی هەڵگرتووە و چاوەڕێی ناوی خۆی دەکات بانگ بکرێ. لە هۆڵێکی تری تەنیشتیشمان کە دەرگایەکی زۆر نایابی سەردەمانی کۆنی بۆ دەچوو گوێمان لە دەنگی گۆرانیبێژێک دەبوو کە تاقی دەکرایەوە. ئەمن ترسم لە دڵا نیشت چونکە ئەوانەی کە بانگ دەکران بۆ ژوورەکە هەموویان ئاریایەکی ئۆپرایان دەچڕی نەک گۆرانیی ئاسایی. تێگەیشتم ئەمە تەنیا بۆ دەنگی ئۆپرالییە. نۆرەی من هات و بانگ کرام. کە چوومە ژوورەکە پڕ بە واتای وشە سامگرتوو بووم. جارێ ژوورەکە کە زۆر گەورە بوو دەسکردی هونەری ئارکیتێکتوری سەردەمانی کۆن بوو کە ئەوسا هێشتا نەمدەزانی بارۆکە یان ڕۆکۆکۆیە یان هەر چییەکی بووبێ. سورەییا و چراخانەکانی ژوورەکە پرشنگیان بە هەموو لایەکدا دەپرژاند. هەرچوار دیوار بە تابلۆی بۆیەکارانی ناوداری پێشینان ڕازابوونەوە. مێزێکی درێژی ئەویش هەر هی سەردەمی ئیمپراتۆراتی لە بنەبانی ژوورەکە داندرابوو کە سێ چوار دادوەر بە ڕیز لە پشتیا دانیشتبوون.

بەڵام دادوەر چۆن دادوەر: هەر هەموویان جلی سەردەمی مۆزارتیان لەبەردا بوو و باڕۆکەی سپیی هی ئەو سەردەمەشیان بەسەروە بوو. لە لادیوارێکی تەنیشت ئەوانیشەوە پیانۆیەکی باڵداری رەش grand piano داندرابوو و پیانیستێکی بە هەمان بەرگەوە لە بەری دانیشتبوو. دادوەرەکەی ناوەڕاست لێی پرسیم کوا نۆتەکانت بدە بە پیانیست با بۆت لێ بدا! گوتم من هیچ نۆتەم نییە گوتی ئەدی بەتەمای چ ئاریایەکی چ ئۆپرایەک پێشکەش بکەیت؟ زۆر شڵەژام و نەمزانی بڵێم چی. لەپاش کەمێک بیرکردنەوە گوتم من ئۆپرا نازانم تەنیا گۆرانیی کوردی دەزانم. ئەویش دوور لەوەی بیەوێ بەسەر خۆمدا بمشکێنێتەوە گوتی دە باشە گۆرانییەکی کوردیمان بۆ بڵێ. منیش، هەڵبەت بێ یاوەریی پیانۆژەنەکە، گۆرانیی (نیوەشەو)ی تایەر تۆفیقم بۆ گوتن. کە لێ بوومەوە کابرا زۆر بەرێزەوە پێی گوتم راستە دەنگت زۆر خۆشە، بەڵام ئەم تێستە تەنیا بۆ دەنگی ئۆپرایە نەک گۆرانیی رۆژانە. هەروەها گوتی دەتوانی بچیت بۆ قوتابخانە تایبەتەکانی موزیک و دەست بکەیت بە فێربوونی نۆتەی موزیک و هەر ئامێرێکی کە حەزت لێی بێ. دیسان هەر زۆر بەرێزەوە سوپاسی کردم و هیوای سەرکەوتنی بۆ خواستم.

بە دڵشکاوی و دڵساردییەوە منیش سوپاسم کردن و چوومە دەرەوە. گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم لە ماڵەکەی فراو بێرگەر و تێر تێر بۆ بەختی رەشی خۆم گریام. زانیم تازە بەم تەمەنە دەبێ دەسبەرداری خوێندنی موزیک و گۆرانی بم. هەزار نەعلەتیشم بۆ کولتووری کۆمەڵگا دواکەوتووەکەی خۆمان رەوانە کرد و برینە سارێژکراوەکەی رکە کۆنەکەشم لە کاک ئەحمەدی براگەورەکەم سەر لە نوێ هاتەوە سوێ.

لێرەوە بەدوا ئیتر دنیاڕوانیم گۆڕا و دڵساردبوونەوەکەم وردە وردە بە شەرابی لەعلی رومانی لە مەیخانەکان بە تایبەتی لە بار و ریستۆرانتەکانی کە موزیکی قەرەجەکانی لێ نمایش دەکرا، لە

باوەشــی کیژۆڵــە خرپشــەکانی ڤیەننــا دادەمرکانــدەوە. یەکێــک لــە خولیاکانــی منداڵیمــەوە موزیکــی قەرەجــەکان بــوو. ئەمانــە بــە ئاڵمانــی (چیگۆینــەر Zigeuner)، بــە زمانــە ســلاڤیەکان (چیــگان Tsigan) و بــە ئیســپانیش (خیتانــۆس Gitanos)یــان پــێ دەڵێــن. بانــدی موزیکاڵــی ئەمانــە بریتــی بــوو لــە ڤیۆلــۆن و چێلۆ و ئەکۆردیــۆن و گیتــار و تســیتەر کــە ئەمــەی دوایــان ئامێرێکــی قانــون ئاســایە. ئــەم باندانــە بــە زۆری لــە ریســتۆرانتی هەنــگاری و رۆمانــی و یوگۆســلاڤی و ئەوانــەی وڵاتانــی باڵــکان بــە گشــتی موزیکیــان لــێ دەدا و ســوخمەی ســوور و پانتۆڵــی رەشــیان دەپۆشــی و هەندێکیــان پشــتێنێکی پەرۆیینــی پانیــان دەبەســتا و خۆشــیان بــە رەچەڵــەک هــەر قەرەجــی ئــەو وڵاتانــە بــوون. جــێ ژوانــی شــەوانی ویکێندەکانــم لەگــەڵ کیژۆڵەیەکــی جــوان بــەزۆری یەکێــک لــەو ریســتۆرانتانە بــوو کــە بانگــی موزیکژەنــە چیگۆینەرەکانــم دەکــرد بێــن بــۆ لای مێزەکــەی ئێمــە و چەنــد ئاوازێکمــان بــۆ لــێ بــدەن کــە خــۆم داوام دەکــرد. ڤیۆلــۆن ژەنێــک و ئەکۆردیــۆن ژەنێــک دەهاتــن و منیــش هەمیشــە داوای ئــەم چەنــد ئــاوازەم لــێ دەکــردن کــە هــەر لــە کۆنــەوە پێــم خــۆش بــوون و هەندێکیانــم لەگەڵیانــا دەگوتــەوە ئەگــەر وشــەکانم لەبــەر بــوا: (تراوریگــەر ســۆنتاگ Trauriger Sonntag واتــا یەکشــەممە خەماوییەکــە)، (ئۆچــی چیۆرنیــا Otchi Tchiornya کــە گۆرانییەکــی رووســییە واتــا چاورەشــەکان)، (مۆســکۆ ڤێچێــرا Mosko Vetchera واتــا ئێوارانــی مۆســکۆ)، (دی لێرخــە Die Lerche واتــا قومــری)، (داس ئاڵتــە لیــد Das alte Lied واتــا ســترانە کۆنەکــە)، (کــۆم چیــگان Komm Tsigan واتــا وەرە قــەرەج)، (دی تســڤای گیتــارە Die zwei Guitare واتــا دوو گیتارەکــە) و هەنــدێ ئــاوازی دیکــە کــە زۆر جــار دەیانگریانــدم چونکــە خــۆم بــە رێ لــێ گــۆڕاو دەدی. وەکــو پێشــتر باســم کــردووە، لــە ( بەبــەک کازینۆســی) یەکــەی ئەســتەنبوڵ کــە زەکــی مــورەن گۆرانــی لــێ دەگــوت هەمــان هەســتی دڵ بریــنداری و بەدبەختیــم بــە ناخــا دادەهــات. جــا لەپــاش تەواوبوونــی ئــاوازە دڵخــوازەکان شاباشــێکی باشــم دەدا بــە موزیــک

ژنەکان. لەم تەرزە ریستۆرانتانە ژنە گوڵفرۆشێکیش دەگەڕا و گوڵی سووری بەسەر مێزی دۆست و گراوانی وەک مندا دەگێڕا و منی دڵداریش دانەیەکی جوانم لە چەپکەکەی هەڵدەبژارد و پێشکەشی دڵبەرەکەم دەکرد.

## مەیخانە رەمەکییە ترادیشناڵەکانی ڤیەننا

بێجگە لەو ریستۆرانتە تایبەتانە جۆرێک لە مەیخانەی زۆر باوی ڤیەننا هەیە کە زۆریان لە سەردەمانی کۆندا ژێرزەمین یان بندالآنی خانووێکی مێژوویی کۆن بووین و کراون بە مەیخانەی وا کە بۆنی مێژوویان لێ دێت و بە ئاڵمانی بەمانە دەڵێن (ڤاین کێلەر Wein Keller). بۆ نموونە هەندێ لەو ڤاین کێلەرانە کە ئێستاش ماون ئەمانەن: (ئەوگوستینەر کێلەر Augustiner Keller کە دەڵێن جاران تەویلەی ولاخەکانی کایزەر بووە)، (شتیفتس کێلەر Stifts Keller)، (ئوربانی کێلەر Urbani Keller ئەمەیان کە من گەیشتمە ڤیەننا یەکێک لە شوێنە پەسندەکانم بوو و دەیانگوت کە 700 ساڵ کۆن بووە و کە دادەنیشتی تەونی جاڵجاڵۆکە هێشتا بە دیوارەکانیەوە بوون و دەسکارییان نەدەکرد، بەداخەوە ئێستا نەماوە)، (راتهاوس کێلەر Rathaus Keller)، (پیاریستن کێلەر Piaristen Keller) و زۆری تریش کە ناوەکانیانم لەبیر نەماوە. ئەم شوێنانە ئێستاش هەر یەکێکن لە مۆرکە زۆر تایبەتەکانی شاری ڤیەننا. لەوێ تەنیا شەراب دەخورێتەوە و جۆرە باندێکی موزیکاڵی شەعبیی نەمساوی کە پێی دەڵێن (شراml موزیک Schrammel Musik) لێ دەدەن بەلام لە هەندێ لەو مەیخانانە باندی قەرەجیش هەن.

نەمساوییەکان بە رابواردنی ئێوارانیان لە مەیخانە شەعبییەکان دەڵێن (هۆیریگە Heurige). جا ئەگەر بتەوێ ئێوارەکەت لە ریستۆرانتێک یان لە بارێکی ئاسایی نەبەیتە سەر و حەزت لە مەیخانە شەعبییەکان

بـوو ئـەوا بـۆ خـۆت یەکـێ لـەو هۆیریگانـە هەڵبژێـرە. بەناوبانگتریـن هۆیریگـەش لـە ڤیەنـا (گرینچینـگ Grinzing)ە کـە دواتـر پتـر باسـی دەکـەم.

هونەرمەنـدی دەنـگ فریشـتەیی میسـری اسـمهان لـە خوتوخۆڕایـی نەیگوتـووە:

"ليالي الانس في ڤينا... نسيمها من هوا الجنة...

مابين رنين الكاس ورنة الالحان. متع شبابك في ڤينا" و تا دوایی

هـەر لـەو هاوینـەی ڤیەنـا پێش سـەفەری مۆسـکۆم لەگـەڵ کیژۆڵەیەکی جوانکیلـەی نەمسـاوی (ئێریـکا بلێـدل Erika Bledl) لـە ڕۆمانسـێکی کورتخایەنـدا بوویـن بـە گـراوی یەکتـری و دوای لێکدابڕانمـان هەڵبەسـتێکی پـڕ لـە سـۆز و هەسـتی دڵشـکاوی خۆمـم بـۆ داڕشـت. کـە دواتـر دەگەڕێمـەوە سـەری.

## سەفەرەکەی مۆسکۆم

مۆسـکۆ بـۆ عیراقیـی چەپـڕەوی وەک ئێمـە بـە کـورد و عەرەبـەوە وەک قیبلەگاهێـک بـوو کـە بـە حەسـرەتەوە وێنامـان دەکـرد. جـا دەبـێ چ خۆشـییەک بووبـێ بۆمـان کـەوا خـەون و خەیاڵەکەمـان لـێ بـوو بـە ڕاسـتی!.

وەکـو پێشـتر باسـم کـردووە ئێمـە هەشـت خوێنـدکاری عیراقـی بووین کـە لـە ڤیەنـا خۆمـان بـۆ ئـەو سـەفەرە ناونـووس کردبـوو. وا داندرابـوو کـە لـە مۆسـکۆ لەگـەڵ زۆرێـک لـە خوێنـدکار و لاوان و ڕۆشـەنبیرانی دیکـەی عیراقـی چ ئەوانـەی لـە دەرەوە دەژیـان چ ئەوانـەی کـە لـە عیراقـەوە بـە ڕێـگای نهێنـی دەچوونـە مۆسـکۆ لـەوێ یەکدیگـر ببینـەوە و دەلەگاسـیۆنێکی عیراقـی فرەوانتـر پێکوەبنێـن. پاسـپۆرتمان پـێ بـوو بـەڵام ناسـنامەی تایبەتییـان بـۆ کردبوویـن بـۆ ئـەوەی هیـچ مۆرێـک بـە پاسپۆرتەکانمانەوە نەبێـت چونکـە وڵاتیانـی عیراقـی بۆیـان نەبوو سـەفەری

هیچ وڵاتێکی بەرەی سۆسیالیست بکەن کە گشتیان کۆمونیست بوون و سەر بە یەکیەتی سۆڤیەت بوون. حکومەتی عیراقی بیزانیایە یەکێک چووەتە ئەو وڵاتانە دادگایی دەکرا و ئەو عیراقییانەی لە دەرەوەش دەژیان ئەوانیش باڵیۆزخانەی عیراق پاسپۆرتی بۆ نوێ نەدەکردنەوە یان هەر لێی دەسەندنەوە.

لەو هەشت عیراقییەی ڤیەننا پەروینی مەحمود جەودەت و من کورد بووین. من بەرگی تەواوی کوردیم هەبوو و گۆپاڵێکی زۆر جوانی کوردیشم لەکاتی خۆی لە شەقڵاوە کڕیبوو کە سەرتا بەخوار نەخشێکی زۆر جوانی هونەری لێ هەڵکەندرابوو. خۆشم بە ئینگلیزی لەسەرم نووسی (مێد ئین کوردستان Made in Kurdistan ) و لە دووگردکان داوام لە یەکێک کرد کە پێم وایە یان حوسێنی مام کەریم هەباسی یان مام وسووی عەلی قادری بوو نووسینەکەی من تیپ بە تیپ بە چەقۆ هەڵکەنێ. هەر واشی کرد و بەڕاستی شتێکی زۆر نایابی لێ دەرچوو کە لەو سەفەرەم بێجگەلە رانک و چۆغە رەنگاوڕەنگەکەم و کاڵە سەر ئاوریشمینە کۆییەکەم و پووزەوانە بەنە رەنگینەکەم شانازییەکی زۆریشم بە گۆپاڵە مێد ئین کوردستانەکەمەوە دەکرد. ئەو گۆپاڵەم لە مۆسکۆ هەمیشە بە دەستەوە بوو و پیشانی خەڵکم دەدا. ئەمن ئەو جلەی لەبەرم بوو لە پشتێن و تیلاک بەو لاوە هەمووی دەسکردی خۆماڵی کوردی بوون و زۆر جاریش کلێتەیەکی مەرەزی سپی زۆر جوانم لەباتی شەدە لەسەرم دەنا کە ئەویشم چەند ساڵێ پێشتر بە دیاری وەرگرتبوو لە سەردانێکم لەگەڵ براکانم بۆ ماڵی سەید ئەحمەدی کوڕی سەید تەهای نەهری ناودار لە شارۆچکەی باتاس. خۆی با بۆ مێژوو تۆمار بکرێت کە دروستکردنی کلێتە کە بۆ ماوەیەک لە کوردستانا بڵاو ببوەوە بیرۆکەی ئەو سەید تەهای نەهرییە بووە کە پێم وایە لە شێوەی helmet (خوودە)ی سەربازی بریتانی دیزاینی کردبوو. جگەلە کڵاوە نەخشینە کوردییەکەی خۆم چەند کڵاوێکی زۆر جوانی دەسکردی کوردەواری دیکەشم لەگەڵ

خۆما بردبوو و بە دیاری دەمدا بە هەندێ کیژۆلەی جوانی ولاتانی جیاجیا.

فێستڤاڵەکەی مۆسکۆ لە 1957/7/26 دەستی پێ دەکرد بەلام ئێمەیان چەند رۆژێک زووتر لە ڤیەنناوە بەشەمەندەفەر برد بۆ مۆسکۆ. ئەو ترێنەی ئەو رۆژە ئێمەی برد پڕ بوو لە دەلەگاسیۆنی ولاتانی دیکەش کە دیار بوو هاتبوون لە ڤیەنناوە بە رێگای پارتی کۆمونیستی نەمساوییەوە رەوانەی مۆسکۆ بکرێن. نەمسا ئەو سەردەمە، دە ساڵ پاش کۆتایی دووەم جەنگی جیهان (1945-1955)، بە پێی رێککەوتنێکی نێوان هاوپەیمانە رۆژئاواییەکان، ئەمەریکاو بریتانیا و فرانسە لە لایەکاو یەکیەتی سۆڤیەت لە لایەکی ترا کە ساڵی 1955 لە ڤیەننا بە ناوی (رێککەوتنی دەولەت Staat`s Vertrag) مۆر کرابوو سەربەخۆیی تەواوی پێ درابۆوە بە مەرجێک لە سیاسەتا بێ لایەن (neutral) بێت، نە لای رۆژئاوا نە لای سۆڤیەت و ولاتە سۆسیالیستەکان بگرێت ونەبێتە ئەندامی هیچ پەیمانێک یان رێکخراوێکی جیهانیش ئەگەر بۆنی دژایەتیکردنی یەکێک لەو دوو کامپەی لێ بێت.

ترێنەکەمان بۆ مۆسکۆی دواقۆناخ بە هەنگاریا و ئۆکراینادا (کە ئەمەی دوایان هەنگی یەکێک بوو لە پانزدە کۆمارەکانی یەکیەتی سۆڤیەت ) تێ دەپەڕی. ئەو هەموو کچ و کوڕە گەنج و جوانەی دەلەگاسیۆنەکانی ناو ترێنەکە کە زۆریان لە ئەمەریکای لاتینەوە هاتبوون بە شەو و بە رۆژ هەندێکیان بە بەرگی میللی خۆیانەوەو بە گیتاری دەستیانەوە هەر لە سەما وستران گوتندا بوون و لە هەموو لایەکەوە دەسلەملانە و ماچ و مووچ بوو. یەکەم شار کە ترێنەکەمان لێی وەستا بوداپێستی پایتەختی هەنگاریا بوو. لەوێ حەشاماتێکی گەورەی لاوی هەنگاری بە بەرگی میللیانەوە و بە چەپکە گوڵی جوان جوان لەسەر شۆستەی وێستگەی شەمەندەفەرەکەمان لە چاوەڕوانی ئێمەدا بوون. ئێمەش دابەزین و بوو بە گەرەلاوژە و هەڵپەڕکێ و

دەسلەملانەو ئاڵوگۆڕکردنی ناونیشانی یەکتری. ساردیمان نۆش کرد و بەڕێ کەوتینەوە بۆ سنووری سۆڤیەت لە ئوکراینا. دیسان لە شاری (کیێف)ی پایتەختی ئەو وڵاتە دابەزین و هەمان بەزم و هەرای ئەو هەموو گەنجانەی ناو ترێنەکە لەگەڵ گەنجانی ئۆکراینیشا دووبارە بووەوە. پێموایە دوو شەومان پێ چوو تا گەیشتینە مۆسکۆ. دەبا پێش گەیشتنە مۆسکۆمان ئەم قسە خۆشەی ناو ترێنەکەمتان بۆ بگێڕمەوە.

کاربەدەستانی رووس تەرجومانێکیان بۆ هەر دەلەگاسیۆنێکی ناو ترێنەکە بە زمانی خۆیان دانابوو شەو و رۆژ لەگەڵیانا بێت تا دەگەنە مۆسکۆ.

تەرجومانی ئێمەی عیراقی رووسێکی عەرەبیزان بوو. بەڵام دیار بوو کە عەرەبی فوسحایەکی ئەکادیمی پەتی زۆر باش فێر ببوو هەرچەندە کە زۆر لەسەرەخۆ قسەی دەکرد نەوەکوو هەڵەیەکی رێزمانی بکات. ئەو لە عەرەبی رەمەکی (جلفی) نەدەگەیشت. سەیرەکە لەوەدا بوو کە عیراقییەکان هەرچەندی هەوڵیان دەدا عەرەبی فوسحایان بۆ نەدەهات و دوای یەک دوو وشە دەگەڕانەوە بۆ شێوەزاری جلفی بەغدادی. کابرای رووسی داماو دیار بوو زۆر تەنگاو دەبوو کە لەو عەرەبییەی ئەوان نەدەگەیشت. من کە عەرەب نەبووم هیچ کێشەیەکم لەگەڵ زمانی عەرەبی فوسحادا نەبوو و راستییەکەی منیش وەک کاکی رووس فوسحاکەم زۆر باشتر بوو لە جلفی بەغدادی چونکە جلفی زمانی دایکم نەبوو و ئەوەی لە قوتابخانەش فێری ببووم فوسحا بوو نەک جلفی بەغدادی. کار گەیشتە ئەوەی کە هەندێ لە عیراقییەکان کەوتنە پێکەنین و گاڵتە پێکردن بە فوسحاکەی وەرگێڕی رووسی بەدبەخت کە دیار بوو زۆر بەسەرخۆیدا دەشکایەوە. ناچار ئەمن بوومە موتەرجیم لە نێوان فوسحاکەی برای رووس و جلفییەکەی برا عیراقییەکانما. بەزمەکە لێرەدا بوو کە گەیشتینە دوا قۆناخ، وێستگەی شەمەندەفەری مۆسکۆ. لەوێ هەر وەرگێڕە و دەبوایە ماڵاوایی لە دەلەگاسیۆنەکەی خۆی بکات. ئەوەی ئێمەش تۆقەی لەگەڵ هەمووان

كرد و كه گه‌یشته من زۆر به دڵخۆشی و منه‌تبارییه‌وه ده‌ستی گوشیم و قۆڵی گرتم گوتی " انني سعيد جدا بالتعرف على شخصكم الكريم كما انني اراك انت العربي الاصيل الوحيد من بين هؤلا الشباب، عسى ان نلتقي تارة اخرى." منیش له دڵی خۆما گوتم " ترحێو ته‌ڤاریش !!". ته‌ڤاریش به رووسی واتا ره‌فیق و ئه‌م وشه‌یه له كابرای ته‌رجومان خۆیه‌وه فێر ببووم.

له وێستگه‌ی شه‌مه‌نده‌فه‌ر ئێمه‌یان به ئۆتۆبوسی گه‌وره گه‌وره گواسته‌وه بۆ چه‌ند باڵاخانه‌ی به‌رزی نزیك یه‌كتری، هه‌ر چه‌ند ده‌له‌گاسیۆنێك له باڵاخانه‌یه‌ك و ئیتر ئه‌وێ بووه شوێنی نووستن و خواردن و هه‌ندێ چالاكی كولتووریشمان تا كۆتایی فێستڤاڵه‌كه. خێوه‌تێكی دوورو درێژیش له‌به‌رده‌م باڵاخانه‌كاندا داكوترابوو بۆ سێ ژه‌مه نان خواردن به سیسته‌می بووفێ به‌ڵام خۆیان بۆیان تێ ده‌كردین و خواردنه‌كانیش به‌ڕاستی هه‌مه جۆر بوون و راهاتنی هه‌ر میلله‌تێكیان به خواردنی خۆماڵیی خۆیان له‌به‌رچاو گرتبوو. ئه‌م خێوه‌تی خواردنانه ته‌نیا بۆ ده‌له‌گاسیۆنه بێگانه‌كان بوو و هیچ وڵاتیه‌كی سۆڤیه‌ت مافی له‌وێ خواردنی نه‌بوو، ئێمه هه‌موومان ناسنامه‌مان پیشان ده‌دا كه ده‌چووینه ژێر خێوه‌ته‌كه‌وه و بۆمان نه‌بوو هیچ سۆڤیه‌تیه‌ك له‌گه‌ڵ خۆمانا به‌رینه ژووره‌وه ئه‌وانه نه‌بێ كه ناسنامه‌ی په‌یامنێری یان ناسنامه‌ی تایبه‌تییان هه‌بوا.

تێبینی: ئه‌مرۆ 2017/5/2 یه كه ئه‌م لاپه‌ڕه‌یه ده‌نووسمه‌وه وا بوو به 60 دانه سالی خشت كه بۆ یه‌كه‌مجار گه‌یشتمه ڤیه‌ننا له رۆژی 1957/5/2.

## سەفەرەکەی مۆسکۆم (2)

### لەگەڵ مام جەلال و کوردە هاتووەکانی دی پێک شاد بووینەوە.

ئێمەی لە ڤیەنناوە هاتوو کە گەیشتینە شوێنی دامەزراندنمان لە باڵاخانەی دیاریکراوا کە ئاڵای ولاتانی ئەو دەلەگاسیۆنانەی کە لەوێ دامەزرێندرابوون لەسەردا دەشەکایەوە دیار بوو عیراقییەکانی پێش ئێمە گەیشتوو لە چاوەڕوانیی ئێمەدا بوون. مام جەلال بە جلی کوردییەوە لە دوورەوە بەپیرمانەوە هات و بوو بە دەسلەملانە و چاکوچۆنی. ئەو کوردانەی کە وەک مام جەلال لەگەڵ دەلەگاسیۆنی عێراقی هاتبوون ئەگەر بەچاکی لەبیرم مابن ئەمانە بوون کە زۆریانم پێشتر دەناسی: بێجگە لە مام جەلال خۆی، جەباری پیرۆزخان لە کەرکووکەوە، بەشیر ئیسماعیل چیچۆ لە هەولێرەوە، حەمەی حسێنی مەلای دزەیی ئامۆزای خۆم کە لە قاهیرە دەیخوێند، ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر کە لە بەیروت دەیخوێند، نەجیبی حاجی برایماغای خەفاف لە ئاڵمانیای رۆژئاوا دەیخوێند، دارا تۆفیقیش لە لەندەن و قەدری جانی شاعیری کوردی سووریاش لە سووریاوە هاتبوو. کوڕێکی دیکەی هەولێری و یەکی بادینیشیان لەگەڵدا بوون بەڵام ناوەکانیانم لەبیر نەماوە. لەو کوردانە تەنیا مام جەلال و نەجیب خەفاف و قەدری جان و من سەر بە بزووتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی بووین کوردەکانی تر هەموویان سەر بە حزبی شیوعی عیراقی بوون. بەڵام با مێژوو تۆماری بکات کە کوردایەتییەکەی ئەوانیش لەوەی ئێمە کەمتر نەبوو هەڵبەت بە بۆچوونی خۆیان و وەک ئێمەش لە بۆنەکانا هەمیشە بە بەرگی کوردییەوە بوون، ئاڵا وردیلەکانی کوردستان کە من لەگەڵ خۆما بردبووم و دواتر بەسەر کوردەکانا دابەشمان کردبوون ئەوانیش

هەمیشـە بـە بەرۆکیانەوەیـان کردبـوون و وەک ئێمـە بـە پەرۆشـەوە باسـی پرسـی رەوای کوردیـان بـۆ بێگانـەکان دەکـرد.

دیـار بـوو هەندێ لە رۆشـەنبیرانی کوردی سـۆڤیەتی وەک پرۆفیسـۆری زمانەوانـی قەناتـێ کـوردۆ، شـاعیر و نووسـەر ئەحمـەدێ سـیبکی و رۆژنامـەوان کارلینـێ چەچـان و هەنـدێ لاوی کوردی دیکـەش زانیبوویان کـە دەلەگاسـیۆنی عێراقـی کوردیشـی تیایـە بۆیـە هاتـن بـۆ لامـان و هەمیشـە یـار و یاوەرمـان بـوون. قەناتـێ کـوردۆ کـە لـە دانیشـتنەکانمانا هەسـتی پـێ کـرد مـن جگـە لـە موزیـک توانـای زمانەوانییشـم هەیـە و بـە کرمانجییەکـی باشـیش کـە لـە سـاڵانی خوێندنـی تورکیـام فێـری بووبـووم قسـەم لەگـەڵا دەکـرد کتێبێکـی خـۆی بـە زمانـی رووسـی لەبـارەی رێزمانـی کـوردی کرمانجـی پێشـکەش کـردم کـە دیـار بـوو تـازە بـە چاپـی گەیاندبـوو. وا وێنەیەکـی بەرگـی کتێبەکـە و پێشکەشـکردنەکەی بـە دەسنووسـی خـۆی بـە ئەلفبـای لاتیـن لێـرەدا دەخەمـە بەرچـاو و بـۆ ئاسـانکارییش بـۆ خوێنـەرە خۆشەویسـتەکانم پێشکەشـکردنەکە دەگۆڕمـە سـەر ئەلفبـای کـوردی عەرەبیـش.

ڤێ کتێبا خوە ئەز ب دل و جان
پێشکێشی ئۆمەرێ دزەیی دکم بۆنا
پێشڤەچوویینا کوردناسیێ و کوردپەروەریێ و
قایمکرنا پەڤگرێدانا مە د ڤی شخولیدا.
هەڤالێ ئەزیز، ڤێ کتێبێ بخوونە و بزانبە،
کو زمانێ کوردی باشە، شیرنە و دەولەمەندە.

**خوەدینڤیس**
**8.8.1957 / مۆسکوا**

بێجگـە لـەو کوردانـەی سـۆڤیەت کـە ڕۆژانـە دەهاتنـە لامـان چەنـد کوردێکـی ئێرانـی و عێراقـی کـە هەندێکیـان دە سـاڵ پێشـتر لەگـەڵ مـەلا مستەفای بارزانیـدا چووبوونـە سۆڤیەتسـتان و هەندێکیشـیان لەپاش نەمانـی کۆمـاری کـوردی مەهابـاد پەنایـان بردبـووە بـەر یەکیەتیـی سـۆڤیەت ئەوانیـش هەمیشـە لەگەڵمانا بـوون. لەوانـە سـەید عەزیـز شـەمزینی، دکتـۆر مـوراد و دکتـۆر سەلماسـی لـە کوردسـتانی ئێـران و پێـم وایـە لـە بنەماڵـەی (خۆشـەوی)ش لـە کوردسـتانی عیـراق ئەسـعەد خۆشـەوی و عەلـی خەلیلی بـرازای (ئـەم دوو نـاوەم دواتـر لـە کاک موحسـینی برامـەوە زانـی و زۆر سوپاسـی دەکـەم).

ئـەو ئاڵایانـەی کوردسـتان (دەمبـووز و پەڕۆییـن) کـە مـام جـەلال لـە بەغـدا ڕایسـپاردبووم لـە ڤیەننـا بـە کردنیـان بـدەم هەموویـم ڕادەسـت کـرد و هێنـدەی یـەک دونیـا دڵـی پـێ خـۆش بـوو چونکـە ئـەوە یەکەمیـن جـار بـوو ئـاڵای کوردسـتان وەک دەمبـووزی یاخـە دروسـت بکرێـت. کـە لـەوێ مـام جەلالـم دی کۆلێـک دەمبـووزی ئـاڵای میللەتانـی جیاجیـای جیهانـی بـە بەرۆکـەوە بـوو بۆیـە کـە چـاوی بـە ئەوانـەی مـن کـەوت شاگەشـکە بـوو و گوتـی: "هۆمـەر گیـان، لەنـاو ئـەو هەمـوو خەڵکانـە هـەر ئێمـەی کـورد ئـەو ئاڵایانەمـان نییـە کـە لـە یاخـە دەدرێـن و تـا ئەمـڕۆ مـن هیـچ شـتێکی کـوردی وام نەبـووە تـا لـە بەرامبـەر پێشکەشیانی بکـەم، ئەتـۆ کارێکـی بـێ وێنـەت کـردووە." منیـش پەروینـی مەحمـود جەودەتـم پێشـکەش کـردو گوتـم کـە ئـاڵا پەڕۆیینـەکان هەمـووی دەسـکردی شـەونخوونیی پەرویـن خـان بـووە.

لەپاشـان مـام جـەلال منـی جیـا کـردەوە و گوتـی لـە سـبەینێ ڕا خـۆت ئامـادە بکـە پێکـەوە دەچینـە دەزگا پەیوەندیـدارەکان و هەوڵێکـی زۆر دەدەیـن ڕەزامەنـدی بـۆ دەلەگاسـیۆنێکی سـەربەخۆی کوردسـتان بەدەسـت بێنیـن و هـەر کوردێکـی لەگـەڵ دەلەگاسـیۆنی بەشـەکانی دیکـەی کوردسـتاندا هاتبـن بـا ئێمـە و ئـەوان پێکـەوە وەک دەلەگاسـیۆنی کوردسـتان لەژێـر ئـاڵای کوردسـتان بەشـداریی فیسـتڤاڵەکە بکەیـن.

گوتیشـی هەوڵێکـی زۆریـش دەدەیـن بتوانیـن چاومـان بـە ڕەهبـەری گەورەمـان مـەلا مسـتەفای بارزانـی بکـەوێ. بـەڵام گوتـی جـارێ بـا کەسـمان تـێ نـەگا.

هـەر وەک کـە پێشـتر گوتوومە هێشـتا چەنـد ڕۆژێک مابوو فێسـتڤاڵەکە لـە 7/26 بکرێتـەوە. ئـەو چەنـد ڕۆژە مـام جـەلال و مـن بـەدوای ئـەو دوو مەبەسـتە دەرگا نەما لێـی نەدەیـن، کـون نەمـا سـەرمانی پیا نەکەیـن. ڕووسـەکان زۆر کەمیـان نیمچـە ئینگلیزییەکـی تێکشـکاویان دەزانـی و زیاتـر ئاڵمانییـان دەزانـی ئیتـر بـە ئینگلیـزی هەردووکمـان و بـە ئاڵمانییـە دوو سـێ مانگییـە سـاواکەی منیـش لەگـەڵ کاربەدەسـتە سـۆڤیەتەکان تێک دەگەیشـتین. جارێ بـۆ بینینـی مـەلا مستەفا هـەر دەیانگـوت لـە مۆسـکۆ نییـە و ناتوانـن ببینـن. بـۆ دەلەگاسـیۆنێکی سـەربەخۆی کوردسـتانیش دەیانگـوت چونکـە کوردسـتان دەوڵەتێکـی سـەربەخۆ نییـە ڕاسـتتر ئەوەیـە لەگـەڵ میللەتانـی عـەرەب و فـارس و تـورکا خەباتـان یـەک بکـەن تـا ڕەژیمـە کۆنەپەرسـتە سـەر بـە ئیمپریالیسـتەکانی خۆتـان لەنـاو دەبـەن ئینجـا هـەر میللەتـە مافـی ڕەوای خـۆی پـێ ئەدرێتـەوە. مـام جـەلال لێـی پرسـین باشـە وڵاتێکـی وەک سـۆمال خـۆ ئەویـش وەک کوردسـتان دابـەش کـراوە (سـۆمالی بریتانـی، سـۆمالی ئیتالـی، سـۆمالی فرانسـی) بۆچـی ئـەوان دەلەگاسـیۆنێکی سـەربەخۆی سـۆمالیان لـەم فێسـتڤاڵەدا بـۆ بڕیـار دراوە بۆچـی ئـەوە بـۆ کوردیـش نەبـێ؟ کابـرای ڕووس گوتـی ئاخـر بریتانیـا و ئیتالیـا و فرانسـا ئەمانـە هەرسـێکیان ئیسـتیعمارن بـەڵام خـۆ عـەرەب و فـارس و تـورک ئیسـتیعمار نیـن، ئـەو سـێ میللەتـە خۆیشـیان وەک ئێـوەی کـورد دوچـاری زوڵـم و بێـدادی ڕیژیمەکانـی کلکـی ئیسـتیعمار بووینـە بۆیـە پێویسـتە ئێـوە پێکـەوە لەگـەڵ ئەوانـا خەبـات بـۆ ئـازادی و دیموکراسـی و سـەربەخۆیی بکـەن. خولاسـە، ئەوەنـدی هەوڵمـان دا دیـار بـوو سیاسـەتی سـۆڤیەت بـە ئێمـە نەدەگـۆڕا و ڕەزامەندیـی پێکهێنانـی دەلەگاسـیۆنی کوردسـتانیمان پـێ وەرنەگیـرا.

هەموو دەلەگاسیۆنەكان بەرنامەی پڕ و چڕی رۆژانەمان بۆ داندرابوو كە بە ئۆتۆبوس دەهاتن تووریان پێ دەكردین بۆ شوێنە مێژوویی و كولتوورییەكان و سەردانی كەسایەتیی ناوداری زیندوو و ئارامگای گەورەپیاوانیان. شەوانیش لە زۆر شوێنی جیاجیادا بەرنامەی موزیک و گۆرانی و هەڵپەڕكێی میللی دەلەگاسیۆنەكان دەگێڕدرا و هۆڵەكان پڕ دەبوون لە رووس و لە دەلەگاسیۆنی میوانی وەک ئێمە و ئێمەش ئەگەر ئەو شەوە خۆمان بەرنامەمان نەبووایە بەسەریاندا دەگەڕاین و كامەی لامان خۆش بوا زیاتر لەوێ دەماینەوە. لەو بۆنانەدا دەرفەتی باش دەڕەخسا هەر دەلەگاسیۆنەو باسی كێشە و گرفتەكانی میللەتی خۆی بكات، دیاری و ناونیشان ئاڵوگۆڕ دەكران، حەزحەزۆكێ و ژوانی درەنگانی شەوانیش بەربڵاو بوو لەنێوان ئەو هەموو كیژوكوڕە جەوانانە و بە دەسگیرانكردنیش لەناو زۆرێک لەوانە رووی دەدا.

بەرنامەی كوردەكان لەناو چوارچێوەی بەرنامەی دەلەگاسیۆنی عیراقیدا بوو چونكە بەرنامە تەنیا بۆ دەلەگاسیۆنی رەسمی دادەندرا و كوردیش نەیبوو. لەو چوارچێوەیە ئەمن رۆڵم هەبوو لە پێشكەشكردنی گۆرانی و پێكەوە لەگەڵ نەجیب خەفافیش لە سەرپەرشتی كردنی گرووپی هەڵپەڕكێی كوردی.

## سەفەرەكەی مۆسكۆم (3)

لەو گەشت و گوزەرانەی كە كاربەدەستانی سۆڤیەت بۆ دەلەگاسیۆنەكانیان رێک دەخست بەر لە هەموو شتێک سەردانی مۆسۆلێیوم (ئارامگەی لێنین و ستالین) بوو لە رۆخێكی مەیدانی سووردا. بە ئۆتۆبوسان ئێمەیان گەیاندە ئەوێ و ئەو هەموو حەشاماتە چەندین سەعات ریزمان لە دەرەوەی ئارامگەكە گرت تا گەیشتینە ژوورەوە.

هەردوو رابەری گەورەی مێژوویی سۆڤیەت بە جلی تەواوی خۆیانەوە لەسەر دوو تەختی نووستنی کراوە بەڵام شووشەبەندی تەنیشت یەکتریدا راکشێنرابوون، لینین بە بەرگی سیڤیل و ستالین بە یونیفۆرمی مارشالی. بە رووبانەوە دیار بوو کە سوورە و سپیاوێکی باش کرابوون و قژلێشیان بۆ سەر سگیان شۆڕ کرابوونەوە و دەستوپەنجەکانیان بەڕووتی بەدەرەوە بوون. وێنەگرتن قەدەغە بوو و ئێمەش یەک لە دوو یەک بەو پەڕی ڕێز و بەکشوماتی و بێدەنگی و بە وەستانێکی کورت بە پێش تەرمەکاندا ڕەت دەبووین و بە دەرگایەکی دیکەشدا دەچووینە دەرەوە.

هەروەها ئێمەیان برد بۆ سەردانی دوو کەسایەتیی ناوداری زیندووش: دایکی زۆیا کە زۆیای کچە پارتیزانە هەژدە ساڵییەکەی (1941 - 1923) لەلایەن ئاڵمانە نازییەکانەوە لەسێدارە درابوو و دوای شەهیدبوونی خەڵاتی (قارەمانی یەکیەتیی سۆڤیەت)ی بە خۆی و بە دایکیشی بەخشرابوو کە بەرزترین خەڵاتی ڕێزلێنان بوو لە یەکیەتیی سۆڤیەتا. هەندێ وێنەمان لەگەڵا گرت ئینجا ئێمەیان برد بۆ سەردانی شاعیری گەورەی تورک نازم حیکمەت (1963 - 1902). ئەمیان مارکسییەکی کۆن بوو و چەندەها ساڵی لە زیندانەکانی تورکیادا بەسەر بردبوو تا ساڵی 1951 کە ئازاد دەکرێت ئەویش خۆی گەیاندبووە یەکیەتیی سۆڤیەت و وەک پەنابەر تا کۆچی دوایی لەوێ دەژیا.

ئێمە پێشەکی دەمانزانی بەرنامەی ڕۆژانەمان چییە، بۆیە مام جەلال هەر کە لە شوێنی نووستنەکەمان دەرچووین یەک دەستە ڕانک و چۆغەی زۆر جوان و کڵاو و کڵاشی کوردیی خستە ناو بوخچەیەک تا پێشکەشی نازم حیکمەتی بکات. لەگەڵ ئەویشا لە ماڵەکەی خۆی دانیشتین و چون ئەو ئینگلیزیی نەدەزانی مام جەلال کە خۆی دیارییەکەی پێشکەش دەکرد بە منی کە تورکیم دەزانی گوت پێی بڵێم ئەمە دیاریی گەلی کوردە بۆ دۆستێکی تورکی

وا گەورە و گوتی پێی بلێ ئومێدێکی زۆرمان پێی هەیە هەمیشە پشتیوانی گەلی کورد بێت بەتایبەتی کوردی بەشخوراوی تورکیە. جا کە من قسەکانی مام جەلالم بۆ نازم حیکمەت گۆڕییە سەر زمانی تورکی ئەویش لە وەرامدا گوتی: "براینە، ئەمن چاوەڕێی ئەو رۆژە دەکەم کە کوردستان سەربەخۆیی بەدەست بێنێت و ئێوەش من بۆ رۆژی راگەیاندنی سەربەخۆیی بانگهێشت بکەن." هەندێ وێنەی جوانمان لەگەڵ ئەویشا گرت و ئەویش دیوانێکی نوێی خۆی کە بە تورکی و بە ئەلفبای لاتین تازە لەچاپ درابوو بە واژۆی خۆی یەکە یەکە پێشکەشی کردین. نازم حیکمەت پیاوێکی رەنگوڕوو پەمەیی جوان بوو و کەلەشێکی تێکسمراو و قژێکی پڕی زیاتر سپیی هەبوو کە پێوەی دیار بوو بە گەنجی مەیلەو قژ زەرد (بلۆند) بووە. کە گەڕامەوە بۆ ڤیەننا کوڕێکی تورکی ناو (سەلاحەدین باشاران)م دەناسی دیوانەکەی بۆ ماوەیەک لێ خواستمەوە کە بیخوێنێتەوە و بۆم بێنێتەوە کەچی بە کتێبەکەوە خۆی لێ شاردمەوە و ئەوسا و ئێستاش چاوم پێی نەکەوتەوە.

لەو شوێنە ناودارانەی مۆسکۆ کە توورپان پێ دەکردین زانکۆی مۆسکۆ، ئۆپێراخانەی (بۆلشۆی تیاتەر) کە بالێی (گۆلێ قولینگان Swan Lake)ی چایکۆفسکیی لێ نمایش کرا، کاتێدراڵی سان باسیل، مۆڵی (گوومی Gumi) و پیشانگای پیشەسازی و کەلوپەلی دەستکردی هەر پانزدە کۆماری یەکیەتیی سۆڤیەت و زۆر شوێنی تریش کە لەبیرم نەماون.

## نەسرینی هاوسەری عەباسی ئەنوەری و هێلێنی هاوسەری عەبدولڕەحمان قاسملو

لە ئەنجامی تێکەڵی و سەردانی یەکتریمان لەگەڵ دەلەگاسیۆنەکانی دیکە ژنێکی زۆر جوانی قژ زەردی چاوشینی پێست زۆر کاڵی کوردی ئێرانیش بە بەرگی کوردیی دەستووری موکریانەوە هاتوچۆی ئێمەی کوردی عێراقی دەکرد. کە قسەمان لەگەڵا دەکرد کوردییەکەی زۆر رەوان نەبوو و وشەکانی لەسەرەخۆ و لە ئەنجامی بیرکردنەوەیەکی کورت دەردەبڕی، فارسییەکەی باشتر بوو. گوتی کە ناوی نەسرینە و هاوسەری (عەباسی ئەنوەری)یە کە خوێندکارێکی کوردی ئێرانە لە پراگ پایتەختی چیکۆسلۆڤاکیا دەخوێنێت و خۆی نەیتوانیوە بەشداریی فێستڤاڵەکە بکات ئەم لەباتی مێردەکەی هاتووە. زۆر درەنگتر دوو ساڵێکی پێچوو ئینجا دەرکەوت کە نەسرین خان کورد نییە چێکە، ناویشی نەسرین نییە (هێلێن)ە و ناوی هاوسەرەکەشی عەباسی ئەنوەری نییە بەڵکو عەبدولڕەحمان قاسملووە کە ناوی خۆی گۆڕیبوو بە (عەباسی ئەنوەری). تا چەند ساڵێکیش دوای مۆسکۆ من نامەگۆڕیم لەگەڵیانا هەبوو، من لە ڤیەننا ئەوان لە پراگ و هەر بە کاک عەباسمان دەناسی و دواتریش بووین بە دۆستی زۆر نزیکی یەکتری. لەسەردانێکی بۆ ڤیەننا د. قاسملو قەوانی (مرا ببوس)ی بە دەنگی گلنەراقی بەدیاری بۆ هێنام کە ئەوە یەکەمجار بوو ئەو گۆرانییە بە ئاواز و وشەوە هەست هەژێنە ببیەم و هەر یەکسەریش لەبەرم کرد.

## کردنەوەی فێستڤاڵ 1957/7/26

ئاهەنگی کردنەوەکە لە ستادیۆم (یاریگا)ی لینین بوو کە شوێنی سەت هەزار کەسی لێ دەبۆوە. پێشتر ستادیۆمی وا جوانم نەدیبوو. دەلەگاسیۆنەکان هەریەکە بە بەرگی میللیی خۆیانەوە بەپێی تیپی ئەبجەدی لە چەشنی کەوانەیەکی زۆر گەورە لەگەڵ پێچی بینای ستادیۆمەکە یەک بە دوای یەکدا ریز کرابوون و لە هەر دەلەگاسیۆنێکا یەکێک ناوی وڵاتەکەی خۆی کە بە گەورەیی نووسرابوو بەرز کردبۆوە. بەو پێیە دەلەگاسیۆنەکانی ئێران، ئێراق، ئیسلاند، ئیسرائیل لە دوو یەکدی بوون.

## ئەلیزابێت ئێرلینگسدۆتیر
**Elisabeth Erlingsdottir**

بەرلەوەی مارشی دەلەگاسیۆنەکان لەسەر ئاوازی سروودە جیهانییەکان دەست پێ بکات و بەبەردەم باڵکۆنی ڤی ئای پی VIP سەرکردایەتیی حزب و حکوومەتا رەت بین لەو ماوەیە ئۆرکیسترا چەند کاری موزیکاڵی زۆر خۆشی لێ دەدا. هەر لە ماوەی ئەو وەستانەشمان و چاوەڕوانی دەست بە مارشکردنمانا ئێمەش بۆخۆمان دەکەوتینە قسەکردن لەگەڵ ئەندامانی دەلەگاسیۆنەکانی پاش و پێشمان. سروشتانە منیش چاوم بەملاو بەولادا دەگێرا. بینیم دەلەگاسیۆنی ئیسلاندی دراوسێمان کچێکی بەبەرگی نەتەوەیی خۆیانەوە تابلێی بە رەنگوڕوخسار جوان و بە بەژنوباڵا شۆڕەژنیان لەگەڵدایە. ناوەناوە هەر ئاوەڕم بەلایدا دەدایەوە و لابەلا سەیرم دەکرد تا هەستی پێ کرد و بۆم پێکەنی. چووم بۆ لای و کەوتینە قسەکردن و باش بوو

باڵاخانەی مانەوەی ئەویش هەر لە نزیک ئەوەی ئێمە بوو بۆیە رێک کەوتین ئێوارە دوای نانخواردن یەکتری ببینین. هەر لە یەکەم ژواندا دڵمان چووە یەکدی و تا فێستڤاڵ تەواو بوو هەر دەرفەت هەبووا پێکەوە دەبووین. لێرەدا مەتەڵۆکەیەکی عەرەبیم هاتەوە بیر کە کتومت بەسەر پەیوەندییەکەی من و ئەلیزابێت پیادە دەکرا کە دەڵێ: (نظرة، فابتسامة، فسلام، فكلام، فموعد، فلقاء، فغرام). سەیر بوو شەوێکیان تا سەعات نزیکەی چواری بەیانی لە پارکێکی نزیک شوێنەکەمان لەسەر لاتەختێک دانیشتبووین باسی رازونیازی خۆمان دەکرد. پۆلیسی پاسەوانی پارکەکان بەوێدا هات و داوای ناسنامەی لێ کردین چونکە کچە رووس بۆیان نەبوو تا ئەو درەنگانە لەگەڵ میوانەکانا بمێننەوە. کە زانی هەردووکمان بێگانەین رۆیشت وازی لێ هێنایـن. لە ئەنجام، بەینی من و ئەو کیژۆڵە نەرم و نۆڵە حەڤدە ساڵییە (لەدایکبووی 1940) هەرچەندە کە لە یەکتریش دابڕاین و دوور کەوتینەوە بوو بە رۆمانسێکی چەندین ساڵ خایەن وەک گۆرانییە کوردییە فۆلکلۆرییەکە کە دەڵێ:

من دوور و تۆ دوور
هەردووکمان دوورین
خودا دەیزانێ
بۆ یەک مەجبوورین

تەنانەت مام جەلالیش کە چاوی پێکەوت گوتی: "هۆمەر گیان ئەمە بەڕاستی شایەستەی ئەوەیە بۆ خۆتی بخوازیت". دوای گەڕانەوەم بۆ ڤیەننا جارێکیان کاک ئەحمەدی برا گەورەشم کە وێنەکانی بینی گوتی: "بەڕاستی جوانە، بۆچی بۆخۆتی ناخوازی !". تا چەند ساڵێکیش دواتر نامەگۆڕیمان لەنێوانا هەر هەبوو و ساڵی شەست و یەک یان شەست و دوو بوو کە سەردانێکیشی کردم لە پاریس کە ئەوسا من لەوێ دەمخوێند. ئەو بە نیازی هاوسەرگیری هاتبوو،

بەڵام ئەوسا ئەمن ئامادەی ژنهێنان نەبووم. دواتر زیاتر لەمە دەدوێم. ئەلیزابێت بە پێچەوانەی زۆرترایەتیی خەڵکی وڵاتانی سکاندیناڤیا کە قژزەرد و چاوشین (بلۆند)ن، ئەو قژڕەش و چاوقاوەیی بوو.

## سەفەرەکەی مۆسکۆم (4)

لە باڵکۆنی ڤی ئای پی VIP ستادیۆمی لێنین تەواوی ئەندامانی سەرکردایەتیی حکوومەت و پارتی کۆمونیستی سۆڤیەت دانیشتبوون کە ئەوەی لەبیرم مابن و لێم تێکەڵ و پێکەڵ نەبووبێ چونکە ئێمە بەبەردەمیاندا مارشمان دەکرد ئەمانە بوون: ڤۆرۆشیلۆف، بولگانین، خروشچێڤ، مالینکۆف، مۆلۆتۆف، گرۆمیکۆ، میکۆیان و زۆری تریش. خەڵکێکی زۆری دیکەش لەپشت ئەواندا دانیشتبوون و ئۆرکێسترای موزیکیش کە هونەرمەندی گەورەی ئەرمەنی ئارام خاچاتۆریان مایسترۆیاتیی دەکرد هەر لەو ناوە دامەزرێندرابوو.

ئەو هەموو حەشاماتەش لەگەڵ مارشی ڕۆیشتنیان هەر هەموویان پێکەوە سروودی خوێندکارانی جیهان و سروودی لاوانی جیهانیان هەریەکە بە زمانی خۆی کە پێشتر فێر کرابوون دەچری و لەو ستادیۆمە گەورەیە پێکەوە لەگەڵ سەدای ئۆرکێسترای سیمفۆنی وەک هارمۆنییەکی دڵهەژێن دەنگی دەدایەوە و بەڕاستی مووچڕکی بەناخماندا دەهێنا. ئێمە ئەندامە کوردەکانی دەلەگاسیۆنی عیراقی سروودەکانمان لەگەڵ عیراقییەکان بە عەرەبی دەچڕی چونکە بە کوردی نەمانبوو. من چەند دێڕێکی ئەو سروودانەم لەبیر مابوو بەڵام لە ڕاستیی وشەکانی زۆر دڵنیا نەبووم. باش بوو کاک مومتاز حەیدەری فریام کەوت و دەقی تەواوی هەردوو سروودی بۆ پەیا کردم کە مایەی سوپاس و منەتباریمە. ئەمن لێرەدا لە هەر یەکێکیان تەنیا چەند کۆپلەی سەرایی دەخەمە ڕوو:

«نشيد الطلاب العالمي»

في كل قطر جموع الشباب

تنشد لحن الاخاء والوئام

لن نرض للارض هول الخراب

لن تطمس الحرب فجر السلام

طلابنا.. هيا بنا.. للسلم

للخير.. نحو الامام

ئەمەشیان چەند کۆپلەیەکە لە (نشيد الشبيبة الدمقراطي العالمي):

امالنا المقبلات

حشدتنا لنبني الحياة

ونستشير النضال

في قلوب تحب السلام

انا نحب النضال

وصوتنا يتعالى

ان الشباب

يلوي ااصعاب

ويبهج الايام

بێجگەلـە ئـەم سـروودانە هەموومـان فێـر کرابوویـن پێکـەوە هـاوار بکەیـن (میـر دروژبـا، میـر دروژبـا، میـر دروژبـا) واتـا ( ئاشـتی و دۆستایەتی، ئاشتی و دۆستایەتی، ئاشتی و دۆستایەتی) کە دروشـمی بـاوی فێسـتڤاڵەکە بـوو.

لەگـەڵ تەواوبوونـی ئاهەنگـی رۆژی کردنـەوەی فێسـتڤاڵەکە مـن و چەنـد کەسـێکی تـری عێراقـی و ئـی تریـش خۆمـان گەیانـدە شـوێنی ئۆرکێسـتراکە تـا چاومـان بـە موزیـککاری نـاوداری ئەرمەنـی سـۆڤیەتی ئـارام خاچاتوریـان (1978 - 1903) بکەوێـت. تۆقەمـان لەگـەڵا کـرد و

مـن خـۆم وەک کـورد پێشـکەش کـرد و سوپاسـم کـرد بـۆ دانانـی پارچـە موزیکاڵێکـی زۆر سـەرکەوتوو بـە تایتلـی (هەڵپەڕکێـی لاوانـی کـورد Dance of the young Kurds) کـە بەشـێکە لـە شـاکارێکی هونەرمەنـد بـە نـاوی بالـێ سـویت (گایانـێ Gayaneh).

ڕۆژی کردنـەوەی فێسـتڤاڵ کـە هەمـوو ئەو دەلەگاسـیۆنانە بە پەرۆشـەوە چاوەڕوانـی بـوون کۆتایـی هـات. فێسـتڤاڵێکی لـە هەمـوو ڕوێکـەوە سـەرکەوتوو بـوو و لای زۆرێکیـش ڕاگەیانـدن وپرۆپاگەندەیەکی بەدڵـی دەوڵەتـی سـۆڤیەت بـوو بـۆ ئایدیۆلـۆژی کۆمونیـزم. خـۆی ئەندامەکانـی دەلەگاسـیۆنە بیانییـەکان هەمـوو کۆمونیسـت نەبـوون بەڵکـوو بیروبـاوەڕی جیاجیایـان تێـدا هەبوو، کۆمونیسـت، سۆسیالیسـت، مارکسیسـتی سـەربەخۆ، ناسیۆنالیسـت و هونەرمەنـد و کەسـانی سـەربەخۆی بـواری ڕۆشـەنبیری گشـتی و زۆر کۆمەڵـە و ڕێکخـراوی لاوان و قوتابیانـی وڵاتانـی جیاجیـاش کـە فرِیـان هـەر بەسـەر سیاسەتیشـەوە نەبـوو. ئەوانـە هـەر بـە مەبەسـتی تێکەڵبـوون لەگـەڵ لاوان و قوتابیانـی جیهـان و بینینـی شـاری مۆسـکۆ و بۆ بەسـەربردنی پشـووی هاوینەیـان هاتبـوون. خـۆ کاربەدەسـتانی ڕێکخسـتنی ئـەم فێسـتڤاڵانەی سـەر بـە یەکیەتیـی سـۆڤیەت ئەوانیـش ئـەو ڕاسـتیەیان چـاک دەزانـی بـەڵام کـە هـەر دوو سـاڵ جارێـک ئـەم گەنجانـەی گەلانـی جیهانیـان لـەو بۆنانـەدا تێکـەڵ بـە یەکتـری دەکـرد بـە هومێـدی ئـەوە بـوون وێنەیەکـی (ڕوونـی بێگـەرد)ی ژیانـی لاوانـی کۆمەڵـگا کۆمونیسـتەکان بخەنـە بەرچـاوی لاوانـی دەرەوەی کامپـی سۆسیالیسـت. ئـەوان حەزیـان دەکـرد زیاتـر ناکۆمونیسـت تـا کۆمونیسـت بەشـداریی ئـەم فێسـتڤاڵانە بکـەن چـون کـورد گوتەنـی "بەپایـان بگـرە، بـێ پـا هـی خۆمانـە." بـەڵام مـن پـڕ بـە بەشـی خـۆم و گومانیشـم لـەوەدا نییـە کـە هـەزاران میوانـی دیکـەی وەک منیـش لایـە "لێڵەکـەی" ئـەو وێنـە (ڕوون و بێگـەرد)ەی ژیانـی لاوانـی سۆڤیەتیشـمان بـەدی دەکـرد. جـارێ ئـەو خواردنانـەی کـە بـۆ مـاوەی دوو هەفتـە پێشکەشـی میوانەکانیـان دەکـرد

بە خەونیش نەدەهاتە بەرچاوی وڵاتیەکی سۆڤیەت بۆیە نەیاندەهێشت کەسی خۆیان ئەوە ببینێ، ئەو جلانەی کە لەبەر ئێمەدا بوون و ئەو سەعاتە سویسرییانەی کە لە مەچەکماندا بوون کە بۆ ئێمە شتێکی وا تایبەتیش نەبوون کەچی بۆ ئەو لاوە سۆڤیەتانەی کە لەسەر شەقامەکانا رایاندەگرتین و قسەیان لەگەڵمانا دەکرد مایەی سەرسوورمان بوون و هەناسەی قووڵی پڕ لە عەزرەت و داخیان بۆ هەڵدەهێنا. جلەکانی ئەوان بە ژن و پیاویانەوە لەچاو ئەوانەی میوانەکان زۆر شڕوشپڕێو و دوور لە چێژی هەموو مۆدەیەک بوون کە لە رۆژئاوا باو بوو. تکای زۆریان لێ دەکردین سەعاتە سویسرییەکانی ئێمە کە شتی وایان نەدیبوو بیانفرۆشینێ. هەر واشمان دەکرد. زۆرێک لە ئێمەی میوان جلوبەرگ و سەعاتمان پێ فرۆشتن هەر لەبەر ئەوەی کە لە رۆژئاوا دروست کرابوون. هەر خۆم سەعاتەکەم و بارانییەکی شەمێمشتی جوانیشم فرۆشتنێ کە تازە لە ڤیەننا کڕیبووم و مۆدە بوو. ئەو جۆرە بارانییە لەباتی قۆپچە چەند داروچکەیەکی درێژوکانی جوانی پێدا شۆڕ دەبوونەوە و لەباتی کونەقۆپچەش لە ریزێک زیی بەرامبەرەکەی گیر دەکران. ئەم مۆدەیە تازە لە وڵاتانی کاپیتالیستا پەیدا بووبوو و لاوێکی سۆڤیەت بە تکا و پاڕانەوەیەکی زۆر پێی سەلماندم بیفرۆشمێ. منیش راستییەکەی پارەم لە کورتی دابوو و بە هومێدی وەرگرتنەوەی پارەکەی ئاڵا کوردییەکان بووم کە لە ڤیەننا بە کردنم دابوون و مام جەلال لە بەغدا پێی گوتبووم کە لە مۆسکۆ پارەکەیم دەدەنەوە. بەڵام نە پارەم وەرگرتەوە و راستییەکەی پێشم جوان نەبوو و دڵیشم نەهات بە مام جەلال بڵێم. بۆیە دەبوایە بە نیمچە لاتییەوە بگەڕێمەوە بۆ ڤیەننا.

ئەو رۆژانەی کە مابوون تا تەواوبوونی دوو هەفتەکەی فێستڤاڵ ئیتر کاربەدەستانی سۆڤیەت هەر بەردەوام بوون لە خزمەتگوزارییەکی بێ وێنە بە میوانەکان و رۆژانە و شەوانە ئۆتۆبوس لە خزمەتماندا بوو

بۆ ئەو شوێنانەی کە بە بەرنامە بۆمان داندرابوون. سەردانی هەندێ شاری دیکەش وەک لینینگراد (ئێستا سان پیتەرسبورگ) و شوێنی تری دەرەوەی مۆسکۆش رێک دەخران بەڵام ئێمە ئەوانەی لە ڤیەنناوە هاتبووین لە مۆسکۆ نەچووینە دەرەوە و ئاگام لەوانی تریش نەبوو. بەڵام کە فێستڤاڵ لە 8/8 تەواو بوو هەندێ لە دەلەگاسیۆنەکانیان بردە سەردانی چەند کۆمارێکی یەکیەتیی سۆڤیەت و پێم وایە مام جەلالیش لەگەڵ هەندێ عیراقیی تر چوونە چین.

هەر بۆ مێژووش حەز دەکەم ئەوەش تۆمار بکەم کە دیار بوو کاربەدەستانی سۆڤیەت رازی بووبوون مام جەلال -تەنیا مام جەلال خۆی - چاوی بە مەلا مستەفا بارزانی بکەوێت و ئەوەش بە کەس نەڵێ. من خۆم چەند ساڵێک دواتر ئینجا بەوەم زانی.

رۆژی گەڕانەوەی دەلەگاسیۆنەکان بۆ وڵاتانی خۆیان نزیک بووەوە چونکە فێستڤاڵ وابزانم لە 1957/8/8 کۆتایی هات. بەر لە سەفەرمان برادەرەکانی کوردی سۆڤیەت کۆڵێک قەوانی گۆرانیی کوردی خۆیان و ئازەری و ئەرمەنی و ئوزبەکی و رووسی و زۆری تریشیان بە دیاری بۆ هێنام کە دوای چەندین ساڵ وشەی کوردیم بۆ ئاوازی هەندێکیان دانا کە زۆر بەدڵم بوون، بەڵام بە کەمێ دەسکارییەوە. لەوانە: دوێنێ شەو بینیم لە خەوێ، هێی گیانی من.

## گەڕانەوەم بۆ ڤیەننا

دەهۆڵ دڕا رمبەی بڕا. فێستڤاڵەکەی مۆسکۆ بە شایی و زەماوەندی خۆش و دەسلەملانە و ماچوموچی ئەو هەموو کچ و کوڕە جەوان و جوانانە کۆتایی هات بە هومێدی ئەوەی کە لە فێستڤاڵێکی دیکەی دوو ساڵ دواترا دیسان لە وڵاتێکی کامپی سۆسیالیست یان لە وڵاتێکی لانەگردا بە دیداری یەکتری شاد بینەوە. ئەمن گەڕانەوەکەم لە مۆسکۆ بۆ ڤیەننا وەک چوونەکەم بۆ ئەوێ ئەوها بە چاکی لەبیر نەماوە بەڵام دەزانم کە دیسان بە شەمەندەفەر بە (کییف)ی پایتەختی ئۆکراینا و (بوداپێست)ی پایتەختی هەنگاریادا رەت بووین تا گەیشتینەوە ڤیەننا.

هەرچەندە کە بە نابەدڵی، بەڵام کاتی ئەوە هاتبوو بچم لە زانکۆ خۆم ناونووس بکەم. کۆلێژی زانستی سیاسیم هەڵبژارد کە ئەوسا لە نەمسا بەو رشتەیان دەگوت

(Staatswissenschaften) کە بە کوردی دەبێتە (زانستەکانی دەوڵەت).

خۆ ناونووسکردنم لە زانکۆ لە نائومێدی و ناچاریم بوو پاش ئەوەی کە بینیم دەرگای موزیک خوێندنم لێ داخراوە، بەڵام بژارکردنی ئەم رشتەیەشم پێ خراپ نەبوو، چونکە حەزم لە دیپلۆماسییەتیش دەکرد کە ژیانی دیپلۆماتان جیهانگەڕان و فێربوونی زمانی جیاجیای لەخۆ دەگرت.

زانکۆی ڤیەننا کە لە بینایەکی زۆر جوانی گەڕەکی یەکەمی شارە لە ساڵی 1365دا مەزراوە و یەکێکە لە کۆنترین و بیناکەشی لە جوانترین بینای زانکۆی ئەورووپا بە زمانی ئاڵمانی. نەخشاندنی هۆڵ و

بنمیچی هەندێ لـه هۆڵەکانـی نموونـەی هونـەری بۆیەکاریـی سـەردەمانی کۆنـن و کۆڕیدۆرەکانـی بـه پەیکـەری زانـا و ئەدیـب و پرۆفێسـۆرانی نـاوداری زانکۆکـه لـه هەمـوو بوارێکـی زانسـت و مرۆڤایەتیـدا رازاونەتەوە.

ئەمـن خـۆم ناونـووس کـرد و دەوامـی پۆلەکانـم دەکـرد بـەڵام راستییەکەی هـەر ئەوەنـدە و کـه دەچوومـه دەرەوە ئیتـر چـاوم بـه کتێـب و دەفتەرەکانـم نەدەکەوتـەوە. پرۆفێسـۆرەکانیش جـۆرە چاوپۆشـییەکیان دەکـرد لـه کەمتەرخەمیـی خوێندکارە بیانییـەکان ئەوانەی که هێشـتا ئاڵمانی بەچاکـی فێـر نەبووبـوون. بـه کورتـی ئەمـن هەرگیـز خوێندکارێکـی جدی نەبـووم و زۆرترایەتیـی کاتەکانـم لـه کافیتریـای زانکۆکـه بەسـەر دەبـرد و چێژێکـی زۆرم زیاتـر لـه بوونـم لەنـاو ژینگـەی هونـەری ئاکیتێکتـووری بینـای زانکۆکـه و لـه بینینـی کیژۆڵـه نەشـمیلانەکان وەردەگـرت تـا لـه لێکتوورەکانـی نـاو کلاسـەکانی و ئەمفـی تیاترەکـەی amphitheater.

هـەر بـۆ زانیـن: ئـەم بینـای ئێسـتای زانکـۆی ڤیەننـا لـه سـاڵانی 1884 - 1877دروسـت کـراوە.

* * *

## نامەکانی سەید عەزیز چوار نامەی مێژوویی

دەبا لێرەدا چەند نامەیەکی مێژوویی بڵاو بکەمەوە کە رەهبەرێکی دێرینی کورد، لە بنەماڵەیەکی خانەدانی کوردپەروەر دکتۆر سەید عەزیز شەمزینی نەوەی شێخ عوبێدوڵلای نەهری لەساڵانی 57 و 58 لە مۆسکۆ بۆی ناردبووم بۆ ڤیەننا.

پێشتر باسم کرد کە کاک سەید عەزیز لەگەڵ ژمارەیەک کوردی تری ئێرانی وەک دکتۆر موراد و دکتۆر سەلماسی پێش یان پاش نەمانی کۆماری کوردیی مەهاباد پەنایان بردبووە بەر یەکیەتی سۆڤیەت. سەید عەزیز کوڕی سەید عەبدوڵای کوڕی سەید عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبێدوڵلای نەهری بوو کە بنەماڵەکەیان لەکاتی خۆی لە کوردستانی ئێران و کوردستانی عیراقیش نیشتەجێ ببوون. خۆی بە پیشە ئەفسەری سوپای عیراق بوو هەرچەندە کە ئێرانیش بوو بەڵام دیارە ولاتنامەی ئێران و عیراقیشی هەبوو و لەو ماوەیەی کە لە سۆڤییەت بوو دکتۆراشی لە مێژووی کوردا وەرگرتبوو. لە مۆسکۆ نێوانمان زۆر خۆش بوو بەتایبەتی کە باسی هەندێ خزم و کەسی ناوچەی شەمدینانی ئەوم بۆ دەکرد کە لە ماوەی خوێندنم لە تورکیا ئاشنایەتیم لەگەڵیانا پەیدا کردبوو. هەروەها کە زانی دۆستایەتیم لەگەڵ خزمەکانی کوردستانی عیراقیم هەیە و باسوخواسی سەید ئەحمەد و شێخ جەیتۆ و شێخ دارۆ و شێخ کەوکەسی کوڕانی سەید تەهای نەهریم بۆ دەکرد کە لە ناوچەی باتاس و هەریرا نیشتەجێ ببوون و دۆستایەتییان لەگەڵ براگەورەکانی من و بنەماڵەی ئێمەدا هەبوو. دڵی بەو قسانەم زۆر دەکرایەوە و دواتر تا ماوەیەکی درێژ نامەگۆڕیمان لە نێواندا هەبوو. ئەو سەردەمە ئاڵوگۆڕی نامە لەنێوان ولاتی سۆڤیەت و ولاتانی با بڵێین سەر بە ئیستیعماری وەک تورکیا و ئێران و عیراق

قەدەغە بوو و دەبوایە بەوپەڕی نهێنی و وریاییەوە بکرێت. جا ئەمن کە لەو سەفەرەی مۆسکۆم گەڕامەوە بۆ ڤیەننا لەسەر داخوازی سەید عەزیز خۆی بووم بە تەتەری پەیوەندی لە نێوان ئەو و هەندێ لەو خزمانەی کوردستانی. بەڵام لە مۆسکۆ و لە نامەکانی دواتریشیدا داوای لێ دەکردم کە هیچ نامەیەکی خزمەکانی بۆ نەنێرم ئەگەر پێشتر خۆم نەیخوێنمەوە و دڵنیا نەبم کە هیچی وایان تێدا نییە کە لەلایەن کاربەدەستانی سۆڤیەتەوە قەبووڵ نەکرێ.

ئەمانە چوار نامەی دکتۆر سەید عەزیزن کە لە ڕۆژانی 1957\8\31، 1957\10\31، 1957\11\2 و 1958\3\13 بۆی ناردوومن بۆ ڤیەننا. سەیری ئەم کوردییە جوانە و ئەم دەستخەتە هونەرکارییەی بکەن کە شەست ساڵ لەمەوبەر پێی نووسیوە. لێرەدا ئەمن دەسکاریی ڕێنووسەکەی ئەو سەردەمی ناکەم مەگەر تیپێکم لەناو کۆمپیتەرەکەما نەبێ ئەوسا ئەم نیشانەی پرسیارەم لەناو جووتە کەوانێکدا ( ؟) دەخەمە پاڵی.

## نامەی یەکەم

موسکو: 31/8/957
گیانەکم کاکە عمر دزەی
زور بە اشتیاقەوە دەستەکانت دەگوشم و چاوەکانت ماچ دەکەم هیوام وایە کە زۆر ساغ و سلامەت و همیشە موفق بن. کاغذەکەتم کە لەگەل کاغذی کاکە وریات ناردبو پیم گەیشت زور کەیف خوش بوم. لەپاش چونی ایوە ایمە زور متاثر و عاجز بوین چونکو وەکو چولی لی هات کەستان لیرە نەمان، زور بە زەحمت هەتا هاتینەوە سەر حالی عادەتی جاران. بەراست ئەو روژانە کە ایوە لیرە بون عوز ( ؟) ناکرینەوە.

زور سلامی من بە کاکە رشید عارف بگەینە و پی بلی لەبارەت دعوەتی من بو ڤینا زور زور ممنون و تشکری حسیاتی دەکەم بەلام زور متاسفانە کە ئەوە ممکن نی و پیم ناکری، یعنی بە حەزکردنی من نیە.

جاری ئەو کتیبەی کە ناردبوتان وەرم نەگرتوە چونکە ممکنە یک دو روژیک پاشی کاغەذ پیم بگات. ئەگەر هیچ کتیبی باسی کورد و تاریخی کورد و احسائیات ( ؟) لە کوردستاندا هەبی بوم بنیرن ممنونتان دەبم.

مراد ایستا لیرە نیە لە لینینغرادە چووە اسراحتی کە هاتەوە سلامەکەتی پی دەگەینم. هەڤالە کوردەکانی ایرەش هەمو سلامتان لی دەکەن وە لە حال و احوالتان دەپرسن. ایتر خوشی و موفقی و زانینی ساغی و سلامتی ایوەمان گەرەکە.

31/8/57

**واژۆ**

**برای ایوە سید عزیز**

**ادرسی من**

**........ {بە روسیی نووسیوە.}**

**بە کوردیش ئەوهای نووسیوە:**

**اتحادی شوروی - شاری موسکو شعبەی پوستە نمر ف - 134**

**شمزینی سید عزیز عبدالله**

## نامەی دووەم

موسکو

---

31/10/957

گیانەکەم کاکە عمر دزەی !

روژتان باش هیوام وایە زور باش بن و همیشە ساغ و سلامەت و کەیف خوش بن. نامەکەتان کە لە 9/10/957 نوسیو پیم گەیشت زور سپاستان دەکەم. بە خبری گیرانی ئەو هەوالانەی کە چونەوە عیراق و گیراون زور کز بوین زورمان پی ناخوش بو، دەبوایە یان بە دزی گەرابانەوە بو عیراق وە یان مدەتیک چاوەری یان کردبا هەتا وەختیکی بەسەرەوە دەچو. باسی خزمیکی ایمەتان کردبو کە ناوی " نجم الدینە" وا بزانم ایمە خزمیکمان بەو ناوە هەبو بەلام چونکە من ئەو وەختە زور گچکە بوم چاکیان ناناسم لەبەر ئەوە لەو بارەیەوە بو باوکم نوسیوە کە جوابی هاتەوە بوتانی دەنوسم. ئەگەر لە احوالمان دەپرسن من و هەمو هەوالانی کە لیرەن ساغ و سلامەتین و عاجزی ایمە هەر دوری هەوالانە. وە هەمومان زور سلاو لە ایوە دەکەین چاوتان ماچ دەکەین و همیشە چاوەری زانینی ساغ و سلامەتی و خبری خوشی لای ایوەین. ایوە باسی پنج کتابی رفیق حلمی " یادداشت" تان کردبو لیرە هەر پنج ژمارە هەیە لەبەر ئەوە بو پەیدا کردنی زەحمەت مەکیشن. کاکە عمر ئەگەر کاغذی باوکم زو نەهات و من نەم توانی لە بارەی خزمەکەمان شتیکتان بو بنوسم وە ایوە چون بو لای سلامی ایمە و ساغ و سلامتی ایمەی پی بلین و احوالی خزمەکانی دیمان لی بپرسن. لەبەر ئەوە کە لە نامەکەتاندا

گوتبوتـان هـەر بـە واسـتەی (؟ ) کاک وریـا کاغذتـان بـو بنوسـم لەبـەر ئـەوە ئـەوا هـەر لەنـاو کاغـذی کاک وریـادا بوتـان دەنیـرم. ایتـر دوبـارە همومـان چاوتـان مـاچ دەکەیـن و همیشـە چاوەری نامـە و زانینـی احوالـی ایوەیـن.

31/10/957

براتان سید عزیز

واژۆ

## نامەی سێیەم

2/11/957

گیانەکەم کاک عمر !

ئـەو روژەی کـە نامەکـەم بـو نوسـین لـە بیـرم چـو بیدەمـە پوسـتەی ئەمروکـە چومـە پوسـتە خانـە نامـەی دوەمـی ایـوەم وەرگـرت کـە لەگـەل نامەکـەی کاکـە وریـا لـە 19/10/957 نوسـیبوتان زور سپاسـتان دەکـەم لەبـەر ئـەوە ئـەوا جوابـی هـەردو نامەکەتـان بەیکـەوە دەدەم.

گیانەکـەم گوتبـوت کـە بـە کاکـت گوتـوە ئەگـەر لـە خزمەکانـم کـەس کاغـذی نوسـی بـو ایـوەی بنیـری وە ایـوەش بـو منـی بنیـرن زور باشـە سپاسـتان دەکـەم. بـەلام هـەر ئەوەنـدە هەیـە خواهیشـتان لـی دەکـەم ئەگـەر کەسـی نامـەی نـاردە لای ایـوە پیشـدان خوتـان بـی خویننـەوە و بزانـن نامـەی کـی یـە و چونـی نوسـیوە ئەگـەر زانیتـان ناردنـی هـەر لازم نـی یـە مـەی نیـرن هـەر بـوم بنوسـن کـە فـلان کـەس کاغـذی نوسـیبو بـەلام نەمـان نـارد وە ئەگـەر لەپـاش خویندنـەوەی زانیتـان هیـچ مانعـی نیـە ئـەو وەختـە بـوم بنیـرن. ایتـر هیچـی تـازە نیـە کـە بوتـان بنوسـم بـەلام هـەر ئەوەنـدە هەیـە کـە هـەر وەکـو ایـوەش دەزانـن وزعـی (؟) دونیـا زور خـوش نیـە تورکیـا خەریکـە بـە تحریکـی اسـتعماری امریکـی اگـری شـەر

هەلکات لەبەر ئەوە واجبی هەمو کوردیکە بە هەرچی لە توانایدا هەیە بە قسە و بە عمل زدی (؟) استعمار و زلمی (؟) تورکەکان مبارزەی خوی بە شدت تر بکات و لەگەل ملەتەکانی ازادی خواهی دونیا لە مبارزەی بەر زدی (؟) زوری و زولم (؟) شرکت بکا. ایستا فرسەتیکی (؟) گەورەیە کە کورد بتوانن دەنگی خویان و داوای خویان بە هەمو دونیا بگەینن. ایتر خوشیتان گیانەکەم.

واژو

2/11/957 براتان سید عزیز

## نامەی چوارەم

موسکو

---

13/3/958

گیانەکەم کاکە عمر دزەی!

روژ باش

لەپاش سلامیکی زور گەرم و احوال پرسین هیوام وایە کە سحەتتان (؟) زور باش و همیشە ساغ و سلامەت و کەیف خوش بن.

1 - نوسیبوتان کە گوایە پارتی سورەکانی عراق چند بیانیکی دەرکردووە زور باسی کوردی کردووە. ایمە ئەوانەمان نەدیوە. اگر ممکن بی وە بو ایوە لازم نەبی بو منی بنیرە سپاست دەکەم. سید احمد هەوالی قازی بو، لەگەل وی یک تیپ بو، لەبەر ئەوە ایشی چاکی لی امید ناکری.

2 - نوسیبوتان کە خزمەکانم وینەیەکی منیان خواستوە بەلام ناوی ئەو خزمەی منتان نەنوسیبو کە خواستبوی. ئەوا وینەیکم بوتان

دەنیرم خواهش دەکەم ناوی ئەو خزمەم بو بنوسن.

3 - هاوینی کە دەچنەوە ولات سلاوی من بە هەمو هەوالە باشەکانی خومان بگەینن و احوال و وزعی (؟) وان چونە بومان بزانن لەپاشان زەحمت نەبی بومان بنوسن. خزمەکانیشم ئەوانەی بزانن و زەرەر (؟) و مانعی نیە ساغ و سلامەتی منی پی بلین و سلامی منی پی بگەینن، بەلام کەسیک ئەگەر ویستی کاغذم بو بنوسی با تسلیمی ایوەی بکا، ایوەش پیشدان بوم بنوسن من جوابتان دەدەمی کە بومی بنیرن یان نە. سەروک و هەمو هەالەکانی کورد زور سلاو لە ایوە و کاکە وریا دەکەن و احوالتان دەپرسن لە جیاتی منیش زور سلام لە کاک وریا بکەن و احوالی بپرسن و پی بلین کە ئەوە مدەتیکە کاغذیکم بوی نوسیبو ایا پی گەیشتوە یان نا. ایتر خوشی و موفقیتی هەموتانمان پی ویستە گیانەکەم هەر خۆش و سەربەرز بن .

واژو

13/3/958

براتان سید عزیز

## سەرنجێکی گرنگ:

ئەگەر خوێنەری ئەم نامانە هەڵوەستەیەک لەسەر دێڕی هەشتەمی نامەکەی رۆژی 13\3\1958 بکات نهێنییەکی مێژوویی بۆ ئاشکرا دەبێ کە رەنگە کەم کەس پێشتر بیستبێ. من کە دیارە دەبێ لە نامەیەکی پێشوومدا باسی سەید ئەحمەدی سەید تەهای خزمیم بۆ کردبێت و ئەویش بەم شێوەیە رای خۆی لەسەریا دەربڕیوە " سید احمد هەوالی قازی بو، لەگەڵ وی یک تیپ بو، لەبەر ئەوە ایشی چاکی لی امید ناکری." ئەم قسەیە بەبێ هیچ گومانێک دەری دەخا کە دەبێ سەید عەزیز لەگەڵ قازی محەمەدا ناکۆک بووبێ. ئەمن

نازانـم لەسـەر چـی، بۆیـە ئـەم گـرێ کوێرەیـە بـۆ مێژوونـووس و ئـەو لێکۆڵەرانـەی کـە زیاتـر ئـاگاداری رووداوەکانـی کۆمـاری مەهابـاد بوونـە بەجـێ دێڵـم بـا ئـەوان بیکەنـەوە.

لـە دێڕی پانزدەهەمیشـدا سـەید عەزیـز دەنووسـێ " سـەروک و هەمـو هەوالەکانـی کـورد زور سـلاو لـە ایـوە و کاکـە وریـا دەکـەن و احوالتـان دەپرسـن " ئەڵبـەت لێـرە مەبەسـتی لـە سـەرۆک مـەلا مستەفای بارزانـی یـە. ئەمـەش لـێ وردبوونەوەیەکـی گەرەکـە کـە بـە بۆچوونـی مـن دەکرێ لەگـەڵ تـێ بینییەکـەی سـەرەوەی پێـک گـرێ بدرێـن.

## ئێریکا بلێدل Erika Bledl

هـەر ئـەو هاوینـەی 57 کـە هێشـتا سـێ مانگـم تـەواو نەکردبـوو لـە ڤیەنـا کەوتمـە داوی خۆشەویسـتیی کیژۆڵەیەکـی حەڤـدە سـاڵی نـاو ئێریـکا. چەنـد جارێـک پێـش سـەفەری مۆسـکۆم ژوانمـان دادەنـا و دوای گەڕانەوەشـم پەیوەندیمـان زیاتـر بـوو و هەفتـەی دووجـار یەکتریمـان دەدی. ئێریـکا زۆر جـوان بـوو، چـاو و بـرۆ و قـژ قاوەیـی و بـەژن ناوەنجـی. لەبەرئـەوەی نەیدەتوانـی تـا درەنگانـی شـەو لـە دەرەوە بمێنێتـەوە ناچـار رۆژانـی یەکشـەممە دەچوویـن بـۆ دانسـی کاتژمێـر پێنجـی عەسـر لـە دانسـخانەیەکی زۆر خۆشـی کلاسـیک (هوبنـەرس کـوور سـالۆن Huebner`s Kur Salon ) لەنـاو پارکـی بەناوبانگـی شـار (شـتات پـارک Stadt Park واتـا باخـی شـار).

بـەڵام چەنـد رۆژێـک پێـش سـاڵیادی لەدایکبوونـم لـە 11/11کـە بەتەمـا بوویـن پێکـەوەی بەرینـە سـەر ئـەو دووڵیـی نوانـد و هەسـتم کـرد دەیویسـت بتۆرێـت و خۆیـم لـێ دوور خاتـەوە. نەمدەزانـی بۆچـی. ئەوەبـوو کـە لێـک دابڕایـن و تـا سـاڵی دواتریـش ئەگـەر بەڕێکـەوت یەکتریمـان بدیبایـە چاکوچۆنیمـان دەکـرد کەمێـک لەگەڵیـا دەڕۆیشـتم لەپاشـان ئـەو ماڵاوایـی دەکـرد. لـە یەکێـک لـەو کورتـە چاوپێکەوتنانەماندا

بۆی درکاندم کە پێش من پەیوەندیی لەگەڵ پیاوێکی 29 ساڵی بە ژن هەبووە و ئێستا وا گەڕاوەتەوە بۆ ئەو. خۆی حەڤدە ساڵی و من بیست ساڵی بووم. بۆم دەرکەوت کە هەندێ ژن هەن حەز لە پیاوی بە ژن دەکەن چونکە هەست بە سەرکەوتن دەکەن بەسەر ژنێکی بەمێردا و دڵیان بەوە خۆش دەبێت و ئارەزوویەکی ڕەوانییان پێ دێتە دی.

هەندێ نامەی ئێریکام ماوە بەڵام بە داخەوە هیچ وێنەیەکیم نییە.

هەر چۆنێکی بێ ئەو شەوەی ساڵیادی لەدایکبوونم بەتاقی تەنیا لە ژوورەکەی خۆم و بە گۆزەیەکی پڕ لە شەرابی لەعلی ڕوممانی و دوو پاکەت سیگارەی سمارت کردەوە و بە سەرمەستی ئەم هەڵبەستەم بۆ هات کە بە سێ شەو نووسیومە و دواتر هەندێ دەسکاریشم کردووە.

## بۆ ئێریکا بلێدڵ ڤیەننا شەوی 1957/11/11

ئاوازی کام ژێ یە لە گوێما دەنگ ئەداتەوە؟
شەپۆلی کام زێ یە لە سنگما پەنگ ئەخواتەوە؟
بۆنی کام گوڵە، لەرەی کام چڵە،
رائەهەژێنێ ئەم لانەی دڵە!

***

سەرنجم گرت دڵم وا دێ تەماوی و پەست و شێواو بێ
وەکوو سەنگیی هەموو گێتی بەسەریا کەوتبێ وابێ
ئەناڵێنێ و ئەدا پەل وەک نێچیری کەوتە ناوداو بێ
یا وەک دارێکی تینوو تاقە ئاواتی یەک قومی ئاو بێ

***

دڵە، چاک تێت ئەگەم بۆیە منیش وەک تۆ پەشێواوم
لە فرمێسکی گوڕ و گەرمم گەلێک رشت بۆیە کزچاوم
شەوانی بەزمی جارانم بەسەر چوو بۆیە داماوم
هەزار داخ کورت بوو ئەو خەونەی کە ئێستا وا لێی هەڵساوم

***

ئەزانی ئێستە پیشەی من هەمیشە کاری بەدکارە؟
شەوانم هەر لە مەیخانان، بەرۆژ بێهۆش و ئاوارە
هەڤاڵانم هەموو تۆران، تەنانەت خۆمم لێ بێزارە
بەڵام توخوا مەکەن لۆمەم، بڵێن قەیناکا دڵدارە

***

بە تی چاوی تەلیسماوی دڵم گیراوی ناو تۆڕە
لە ئاستی لێوی و شیرناوی هەموو لێویٚ سەری شۆڕە
بە بۆنی پرچەکەی خاوی گوڵاڵەی دەوری بەستۆڕە[1]
بە بەژنی شلکی لاولاوی هەتا خوا حەز ئەکا شۆڕە

***

هەموو هەست و هەموو کاتم هەتا توانی هەمووم دایێ
لە پێشی هەر ژوانێکا هەزار جار خوایە، دیٚ، نایێ!
لە باخی شار[2]، لەسەر دانووب[3]، لەژێر هەر دارو پەنایێ
گەلێکم مژت لە لێوانی و گەلێش ئامێزی باڵایێ

***

لە ئاسۆی ژینی پڕ هیوام وەکو مانگێکی هاوینی
کە وام زانی بەرەو سەرما ئەکشێ رووناکیم بۆ دێنێ
کەچی توومەز کە ئەو مانگە لە زەردەی ژینی وەک خوێنی
دڵم بوو، هاکا ون بوو، جا دڵەی ساوام کێ ئەینوێنێ؟

***

بەڵێ، رۆیی، لەدەست چوو، کۆترەکەم رۆیی بەدەم باوە
هێلانەی دڵ لەپاشی ئەو، ئەوا وێران و رووخاوە
گوڵی گوڵدانەکەی ژینم لەبۆیە سیس و ژاکاوە
بە کورتی ژینی پاشی ویم لەناو تاریکیدا ماوە

***

---

1. بەستۆڕە: بەستێکە لەنێوان هەولێر و چیای پیرمام، سەیرانگای بەهارانی خەڵکی ئەو ناوچەیەیە.

2. باخی شار: بە زمانی ئاڵمانی شتات پارک باخێکی یەکجار خۆشە لە ناوەڕاستی شاری ڤیەننا و جێژوان و حەزحەزۆکێی دۆست و گراوانە.

3. دانوب: ئەو زێ یە یە کە بە ڤیەننادا تێ دەپەڕێ

بەڵام دوور یا نزیک، شەرت بێ لەبیرت قەت نەکەم تاوێ
وەفادار بم منت ویست و تەنانەت گەر منت ناوێ
ئەگەر نەشبین بە هاوسەر، خۆ ئەمن تازە، ئەمن هەر
بە بەهرەی تۆ، بە چەهرەی تۆ
ئەکا هەسپی هونەرمەندیم لە دڵ سمکۆڵ و پڕتاوێ

***

دوای فێستڤاڵەکەی مۆسکۆ هەندێ کەسایەتیی چەپڕەوی ناوداری عێراقی لە بواری سیاسەت و هونەر و ئەدەبیاتا کە بەشداریی فێستڤاڵەکەیان کردبوو نەیاندەتوانی بگەڕێنەوە بۆ عیراق چونکە دەگیران. ئەمانە هاتن بۆ ماوەیەکی درێژ لە ڤیەننا مانەوە لەپاشان نازانم بۆ کوێ چوون و ئاگام لە دەنگوباسیان نەما. لەناو ئەمانە ئاکتەر و شانۆگەرینووس یوسف العانی، شاعیر عبدالوهاب ئەلبەیاتي و ڕۆژنامەنووس و نووسەر لطفي بکر سدقي و خلوق امین زکي. من و زۆرێک لە خوێندکارانی چەپڕەوی عێراقی لە ڤیەننا گەلێک ئێواران لەگەڵ ئەو کەسایەتییە عیراقییانە لە کافێ شڤارتسشپانیەر بەدەم شەراب خواردنەوە و گۆرانیی عێراقی و کوردییەوە دادەنیشتین. لەو ماوەیەدا یوسف ئەلعاني بەبێ چالاکی دانەدەنیشت. ڕۆژێکیان داوای لە ئێمەی چەند خوێندکاری عێراقی کرد شانۆگەرییەکی خۆی نمایش بکەین بۆ ئەو عەرەبانەی کە لە ڤیەننا دەژییان. یوسف ئەلعاني چەند کەسێکی هەڵبژارد ڕۆڵی ئاکتەری لە شانۆگەرییەکەی ببینن کە یەکێکیان من بووم. من ناوی شانۆگەرییەکەم لەبیر نەماوە بەڵام ڕۆڵی بورەکفرۆشیی لێ بە من سپێردرا.

جگە لەو شانۆگەرییە کە لە هۆڵی یانەی (ڕۆتاری کلەب Rotary Club) لە ڤیەننا نمایشمان کرد یوسف ئەلعانی داوای شتێکی تری لە من کرد. پێی گوتم کاکا عومەر بیرم کردووەتەوە ڕۆمانێکی کوردی ناسراو بکەم بە فیلمی سینەمایی و تۆ بکەم بە ئاکتەری سەرەکی فیلمەکە. گوتی بەداخەوە من زانیاریم کەمە لەسەر ئەدەبیاتی

کوردی تۆ چیرۆکێکی خۆشی کوردیم بۆ هەڵبژێرە و بۆشم تەرجومە بکە بۆ عەرەبی. منیش دوای چەند رۆژ بیرکردنەوە (مەم و زین)ی ئەحمەدی خانیم بۆ پێشنیار کرد و پێم گوت ئەمە بەیتە و بەیتیش لە ئەدەبیاتی کوردیدا هەمان ژانری ئێپیک و بالاد و رۆمانسە لە ئەدەبیاتی رۆژئاوادا. هەروا بە زاریش بیرۆکەیەکی سەرپێیم لەبارەی مەم و زینەوە دایێ کە دڵی زۆر پێ خۆش بوو و گوتی ئەمە بەڕاستی رۆمیۆ و جولیێتیکە بۆ خۆی. بەڵام ئەوسا چاپەمەنیی کوردی ئەوەندە بە ئاسانی دەست نەدەکەوت چونکە کەم بوو بۆیە تا هەوڵم دا مەم و زینێک پەیا بکەم یوسف العانیی لە ڤیەننا نەما و نەمزانی بۆ کوێ چووە. بەم جۆرە پرۆژەکەمان هەر بە چەند مانگی لەبار چوو.

## دکتۆر حسن الچرچفچي

کە باسی ڤیەننا بکەم ناکرێ بەسەر یەکێک لە کەسایەتییە قسە خۆش و ئێسک سووکە عیراقییەکانی ڤیەننادا باز بدەم کە شیعەیەکی چەپڕەوی عەلمانی بوو، دکتور حسن الچرچفچي. دکتۆر حسن پزیشکێکی رەبەن بوو و دوای چەند ساڵ کاری پزیشکی لە بەغدا دەستی لەو پیشەیە هەڵگرتبوو، خۆی خانەنشین کردبوو چووبوو بۆ ڤیەننا تا پاشماوەی ژیانی لەو شارە بە پایان بگەیەنێ. دکتۆر حەسەن لە هەموو رووێکەوە کارەکتەرێکی تایبەت بوو، زۆر رەشتاڵە و لچ و لووت پانی قولەڕەشانی کە بە تەمەن زۆر لە ئێمەی خوێندکار گەورەتر بوو. ژوورێکی لە پانسیۆنێک هەر لە نزیک کافێکەی عیراقییان بۆ ماوەی درێژ بەکرێ گرتبوو، ئۆتۆمۆبیلێکی کڕیبوو کە ئەوسا ئێمەی خوێندکار بایسکلیشمان نەبوو. دکتۆر حەسەن دۆستێکی جوانی نەمساویشی لەتەمەنا هاوقەرانی خۆی هەبوو کە بە ئینگلیزی تێکدەگەیشتن چونکە خۆی ئاڵمانی زۆر کەم فێر بووبوو. بۆهیمی و وجودی کە دنیای لە پێی خۆی کردبوو، بە رۆژ دەنووست بە شەو

تا چوار و پێنجی بەیانی دەیخواردەوە. من و برادەرانی عێراقیم مالک الیاسری و و ایاد الیاسری و باری الشیخ علی و زۆری تریش زۆر ئێواران لەگەڵیا دەمانخواردەوە و گوێمان لە نوکتە خۆشەکانی دەبوو. دکتۆر حەسەن هەر بۆ نوکتە و پێکەنین شیعەچیاتیی دەکرد ئەگینا خۆی باوەڕی بە هیچ دین و مەزهەبێک نەبوو. بە دەیان نوکتەی سەیر سەیری لەسەر خەلیفەکان بۆ دەگێڕاینەوە کە هەندێکیان هەر زادەی خەیاڵە فانتازییەکەی خۆی بوون. دکتۆر حەسەن کوردیشی زۆر خۆش دەویست و دڵی بە گۆرانییە کوردی و فارسییەکانی من زۆر خۆش دەبوو. تا من لە ڤیەننا بووم دۆستی نزیکی یەکتری بووین کە لەوێش نەمام بیستم گەڕاوەتەوە بۆ بەغدا و لەوێ کۆچی دوایی کردبوو. یادی بەخێر ئەو پیاوە کە لە دانیشتنەکانی بێزار نەدەبووی.

## کۆمەڵەی خویندکارانی کورد لە ئەوروپا KSSE

ئەمن کە لە سەرەتای مانگی مایسی 1957 گەیشتمە ڤیەننا تەنها دوو کورد لە نەمسا هەبوون، وریا ڕەواندزی و پەروین مەحمود جەودەت. پەروین دیار بوو هەر بۆ ماوەیەکی کاتی لەوێ بوو و لە پاش گەڕانەوەی خۆم و خۆی لە مۆسکۆ ئەویش گەڕایەوە بۆ بەغدا و تەنها من و وریا ماینەوە. کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد کە ساڵێک پێشتر لە شاری (ڤیزبادن)ی ئاڵمانی دامەزرێندرابوو لکی لە نەمسا نەبوو. کە من گەیشتم یەکسەر پەیوەندیم بە سەعدیی برامەوە کرد کە لە بریتانیا دەیخوێند و لەندەنیش ناوەندی چالاکییەکانی کۆمەڵە بوو لەو سەردەمە. ئەوە بوو کە کۆمیتەی بەڕێوەبەری گشتیی کۆمەڵە داوای لە من کرد لکێک لە نەمسا بکەمەوە و خۆم ببم بە بەرپرسی و خۆشم ئامادە بکەم بۆ سەری ساڵ بچمە لەندەن بۆ بەشداری لە کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵە کە بڕیار درابوو بۆ ئەو ساڵە لەوێ ببەسترێ. منیش دەستم بە چالاکی کرد و خۆم و

وریـا بوویـن بـە ئەندامـی کۆمەڵـە و مێـژوو و جۆگرافیـای کوردسـتان و نوێتریـن دەنگوباسـی کوردسـتانمان بـە ڕۆژنامەکانـی نەمسـا رادەگەیانـد. ئـەو سـەردەمە نەمسـاوییەکان و هەمـوو ئەوروپاییـەکان بەگشـتی زۆر کەمیـان لەبـارەی کـوردەوە دەزانـی و زۆریـان هـەر نـاوی کوردیشـیان نەبیسـتبوو. لای ئاڵمانـی زمانـەکان تاکـە سـەرچاوەیەک کـە نـاوی کوردی پـێ ناسـاندبن کتێبـی چیرۆکێکـی خەیاڵـی سـەدەی نۆزدەهـەم بـوو کـە نووسـەری ئاڵمـان کارل مـای نووسـیبووی بـە تایتلـی (بـە کوردسـتانی دژواردا Karl May , Durchs Wilde Kurdistan). کارل مـای کـە لـە حەیاتـی خۆیـا یـەک تاکـە جاریـش چـاوی بـە کوردسـتان نەکەوتبـوو چیرۆکێکـی فانتازیـی هـەروا بەخەیـاڵ دروسـت کردبـوو کـە بـۆ منداڵانـی ئاڵمـان زمانـی ئـەو سـەردەمانە زۆر خـۆش و سـەرنجکێش بـوو و جارەهای جـار لەلایـەن دەزگای جیاجیـاوە لەچـاپ دراوە و دراوەتـەوە. بۆیـە هـەر ئاڵمـان یـان نەمسـاوییەک ئەگـەر نـاوی کـورد و کوردسـتانی بیسـتبا هـەر بەرێـگای ئـەو کتێبـەوە بـووە و گـەل و وڵاتـی کوردانیشـی هـەر ئەوهـا دەهاتـە بەرچـاو کـە بـە منداڵـی لـە کتێبەکـەدا خوێندبوویـەوە.

جگـە لـە کاری خوێندنـی زانکۆم - کە نەشـمدەخوێند - خۆم خەریکی رابواردنـی شـەوانی ڤیەنـا دەکـرد وەک کـە ئەسـمەهانی دەنگوسـەدا و رەنگوڕخسـار پەریزادەیـی گوتبـووی "لیـال الانـس فـی ڤینـا نسـیمها مـن هـوی الجنـە". زوو زوو دەچوومـە کۆنسـێرتەکانی موزیکـی کلاسـیک و کەمتـر دەچوومـە ئۆپێـرا. شـەوانی ویـک ئێندیـش (شـەممە و یەکشـەممە) لەگـەڵ برادەرانـی عێراقیـم وەک مالـک الیاسـري و قاسـم الگیلانـي دەچووینـە دانسـخانەی بەناوبانگـی (فۆلکـس گارتـن Volksgarten) کـە تاکـە نایـت کلەب بـوو لـە ڤیەنـا دانسـی لـە دەرەوە لەژێـر ئاسـمانی شـین و گـەڵای سـەوزا لـێ دەکـرا. ئـەوەی کـە دەچـووە ئـەوێ کـوڕ زیاتـر بـە قـات و کراڤـات، کچیـش بـە کراسـی شـەو بـوون. لـەو نایـت کلەبـە هـەم دانسـی کلاسـیک وەک تانگـۆ و رومبـا و ڤاڵـس، هـەم رۆکـن رۆڵ و بووگـی بووگیشـی لـێ دەکـرا و هـەر ماوەیـە گۆرانیبێژێکـی ناوداریـان

دەهێنا کە شەوەکە بە خۆشترین ئاوازی هاوچەرخ برازێنێتەوە. لەو گۆرانیبێژە ناسراوانەی ئەو سەردەمە یەکێکیان (ڤیکۆ تۆریانی Vico Torriani) سویسری و (جیمی ماکولیس Jimmy Makulis)ی یۆنانی بوون. ئەمن لێرەشدا وەک کە لە کاتی خۆی لە ئاهەنگەکانی زەکی مورەن Zeki Muren لە ئەستەمبۆل بەسەرم دەهات گریانم بۆ بەختی رەشی خۆم دەهات چونکە دەمزانی کە دەنگی من لە هی ئەوانە کەمتر نییە کەچی ئەوان بوونەتێ و من هیچ. دیسان گرێ رەوانییەکە دای دەگرتمەوە و توورەییەکەی جارانم لە کۆمەڵگا و بنەماڵە سەری هەڵدەدایەوە.

نایت کلەبێکی تریش هەبوو (ئادێ بار Ade Bar) لە کووچەی (ئانا گاسە Anna Gasse) لە جەرگەی گەڕەکی یەکەمی ڤیەننا. ئەمەیان تەنها باندی موزیکی جازی لێ بوو و دانسی مۆدیرنی لێ دەکرا. میوانەکانیش بە کچ و کوڕەوە بە پانتۆلی تەسکی شڕوشپڕێو و سەر و قژی شێتانە و هەندێکیان بە پای پەتیشەوە بوون. دوو کارەکتەری نێرینەی ئەو نایت کلەبەم ئێستاش لەبەر چاوە: (ئاندی Andy) کە پیاوێکی کەڵەگەتی خێلی ناشیرینی قژ رووتاوەی پانتۆڵێکی تەسکی جینگوڕاوی لەبەرا بوو. ئەمیان جوانترین کچی کلەبەکە دانسیان لەگەڵا دەکرد چونکە کەس وەک ئەو دانسی مۆدێرنی وا بەجوانی نەدەزانی، هەر بە یەک پەنجە پارتنەرەکەی خۆی وەک فرفرۆک بە دەوری خۆیدا دەسووڕاند. ئاندی بە رووخۆشی و قسەخۆشەکانی خۆی جوان و روح سووک کردبوو و زۆر جار دەهاتە سەر مێزەکەی من و مالیکی برادەرم و گلاسێک شەرابمان بۆ بانگ دەکرد. ئێمە کە خواخوامان بوو ئاندی بکەین بە برادەری خۆمان لەبەر خۆی نەبوو بەڵکوو لەبەر ئەو کیژۆڵە جوانانەی کە دەوریان دەدا بە ئومێدی ئەوەی بەشکوو شتێک بە ئێمەش دەبڕا. ئەوەی دووەمیان کابرایەکی سمێڵ و ردێن رەشی کلاوێکی شەرقی پێم وایە جوولەکانیی لەسەر بوو (ئێرنست فوخس Ernst Fuchs). ئەمیان دانسی نەدەکرد، هەر

دادەنیشت دەیخواردەوە و کچ و کوڕ دەچوونە سەر مێزەکەی و کەمێک لەگەڵیا دادەنیشتن. ئەو کوڕە دواتر بوو بە یەکێک لە هونەرمەندە شێوەکارە ناودارەکانی ئەورووپا. خوێنەری بەڕێز دەتوانێ لە گووگڵ باسی ئەم هونەرمەندە بخوێنێتەوە.

ساڵی 1957 بەرەو ئاوابوون دەڕۆیشت. منێکی تەمەن بیست ساڵی هاوین و پاییزی ئەو ساڵەم لە ڤیەننا بەنابەدڵیی خۆم بەسەر نەبرد "هەتا توانیم شەرابم نۆشی هەتا پێم کرا روومەتم مژی." هەوڵم دەدا دڵساردبوونەوەکەی کە بە نەخوێندنی موزیک بەرۆکی گرتبووم بە مەی و مێ بڕەوێنمەوە.

کەوتبووینە زستان و منیش کەوتبوومە نێوان دوو بەرداشەوە: لەلایەکا یارێکی نزیک لەخۆمەوە (ئێریکا لە ڤیەننا) کە خۆی لێم دوور دەخستەوە، لەلایەکی کەش یارێکی دوور لە خۆمەوە (ئەلیزابێت لە ئیسلاندا) کە خۆی لێم نزیک دەکردەوە. منیش راستییەکەی هەردووکیانم خۆش دەویست. ئێستاکە رەنگە پرسیار بکرێت چۆن دەبێ ئینسان دوو یاری لە یەک کاتدا خۆش بوێ. الحکم لله!! بەڵام خەڵکینە، راستییەک هەیە رەنگە ئێوە هەستی پێ نەکەن یان هەستیشی پێ دەکەن بەڵام باوەڕی پێ ناکەن ئەویش ئەوەیە کە پەپوولەی دڵی هونەرمەند و شاعیر و نووسەر و خەڵکی قەڵەم بەگشتی هەرگیز تەنها بەسەر یەک تاکە گوڵدا نانیشێتەوە. ئەدی ئەو هەموو گوڵ و گوڵاڵە رەنگ و بۆ جیاجیایانەی ناو گوڵستانی ژیان! چما ئەمانە هەمووی سەرچاوەی ئیلهام و بەهرەی هونەرمەند نین؟ یار و یاوەری هەمیشەی کەسانی ناو دنیای هەستناسکان نین؟ توخوا پەپوولە و هەنگ و بولبول لە ئینسان زیرەکتر نین کە لەم چڵ بۆ ئەو چڵ و لەم گوڵ بۆ ئەو گوڵ دەم دەخەنە ناو دەمی هەر گوڵێکەوە کە بە دڵیان بێت؟ ئەمن لە گۆرانییەکی خۆما کە بەم زووانە بڵاو دەبێتەوە گوتوومە:

وەک پەپوولە و هەنگ و بولبول
شیلەم ئەمژی پڕ بە دڵ
شەو هەتا سۆزەی بەیانان
دەم لەناو دەم، دەس لە مل

بە تێگەیشتنی من شاعیر و هونەرمەند و نووسەر و کەسانی هەست ناسک لەناو دوو دنیادا دەژین، دنیایەکی ئاسایی کە لەگەڵ ئەو مەردومە تێیدا دەژین، دنیایەکی فانتازی تایبەت بە خۆیانەوەش کە هەر خۆیانی لەگەڵ یارێکی خەیاڵی تێدا دەبینن و هەر ئەو دنیایەشە کە سەرچاوەی ئیلهام و بەهرە و داهێنانیانە لە کارەکانیان. یارەکەش لەوانەیە کەسێک یان کەسانێکی حەقیقیش بن کە سەرنجی بەهرەدارێکیان راکێشاوە و ئەویش لەناو پەرستگای دڵیدا بتپەرستییان بۆ دەکات. جا ئەگەر بێتو ئەمانە لەو دنیایەیان دابپچڕێندرێن ئەوا ئەو پەرستگایەیان لێ کاول دەبێت کە کردبوونی بە شاعیر و هونەرمەند و نووسەر. ئەوسا لە دنیا حەوت تەبەقە بڵندەکەی خەیاڵاتیان دەکەونە خوارەوە بۆ ناو دنیا ئاساییەکە و دەبنەوە بە مرۆڤی ئاسایی کە لە ناخیانەوە وا نین. لە ئەنجام، تووشی بەدبەختی دەبن و مرۆڤایەتیش لە داهێنانیان بێ بەش دەبێت. بەڵام جاری واش بووە کە خودی بەدبەختییەکەیان زیاتر گڕی داون بۆ زیاتر داهێنان. مەحرومییەت کردوونی بە شت. ئەوەش هەیە.

دەبا ئەوجا واز لە فەلسەفە بێنین و بگەڕێمەوە بۆ بیرەوەرییەکانی ئەو سەردەمەم کە سەرەتای زستان بوو و دەبوایە خۆم ئامادە بکەم بۆ سەفەری لەندەنم بۆ بەشداری لە کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا، 1958 .

هەر وەکوو زووتریش گوتوومە من حەز لە سەفەری بە شەمەندەفەر دەکەم بۆیە چووم بلیتم بۆ ترێن بڕی. لە ڤیەنناوە تا شاری (ئۆستێندە Ostende)ی بەلژیکی بە ترێن لەوێشەوە دەبوایە بە پاپۆڕ کەناڵی ئینگلیزی ببڕین تا بەندەرشاری دۆڤەر لە بریتانیا و

لەوێشەوە دیسان بە ترێن تا وێستگەی شەمەندەفەری ڤیکتۆریا لە لەندەن.

لە ماوەی سێ چوار مانگا لە قەڵای سەختی سۆسیالیزمەوە (مۆسکۆ) بۆ قەڵای سەختی کاپیتالیزم (لەندەن). لەگەڵ کاک سەعدی براما کە لە ئینگلتەرا دەیخوێند وا رێک کەوتبووین کە بگەمە لەندەن لە وێستگەوە بچم بۆ ماڵی کاک عارف حەمەعەلی کەریمی هەڵەبجەیی کە برادەرێکی لەمێژینی بنەماڵەی ئێمە بوو و لە لەندەن دەیخوێند. سەعدی برام لە شاری (وولڤەرهامتن wolverhampton) دەیخوێند و هاتبوو لە ماڵی کاک عارف چاوەڕێم بکەن.

کاتژمێر وابزانم هەشتی بەیانی گەیشتمە وێستگەی شەمەندەفەری ڤیکتۆریا و تاکسییەکم گرت بۆ ماڵی کاک عارف. بێجگە لە کاک عارف خۆی و کاک سەعدی برام و خۆم، تەحسین هەورامی و عیسمەت شەریف وانلیش گەیشتنە ئەوێ. تەحسین لە کۆلێژی بەناوبانگی LSE لە لەندەن دەیخوێند و کاک عیسمەتیش لە شاری لۆزان لە سویسرا دکتۆرای تەواو دەکرد. من رۆژی 1957/12/31 گەیشتمە لەندەن کە نیوییرز ئیڤ New Years Eve بوو و رۆژی دواتر دەبووە سەرێ ساڵی 58. ئەو شەوە چووین بۆ دانسخانەیەکی زۆر گەورە لە گەڕەکی هامەرسمیث Hammersmith و بەڕێکردنی ساڵی بۆری و بە پیرۆزەچوونی ساڵێکی نوێمان زۆر بە خۆشی لەوێ بەسەر برد.

بۆ بەیانیش کۆنگرەی کۆمەڵە دەستی پێ دەکرد. تەنها خوێندکاری کە لە دەرەوەی ئینگلتەراوە هاتبوون هەر کاک عیسمەت و من بووین ئەوانی دی خرپان خوێندکاری کوردی ئینگلتەرا بوون. نزیکەی 43 کەسێک دەبووین لە بەشداربووانی کۆنگرەکە و زۆرترایەتیی هەرە زۆرمان کوردی عیراق بووین. کەم کەسێکی کۆمونیستمان تێدابوو وەک دارا تۆفیق ئەگینا ئەوانی تر گشتمان کوردی ناسیۆنالیست بووین چ ئەندامی پارتی وەک سەعدی برام و ئی تریش، چ

ناسیۆنالیستی سەربەخۆ وەک خۆم و تەحسین هەورامی و شەوقی عەزیز و ئی تریش. هەر لەو کۆنگرەوە کێشە و مشتومڕی نێوان کوردە ناسیۆنالیستەکان و کوردە کۆمونیستەکان گەرای داکوتا. وەکوو بیستم هەندێ کوردی کۆمونیستی تریش لە ئینگلتەرا هەبوون بەڵام حەزیان نەدەکرد خۆیان لە کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردەوە نزیک بکەنەوە چونکە حیزبی شیوعیی عێراقی ئەو کۆمەڵەیەی بە کلکی پارتی دیموکرتی کوردستان دادەنا. بۆیە هەندێ لەو خوێندکارە کوردە شیوعییانە بەشداریی کۆنگرەکەشیان نەکرد. یەکێک لەمانە محەمەد مەحمود عەبدولڕەحمان بوو کە ئەندازەی ئەلەکتریکی لە ئینگلتەرا دەخوێند و دواتر لەناو شۆڕشی ئەیلوولا بە (سامی عەبدولڕەحمان) ناوبانگی دەرکرد. من لەو سەفەرەی لەندەنم ئەو پیاوەم نەدی چونکە نەدەهات بۆ دانیشتنەکانی کۆنگرە. بەڵام کوردی کۆمونیستی تریش هەبوون وەک دارا تۆفیق و چەند کوردێکی زۆر چەپڕەوی وەک سەلاح سەعدوڵا و فوئادی ساڵح رەشە کە کوردایەتییەکەشیان هیچی وا لە کۆمونیزم یان چەپڕەوییەکەیان کەمتر نەبوو. سەلاح سەعدوڵا نامیلکەیەکی بۆ ئەو زەمانە زۆر سوودبەخشیشی بە زمانی ئینگلیزی بڵاو کردەوە بە ناوێکی خوازراو س . س . گاڤان، کوردستان، وڵاتە دابەشکراوەکەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست

S.S.Gavan,Kurdistan,the divided nation of the Middle East

## بازدانێکی بچووک

زۆرێکمان لەبیرمانە کە سالّی 1963 بەعسی هاتنە سەر حوکم لە عیراق و کوشتارێکی درندانەیان لەناو حیزبی شیوعیی عیراقیدا نایەوە. ژمارەیەکی زۆریش لە ئەندامانی ئەو حیزبە ئەوەی خۆی پێ رزگار کرا خۆیان گەیاندە شۆرشی کوردستان کە یەکێک لەوانە محەمەد مەحموود بوو. ئەوسا منیش بۆ ماوەی سالّێک پێشمەرگە بووم و رادیۆی دەنگی کوردستانمان لە ئەشکەوتی گردەرەشی نزیک ماوەت دادەمەزراند کە سەعدی دزەیی برام و کەمال فوئاد - هەردووکیان سەرکردەی پارتی لکی ئەوروپا - لە ئالّمانیا بۆ شۆرشیان کریبوو و ناردبوویانەوە. بێجگە لە خۆم یەکێک لە دامەزرێنەرانی ئێزگەکە ئەو محەمەد مەحموودەش بوو کە ناوی خۆی گۆریبوو بۆ سامی عەبدولرەحمان. لەوێ ئەوە یەکەم جار بوو کە یەکتریمان ناسی. بۆ مێژوو، سامی کورێکی تا بلّێیت زیرەک و بە ئوسوولّ و ئیتیکێت و خانەدان - رەفتار بوو کە هەر زوو دلّمی بۆ خۆی راکێشا و بووین بە برادەری زۆر نزیکی یەکتری. ئەو هێشتا شیوعی بوو بەلاّم دیار بوو وردە وردە مەیلی کوردپەروەریشی لە تەشەنەکردندا بوو.

با لەوە زیاتر بەسەر زنجیرەی بیرەوەرییەکانمدا باز نەدەم و با بگەرێمەوە بۆ لەندەن.

لە هەلّبژاردنی کۆتایی کۆنگرەکە عیسمەت شەریف بە سەرۆکی کۆمەلّە هەلّبژێردرا و هەر بە پێشنیاری ئەویش هۆمەر دزەیی بە جێگری سەرۆک هەلّبژێردرا بەو حیسابەی کە سویسرا و نەمسا لێک نزیکن و پەیوەندیی نێوانیان ئاسانتر و خێراتر دەبێ. لە هەمان کاتدا سەرۆکایەتیی لکی نەمسای کۆمەلّە و وەرامبارەتی پەیوەندییش لەگەلّ کوردەکانی تورکیا هەر بە من سپێردرا بە حوکمی ئەوەی

کە پێشتر لە تورکیا ژیابووم و کوردەکانی ئەوێم دەناسی. سەلاح سەعدوڵا کرا بە سەرنووسەری کۆڤاری (وەرزنامەی کوردستان) بە زمانی ئینگلیزی و کوردی کە ئۆرگانی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد بوو لە ئەوروپا. بێجگەلە کاک عیسمەت و خۆم، ئەندامەکانی دیکەی کۆمیتەی بەڕێوەبردنی گشتیی کۆمەڵە ئەمانە بوون: سەعدی دزەیی برام، تەحسین هەورامی، دارا تۆفیق، سەلاح سەعدوڵا و پێم وایە یەک دووانێکی تریش. کەمال فوئاد ئەوسا هێشتا نەهاتبوو بۆ ئەوروپا.

چەند رۆژێکی تریش دوای تەواوبوونی کۆنگرە لە لەندەن مامەوە و شارەکەم زۆر پێ خۆش بوو. سیستەمی مێترۆکەی زۆر بەربڵاو بوو بەڵام وێستگەکانی مێترۆی وەک ئەوانەی مۆسکۆ جوان و پاک نەبوون. ئەوانەی مۆسکۆ هەمووی بە پەیکەری گەورە و مێرابی دیوارە سپی و پاکەکانیان هەمووی بە رەنگی زێڕین رازاندرابوونەوە و وەک مۆزەخانەیەک خۆیان دەنواند. راستە تۆڕی مێترۆی لەندەن لەچاو ئەوەی مۆسکۆ زۆر پان و بەرینتر بوو و تەواوی شار و دەرەوەی شاریشی دەگرتەوە، بەڵام وێستگەکانیان لە کۆنییان بە دووکەڵی مێژوو رەش هەڵگەڕابوون و وەک ئەوانەی مۆسکۆ پاک نەبوون.

لە لەندەن ئەوە یەکەم جاریشم بوو (قۆشمەی تاژییان) ببینم. برادەران منیان برد بۆ (ریسزی تاژییان واتا پێشبڕکێی تاژییان) کە پێم وایە لە هەموو ئەوروپا تەنها لە لەندەن شتی وا هەبوو. کەروێشکێکی میکانیکییان بەرەڵا دەکرد و ئەو هەموو تاژییانە راویان دەنا تا یەکێک دەیگرت. تەماشاکەرانیش قوماری گەورە گەورەیان لەسەرا دەکردن.

ساڵ بوو بە 1958. گەڕامەوە بۆ ڤیەننا و دەوامی خۆم لە سیمەستەری زستانەی کۆلێژەکەمدا دەکرد بەڵام بێ ئەوەی بەشداری لە تاقیکردنەوەکاندا بکەم. ئەمانە هەمووی بەقەرز لەسەرمدا کەڵەکەیان دەکرد.

## شەوارەکانی فاشینگ لە ڤیەننا

لـە ڤیەننـا مانگـی یـەک و دوو و هەندێکـی سـێی هەمـوو سـاڵێک ڕەنگـە بـۆ کـوڕ و کچـی جـەوان خۆشـترین مانـگ بـن. ئـەو دوو مانـگ و نیـوە وەرزی شـەوارەی فاشـینگە Fasching کـە بـە زمانـی ئاڵمانیـی نەمسـا زیاتـر (گشـناس فێسـت Gschnass Fest)ی پـێ دەڵێـن و بـە عەرەبیـش (الحفـلات التنكريـة). لـەو وەرزەدا هەمـوو شـەوێک لـە هـۆڵ و ڕێسـتۆرانتی گـەورە لـە شـوێنی جیاجیـای شـارا ئـەم جـۆرە شـەوارانە ڕێک دەخـران کـە هـەر کەسـە بـە جلوبەرگـی سـەیر و سـەمەرە و ئەنتیکـە و دەمامکـی شـاردنەوەی ڕوو یـان هـەر ڕەنگکردنـی ڕوو دەچوونـە ژوورەوە و بلێتـی چوونـە ژووریـش و مەشـرووب خواردنـەوەش زۆر گرانتـر بـوو تـا لـە شـەوانی ئاسـایی و دەبوایـە زۆر پێشـتر بلێـت بکڕیـت ئەگینـا نەدەمـا. هەشـبوو کـە هـەر بـە جـل و ڕووی ئاسـاییەوە بـوون یـان لـەوێ پـاش ماوەیـەک ئیتـر دەمامکەکانیـان هەڵدەدایـەوە. بـۆ ئـەو دانسـە شـەوارانە زۆر کـچ و کـوڕ بەبێ پارتنـەر دەچـوون چونکـە بـۆ ڕاو دەچـوون. ئیتـر لەوێـدا تێکـەڵ بـە یەکتـری دەبـوون و کـەس خاوەنـی کـەس نەدەبـوو، کـورد گوتەنـی: "سـەگ سـاحێبی خـۆی نەدەناسـییەوە"، ئەگـەر سـاحێب هەبـوا. لـەو شـەوارانە تەنهـا حـەز و ئـارەزووی دڵـی کچـە و کـوڕە ڕۆڵیـان هەبـوو. لەبـەر "ڕۆشـنایی" یـان ڕاسـترە بڵێـم لەبـەر تاریکایـی شـەوچرای زۆر کـز و تەمـاوی و تێکەڵبوونـی تاموبـۆی شـەراب و تووتـن هۆڵەکانـی دانسـکردن ئەتمۆسـفێرێکی وا ڕۆمانتیـک و ئێرۆتیکیـان لـێ ئەنجـام دەبـوو کـە هـەر بـۆ دەسـلەملانە و مـاچ و مـووچ و حەزحەزۆکـێ دەسـتی دەدا. کـچ و کوڕیـش هەبـوون -هەرچەنـدە کـە کەمیـش بـوون - کـە دۆسـت و گـراوی یەکتـری بـوون و پێکـەوە دەچوونـە ئـەو شـەوارانە بـەڵام ئـەو شـەوە جاروبـار ئەوانیـش هـەر یەکـە بـە جیاجیـا ئازادیـی دەسـلەملانە

و ماچوموچیان لەگەڵ کوڕێک یان کچێکی تری بەدڵی خۆیان هەبوو. بەکورتی ئەو شەوارانەی ڤیەننا شەوەڕەشەی پڕ بە واتای وشە بوون.

ئەمن سەرەتا یەک دوو جار بە جلی کوردییەوە دەچوومە ئەو شەوارانە کە گوایا کوردایەتیی پێ بکەم، بەڵام دواتر بینیم کە پشتێن و مشکی و فەقیانەکەم لێ دەبن بە بەڵا و پشتێنەکەم بەدوامدا دەخشێت و دەکەوتە ژێر پێی دانسکەرەکان، ئینجا تێی گەیشتم کە "نا، رۆڵە، کەر مەبە، ئێرە جێی کوردایەتی نییە". بۆیە لە شەوارەکانی ترا کوردایەتییەکەم لەماڵەوە بەجێ دەهێشت، باری خۆم سووک دەکرد، پانتۆڵ و کراسێکی شڕ و شپڕێوم دەپۆشی و هادا هوە.

هەر لە دەوروبەری سەریساڵیشدا ئۆپێرای ڤیەننا باڵۆی ساڵانەی خۆی (Opernball) لەناو بینای ئۆپێرادا ئەنجام دەدا. ئەمەیان زۆر کلاسی بوو و دەبوایە چەند مانگێک پێشتر بلیتی بۆ ببڕیت کە هەرزانترینی لە هەزار دۆلار زیاتر بوو و کەسایەتیی ناوداری کولتوور و سیاسەت و کارداری لە ناوەوەو لە دەرەوەی نەمسا دەچوونە ئەو باڵۆیە. جلی پیاوانیش بۆ ئەو باڵۆیە دەبوایە سمۆکینگ یان تۆکسیدۆی رەش بێت و قات و کراڤاتی ئاسایی قەدەغە بوو، کچەکانیش بە کراسی سپیی تایبەت بە شەوارەوە. دەستەیەکی بژاردەی کچ و کوڕانی گەنجی راهێنراو باڵۆکەیان بە دانسی ڤاڵس لەسەر ئاوازی ڤاڵسەکانی یۆهان شتراوس دەکردەوە کە ڤیەننا فیلهارمۆنیک ئۆرکێسترا لێی دەدا و خەڵکەکەی تر هەموویان بە پێوە تەماشایان دەکردن. ئینجا دوای ئەو نمایشە میوانەکانیش هەر یەکە لەگەڵ پارتنەری خۆی دەڕژانە ناو پارکێتی هۆڵەکەوە و ڤاڵسیان دەکرد. هەڵبەت ئەم باڵۆیە خواردنی ئێمەی خوێندکار نەبوو.

## ئورزولا فیشەر - کۆلبری
## Ursula Fischer- Colbrie

پێشتر ناوی یەکێک لە جوانترین و خۆشترین دانس کڵەبەکانی شاری ڤیەننام هێنابوو (فۆلکسگارتن Volksgarten) کە هاوینان هەم لە ژوورەوە و هەم لە باخچە جوانەکەیدا دانسی لێ دەکرا. شەوان هەموو دار و دەوەن و درەختەکانی تیشکی شەوچرای سەوزیان دەخرایە سەر کە ئەتمۆسفێرێکی زۆر رۆمانتیکیی دەئافراند. پارکێتی پانی دانسکردنیش لە ژوور و دەری کڵەبەکە هەبوو نەبادا لەپڕێکا رێژنەیەکی هاوینەباران دای بکوتێ.

هەموو ئێوارانی پێنج شەممە، بوتیکی بەناوبانگی ئانابێل Boutique Annabelle کە دواترین مۆدەی جلی ژنانی لێ دەفرۆشرا، ماوەیەکی دیاریکراوی لەو فۆلکسگارتنە بۆ نمایشکردنی مۆدێلەکانی بۆ تەرخان کرابوو کە بە ئاڵمانی پێی دەڵێن Mode Schau و بە ئینگلیزییش Fashion Show. سروشتانە بوتیکەکەش جوانترین کیژی نەوجوانی دەهێنا بۆ نمایشکردنی مۆدێلەکانی. جا کوڕەلاوەکانیش هەتا بۆیان بلوابا ئەو شەوەی پێنجشەموانیان لەدەست خۆیان نەدەدا و دەچوونە فۆلکسگارتن. یەکێک لەمانە بەندەی خانەوێران بوو. کچەکان دوای ئاخرین خولی نمایشکردنکەیان ئیتر ئازاد دەبوون و دەهاتنە ناو میوانەکانی کڵەبەکە و بۆ خۆیان بەسەر چەند مێزێکا دابەش دەبوون و داوای پەرداخێک شەراب یان هەر شتێکی تر ئیتر لە چاوەڕوانی "شۆڕەسوارێکی خەونەکانیان" دەبوون بچێ بۆ دانسێک داوەتیان بکات.

ئێوارەیەکی ئەو پێنجشەممانە چاوی خۆم بەسەر مێزەکانیاندا دەگێرا و کیژۆڵەیەکی جوانکیلەم رەچاو کرد کە باندی موزیک دوای پشوو

دەست پێ بکاتەوە، منیش بەپەلە خۆم بگەیەنمە سەر مێزەکەی ئەو نەوەکوو یەکێکی تر پێشی من بیگاتێ. زۆر لە کوڕەلاوەکان ئەگەر چاویان بڕیبوایە کچێکی بەدڵیان لە کاتی پشووی باندی موزیک نەدەچوونەوە سەر مێزەکانی خۆیان بەڵکوو هەر لە نزیک مێزەکەی ئەو کچە دەوەستان تا کە موزیک دەست پێ بکاتەوە ئەوان زوو بیگەنێ. ئەڵبەت کچێک ئەگەر کوڕێکی بەدڵ نەبوا یان دووربەدووری چاوبازیی لەگەڵ کوڕێکی ترا هەبوا ئەوا داخوازیی بانگکردن بۆ دانسی ئەو کوڕەی کە زووتر گەیشتووەتە لای بە ئەدەبەوە ڕەت دەکردەوە و چاوەڕێی ئەو کوڕە نەناسراوەکەی تر دەبوو بێت بۆ دانسکردن هەڵیسبتێنێ.

ئەمن خۆم گەیاندە ئەو کچەی کە بەبێ چاوبازیی پێشتر لە دڵی خۆما دەسنیشانم کردبوو و چووم بەختی خۆم تاقی بکەمەوە. ئەو لەگەڵ دووسێ کچی تر لەسەر مێزێکا دانیشتبوون. کە لەبەردەمیا داوەرامەوە سەیرێکی خێرای کردم و لەگەڵما هەڵستا. هەر لە یەکەم دانسا جەستەمان ئارەزووی لێک نزیکبوونەوەیان کرد، روومەت کەوتە سەر روومەت و ناومان ئاڵوگۆڕ کرد، ئەو ئورزولا Ursula من رۆمێرۆ Romero ی ئەرجەنتینی. بۆ؟

لە پەنجاکانی سەدەی رابردوو کە من لە ڤیەننا بووم باو باوی کوڕی ئیتالی و ئیسپانی و فرەنسی و یۆنانی و ئەوانەی وڵاتانی ئەمەریکای لاتین بوو لای کیژۆڵە چاوشین و قژ زەردەکان بەتایبەتی. دیار بوو کچە ئەوروپایی جەرمەن نەژادی وەک ئاڵمان و فلاماند و سکاندیناڤی و ئەنگلۆساکسۆنەکان لە کوڕە قژ زەرد و چاوشینەکانی خۆیان تێر و وەڕس بووبوون و مۆدە کەوتبووە سەر کوڕی قژ و چاوی رەش بەتایبەتی ئەگەر ئەوروپی و ئەمەریکای لاتین بوان و بە پلەی دووەمیش خەڵکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی موسڵمانی وەک ئێمە کە هەندێکیان شانسی باشیان لای کچان هەبوو. کچەکان دەیانگوت کە خەڵکی پێست کەمێک رەشتاڵەی ئەو وڵاتانە گەرموگوڕترن،

تێمپرێمێنتیان temperament هەیە واتا گەرمی و خوێن شیرینیان لێ دەتکێتەوە بە پێچەوانەی پیاوەکانی خۆیان کە گوایا زۆر سپی بێتام و ساردوسڕن. هەڵبەت ئەمە گشتاندنە چونکە بەڕاستی خۆشیان کوڕی قۆزی وایان هەبوو کە بە سەروسیما و بەژنوباڵا بە رواڵەت زۆر لە ئێمەی قژ و چاوڕەش پەسندتر بوون لایان. ئینجا ئەوە بوو کە زۆرێک لە ئێمەی خەڵکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە بۆ یەکەم جار کچێکمان دەناسی خۆمان دەکردە خەڵکی یەکێک لەو وڵاتانە تا دەبووین بە دۆستی نزیکی یەکتری ئینجا لەپاشان خۆمان لێ ئاشکرا دەکردن. من دوو ناوم هەبوو رۆمێرۆ و ناوێکی فرەنسیش (هێنری د لامار) کە بە بەلێوکردنی زمانی فرانسی دەبێتە ئانغی دلاماغ Henri de La mare) و زۆر جاریش هەر هۆمەرم بەکار دەهێنا کە بە یۆنانی دەبێتە هۆمیروس. قاسم الگیلاني برادەری عیراقیم ئەویش ناوی خۆی کردبووە دانیللۆ Danillo ی ئیسپانی و ئیتالی.

لەگەڵ ئورزولا بووین بە دڵدار و دڵبەر. بەڵام ئەو ماڵی لە شارۆچکەیەکی دەرەوەی ڤیەننا بوو (گلۆکنیتز Glocknitz) لە نەمسای ژێری و هەفتەی تەنها چەند رۆژێک دەهاتە ڤیەننا و یەکتریمان دەدی. بۆیە ماوەی رۆمانسەکەمان کورتخایەن بوو، تەنها دوابەهار و هاوین و پایزی ساڵی 1958.

هاوینی 1958 هاوینە رەشەکەی کودەتا سەربازییەکەی جەنڕاڵ عبدوللکەریم قاسم بوو لەدژی سیستەمی پادشایەتی لە عێراق. لەو رۆژەشەوە ئەم گەلی عێراقە بە هەموو پێکهاتە ئێتنی و ئایینی و ئایینزاییەکانییەوە ئیتر سەقامگیریی سیاسی و ئابووریی بە خۆیەوە نەدی، ساڵ بەساڵ خۆزگەی بە پار. هەرچەند رۆژێکی زیاتر نەبرد کودەتاکە بوو بە شۆڕشێکی گەلەکیی درندانەی پڕ لە خوێنڕێژی و دوور لە هەموو رەوشت و بەهای مرۆڤایەتی و ئەخلاقی.

بەڵام بۆ کۆمونیستی عێراقی و بۆ ئێمەی کوردی ناسیۆنالیستی چەپڕەویش رۆژی چواردەی تەمووز بوو بە رۆژێکی پیرۆز لە

مێژووی ئەو وڵاتە کە مژدەی ئازادی و دیمۆکراسیی بۆ هێنابووین و پێمان وابوو کوردستانیش لە سەربەخۆیی نزیک دەکاتەوە.

بەم بۆنەیەوە نامەیەکی پڕ لە دڵخۆشی و ئومێدەواریی خۆم بۆ ئورزولای گراوم نارد. ئەویش بە نامەیەکی لەم شێوەیە وەرامی دامەوە کە ئێستاش هەڵمگرتووە. هەنگی، قسەکانیم ئەوەندە بەهەند وەرنەدەگرت بەڵام زۆر دواتر کە دەمخوێندەوە تا دەهات پتر بۆم دەردەکەوت کە ئەو کچە تەمەن بیست ساڵییە بە ئەقڵ و بیرکردنەوە زۆر بەپێش تەمەنی خۆی کەوتووە. ئەمە تەرجومەی نامە ئاڵمانییەکەیە کە لەگەڵ نامەیەکی تریشی لە کاتی خۆی لە کۆڤاری لڤین (ژمارە 82 ساڵی حەوتەم 1 کانوونی دووەم 2009 ) دا بڵاوم کردوونەتەوە:

خۆشەویستەکەم ئۆمەر

ئەمڕۆ نامەکەتم پێ گەیشت. من دوێنێ بۆ ماوەی سێ سەعات لە ڤیەننا بووم و پۆستکارتێکم بۆ ناردیت.

من وای تێ گەیشتووم کە دیارە باری سیاسی لە عێراقدا بە دڵی تۆیە. بەڵام هەڵوێستی من لەم رووەوە دوولایەنەیە و حەز ناکەم بە درێژی بۆتی روون بکەمەوە. راستە تۆ هەقتە کە دەڵێیت دەبێ گەل خۆی بڕیاری خۆی بدات و دەڵێیت ئەمەریکییەکان نابێ خۆیان تێکەڵی ئەم کێشەیە بکەن. بەڵام ئەم شۆڕشە لەلایەن ناصرەوە بەرپا کراوە و ئەویش لەژێر کاریگەریی کۆمونیستەکان (روسیا)دایە. لەبەرئەوە پیاو هەقیەتی بێتە سەر ئەو بڕوایە کە زوو یان درەنگ عێراق بۆی هەیە بکەوێتە ناو چنگی رووسەکانەوە. ئەڵبەت رۆژئاوا هەوڵ دەدات ئەمە روو نەدات چونکە ئەمە پەیوەندییەکی نزیکی بە ئابووریی جیهانەوە هەیە، کە من لەم بوارەدا ئەوەندە زانیاریم نییە. هەروەها ئێمەش لێرە دژی کۆمونیزمین. بە چی دەچێ ئازادیی نەتەوەیی ئەگەر تۆ ئازادیی کەسەکیت نەبوو. جا لێرەدا وا دەبینیت کە من بەڕاستی نازانم لەگەڵ یان لە دژی ئەو شۆڕشەی ئێوە هەڵوێست بگرم. منیش دەڵێم دەبێ لێ بگەڕێن با میللەت خۆی بڕیاری خۆی بدات، ئەوان دەزانن

چییان دەوێ. هەر چۆنێکی بێ ئازادیی کەسەکی بۆ من زۆر بەنرخە. من حەز دەکەم بە ئازادی ئەوە دەرببڕم کە لە دڵمدایە، بە ئازادی بتوانم سەفەر بکەم بۆ هەر کوێیەکی دڵم بیەوێ، بە کورتی بەو شێوەیە بژیم کە خۆم بۆ خۆمم داناوە. بەڵام ئەم ئازادییە لەپشت پەردەی ئاسنیندا زۆر سنووردارە. پێم وایە ئەوروپاییەکانی دیکەش هەروا بیر دەکەنەوە. هیوادارم تێم بگەیت و بشزانە کە بەڕاستی دڵم بەوە خۆشە کە شت بەدڵی تۆ و برادەرەکانت بووە و هیوادارم هەرواش بەدڵی ئێوە بمێنێتەوە. من ئەم قسانەم بەڕاستییە و لە دڵمەوەیە.

نزیکەی نیو سەعاتێک دەبێ لە مەلەوانگە گەڕاومەتەوە و قژم هێشتا زۆر تەڕە. بۆیە ئێستا وا لە باخچەی ماڵەکەمان لەبەر هەتاو دانیشتووم و ئەم نامەیە بۆ تۆ دەنووسم. خاولییەکیشم لە قژم ئاڵاندووە نەبادا دڵۆپی ئاو بتکێتەوە سەر کاغەزەکەم. وا تەلیسمانێکت بە دیاری بۆ دەنێرم کە کەلایەکی شووشەیە. ئەوە پێنج ساڵە ئەم کەلایەم هەڵگرتووە. با ئەمەیان لەبری ئاسکە شکاوەکە بێت. نەکەیت ونی بکەیت! چونکە ونبوونی بەدبەختیی بەدوادا دێ. دەتوانیت بەدیاری بیدەیتە برادەرێکی زۆر نزیک یان کەسێک کە بەڕاستی خۆشت بوێت. بەڵام راستییەکەی من حەز دەکەم تاهەتایە هەر لای خۆت بێت.

سڵاوی زۆرم بۆ ماڵیکی برادەریشت. هیوادارم بەم زووانە لە ڤیەننا ببینم.

بەوپەڕی خۆشەویستیمەوە.

ئورزولا

{ پۆرترێتێکی رەنگاورەنگی خۆیشی کە خاولییەکەی لە سەری ئاڵاندووە بە دەستی خۆی کێشاوە}. جا هەر بەو بۆنەشەوە حەز دەکەم بڵێم کە ئورزولا رەسامێکی زۆر چاک بوو و دیزاین کردنی مۆدێلاتی جلوبەرگی خوێندبوو.

تێبینی:
**زیاتر لەبارەی کودەتاکەی چواردەی تەموزی 58 لە دواترێ یە.**

پایزی سالی 58 پایزی پەیوەندیی من و ئورزولاش بوو. نامەیەکی پڕ لە واتای ئەوم بۆ هات کە بە داخ و خەفەتێکی زۆرەوە داوای لێک جیابوونەوەمان دەکات. هۆیەکانیشی بەلامەوە زۆر ئاقلانە و وردبینانە و لۆژیک بوون. ئەوەی کە لێی تێ گەیشتبم ئەوە بوو کە ئەو زۆر لە من واقیعیتر بووە و حەزی کردووە ئیتر ژیانی خێزانی بنیاد بنێت و ئەوەشی لە منێکی هێشتا خوێندکارێکی بێباکی سەرەڕۆ بەدی نەدەکرد. بۆیە بڕیاری داوە لەوە زیاتر کاتی خۆی بە رابواردنی هەرزەکارانە بەفیڕۆ نەدات و ئەو نامەیەی بۆ نووسیم کە پڕە لە خەم و پەژارە و پەرۆشی و هەستی دوودلی و بڕیاری لە ناچاری و نائومێدییەوە. لەو نامەیەی زۆر بەڕوونی دەردەکەوێت کە لای ئەو کچە بیست سالییە هۆش بەسەر دلدا زال بووە. ئەمن لە کاتی خۆی کە نامەکەم دەخوێندەوە راستییەکەی ئەوەندە بەهەندم وەرنەدەگرت، بەلام دواتر، زۆر درەنگتر کە دووبارە و زیاتریش دەمخوێندەوە تا دەهات پتر سەرم لە زیرەکی و توانایی نووسینی ئەدیب ئاسای کچێکی بیست سالی وەک ئەو سوڕ دەما. ئەمن دەمزانی کە ئورزولا رەسامێکی لێهاتووە و دیزاینی مۆدێلاتی بەرگی ژنانی دەکێشا بەلام نەمدەزانی نووسەریشە و نەشمدەزانی کە ئەو، بەپێچەوانەی من، یەخسیری دونیای خەون و خەیالات نییە. ئەو نامەیە و چەند نامەیەکی تر و چەندین پۆستکارت و هەندێ وردە یادگاریی ئورزولام لەگەل چەند سوورەگولێکا پێچایەوە و ئەوە ئەمڕۆ وا دەبێتە 59 دانە سال کە هەموویم زۆر بەجوانی هەلگرتووە. چەند سالێ لەمەوبەر ئەم نامەی مالئاواییە و نامەیەکی تریشیم لە ئالمانییەوە وەرگێڕایە سەر کوردی و لە کۆڤاری لڤین (ژمارە 82 سالی حەوتەم 1 کانونی دووەم 2009) بلاوم کردەوە. ئەمەیان نامە مالاوابیەکەیە.

خۆشەویستەکەم تۆمەر..

ئەوەنـدەت بیـر دەکـەم و ئەوەنـدەش شـت هەیـە دەمەوێـت پێتـی بڵێـم، بـەڵام ئاخـر کـەی سـەرچاوەی بیرکردنەوە وشـە و رسـتە بـووە؟ بیرکردنەوە زادەی خەیاڵـە. بەڵـێ بریـا بمانتوانیایـە تێبگەیـن ئـەو شـتە چییـە، ئـەو شـتە خێـرا تێپـەڕە، ئـەو شـتە تیـژڕەوە، ئـەو شـتە کـە دەرنابڕدرێـت و هـەروا سـەرپێیی بەنـاو مێشـکی مرۆڤـدا گـوزەر دەکات، وەک مێلۆدییەکـی لەمێژە نەبیسـراوی لەبیرکـراو، وەک گوڵێکـی لەمێـژە ژاکاوی ژیـان لەبەربـڕاو. گوڵێکـی بـە دونیایـەک پـڕ لـە یـادگار و خاتیراتـی بەسـەرچو، خاتیراتێـک کـە لەپـاش سـاڵەهای سـاڵانیش بـە بینینـی هەندێـک شـت، یـان هەندێـک شـوێنەوار یەکسـەر دەتگەڕێنێتـەوە بـۆ دواوە، بـۆ رۆژگارانـی رابـردوو چونکـە ئـەو یـادگارە لـەو شـت و شـوێنەوارانەوە هەڵقـوڵاوە. ئـاخ، بریـا بمتوانییـا ئـەوە بخەمـە سـەر کاغـەز کـە لەنـاو خەیاڵمـدا پەنـگ دەخواتـەوە بـێ ئـەوەی تووشـی ئەشـکەنجەی داڕشـتنی فۆرمـی نووسـینەکەم ببـم، بـێ ئـەوەی کـە لـەو رێگـە کورتـەی نێـوان کەللـە و کاغـەزا ناوەڕۆکـم لـێ ون ببێـت.

ئێسـتا دەبینیـت کـە مـن وا خەریکـە نامەیەکـی ئاڵـۆزت بـۆ دەنووسـم و هەندێـک روونکردنـەوەی لەگـەڵ دەدەم کـە لەوانەیـە بـۆ تـۆ ئیتـر هەسـتبزوێنیش نەبـن.. یـان؟

بەڵـێ، مـن حـەزم لـە تـۆ کـردووە. ئەمـن بـە چەشـنێک تـۆم خـۆش ویسـتووە، خۆشەویسـتییەک کـە منـی بەتـەواوی شـێواندووە و لـە تـەوری خۆمـی دەرهاوێشـتووم. جـا لێـرەدا مـن دوو جـۆرە مـرۆڤ دەبینـم.. جۆرێکیـان شـتی لـەم بابەتـە بەئاسـانی وەر دەگـرن، ئەمـن لەوانـە نیـم. مـن لەوانـەم کـە خۆشەویسـتیی تـۆ لەنـاو دڵمـدا زۆر بەقووڵـی رەگـی داکوتـاوە. ئێسـتاش وا لەپاش هەوڵێکـی نزیکـەی دوو مانـگ خایـەن کـە تـەواوی هێـز و هۆشـم بـۆ تەرخـان کردبـوو توانیومـە ببمـەوە بـە مرۆڤێکـی نۆرمـاڵ و کۆنترۆڵـی خـۆم بکەمـەوە. لەوانەیـە لـەلات سـەیر بێـت ئـەم قسـانە دەکـەم. بـەڵام مـن ئێسـتا لـە خـۆم رادەبینـم راسـتیت پـێ بڵێـم

بێ ئەوەی ئازارێکی ئەوتۆی ویژدانی خۆم بدەم. ئێستا تۆ بۆ من بوویت بە بێگانە و منیش بە ئاستەم هەستی پێ دەکەم کە ڕۆژێک لە ڕۆژان من هی تۆ بووم. ڕەنگە هەر لە خەونەکانمدا ببمەوە بە هی تۆ. کەچی هێشتا ترسم هەر ماوە. دەزانیت لە چی دەترسم؟ لەوە دەترسم ڕۆژێک لە ڕۆژان بتبینمەوە. چونکە ئەگەر هاتوو بەڕێکەوت یەکتریمان بینییەوە دەتوانم بەوپەڕی سادەییەوە پێت بڵێم کە دڵم لە لێدان دەوەستێت. دڵم دەوەستێت بەو بەڵگە زەق و زیندووەی بەرچاوم کە تۆ بەڕاستی، بە حەقیقەت لەناو ژیانمدا هەبوویت.

جا هەروەک کە لە سەرەوەش بۆم نووسیویت، ئێستا من تەنیا لەناو خەونەکانمدا لەگەڵ تۆدام. زۆریش مەبەستمە هەروا بمێنێت. بێگومان ئێستا تۆ دەبێت بپرسیت بۆچی؟ ڕاستە دوو مرۆڤی وەک من و تۆ دەتوانن یەکتریان خۆش بوێت بەڵام پرسیار ئەوەیە دەتوانن پێکەوە بژین؟

من ماوەیەکی زۆرم بەسەر برد بۆ بیرکردنەوە لە وەڵامێک بۆ ئەم پرسیارە. خۆ تۆ دەزانیت ئێمە هەردووکمان هێشتا زۆر گەنجین. بەڵام من جیاوازییەک لە نێوانماندا دەبینم کە زوو یان درەنگ هەر لێکمان دەکاتەوە. من وام پێ باشە ئەم لێکدابڕانە تا زووتر بێت چاکترە. لێم گەڕێ با زیاتریش لەگەڵتدا ڕاشکاو بم.. هەر ئێستا باشترە و با نەیخەینە دوا چونکە تا درەنگ بێت بۆ من سەختتر دەبێت بتوانم تەحەمولی بکەم. جیاوازییەکەش ئەوەیە کە تۆ هێشتا ساڵانێکی زۆرت لەپێشدایە و دەتوانی ژیانێکی پڕ لە ئازادی و بێ خەم و بێ بەرپرسیاری بەسەر بەریت چونکە تۆ هێشتا خوێندکاریت. بۆ منیش دەکرا لەگەڵ تۆدا بمابام ئەگەر منیش هێشتا بمخوێندایە بەڵام من ئەمساڵ وا خوێندنم تەواو کرد و ئیتر ڕێچکەی ژیانم لەوەی تۆ بە تەواوی لادەدات و هیوا و داخوازییەکانم لەوەی تۆ دوور دەکەونەوە. لەمڕۆ بەدواوە ژیانی من ئیتر بەرگێکی زۆر جیدیتر لەوەی تۆ دەپۆشێت و ڕوخسارێکی جیا لەوەی تۆ وەردەگرێت. من حەزم لە

تۆیـه و دڵـی هەردووکمـان لـەم راسـتییه دەگـەن، بـەڵام بیـر و هۆشـمان ئیـدی تێـی ناگـەن. هیـوادارم تـێ بگەیـت مەبەسـتم چییـه.

مـن ئـەم چەنـد دێـڕەی کـەوا لێـرەدا دەیاننووسـم بـه هـۆش و هزرێکـی زۆر روون و زوڵاڵـەوه دەیاننووسـم و هیـچ پەیوەندییەکیـان بـه هەسـتەکانمەوە نییـه چونکـه لێـرەدا هەسـت و هـۆش لێـک هەڵسـاونەته سـەر پـێ و بەگـژ یەکـدا چـوون. راسـتییەکەی ئـەوەی کـه دەمەوێـت پێتـی رابگەیەنـم دڵمـی لەگەڵـدا دەتوێتـەوە. ئەمـن درۆ ناکـەم و ئـەوەی کـه دەمەوێـت بیڵێـم حەقیقەتێکـی زۆر کارەسـاتییه.

ئـای کـه ناخۆشـه پێـت بڵێـم کـه مـن ئـەوه چـوار سـاڵه بەدەسـگیرانم. بـه دەسـگیرانم لەگـەڵ کوڕێـک کـه خۆشـم ناوێـت. بـەڵام ئـەو کـوڕە ئـەو ماوەیـه باشـترین هۆگـر و هەڤاڵـم بـووه و منیـش هەمیشـه لەگـەڵ ئەودا بـه چاکـی هەڵـم دەکـرد تـا تـۆ لەنـاکاو پەیـدا بوویـت و کەوتیتـه نـاو ژیانمـەوه. ئەمـن لـه ژیانمـدا بـۆ یەکـەم جـار لەگـەڵ تـۆدا تووشـم بـه تووشـی خۆشەویسـتییەوه بـووه. تـۆ دەتوانیـت بـڕوام پـێ بکەیـت چونکـه مـن هیـچ هۆیـەک نابینـم شـتێکی پێچەوانـه بنووسـم. جـا لـه قووڵایـی دڵمـەوه تـکات لـێ دەکـەم ئـەم خۆشەویسـتییەمان وەک گەوهەرێکـی چکۆلانـه بپارێزیـت و فڕێـی نەدەیتـه نـاو زۆنـگاوی بـێ بنـی لەبیرکردنـەوه. تـکات لـێ دەکـەم قسـەی ناشایەسـته و ناشـیرین بـەو خۆشەویسـتییەمان نەڵێیـت. مـن بۆیـه ئـەم قسـانه دەکـەم چونکـه زۆر کـەس هـەن کـه بەداخـەوه لـەم شـتانه ناگـەن و بـێ پـەروا قسـەی سـووک و ناتاقڵانـه دەکـەن. چـاک بزانـه کـه مـن تاهەتایـه لەبیـرت ناکـەم. مـن دەزانـم و هەسـتی پـێ دەکـەم کـه تـۆ لـه مـن گەیشـتوویت و تـۆ لـەو پیاوانـه نیـت کـه دەیانەوێـت بـه هـەر چۆنێکـی بێـت گوڵێـک بقرتێنـن هەرچەنـدە کـه سـوور دەشـزانن هێنـدەی پـێ ناچێـت ئـەو گوڵـه سـیس دەبێتـەوه.

ئـای چەنـد خۆشـه بیـر لـه رۆژانێـک بکەیتـەوه کـه هێنـدەی تۆزقاڵێـک ناخۆشـی و ناشـیرینیی تێـدا نەبـووه، رۆژانێـک کـه هـەر هەمـووی خۆشـی و خۆشەویسـتی و جوانـی بـووه. زۆر بەدڵنیاییـەوه مـن و تـۆ هەردووکمـان

دەتوانین بیر لەو رۆژانە بکەینەوە چونکە ئەو ماوە کورتەی کە من و تۆ تێیدا بەیەکەوە بووین رۆژانێکی پڕ لە بەختەوەری بوون، لای من وا بوو، نازانم لای تۆ!

من بۆیە ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم چونکە لەو باوەڕەدام ئەگەر یەکێک بە کەسێکەوە بەسرابێتەوە رەوشت و ئەخلاق داوای لێ دەکات دەبێت راستی پێ بڵێت و نابێت هەروا بە داماوی بەجێی بهێڵێت. خۆ من دەمتوانی رێگاکە لە خۆم کورت بکەمەوە و ئیتر نە جارێکی تر بتبینم و نە بۆشت بنووسم. دەمتوانی ئەوە بکەم بەڵام ئەدی ویژدان! ئێستا کەوا هەموو شتێکم بە راشکاوی پێ گوتی ویژدانم ئاسوودەیە و دەشتوانم متمانەی پیاوەکەی تریش بۆ خۆم بەدەست بهێنم کە من بەڕاستی سەرڕاست و راستگۆم. ئەمە بۆ من گرنگە.

لە ناخی دڵمەوە تکات لێ دەکەم چیدی بۆم نەنووسیت و هەوڵیش نەدەیت لە ڤیەننا بمبینیت. چونکە گەر وا بکەیت بڕوات هەبێ کۆنەبرینی سارێژکراوی خۆشەویستی سەرلەنوێ دەکولێتەوە و دێتەوە سوێ. راستییەکەشی من دەزانم ئەوە لە تۆ ناوەشێتەوە. ناشمەوێت پێت بڵێم کەی دێمەوە بۆ ڤیەننا چونکە ئیتر پێویست بەوە ناکات. بێجگەلەوە ئێمە ماڵەکەشمان گواستووەتەوە و ئێستا ئێمە سێ خوشک بەیەکەوە دەژین و ژوورەکەی پێشوومان بەشی نەدەکردین.

تا من دەگەڕێمەوە بۆ ڤیەننا پایزیش دادێت. ئەتۆش لەگەڵ گەڕانەوەی پایز ئیتر لەبیرم بکە. من لە بیر و خەیاڵی خۆت دەربهێنە. خۆی رەنگە هەر خۆشت وات لێ بێت و لەبیرم بکەیت.

ئورزولا

{لەباتی واژۆ، جێ ماچێکی بەهەردوو لێوە سوورەکانی لەسەر کاغەزەکە بەجێ هێشتووە کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا پڕە لە واتا. مەبەستی بووە بڵێ: بۆ تۆ واژۆی من ماچە.}

راستی دەکرد ئورزولا، هەرچەندە کە لە نامەکەیدا زۆر بە ڕوونی و راشکاوی هەستی هەوینییەکی پڕ بەدڵی بۆ من دەربڕیوە، بەڵام زۆر

زوو فریای خۆیشی کەوتووە. لەوە دەچێ ئەو سەرەڕای ئەوەی کە بە خوێندنەوە و خەیاڵ ئاشقی داستانە ئەفسانەییەکانی مۆرگنلاند بووە بەڵام بە واقیع نەیویستووە لەوە قووڵتر بکەوێتە داوی خۆشەویستیی لاوێکی بیست و یەک ساڵی، بێباکی، سەرەڕۆی دۆن جوان ئاسای پەروەردەی ئاو و هەوا و دەشت و کێوە سامناک و ڕۆمانتیکەکانی کوردەلان Kurdland. ڕەنگە بۆ کیژۆڵەیەکی نەوجوانی پەروەردەی ئاو و هەوای ڕووباری دانووب و شاخەکانی ئەلپ ئەو چەشنە ڕۆمانسە نوێ و نامۆیە وەک ئەفسانەی ناو کتێبانیش بووبێت بەڵام دیارە ئەو لەوەش دوورتری ڕوانیوە. سەرەڕای خۆشەویستی، زوو لە من گەیشتبوو. خۆ من خۆیشم لەو باوەڕە دام کە هێندەی نەدەبرد لەگەڵ مندا هەڵی نەدەکرد و جیا دەبووینەوە. منیش ئەوم زۆر خۆش دەویست بەڵام ڕاستییەکەی من هەر ئەوم نەبووە. ئەمن وەکوو پێشتریش باسم کردووە سروشتی پەپوولە و هەنگ و بولبولم هەبوو. زوو یان درەنگ ژیانم لەگەڵ ئورزولا تا سەر نەدەبوو. هەرچەندە کە خەفەتی زۆرم بە نامەکەی ماڵئاوایی خوارد بەڵام لەپاش دەسلێکبەردانیش بەنابەدڵی خۆم نەدەکرد. لەسەر داخوازی خۆیشی وەرامی نامەکەیم نەدایەوە. ئەو وێنانەی کە هەر بۆ مێژوو وا لەم بەشەدا بڵاوم کردوونەتەوە ئەوە هەندێ وێنەی هەندێ ئەو یار و گراوانەی ساڵانی لاویمە لە ڤیەننا.

دەشتوانم بەدڵنیاییەوە بڵێم، چونکە هەستم پێ دەکرد، کە تێکڕای ئەو کچانەی کە دۆستایەتیم لەگەڵیانا دەبوو یەکسەر بیریان لە هاوسەرگیری دەکردەوە. ئەمەش خەسیەتێکی بنچینەیی کچانی هەموو کۆمەڵگایەکە بە جیاوازیی ڕەگەزی و ئایینی و کولتووریشیانەوە. ئەمە سروشتی مێینەیە کە حەز دەکات بە زووترین کات هێلانەی تایبەتی خۆی دابمەزرێنێت. من وا نەبووم چونکە نێرینە بە سروشت ئارەزووی دانانی ماڵ و خێزانی بەڕادەی ئارەزووی مێینە وا زوو بەسەرا زاڵ نابێت.

وەک پەپوولە و هەنگ و بولبول
شیلەم ئەمژی گوڵ بە گوڵ
شەو هەتا سۆزەی بەیانان
دەم لەناو دەم دەس لە مل
ئێستەش وا ئەستێرەی ژینم
زەرد و کز ئەبێتەوە
رۆیی رۆیی رۆیی ئاخ
جارێکی تر نایێتەوە
برادەران دوێنێ کە جوان بووم
نەمدەزانی غەم چییە
نەمدەزانی ماندوبوون و
خەو و واتای دەم چییە
برادەران برادەران برادەران

یەکەم شوێنی ژیانم لە ڤیەننا لە نهۆمی ئەرزی
ئەم باڵاخانەیە بوو 1957

خانم ئێڤا مامۆستای زمانی ئەڵمانیم
1957

لە ڕاستەوە: هۆمەر دزەیی، پەروین مەحموود جەودەت، وریا ڕواندزی 1957 ئەو ڕۆژەی پەروینمان
بەڕێ دەکرد دەگەڕایەوە بۆ بەغدا

وریا ڕواندزی و پشتەوەی وێنەکەی

شازادە ڕوودۆلفی 30 ساڵی، جێگر و تاکە کوڕی کایزەری نەمسا فرانس یۆزێف کە لەگەڵ دۆستەکەی بارۆنێس ماری ڤێتسێرای 17 ساڵی، لە مایەرلینگ لە باشووری ڤیەننا خۆیان کوشت 1889

خانم ئێڤا مامۆستای زمانی ئەڵمانیم 1957

هۆمەر دزەیی و ڕووناس خانی هاوسەری لە بەردەم چەند پەیکەرێکی شاری ڤیەننا

هۆمەر دزەیی لە بەردەم مەیخانەی ئۆگستینەر کێلەر کە لە سەردەمی کایزەرا تەویلەی ئەسپەکانی بووە و دواتر کرا بە مەیخانەیەکی ناوداری شار

نهۆمی ئەرزی ئەم باڵەخانەیە کافێ شپارتشپانیەری لێ بوو نهۆمی یەکەمیش ئەو ماڵە بوو کە لە 26 / 3/ 1827 بێتهۆڤنی لێ مرد

هۆمەر و ڕووناس خانی هاوسەری لە ڤیەننا

هۆمەر و ڕووناس لە گۆڕستانی هایلیگن
کرۆیتس کە ماری ڤێتسێرای لێ نێژراوە

لە ڕاستەوە هۆمەر دزەیی و تەحسین هەورامی، لە بەردەم بورک تیاتەری ناوداری ڤیەننا 1957

هۆمەر و ئەرشەد پۆرتەر، ڤیەننا 1957

هۆمەر و ڕووناس خانی هاوسەری لەسەر گۆڕی بێتهۆڤن

له ڕاستەوە: باري الشيخ علي و هۆمەر و مالك الياسري، ڤیەننا 1957

هۆمەر و يدالله صادق وەزيری، ڤیەننا 1957

هۆمەر و دەرهێنەری سینەمایی عێراقی ناسراو، فیصل الياسري ئەوەی پشتەوە مازن الياسري ڤیەننا 1957

هۆمەر و خوسرەو ڕەشید جەودەت لەسەر ڕووباری دانوب ڤیەننا 1957

لە ڕاستەوە: باري الشيخ علي و هۆمەر دزەیی و تیماتیۆس ڤیەننا 1957

لە ڕاستەوە: حسن ذوالفقار و هۆمەر و حسێنی مەلا، ڤیەننا 1957

هۆمەر و حسێنی مەلا، ڤیەننا 1957

هۆمەر و پەروین مەحموود جەودەت لەگەڵ خوێندکارانی عێراقی ڤیەننا 1957

هۆمەر دزەیی و ئایلین، کچە ئاشووری عێراقی لە کافێ شڤارتسشپانیەر ڤیەننا 1957

لە چەپەوە: هۆمەر دزەیی، ئەرشەد پۆرتەر، تاریق عەباس، حەمید ڕەشید، مەحمود خالید
دانیشتووەکەش: سەمیر بۆتانی لە ڤیەننا 1957

هۆمەر گۆرانی بۆ عێراقی و نەمساوییەکان دەڵێ، ڤیەننا 1957

هۆمەر دزەیی و ئیلزا هۆخموت لەسەر ڕووباری دانوب ڤیەننا 1967

باندی موزیکی چیگۆینەر

لەناو گوڵفرۆشەکانی بەردەم ئۆپرای ڤیەننا 1967

تێوارمیەک لە گرینچینگ

ستوونی ڕیکلامکردن لەسەر شۆستەکانی ڤیەننا

لەڕاستەوە: هۆمەر و گابی و فیصل الیاسري و دۆرلی هاوسەری، ڤیەننا - 1957

لەگەڵ هایدی سۆنتاگ کچی خاوەنی کافێ شڤارتسشپانیەر، ڤیەننا - 1957

هۆمەر و موزیسیانەکانی گرینجینگ بەم دواییانە

هۆمەر و کریستا خرپشۆکە، ڤیەننا - 1957

دادوەرەکانی تێستیان کردم ئەم جلانەیان لەبەرابوو

ئۆپەراخانەی ڤیەننا

کاتیدراڵی سان باسیل لە مۆسکۆ

بەرگی نەتەوەیی ئەرمەنی

بەرگی نەتەوەیی گورجی

هۆمەر دزەیی کە گەیشتە مۆسکۆ

هۆمەر دزەیی و نەجیب خەفاف لەگەڵ هەندێ ڕووس

هۆمەر و حەمەی حوسێنی مەلای ئامۆزای لەگەڵ دوو میوانی ڤێستیڤاڵەکە

هۆمەر دزەیی و نەجیب خەفاف لەگەڵ کچانی شاندی ئیتاڵی

هۆمەر دزەیی و دوو کچی ئیسلەندی و سوێدی لە پیشەنگای پیشەسازی مۆسکۆ

ستاوەکان لە چەپەوە: لەمیس، نوری عەبدولڕەزاق هاوسەری لەمیس، دارا تۆفیق، عێراقییەک، نەجیب خەفاف، عێراقییەک. دانیشتووەکە هۆمەر دزەیی. مۆسکۆ 1957

وەستاوەكانی لە چەپەوە: كارلینێ چەچان، هۆمەر دزەیی، قەناتێ كوردۆ،
قەدری جان، سەید عەزیز شەمزینی، مام جەلال، (پێم وایە ئەسعەد خۆشەوی و
عەلی خەلیلی برازای)، ڕووسێك. دانیشتووەكان لە چەپەوە: ئەحمەدێ سیبكی،
حەمەی حوسێنی مەلای دزەیی، نجیب خەفاف،
ئەحمەد عوسمان و سەعیدێ سلۆ. مۆسكۆ 1957

وەستاوەكان لە چەپەوە: كوڕێكی بادینی، مام جەلال، دانیماركییەك، جەباری پیرۆزخان،
دانیماركییەك، هۆمەر دزەیی، قەدری جان و كوڕێكی هەولێری. دانیشتووەكانیش عێڕاقین
مۆسكۆ 1957

مام جەلال و هۆمەر لەگەڵ چەند سوودانییەك. چوارەم كەس لە چەپەوە
مام جەلالە، سێیەم لە ڕاستەوە هۆمەرە. مۆسكۆ 1957

وەستاوەکانی لە چەپەوە: کارلینێ چەچان، هۆمەر دزەیی، قەناتێ کوردۆ،
قەدری جان، سەید عەزیز شەمزینی، مام جەلال، (پێم وایە ئەسعەد خۆشەوی و
عەلی خەلیلی برازای)، ڕووسێک. دانیشتووەکان لە چەپەوە: ئەحمەدێ سیبکی،
حەمەی حوسێنی مەلای دزەیی، نجیب خەفاف،
ئەحمەد عوسمان و سەعیدێ سلۆ. مۆسکۆ 1957

وەستاوەکان لە چەپەوە: کوڕێکی بادینی، مام جەلال، دانیمارکییەک، جەباری پیرۆزخان،
دانیمارکییەک، هۆمەر دزەیی، قەدری جان و کوڕێکی هەولێری. دانیشتووەکانیش عێراقین
مۆسکۆ 1957

مام جەلال و هۆمەر لەگەڵ چەند سوودانییەک. چوارەم کەس لە چەپەوە
مام جەلالە، سێیەم لە ڕاستەوە هۆمەرە. مۆسکۆ 1957

ئێوارەیەکی کوردی لە ڤیەننا 1958 لە چەپەوە: د. عەبدولڕەحمان قاسملوو، هێلێن خانی هاوسەری، عەلی ئاغای ئەرکەوازی،هۆمەر دزەیی

ڕیزگرتن بۆ سەردانی ئارامگای لێنین و ستالین لە مۆسکۆ

پەروین مەحموود جەودەت

لاشەی لینین

لاشەی ستالین

له ماڵی دایکی زۆیا، ڕیزی پێشەوە لە چەپەوە: دارا تۆفیق، مام جەلال، جەبار پیرۆزخان، ؟،
حەمەی حسێنی مەلای دزەیی، پەروین مەحموود جەودەت، دایکی زۆیا،هێلێن هاوسەری
د. قاسملوو، نەجیب خەفاف، هۆمەر دزەیی، ؟، ؟، بەشیر ئیسماعیل چیچۆ، ئەحمەد عوسمان

پێشکەشکردنەکەی کتێبەکەی
قەناتی کوردۆ بە هۆمەر دزەیی

بەرگی ناوەوەی کتێبەکەی
قەناتی کوردۆ

شاعیری تورک، نازم حیکمەت
1963 - 1902

لە سێدارەدانی زۆیا لەلایەن سەربازانی
ئەڵمانیای نازییەوە 1941

ستادیۆمی لێنین (جێگەی سەد هەزار کەسە)

تیاترۆی بۆلشەڤیک

لە چەپەوە: هۆمەر دزەیی، نەجیب خەفاف، ئێتنۆلۆگ تاتیانا ئاریستۆڤا، حەمەی حوسێنی مەلای دزەیی، جەبار پیرۆزخان، رووسێک

هۆمەر دزەیی و ئەلیزابێت ئێرلینگسدۆتیر

لە ڕاستەوە: ئەلیزابێت ئێرلینگسدۆتیر، هۆمەر دزەیی، کچێکی سوێدی دۆستی نەجیب خەفاف

هۆمەر دزەیی، ڤیەننا 1957

دەفتەری تۆماری خوێندکار عمر امین (هۆمەر دزەیی) لە کۆلێژی زانستی سیاسەت ، زانکۆی ڤیەننا

دەستنووسی شیعرەکەم بۆ ئێریکا کە دواتر کەمێک دەستکاریم کرد

باڵۆی ساڵانەی **ئۆپەرای ڤیەننا**

بەرگی **کتێبەکەی کارل مای لەسەر کوردستان**

لۆگۆی جازنایتکڵەبی **(ئادیَ بار) لە ڤیەننا**

**شێوەکار و دیزاینەر و شاعیر و کۆمپۆزەری نەمساوی ئێرنست فوخس 1930 - 2015**

**موزیککاری ئەرمەنی ئارام خاچاتوریان 1903 - 1978**

شانۆگەرییەکی یوسف العاني لە ڤیەننا لەچەپەوە: هۆمەر دزەیی، قحطان کمال الدین

لەچەپەوە: یوسف العاني، لطفي بکر صدقي، مالک الیاسري، هۆمەر دزەیی 1957 لە دەرەوەی ڤیەننا

دکتور حسن الچرچفچي ، ڤیەننا

له چەپەوە: لطفي بكر صدقي، مالك الياسري، هۆمەر دزەیی لەسەر دانوب

هۆمەر دزەیی و وریا رەواندزی ڤیەننا 1957

نەورۆزی کوردەکانی ئینگلتەرە 1955 لەچەپەوە : عارف کەریم ، حەمەنوری عەمادی ، سەعدی دزەیی
، شەوکەت عەقراوی ، دارا تۆفیق، عەزیز رەشە ، فوئاد رەشە ، نەژاد سەلیم

مالک الیاسري
(2004 - 1934)

یوسف العاني و هۆمەر دزەیی ڤیەننا 1957

گۆرانیبێژی سویسری بە ئاڵمانی لە پەنجاکان و شەستەکان ڤیکۆ تۆریانی (1920 - 1998)

گۆرانیبێژی یۆنانی بە ئاڵمانی لە پەنجاکان و شەستەکان جیمی ماکولیس (1935 - 2007)

عیسمەت شەریف وانلی
1924 - 2011

لە ماڵی کاک عارف لەندەن 1957 لە چەپەوە:
هۆمەر دزەیی ، تەحسین هەورامی، سەعدی دزەیی برای هۆمەر ، عارف کەریم

هەندێ لە بەشداربووانی کۆنگرە. وەستاوەکان لەچەپەوە: فوئاد رەشە ، هۆمەر دزەیی،
شەوقی عەزیز ، عیسمەت شەریف ، عارف کەریم ، نازدار رەشید جەودەت ،
تەحسین هەورامی ، عومەر رەمزی ، سەلاح رەشید سدقی ، ئەنوەر عەمادی ،
سەعدی دزەیی ، نەژاد مەجید سەلیم ، حسام الدین سەعدوڵا. دانیشتووەکان لە چەپەوە:
سەلاح سەعدوڵا ، جەمیل جەلال ، زاهیر مەحمود ، عەزیز خۆشناو.

لەچەپەوە: هۆمەر دزەیی، تەحسین هەورامی، عیسمەت شەریف،
سەعدی دزەیی.

هۆمەر بەجلی کوردییەوە لە شەوارەیەکی فاشینگی ڤیەننا

هۆمەر بەجلی کوردییەوە لە شەوارەیەکی فاشینگی ڤیەننا

زانیم کە جلی کوردی بۆ ئەو فاشینگانە دەست نادا

هۆمەر و مالک الیاسري برادەری (1934 - 2004) دەڕۆن بۆ زانکۆ

هۆمەر بەجلی کوردییەوە لە شەوارەیەکی فاشینگی ڤیەننا

ئەلیزابێت ئێرلینگسدۆتیر، خەڵکی ئیسلەندا، لەدایکبووی 1940

هۆمەر دزەیی و ئەلیزابێت ئێرلینگسدۆتیر

هۆمەر دزەیی و ئەلیزابێت ئێرلینگسدۆتیر

Reykjavík May 26th

O-590

Darling Omar

I hope you will forgive me, that I have not written to you. I am in my exam now, and if I do not pass it then I can not live any longer!

I am glad to hear that the next festival will take place in [illegible], and I hope I shall see you there again [illegible]

Útgefandi: Photosport, Reykjavík Ísland. Einkaréttur (Copyright)

Mr. Omar Dizai

نامەیەکی ئەلیزابێت لە ئیسلاندەوە

دکتۆر سەید عەزیز شەمزینی

موسکو: ٣١/٨/٥٧

گیانەکەم کاکە عمر دزەیی

زور بە اشتیاقەوە دەستەکانت دەگوشم وچاوەکانت ماچ
دەکەم هیوام وایەکە زور ساغ وسلامەت وهمیشە موفق بن.
کاغەزەکەتم کەلەگەل کاغەزی کاکە وریاتنا ردبو بیم گەیشتە
زور پێ خوشحال بوم، لەپاش چونی ایوە ایرە زور متأثر
ومعاجز بوین چونکە وەکو چون لی هاتن کە ستان لیرە نەمان و
زور بە زەحمت هەتا هاتینەوە سەر حالی عادەتی خۆمان.
بەراستی ئەوەندە کە ایوە لیرە بون هوش ناکرینەوە.

زور سەلامی من بە کاکە رشید عارف بگەیەنە وپێی بلێ لەبارەت
دەعوەتەکەی بوئینا زور زور ممنونی وتشکری حیاتە دەکەم بەلام
زور متأسفانە کە ئەوە ممکن نیە پیم ناکرێ، یعنی بە هەزار جوری نایخ
چارە ئەو کتیبە کە نار دوتان وەرم نەگرتووە چونکە ممکنە بلێ
دوو روژی تر باشی کاغەزیم بگات. ئەگەر هیچ کیتبی باس کوردو تاریخی کورد
واحصائیات لەکوردستاندا هەیبێ بوم بینێرن ممنونتان دەبم.

بو ئیستا لێرە نیە لە لینینگرادە چووە استراحتی اجازەوە
سلامەکەی پێ دەگەیەنم. هەموو کوردەکانی ایرە سلام تان لی دەکەن
وە لە حال و احوالتان دەپرسن. هیوام وایە هەمیشە احوال وصحت
واخباری کوردستانم بو بنوسن. ایتر خوشی وموفقی وزانستی ساغ وسلامتی
ایوەمان گەرەکە.

٢١/٨/٥٧

برای ایوە سید عزیز

آدرەسی من

СССР

город МОСКВА, п/о. B-134

ШАМЗИНИ САИД АЗИЗ АБДУЛЛА

اتحادی شوروی. شاری موسکو شعبەی پوستە ژ ب-١٣٤

شمزینی سید عزیز عبدالله

مۆسکۆ

٣١/١٠/٥٧

گیانەکەم کاکە عمر دزەیی!

ڕۆژتان باش، هیوام وایە زۆر باش بن و هەمیشە ساغ و سلامەت و کەیف خۆش بن. نامەکەتان کە لە ٩/١٠/٥٧ نوسیبوتان گەیشت زۆر سپاستان دەکەم. بە خەبەری گیرانی ئەو هەوالانەی کە چونەوە عراق و گیراون زۆر گرتبوین زۆریشمان پێ ناخۆش بو، دەبوایە یان بە دزی گەڕابانەوە بۆ عراق وە یان مدەتێکی تر چاوەڕێیان کردبا هەتا وەختێکی بە سەرەوە دەچو. باسی خزمێکی ئێوەتان کردبو کە ناوی "نجم الدین" وا بزانم ئێوە خزمێکتان بەو ناوە هەبو بەلام چونکە من ئەوە هەشتە زۆر چکە بوم چاکیان ناناسم لەبەر ئەوە لەو بارەیەوە بۆ باوکم نوسیوە کە جوابی هاتەوە بۆتانی دەنوسم. ئەگەر لە احوالمان دەپرسن من و هەمو هەوالانی کە لێرەن ساغ و سلامەتن و عاجزی ئێمە هەر دوری هەوالانە. وە هەمومان زۆر سلاو لە ئێوە دەکەین چاوتان ماچ دەکەین و هەمیشە چاوەڕێی زانینی ساغ و سلامەتی و خەبەری خۆشی لای ئێوەین. ئێوە باسی پێنج کتابی رفیق حلمی «یادداشت»تان کردبو لێرە هەر پێنج ژمارەی هەیە لەبەر ئەوە بۆ پەیدا کردنی زەحمەت مەکێشن. کاکە عمر ئەگەر کاغەزی باوکم زو نەهات و من ئەم توانی لە بارەی خزمەکەمان شتێکتان بۆ بنوسم وە ئێوە چون بۆ لای سلامی ئێمە و ساغ و سلامەتی ئێمەی پێ بلێن و احوالی خزمەکانی دیمان لێ بپرسن. لەبەر ئەوەی کە لە نامەکەتا نەدا گوتبوتان هەر بە واسطەی کاکە وریا کاغەزتان بۆ بنوسم لەبەر ئەوە ئەمەلەدا هەر لە ناو کاغەزی کاکە وریادا بۆتان دەنێرم. ئیتر دوبارە هەمومان چاوتان ماچ دەکەین و هەمیشە چاوەڕێی نامە و زانینی احوالی ئێوەین.

براتان سعید عزیز

٣١/١٠/٥٧

٢/١١/٩٥٧

گیانەکەم کاکە عمر !

~~[illegible]~~ ئەو رۆژەی کە نامەکەم بۆ نووسی لە بیرم چوو بیدەمە پۆستەی
ئەمرۆکە چوومە پۆستەخانە نامەی دووەمی ئیوەم وەرگرت کە لەگەل
نامەکەی کاکە ووریا لە ١٩/١٠/٩٥٧ەوە نووسیبووتان زۆر سپاستان دەکەم
لە بەر ئەوە ئەوا جوابی هەردوو نامەکەتان پێکەوە دەدەم.

گیانەکەم گوێ بووتە کە بە کاکت گوتووە ئەگەر لە خزمەلانم کەسێ کاغەزی
نوسی بوابوەی بنێری وە ئیوەش بۆمی بنێرن زۆر باشە سپاستان دەکەم
بەلام هەر ئەوەندە هەیە خواهیشتان لێ دەکەم ئەگەر کەسێ نامەی
ناردە لای ئیوە پێشدا خۆتان بی خوێننەوە و بزانن نامەی چی یە
و چونی نووسیوە ئەگەر زانیتان ناردنی هەر لازم نی یە مەی نێرن
هەر بۆم بنووسن کە فلان کەسێ کاغەزی نووسیبوو بەلام نەمان نارد وە
ئەگەر لە پاش خوێندنەوەی زانیتان هیچ مانعی نیە ئەوە ئەوجا بۆم بنێرن.
ئیتر هیچی تازە نیە کە بۆتان بنووسم بەلام هەر ئەوەندە هەیە کە هەر
وەکو ئیوەش دەزانن وەضعی دونیا زۆر خۆش نیە تورکیا خەریکە بە
بە تحریکی استعماری امریکی ئاگری شەر هەلگات لە بەر ئەوە واجبی
هەموو کوردێکە بە هەر جۆری لە توانایدا هەیە بە قسە و بە عمل ضدی
استعمار و ظلمی تورکەکان مبارزەی خۆی بە شدەت تر بکات وە لەگەل
ملتەکانی ئازادی خواهی دونیا لە مبارزەی بەرضدی زۆری و ظلم شرکەت
بکا. ئیستا فرصەتێکی گەورەیە کە کورد بتوانن دەنگی خۆیان و داوای خۆیان
بە هەموو دونیا بگەیەنن. ئیتر خۆش تان گیانەکەم.

[signature]
براتان [illegible] ٢/١١/٩٥٧

مۆسکۆ
١٢/٢/٩٥٩

گیانەکەم کاکە عمر دزەیی!
رۆژ باش

لە پاش سڵاوێکی زۆر گەرم و ئەحواڵ پرسین هیوام وایە کە صحەتان زۆر باش و هەمیشە ساغ و سەلامەت و کەیف خۆش بن. نامەکەتان کە لە ٢٠/١/٩٥٩ نوسرابو پێم گەیشت زۆری پێ کەیف خۆش بوم.

١- نوسیبوتان کە گوایا پارتی شیوعیەکانی عیراق چەند بەیانێکی دەرکردووە زۆر باسی کوردی کردووە. ئێمە لێرە ئەمانمان نەدیوە. ئەگەر ممکن بێ وەرگیراوی لازم نەبێ بۆمی بنێرە سیاسەت دەکەم. سید احمد هەواڵی قانعی بو، لەگەڵ وی یەک پێشی بو، لە بەر ئەوەیش چاکی تامید ناکری.

٢- نوسیبوتان کە خزمەکانم وێنەیەکی منیان خواستووە بەلام ناوی ئەو خزمەی منتان نەنوسیبو کە خواستبوی. ئەوا وێنەیەکم بۆتان دەنێرم خواهشت دەکەم ناوی ئەو خزمەم بۆ بنوسی.

٣- هاوڕێی کە دەچنەوە وڵات سڵاوی منی بە هەمو هەواڵە پاشەکانی خۆمان بگەیێنن و ئەحواڵ وضعی وان چۆنە بۆمان بزانن لە پاشانا زەحمەت نەبێ بۆمان بنوسن. خزمەکانیشم کە داوای بزانن ضرورەمانی نیە ساغ و سەلامەتم پێ بڵێن و سڵاوی منی پێ بگەیێنن، بەلام کە سید عزیز کە ویستی کاغەزم بۆ بنوسی با تەسلیمی ئێوەی بکا، ئێوەش پێشدان بۆم بنوسن. من جوابتان دەدەمی کە بۆی بنێرن یان نە. سەرەوک و هەمو هەواڵەکانی کورد زۆر سڵاو لە ئێوە و کاکە وریا دەکەن و ئەحواڵتان دەپرسن. جیاتی منیش زۆر سڵاوم لە کاکە وریا بکەن و ئەحواڵی بپرسن و پێی بڵێن کە لە دەرەجەیێکی کاغەزێکم بۆی نوسیبو ئایا پێی گەیشتوە یان نا. ئیتر خۆشی و موفەقیەتی هەموتانم بە دڵە. گیانەکەم هەر خۆش و سەربەرز بن.

برایان سید عزیز
١٢/٢/٩٥٩

Lieber Omar

Ich wünsche Dir ein recht schönes
Weihnachtsfest und einen guten
„Rutsch" ins Neue Jahr." Hoffentlich
gehen alle Deine Wünsche in
Erfüllung.
Bitte entschuldige, daß ich Deine
Briefe nicht beantwortet habe, aber
ich war einige Zeit nicht in Wien.
Was macht die Schule? Macht
es Dir schon Spaß?
Was machst Du in den Schulferien?

Fährst Du weg oder bleibst Dr
in Wien? Ich fahre mit einer
Arbeitskollegin ein paar Tage
hoffentlich ist es schön.

Nun nochmals alles gute un
Liebe von

Erika

نامەیەکی ئێریکا هەر لە ڤیەنناوە

ئورزولا لەکاتی نمایشکردنی مۆدەی نوێ

Lieber Omer!
Ich war heute Donnerstag nachmittag
in Wien. Versuchte Dich zu erreichen,
warst aber nicht da, habe mit
Deinem Freund Malik gesprochen.
Vielleicht komme ich nächsten
Donnerstag nach Wien ich
schreibe Dir das noch genau
falls Du mir auf diese
Karte antwortest. Ich
würde mich sehr freuen
Herzliche Grüße an Deinen
Freund und besonders
an Dich
Ursula

ئۆریگیناڵە ئاڵمانییەکەی
نامەیەکی ئورزولا

ئورزولا خۆی وێنەی خۆی کردووە
بە قژی تەڕی خاولی تێ ئاڵاو

ئورزولا فیشەر - کۆلبری، لەدایکبووی 1938

هەندێ نامەی ئورزولا کە ساڵی 58 بۆی ناردووم و تا ئێستا هەڵمگرتوون

یەکێک لەو جگارانەی کە ئەوسا دەمکێشا ئورزولا ناوی خۆی و دڵێکیشی لەسەرا کێشاوە و ساڵی 58 بۆ ماڵاوایی بە پۆست بۆی ناردووم و تا ئێستا هەڵمگرتووە. ئەم سووتاندنی ناو و دڵە واتای زۆری پێوەیە

کارتاسکێکی کریستال کە ئورزولا ساڵی 58 بۆ ماڵئاوایی بۆی ناردبووم و لە رێگای پۆستا لنگێکی شکابوو و خۆم پێکم وەناوە و تا ئێستا هەڵمگرتووە

کەلاشووشەیەک کە ئورزولا ساڵی 58 بۆ چاو و زار بۆ ماڵئاوایی بۆی ناردووم و تا ئێستا هەڵمگرتووە

ئەم سوورە گوڵانە لەگەڵ وردە یادگارەکانی ئورزولا ساڵی 58 پێچاومنەتەوەو و تا ئێستا هەڵمگرتوون

usammen wohn
ürde das Zimm
lein sein. Es wir
ein, wenn ich nic
ien bin und D
nd wirst mich
edanken verges
Ursula

نامە ماڵئاواییەکەی ئورزولا کە لە جیاتی واژۆی ماچێکی بە لێوە سوورەکانی بە دامەنی کاغەزەکەوە ناوە

هەندێ پۆستکارتی ئورزولا کە ساڵی 58 بۆی ناردووم و تا ئێستا هەڵمگرتوون

لەچەپەوە : هێلگا شلاپشی ، پووری هێلگا، دایکی هێلگا و هۆمەر

هۆمەر و ئوتا و قاسم الگیلانی و خوشکی ئوتا

لەگەڵ هێرتا ڤورلێندەر

ئینگرید ڤاگنەر

# بەشی 14

## کودەتا سەربازییەکەی 14ی تەموزی 58 لە عیراق

کودەتـای چـواردەی تەمـووزی عێـراق جۆشـێکی دایـە بـەر ئێمـەی کوردەکانـی ئەوروپـا و جموجـۆڵ و چوسـت و چالاکیـی سیاسـیمان پـەرەی سـەند و بازنـەی پەیوەندیمـان لەگـەڵ ڕێکخـراوە خوێنـدکاری و سیاسـییە سۆسیالیسـتەکانا فرەوانتـر دەبـوو.

دوو ڕێکخـراوی قوتابییانـی جیهانـی نەیـاری یەکتـری هەبـوون کـە هـەر یەکـە هەوڵـی دەدا کۆمەڵـە و یەکیەتیـە قوتابییەکانـی میللەتانـی جیاجیـای دونیـا بـۆ خـۆی رابکێشـێت. یەکیەتیی قوتابیانـی نێونەتەوەیـی (اتحـاد الطلبـة العالمـي ئـاي يـو ئێـس IUS) کـە کورتکـراوەی ئەمەیـە International Union of Students و بارەگاکـەی لـە شـاری پـراگ (چیکۆسـلۆڤاکیای ئـەو سـەردەمە) بـوو و سـکرتێرە گشتییەکەشـی پەلیکان Pelikan ناوێکـی چێـک بـوو. ئەمەیـان سـەر بـە یەکیەتیـی سـۆڤییەت بـوو. ئـەوەی تریـان ڕێکخراوێکـی قوتابییانـی سـەر بـە ڕۆژئـاوا بـوو بـە نـاوی (کۆسـێک COSEC) کـە بارەگاکـەی ئەگـەر بەهەڵـەدا نەچووبـم لـە دانمـارک بـوو.

کۆمەڵـەی خوێندکارانـی کـورد لـە ئەوروپـا KSSE هـەر لەگـەڵ دامەزراندنـی لـە سـاڵی 1956هەوڵـی دەدا ببێ بـە ئەنـدام لـە IUS بـەڵام سـەبارەت بـە نارەزایـی (اتحـاد الطلبـة العراقـي) ئێمەیـان قەبـووڵ نەدەکـرد. کاک سـەعدی دزەیـی بـرام دەڵـێ لەپـاش کودەتـا خوێناوییەکـەی بەعسـییان سـاڵی 1963 و پەنابردنـی ژمارەیەکـی زۆر لـە کۆمونیسـتەکانی عێـراق بـۆ شۆڕشـی کـورد ئینجـا لـە کۆنفرانسـی 1964ی IUS لـە شـاری

سـۆفیا (بولگاریـا) کۆمەڵەکـەی ئێمەیـان بـە ئەنـدام وەرگـرت. کاک سـەعدی دەڵێ دەلەگاسیۆنی کۆمەڵەی خوێندکارانی کـورد لـە ئەورووپا بـۆ ئـەو کۆنفرانسـەی سـۆفیا بریتـی بـوو لـە سـەعدی دزەیـی، شـێرکۆی تاهیرەفەندیـی کۆیـی و روشـدی عەلـی شـەریف.

بێجگـە لـە IUS کۆمەڵـەی خوێندکارانـی کـورد لـە ئەورووپا هەوڵـی دەدا پەیوەندیـی دۆسـتانەی لەگـەڵ (کۆسێک)یشـا بگرێـت.

هەڵبـەت شۆڕشـی چـواردەی تەمـووز کاردانەوەیەکـی زۆر خراپـی هەبـوو لای وڵاتانـی رۆژئـاوا چونکـە بـە فیتـی جەمـال عبدالناسـر و مۆسـکۆیان دەزانـی. لـە ڤیەننـا مـن و کاک وریـا رەوانـدزی بارمـان گرانتـر بـوو و دەبوایـە هـەر هـەوڵ بدەیـن بـە میدیـای نەمسـاوی بسـەلمێنین کـە ئێمـەی کـوردی عێـراق نـە ناسـرین نـە کۆمونیسـتین بەڵکـو ناسیۆنالیسـتین و خەباتـی ئێمـە تەنیـا لـە پێنـاو دەوڵەتێکـی کـوردی سـەربەخۆی سـەر بـە رۆژئـاوا دەبـێ. بـەڵام لـە هەمـان کاتـدا پەیوەندیـی باشیشـمان لەگـەڵ پارتـی کۆمونیسـتی نەمسـاوی KPOe و پارتـی سۆسیالیسـتی نەمساویشـا SPOe زۆر بـاش بـوو و هەمـوو سـاڵێک بەشـداریمان لـە فێسـتڤاڵی سـاڵانەی رۆژنامـەی (ڤۆلکـس شـتیممە Volksstimme)ی ئۆرگانـی پارتـی کۆمونیسـتدا دەکـرد.

ئەوجـا بـا بگەڕێمـەوە بـۆ رووداوەکانـی عێـراق کـە کاریگەریـی راسـتەوخۆی لەسـەر ئێمـەی قوتابییانـی کـورد و عێراقـی لـە دەرەوەی وڵاتـا هەبـوو.

دڵخۆشـی و شـادی و هیـوای دواڕۆژێکـی رووناکتـر کـە شۆڕشـە ناموبارەکەکەی چـواردەی تەمـووزی 58 بـۆ گەلەکانی عیراقـی هێنابـوو، لـە 59وە بـەدوا ئیتـر بـوو بـە دڵسـاردبوونەوە و بەدبەختـی بـۆ توێژێکـی زۆری کۆمەڵگای عێراقـی هـەم لەنـاو سیاسـەتکاران هـەم لـە بـازاڕی کار و لەنـاو کارداران و هـەم لەنـاو چینـی رۆشـەنبیر و نووسـەر و شـاعیر و هونـەرکاران. راسـتە دەسـەڵاتی دەوڵـەت بەدەسـت ئەفسـەرە ئـازادەکان (مجلـس قیـادة الثـورة)ەوە بـوو بـەڵام لەسـەر شـەقام دەسـەڵات کەوتـە

دەست جاهیل و نەزان و منالە ورتکەی دێهات و شاران کە حزبی شیوعیی عێراقی لە پشتیانەوە بوو. ئێمە لە چلەکانا ئومێدێکی زۆرمان بە حزبی شیوعییەوە هەبوو، بەڵام کە دەستی رۆیشت سیاسەتێکی چەوتی ئەنجام ترسناکی وەهای پەیڕەو کرد کە زیانێکی گەورەی نەک هەر لە کۆمەڵگا و ئابووریی عێراق دا بەڵکوو تەنانەت لە وجودی خۆیشی. رۆژ نەبوو خۆنیشاندانی پڕ بە خیابانەکانەوە هەڕەشە و گوڕەشەی پەت لەملکردنی هەموو جۆرە ئۆپۆزیسیۆنێک نەکەن. وشەی " اقتل، اسحل" واتا ( بکوژە، پەتکی لە مل کە و بەدوای خۆتا رایکێشە) بوو بە دروشمی شۆڕش کە نوری سەعید و عەبدول ئیلاهیان بەو وەحشییەتە لەتوپەت کرد. خەڵکی عێراقیان کرد بەگژ یەکدا و نرخ و بەهای پێکەوەژیانی ئاشتییانەیان نەهێشت. حزبی شیوعی بۆ پاکانەکردن دەیگوت ئەمە (المد الثوري)یە واتا (تەوژمی شۆڕشگێڕی)یەکی جەماوەریی خەڵکە کە کاتییە و هەر خۆی خۆی دادەمرکێنێتەوە.

بنەماڵەی ئێمەش تەبای گەلێک لە بنەماڵەی کوردی وەک ئێمە سەرەڕای مێژوویەکی دوورودرێژی کوردپەروەری و چەپڕەویش، کە پێشتر باسم کردووە، ئەویش کەوتە بەر شاڵاوی کردەوەی ناحەزی جاهیل و نەزانان هەرچەندە کە بە هیچ شێوەیەک دژایەتیی شۆڕشەکەشیان نەدەکرد، بەڵکوو هەر تەنها لەبەرئەوەی کە بنەماڵەی ئاغا بوون. ئامانجی سەرەکیی چەپلەکوتان بە پلەی یەکەم هەر ئەوە بوو قسەی سووک بە ماڵە ئاغا و خاوەن موڵکەکان بڵێن و تا بکرایە ئەزیەتیان بدەن. وا فێر کرابوون "تۆڵە"ی خۆیان بکەنەوە. ئاخر تۆڵەی چی؟ لە کێ؟ ئایا تۆڵە لە سیستەمێکی فیئوداڵی کە بە سەدان ساڵ بوو خۆ نەک هەر لەناو کوردا بگرە لە تەواوی کۆمەڵگاکانی دونیادا باو بووە و بۆ رۆژگارانی خۆی ئاسایی بووە؟ ئەو نەزانانە وایان دەزانی کە هەر کورد ئاغا و دەرەبەگی هەبووە. ئەم بەرەڵلاییە سیاسییەی کە شۆڕشی چواردەی تەمووز لە عێراقا نایەوە توومەز

زووتـر شۆڕشــی بۆلشـێفیکی 1917ش لـە روسـیای قەیسـەری بەرپـای کردبـوو. ئەمـەم دوای چەندیـن سـاڵ لـە رۆمانـی (دکتـۆر ژیڤاگـۆ)دا خوێنـدەوە کـە نووسـەری رووس بۆریـس پاسـتەرناک خەلاتـی نۆبلـی پـێ وەرگـرت. وەک فیلمـی سـینەماییش جارەهـای جـار دەچوومـە بینینـی. جـا کـە لـە فیلمەکـەدا رووداوەکانـی شۆڕشـی بۆلشـێفیکم لەگـەڵ ئـەو رووداوانـەی شۆڕشـی چـواردەی تەمـووزی عێراقـا بـەراورد دەکـرد کتومـت کۆپـی و ئۆریگینـاڵ بـوون. کاک موحسـین دزەیـی براشـم شـتێکی لـەم بابەتـەی بـۆ گێڕاینـەوە کـە لـەم چەنـد سـاڵانەی دواییـدا جارێکیـان کاک عەزیـز محەمـەدی سـکرتێری یەکەمـی پێشـووی حزبـی شـیوعیی عێراقـی (یـادی بەخێـر) پێـی دەڵـێ: "کاک موحسـین، هەنـدێ کەسـی ئـەم دەشـتی هەولێـرە دێنـە لام و پێـم دەڵێـن کاک عەزیـز ئەتـۆ لای ئێمـە زۆر گەورەیـت بـەڵام یـەک عەیبـت هەیـە هاتوچـۆی ئاغـاکان دەکەیـت." جـا کاک عەزیـز بـە کاک موحسـین دەڵـێ بەداخـەوە ئەمانـە ئێسـتاش هـەر لـە سـاڵەکانی پەنجاوهەشـت و پەنجاونـۆ دا دەژیـن.

هـەر ئـەم بەرەڵلاییـەی کـە شۆڕشـی چـواردەی تەمـووز بەرپـای کـرد نامەکـەی ئـورزولای خسـتمەوە بیـر کـە سـاڵێک زووتـر لەبـارەی کودەتاکـەی چـواردەی تەمـووز بـۆی نووسـیبووم و گوتبـووی: "... هیـوادارم تێـم بگەیـت و بشـزانە کـە بەڕاسـتی دڵـم بـەوە خۆشـە کـە شـت بەدڵـی تـۆ و برادەرەکانـت بـووە و هیـوادارم هـەر بەدڵـی ئێـوە بمێنێتـەوە." ئـای کـە چاکـی بـۆ چووبـوو ئـەو کچـە تەمـەن بیسـت ساڵیـە کـە دەڵـێ "... هیـوارارم هـەر بەدڵـی ئێـوە بمێنێتـەوە" کـە نەمایـەوە.

بـاری ئابـووری لـە تـەواوی عێراقـدا شـڵەژا چونکـە (المـد الثـوري) رێگـای نـەدەدا خـاوەن زەوییـە گەورەکانـی جـاران کـە پێشـان گەنـم و جـۆ و مەڕومالاتیـان بـۆ فرۆشـتن هەنـاردەی ولاتـە دراوسـێکانی عێراقیـش دەکـرد بـەردەوام بـن لـە کارەکانیـان و نەیاندەهێشـت بازرگانـە گەورەکانی جـاران بازرگانیـی خۆیـان لـە بازاڕێکـی ئـازادا بکـەن. دواتـر (قانـون الاصـلاح الزراعي)یشـی هاتـە سـەر و ویسـتیان کۆپیـی کۆلخۆزەکانـی

(هەرەوەز) یەکیەتیی سۆڤییەت بکەن و (الجمعیات التعاونیة الفلاحیة)یان دامەزراند کە شکستێکی کارەسات ئاوەر بوو بۆ کەرتی کشتوکاڵ و بۆ ئابووریی نەتەوەیی لە تەواوی عێراقا. نە خاوەن زەوییە گەورەکانی جاران کە زەوییەکی زۆریان لێ سەندرا ئەو توانایی و ئەو زەوقەی جارانیان ما بەردەوام بن لە بواری خۆیاندا، نە جووتیارە تازە بووە خاوەن شەست دۆنمەکانیش توانییان بەم چەند دۆنمە کەمە بەردێک بخەنە سەر دیواری بینای ئابووریی نیشتمانی. داهاتی تاکسی ئاژۆتن و کرێکاریکردنی ناو شاران جووتیارەکانی چاکتر دەژیاند. هەر ئەوەش بووە یەکەم هۆی کۆچبارکردن لە دێ بۆ شار و گەورەبوونی بێ پلانی شارەکان و ئەو هەموو دیاردە کۆمەڵایەتییە نەرێتییانەش کە لەگەڵ خۆیدا هێنای.

## کۆنگرەی 4ی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا

دوای کۆنگرە دووەمەکەی کە لەگەڵ دەسپێکی ساڵی 58 لە لەندەن گیرا و خۆم لەوێ بووم، کۆنگرەی سێیەمیش هەر لەپاش بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووزی 58 لە شاری میونیخ لە ئاڵمانیا گیرا. من لەبەر هەندێ هۆی کەسەکیی خۆم نەمتوانی بەشداریی تیا بکەم. پێم وایە هەر لەوێش بڕیار درابوو کە کۆنگرەی ساڵانەی چوارەم لە هاوینی 1959 لە ڤیەننا ببەسترێت. ڤیەننا لەبەر ئەوەش هەڵبژێردرا چونکە لە هاوینی ئەوساڵە حەوتەم فێستڤاڵی لاوان و قوتابییانی جیهانیش لەوێ دەگیرا. ئیتر بڕیارەکە وابوو کە دوو چۆلەکە بە بەردێک بگرین. لەلایەکەوە ڕەنگە ژمارەیەک خوێندکار و لاوانی کورد لە دەرەوە و لە کوردستانیشەوە وەک کە دوو ساڵ پێشتر بەشدارییان لە فێستڤاڵەکەی مۆسکۆدا کردبوو ئەمجارەش بێن بۆ ڤیەننا و بەشداریی هەم لە فێستڤاڵەکە و هەم لە کۆنگرەکەی

خۆمانیشدا بکەن. لەلایەکی تریشەوە بیستبوومان کە کوردێکی زۆری عیراقی لەگەڵ دەلەگاسیۆنی عیراق دێن بۆ فێستڤاڵەکە و ئیتر لە ڤیەننا چاومان پێک دەکەوێت دواترین دەنگوباسی راستەقینەی بارودۆخی کورد لە عیراقی کۆماری لەوانەوە دەزانین چونکە هەمیشە هەواڵی خۆش و ناخۆشیشمان لەبارەی حاڵی کوردەوە بۆ دەهات کە بەڕاستی سەری لێ شێواندبووین. پەیوەندیی نێوان جەنراڵ عەبدولکەریم قاسم و کورد، نێوان ئەو و شیوعییەکان و نێوان کورد و شیوعییەکان ئاڵۆز بوو و نەماندەزانی هەڵوێستی راستەقینەی ئەو سێ کوچکە بنچینەییەی عێراقی نوێ بەرامبەر یەکتری چییە و چۆنە.

پێم وایە پاش چواردەی تەمووزی 58 بوو کە خوێندکارێکی کوردی نوێمان بۆ هات بۆ ڤیەننا، سەرداری رەمزی فەتاح. سەردار کە ئامۆزای مامۆستا برایم ئەحمەد بوو بۆ من فەرامۆشییەک بوو چونکە پێشتر وەک کورد هەر من و وریا رەواندزی لەو شارە بووین و وریاش بەپێچەوانەی من ئەوەندە جددی و سەرقاڵی خوێندن بوو کە تەنها جاروبار کاتی چوونە دەرەوەی لەگەڵ مندا دەبوو بۆیە هەڵسان و دانیشتنی من جگە لە کیژۆڵە خرپنەکانی ڤیەننا زیاتر لەگەڵ خوێندکارە عەرەبە عیراقییە چەپڕەوەکانا بوو. سەردار وەک خۆم هەم هونەرمەند بوو (ڤیۆلین ژەن) هەم وەک خۆیشم حەزی لە رابواردن و مەی بوو کەواتا هەر سێ میمەکەی منی بەسەرا پیادە دەکرا (م م م = مەی، مێ، موزیک).

من پێشتر سەردارم نەدەناسی بەلام لە ڤیەننا بووین بە برادەری زۆر نزیکی یەکتری و چێژێکی زۆرم لە قسە خۆشەکانی وەردەگرت، هەزار جار یادی بەخێر. دوای سەردار بە ماوەیەکی کورت ئیتر کیسرای ئەدیب ئەفەندی کۆنە برادەری قوتابخانەی کەرکووکم و سەباحی نوری بەگی بابان و رەئوف ئەحمەد فەتاحی برای مامۆستا برایم ئەحمەد و وریای ئەحمەدی قازی ئەوانیش بۆ خوێندن هاتن بۆ ڤیەننا ئیتر کۆمەڵگا کوردییەکەمان لە ڤیەننا و ئەندامانی کۆمەڵەی خوێندکارانمان وردە وردە لە گەورەبووندا بوو. دواتر کیسرا و رەئوف

چوون بۆ ئاڵمانیا و خوێندنی خۆیان لەوێ تەواو کرد. بەڵام پێش هاتنی ئەمانەش کاک وریا رەواندزی پێی دەگوتم کە کوردێکی تریش لە سویسراوە هاتووەتە ڤیەننا کە بەتەمەن لە ئێمە زۆر گەورەتر بوو و زۆر کەم دەردەکەوت. ئەو برادەرە، یادی بەخێر، کاک عەبدوڵا عەبدولڕەحمان قادری خەڵکی هەڵەبجە بوو کە لە ساڵی 1939بە بورسی حکوومەتی عیراق نێردرابووە نەمسا بۆ خوێندن. بەڵام ئەوەندەی پێ نەچووبوو لە ڤیەننا کە دووەم جەنگی جیهان دەستی پێ کردبوو و حکوومەتی عێراقیش ئەویان گواستبۆوە بۆ سویسرا. جا وریا رەواندزی دەیگوت کە کاک عەبدوڵا دوای ئەو هەموو ساڵە ئێستا وا گەڕاوەتەوە بۆ ڤیەننا و ناوەناوە کۆڕێک لەسەر کورد بۆ رێکخراوێکی نەمساوی دەبەستێ. لەگەڵ ئەویشا بووین بە برادەر و مرۆڤێکی زیرەکی زۆر بەڕێز بوو و لە خێڵی نەورۆڵی بوو. کاک عەبدوڵا ماوەیەک لە ڤیەننا مایەوە تا کارێکی لە شاری میونیخ لە ئاڵمانیا دەست کەوت و باری کرد بۆ ئەوێ.

جا ئێمە ئەو چەند کوردەی ڤیەننا دەبوایە خۆمان بۆ دوو بۆنەی گەورە ئامادە بکەین کە لە هاوینی 59 لە ڤیەننا رووی دەدا، کۆنگرەی چوارەمی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا KSSE و فێستڤاڵی لاوان و قوتابیانی جیهانیش. بۆ کۆنگرەکەی خۆمان من و برادەرانی ڤیەننا پەیوەندیمان بە رێکخراوانی خوێندکارانی نەمساوی و بیانییەکانەوە کرد و جێگای نووستنمان بۆ نزیکەی چل کەسێک لە خەوخانەکانی قوتابییان و هۆڵی کۆبوونەوەشمان هەر لای ئەوانا دابین کرد. پۆستەرێکی زۆری بە دروشمەکانی کۆنگرەشمان ئامادە کرد و لە دیوارەکانی هۆڵەکەمان دان. هەموو شتێک ئامادە کرا بۆ کۆنگرەی چوارەم و منیش کە سەرۆکی لکی نەمسا بووم راپۆرتی چالاکی و دارایی ساڵانەی لکەکەمانم ئامادە کرد چونکە لە کۆنگرەکاندا هەر سەرەک لکێک دەبوایە راپۆرتی ساڵانەی چالاکی لکەکەی پێشکەش بە کۆنگرە بکات و لێدوانی لەسەرا دەکرا.

لـە کاتـی بەسـتنی کۆنگـرە کـە وابزانـم 7/25 دەسـتی پـێ کـرد و فێسـتڤاڵەکەش رۆژێـک پاشـتر دیسـان ململانێـی سیاسـی لەنێـوان کـوردە ناسیۆنالیسـتەکان و کـوردە کۆمونیسـتەکانا هەڵگیرسـایەوە. راسـتییەکەی ئەمجارەیـان زۆر تونـد و تیرتـر بـوو تـا لـە سـاڵەکانی پێشـوو چونکـە رەنگدانـەوەی بـاری سیاسـی ناوخـۆی کوردسـتانی عێـراق بـوو کـە پارتـی و شـیوعی لێـک هاتبوونـە کلـکان. نوێنـەری (اتحـاد الطلبـة العراقـي) بـۆ کۆنگرەکەمـان وابزانـم (مهـدي الحافـظ) بـوو. لێرەشـدا هێرشـێکی زۆر کرایـە سـەر ئـەم و سـەر ئیتیحادەکـەی کـە بووبوونـە رێگـر لەپێـش بوونـە ئەندامـی کۆمەڵەکەمـان لـە یەکیەتیـی قوتابیانـی جیهانـی IUS سـەر بـە یەکیەتیـی سـۆڤیەت کـە پێشـتر باسـم کـرد.

لـە هەڵبژاردنـی کۆمیتەی بەڕێوەبەری گشـتی دیسـان عیسـمەت شـەریف بـە سـەرۆک هەڵبژێردرایـەوە و پێـم وایـە ئەندامەکانـی پێشـووش زۆریـان مانـەوە. بـۆ یەکـەم جاریـش جەنابـی میـر کامـەران بەدرخـان وەک میـوان لـە پاریسـەوە هاتبـوو بـۆ کۆنگرەکەمـان و خاتـوو (دریـة عونـي) کـە ئەویـش هـەر لـە پاریـس دەژییـا لەگەڵیـا هاتبـوو. کەسـایەتیی نـاوداری کـورد لـە بـواری کاردارییـا مـام رەشـید عـارف کۆیـی ئەویـش وەک پیشـەی هەمـوو هاوینانـی هـەر لـە ڤیەننـا بـوو و بانگهێشـتی میـر کامـەران و هەنـدێ لـە قوتابییەکانـی بـۆ ئێـوارە دەکـرد و یارمەتیـی دارایـی بەسـتنی کۆنگرەکەشـی دەدا. لـە بەشـەکانی پێشـووی ئـەم بیرەوەریانـەم بـە درێـژی باسـی کەسـایەتییە قسـە خۆشـەکەی مـام رەشـید عارفـم کـردووە.

دڵمـان زۆر خـۆش بـوو کـە کوردێکـی زۆر لـە عێراقـەوە لەنـاو دەلەگاسـیۆنی عیراقیـدا بـۆ فێسـتڤاڵی حەوتەمـی لاوان و قوتابییانـی جیهـان هاتبـوون بـۆ ڤیەننـا. لەوانـەی کـە لەبیـرم مابـن ئەمانـە بـوون: حەمەسـاڵح دیـلان، حەمـەی بەکـر،، سـاحیبەی نـوری بەگـی بابـان، ئەنجـوم زوهـدی و پێـم وایـە ئەنـوەر تۆفـی. مـن بـە تایبەتـی دڵـم بـە ناسـینی دوو هونەرمەندی گـەورەی وەک دیـلان و حەمـەی بەکـر زۆر خـۆش بـوو. شـەوێکیان ئێـوارە موزیـک و دانسـێکی خۆشـمان بـۆ ئـەو کـوردە میوانانـە رێـک

خست کە خۆم گۆرانیم تیا دەگوت و سەرداری رەمزی فەتاحیش کەمانی بۆ لێ دەدام. ئەوەی کە لە فێستڤاڵەکەش لەبیری ناکەم کۆنسێرتێکی هەوای کراوە بوو لەلایەن گۆرانیبێژی ناوداری ئافرۆ-ئەمریکی پۆل رۆبسن Paul Robeson لە مەیدانی (هێلدن پلاتس Helden Platz) کە بە هەزاران کەس بەپێوە گوێمان لێ راگرتبوو.

کۆنگرەی چوارەم لە ڤیەننا وەرچەرخانێک بوو لە مێژووی کۆمەڵەکەماندا، چونکە بەشدارییەکی بۆ ئەو زەمانە بێ وێنەی خوێندکارانی کورد و کەسایەتیی ناوداری کوردی تێدا کرا و نامە و تەلەگرافێکی زۆری هیوای سەرکەوتن و پشتگیریشمان لە کوردستان و دەرەوەی کوردستانیشەوە بۆ هات و ژمارەیەکی زۆریش لە کۆمەڵە و رێکخراوانی خوێندکاریی نێونەتەوەییش بە میوانی هاتبوون یان نامەی پیرۆزباییان ناردبوو. رۆژنامەکانی نەمساش بە تێروتەسەلی لەسەریان نووسی. ئەمە هەمووی نوێ بوو لەچاو کۆنگرەکانی پێشوو. بۆ خودی خۆیشم فەرامۆشییەکی باش بوو چونکە ژمارەیەک لە خزم و برا و برادەرانم هاتبوون بۆ ڤیەننا و چەند رۆژێکی زۆر خۆشمان پێکەوە بەسەر برد لە ناویانا: کاک سەعدیی برام و تەحسین هەورامی برادەرم و سدقی دزەیی ئامۆزام لە ئینگلتەرەوە، دارا ئەدیبی برادەری دێرینم و ئامۆزاکانی تریشم برایم دزەیی، عەلی دزەیی، عەزیز دزەیی، عزەدین دزەیی ئەوانەش هەموویان لە ئاڵمانیاوە هاتبوون.

کۆنگرەکەی ئێمە و فێستڤاڵەکەی لاوان و قوتابییانی جیهانیی سەر بە سۆڤییەت لە ڤیەننا هەردووکیان تەواو بوون و میوانەکان گەڕانەوە بۆ وڵاتانی خۆیان.

هەر ئەو ساڵەش کە پێم وایە دوای فێستڤاڵەکە بوو دەلەگاسیۆنێکی رێکخراوی ئاشتیی عێراقی بە رێگای ڤیەنناوە دەچوو بۆ مۆسکۆ و لە ڤیەننا دووسێ رۆژ مایەوە. دەلەگاسیۆنەکە کە وابزانم بە سەرۆکایەتیی عەزیز شریف بوو ئەم کوردانەشیان لەگەڵا بوو: عەبدوڵا گۆران، شێخ لەتیفی شێخ مەحمودی حەفید، مەلا جەمیل رۆژبەیانی، لوقمانی

مەلا مستەفای بارزانی و مەهدی حەمید کە ئەمەیان ئەفسەرێکی کورد بوو لە سوپای عێراق و دواتر کە بەعسییەکان هاتنە سەر دەسەڵات ئیعدامیان کرد. دیار بوو لە بەغدا مام جەلال ئەدرەس و تەلەفۆنی منی دابوونێ کە ئەو چەند رۆژەی ڤیەننا لەگەڵیانا بم و بیانگێڕم. هەر واش بوو و هەموو شوێنە مێژوویی و کولتوورییە ناودارەکانی شارم پیشان دان. ئەوەی سەرنجی رادەکێشام لەو توورانەی کە پێم دەکردن و بۆشم روون دەکردنەوە تەنها گۆران بە بایەخی تایبەتەوە حەزی دەکرد زیاتر لەو شوێنانە بمێنێنەوە و بە سەرنجی ورد و قووڵەوە لە بنمیچ و ستوون و دیواری ئەو بینا مێژووییانە رادەما و پرسیاری لە من دەکرد. جاروباریش سەرنجنامەیەکی چکۆلانەی لە باخەڵی دەردەهێنا و هەندێ تێ بینیی لێ یادداشت دەکرد.

## دیسان پایز داهات ، دیسان کەوتمەوە بن باری خەمان

لە ساڵی 59 وە، ساڵێک دوای شۆڕشی چواردەی تەمووز، دژایەتیکردنی رژێمی جەنەراڵ قاسم هەم لەناوەوەی عێراق و هەم لەلایەن وڵاتە عەرەبییەکان و رۆژئاواشەوە هەر لە زیابووندا بوو. جەمال عەبدولناسری میسر تەواوی دامودەزگای میدیاکانی خۆی تەرخان کردبوو، عەرەبە ناسیۆنالیستەکانی عێراق هان بدەن رژێمی "قاسم العراق" وەرگەڕێنن و عێراق رەگەڵ (الجمهوریة العربیة المتحدة)کەی ناسر بدەن کە لە میسر و سووریا و یەمەنەوە پێک هێنرابوو. بە پشتیوانیی یەکیەتیی سۆڤیەت قاسم خۆی و شیوعیەکانی عێراقیش ئەمەیان رەت دەکردەوە. کوردی عێراق - لەسەرەوە - لاریان پیشان نەدەدا عێراق رەگەڵ وحدەی عەرەبی بکەوێت بە مەرجێک ئەگەر پێناسین بە جۆرێک لە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان لەناو ئەو دەوڵەتە تازەیەی بۆ بکرێت. ئەمەریکا و ئەورووپا دژی قاسم

بـوون چونکـە دەیانگـوت کەوتووەتـە بـەر کاریگەریـی حزبـی شـیوعی و یەکیەتیـی سـۆڤیەت. پارتـی دیموکراتـی کوردسـتان هەرچەنـدە کـە گلەیی لـە هەنـدێ هەڵوێستی حزبـی شـیوعی هەبوو بەرامبەر بـە پرسـی نەتەوایەتیـی کـورد، بـەڵام پشـتگیریی لـە قاسـم دەکـرد. لـە ئیشـوکار دەرهێنانـی رۆژانـەی کارمەنـد و کرێـکار و جووتیارەکانـی عیـراق و لـە خوێندنکردنـی قوتابیـی ورد و درشـت کـە دەیانبردنـە سـەر شـەقامەکان بـۆ چەپڵەکوتـان و هاتوهـاواری هەرزەکارانـەی بـێ سـوود و سـەمەرە بـۆ پشـتگیری لـە رژێـم، ئەمانـە هەمـووی بەسـەر یەکـەوە کارێکـی نێگاتیڤـی زۆر خراپـی دەکـردە سـەر ئابـووری و پـەروەردەی وڵات و بنکۆڵـی سـتوونە بنچینەییەکانیانـی دەکـرد.

سروشـتانە، ئـەم بـارە نالەبـارەی ناوخـۆی عیـراق کاری دەکـردە سـەر بـاری دارایـی ئـەو عێراقیانـەی کـە لـە دەرەوەی وڵات دەیانخوێنـد و پارەیـان لـە کەسـوکاریانەوە بـۆ دەهـات. یەکێـک لەمانـە خـۆم بـووم.

لـە ماڵـی ئێمـە لـە دەشـتی هەولێـر کاک ئەحمـەدی براگەورەمـان و کاک موحسـینی لـەو بچووکتـر پێکـەوە سەرپەرشـتیی موڵـک و ماڵـی ئێمـەی براکانیـان و دایـک و خوشـکمانیان دەکـرد، ئـەو موڵـک و سـامانەی کـە بـە یەکسـانی لـە باوکـی کۆچکردوومـان بۆمـان مابـۆوە. لـەو پایـزەوە بـەدوا پـارەم زۆر درەنـگ بـۆ دەهـات بـۆ ڤیەننـا. چەندیـن نامـەم بـۆ دەنووسـین کـە مـن لـە وڵاتێکـی بێگانـە بـێ پـارە و پـوول نەتوانـم کرێـی ژوورەکـەم بدەم ئاخـر وەک هۆملێـس (homeless بێمـاڵ) دەکەومـە سـەر جـادە. وەرامـی براکانـم تـا رادەیـەک لۆژیـک و مەعقـوول بـوو، هەرچەنـدە کـە ئەوسـا وام نـەدەدی بـەڵام ئێسـتا، ئاخـر ئێسـتا هەشـتا سـاڵ تەمـەن فێـری کـردووم نـەک هـەر بەبـێ دوودڵـی بەڵکـوو بـە دڵخۆشیشـەوە دان بـە هەڵەکانـی ژیانمـدا بنێـم و بڵێـم کـە ئـەوان راسـت بـوون و گوناهەکـە زیاتـر لـە خۆمـەوە بـووە. ئـەوان دەیاننووسـی بـاری داراییـان زۆر تێکچـووە و کـە تـۆش ناخوێنیـت و هـەر بـۆ کەیـف و سـەفا پاڵـت داوەتـەوە ئێمـە چیتر لـە توانامانـدا نابێـت

پارمەتیت بۆ بنێرین، وەرە بگەڕێوە بۆ کوردستان و حاڵت حاڵی ئێمە. دەیانگوت ئەگەر بەڕاستی بخوێنیت ئەوسا هەرچۆنێکی بێ پارمەتیت دەدەین تا خوێندنەکەت تەواو دەکەیت بەڵام بۆ رابواردنت ئەوەمان پێ ناکرێ. دەیانگوت خۆ سەعدیی براشمان وا لە ئینگلتەرایە و ئەو زۆر رشتە لەسەر خوێندنەکەی بۆیە بە قەردوفەردیش بێ پارمەتیمان بۆ دابین کردووە تا خوێندنەکەی تەواو دەکات. قسەکانیان زۆر لە جێی خۆی بوو. بەڵام یەک شت هەیە کە بەداخەوە خەڵک بە هەندی وەرناگرن. براکانم ئاگایان لە باری زگماکە -سروشتی من نەبووە inborn mental makeup. ئەمن بەڕاستی هەر لە منداڵییەوە جیاواز بوومە. کاک سەعدیی برام ئێستاش هەمیشە بەبیرم دێنێتەوە کە بە منداڵی یاریم لەگەڵیانا دەکرد لە پڕێکا لێیان بێزار دەبووم و خۆم لە گرووپەکەی ئەوان دادەبڕی و دەچووم لە لایەکا بە تاکی تەنیا بۆخۆم هەر لەگەڵ خۆما یاریم دەکرد. ئەوان هەوڵیان دەدا بمگەڕێننەوە بۆ ناویان کەچی من هەوڵم دەدا نەک هەر بۆ گەمان لێیان دوور بکەومەوە بەڵکوو بە شێوەزاری سلەیمانیش وەرامیان بدەمەوە کە پیشانیان بدەم ئیتر من لەگەڵ ئێوە ناگونجێم و بە شرە سلەیمانییەکی ئەوسام پێم دەگوتن: " نا، من گەمان ئەکەم بە تەن... تەنها ". ئەمن وەکو براکانی دیکەم نەبووم. بەڵام ئاخر کەی لە کۆمەڵگای ئێمەدا سروشت و رەوشت و پێکهاتەی زگماک inborn mental makeup لەلایەن باوان و براگەورەکانەوە لەبەرچاو گیراوە؟ هەقیشیان بووە لەبەرچاوی نەگرن چونکە لە کولتووری ئەواندا شتی وا نەبووە.

چارم ناچار بڕیارم دا بار بکەم بۆ میونیخ. هەندێ خوێندکاری عێراقیی تریش ئەوانیش سەبارەت بە بارودۆخی ناو عێراق پارەیان لێ بڕابوو و بەدوای کارێکدا روویان دەکردە ئاڵمانیا چونکە هەلی کارکردن بۆ بێگانە لە نەمسا زۆر کەمتر بوو تا لە ئاڵمانیا و ئەوانەی گەیشتبوونە ئەوێ دیار بوو کاریان دەست کەوتبوو و ئەمەیان بۆ

برادەرەکانی خۆیان لە نەمسا دەنووسی. ئەوە بوو کە منیش ناچار بڕیارم دا بار بکەم بۆ شاری میونیخ و لەوێ کارێک بۆخۆم بدۆزمەوە. میونیخ ژمارەیەک خزمی خۆمی لێ بوو: مەحمود کانەبی دزەیی، برایم دزەیی، عەلی سمایل دزەیی و عەزیز حوسێن دزەیی بێجگە لە برادەرێکی دێرینی سەردەمی خوێندنی ناوەندیم لە کەرکووک، ئەرجومەند سدیق کە ئەو لەگەڵ حەمەجەلال ساڵح دواتر گەیشتنە میونیخ.

بۆ ئەوەی باری سەفەرم بە ترێن بۆ میونیخ سووک بکەم و بڕێ پارەی بەسیشم پێ بێ هەندێ شرووپڕی بارگرانیم برد بۆ دۆرۆتیۆم Dorotheum و رەهنم کردن. دۆرۆتیۆم دامەزراوەیەکی دارایی زۆر ناوداری نەمسایە بۆ رەهونات و کڕین و فرۆتنی هەموو جۆرە کاڵا و کەلوپەلێکی کۆنە و نوێ. زۆرێک لە خوێندکارانی بیانی ئەگەر پارەیان لە وڵاتی خۆیان درەنگ بۆ بهاتایە دەچوونە ئەوێ سەعات بوا، کامیرا بوا، ئەنگوستیلە و قەوان و کتێب بوا و بگرە دەیانتوانی جلوبەرگ و پێڵاویشیان لەوێ بۆ چەند مانگێک بە رەهن دابنێن و لە بەرامبەر ئەوە بڕێک پارەی زۆر کەمتر لە بەهای شتەکەی خۆیانیان پێ دەدرا. کە پارەت دەبوو ئیتر دەچووی دەتدانەوە و شتەکەی خۆت وەردەگرتەوە. ئەگەر مۆڵەتەکەشی بەسەر چووبا و هیچ سۆراخێکیش لە خاوەن شتەکەوە نەبووا ئەوسا نامەیان بۆ دەناردیت کە ئەگەر نەچیت ئەوان شتەکەت بە مەزادکردن دەفرۆشن. ئەمە زۆر باوە لە نەمسا و ئێستاش ئەگەر حەزت لە مەزادخانە بێت شتی زۆر هەرزانت دەست دەکەوێت. ئەو شتانەی کە من بۆ سەفەرەکەی میونیخم رەهنم کردن کەمانێک و گیتارێک و قەوانژەنێک (ریکۆرد پلەیەر record player) و ژمارەیەک قەوانی ڤیری کە لە کاتی خۆی لە مۆسکۆ بە دیاری پێشکەشیان کردبووم ئەوانە بوون. ئەمانەم هەموو بە نابەدڵی و گەرووی پڕ لە گریانەوە رەهن کرد و هەرگیزیش چاوم پێیان نەکەوتەوە. هەندێ کتێب و وردەواڵەی دیکەشم هەبوو ئەوەشم

لای سەرداری ڕەمزی فەتاحی بڕادەرم لە ڤیەننا بەجێ هێشت بۆم هەڵگرێ، بەڵام ئەوەشم نەدییەوە چونکە سەرداریش کە باری دارایی تێک چووبوو ئەویش بە نامە بۆی نووسیم کە بە نیازە شتەکانی خۆی و ئەوانەی منیش هەمووی ڕەهن بکات. هەر واشی لێ هات و ئیتر نە ئەو نە منیش شتەکانمان پێ دەرنەهات و ئاوە و ئاو چوون.

بەرلەوەی بار بکەم بۆ میونیخ با باسی چەند چیرۆکێکی سەیری ئەو ماڵانە بکەم کە لە ڤیەننا لێیان دەژییام.

ئەمن لەو ماوەیەی کە لێی لە ڤیەننا بووم (مایسی 1957 تا ئەیلوولی 1959) چوار جار ماڵم لە گەڕەکە جیاجیاکانی شاردا گواستەوە. ئەگەر خوێنەری بەڕێز سەیرێکی وێنەکان بکات ئەوە ئەو ماڵانەن کە لەو ماوەیە لێیان دەژییام. هەڵبەت من کە دەڵێم ماڵ ئەوە مەبەستم تەنها ژوورێکە، ژوورێکی ڕاخراو کە قوتابی یان هەر کەسێکی ڕەبەن لای خێزانێک بە کرێی مانگانە دەیگرت (پێم وایە لە ئینگلتەرە بە هەفتانە بوو) و هەندێکیان مۆبیلیاتەکەی زۆر ڕێکوپێک و هەندێکیشیان یەکجار وا نەبوون. کرێیەکەش بەپێی گەڕەک و بەپێی جۆری مۆبیلیاتەکەی دەگۆڕا. دەبا هەندێ کورتەچیرۆکی پڕ لە سەیروسەمەرەی ژیانی هەندێ لەو ماڵانەتان بۆ بگێڕمەوە.

یەکەم ژوورم کە لە مانگی مایسی57 گەیشتمە ڤیەننا لە گەڕەکی چوارەم بوو لای ژنێکی ناو (فراو بێرگەر Frau Berger) کە بە تەنیا دەژیا. فراو بێرگەر ژنێکی لە تەمەنی نێوان پەنجا و شەست ساڵیا بوو، ناشیرین بوو و چەند تەڵەمووی سپیشی بەلا چەناگەیەکییەوە دەبریسکایەوە. ژووری خۆی لە تەنیشت ژوورەکەی من بوو و وەک دەڵێن گوێمان لە ترووسری یەکتری دەبوو. فراو بێرگەر دۆستێکی هەبوو کە شەوانی ویکێند دەهات لای دەمایەوە و ئەو شەوە لەبەر جرەجر و زیکەزیکی تەختە شڕە کۆنەکەی و ئاخ و ئۆفی فراو بێرگەر لەژێر دۆستەکەی خەوم لێ هەڕ دەما. ناچار بڕیارم دا ماڵەکەم بگوازمەوە. بەڵام بریا هەر نەمگواستبایەوە چونکە تووشی خراپتریش

بووم. ئەوە بوو کە گواستمەوە بۆ گەڕەکی دووەم لای ژنێک (فراو سایدل Frau Seidl) کە بە رەچەڵەک پۆڵەندی بوو و لەگەڵ مێرد و کوڕێکی چواردە پانزدەساڵیان، یورگن (Juergen) دەژیان بەڵام چۆن ژیانێک: نیوەشەو نەبوو بە شەڕی ئەو ژن و مێردە بەئاگا نەیەم یان هەر خۆیان بەئاگایان دەهێنام بۆ ئەوەی لە پاشەڕۆژا لە دادگا بمکەن بە شایەت خەتای کامیان بووە. لە شەڕەکانیان تیتکیان بە سەری یەکترییەوە نەدەهێشت ئەوەندەیان بە سەروگوێلاکی یەکدیدا دەدا و بەرۆکی یەکتریان دادەپچڕاند. لەپاش ماوەیەک پیاوەکە، رەنگە بە بڕیاری دادگا یان پۆلیس، لە ماڵەکە گواستییەوە و ژنە و کوڕەکەی بە تەنیا لە ماڵەکە مانەوە. شەوێکیان درەنگ گەڕامەوە بۆ ماڵ کە ویستم کلیلەکەم بخەمە ناو کونی دەرگای دەرەوەی ئەپارتمانەکە کونەکە گیرابوو و پشتی پەنجەکانیشم بە لیتەیەکی پەیت کەوت کە بۆنێکی زۆر پیسی لێ دەهات. کە سەیری پەنجەکانی خۆم و سەیری کونی دەرگاکەم کرد دەرگا سەرتابەخوار بە پیسایی ئینسان سواخ دراوە و کونی کلیلیش داروچکەیەکی تێ پەستراوە و گیراوە. ناچار هەر بە دەستی گواوییەوە بەم نیوەشەوە خۆم گەیاندە ماڵی دۆستێکی فراو سایدل کە دەمزانی ئێواران لای ئەو دەبوو. باش بوو لەوێ بوو و دەستەکانم شت و سەر و سەربردەم بۆ گێڕایەوە. ئەویش تەلەفۆنی بۆ پۆلیس کرد و هاتن وێنەی دەرگاکەیان گرت و هەندێ پرسیاریان لە من کرد و رۆیشتن. من و فراو سایدل و یورگنی کوڕیشی ئاومان هێنا و دەبوایە بەم نیوەشەوە ئەو دەرگایە بشۆین و پاکی بکەینەوە، ئەمە جارێکیان. جارێکی کەش هەر لەناو ماڵ فراو سایدل بانگی کردم بچم ببینم، چی ببینم: چەند جلی جوانی و فەروەی کورکی گرانی کە هەیبوو هەمووی بە مقەست تیلمەتیلمە کراون و لەناو بانیۆی گەرماوەکە بەسەر یەکدا کەڵەکە کراون. لاحەولە وەلا ! سەت خۆزگەم بە ماڵەکەی پێشووی فراو بێرگەرم.

ناچـار پـاش ماوەیـەک لەوێشـم گواسـتەوە و ژوورێکـی خنجیلانـەم لـە سـەرەتای گەڕەکـی چـوارەم بـە کـرێ گـرت کـە هـەر لەتەنیشـت بـازاڕی شـەعبی بەناوبانگـی شـار (نـاش مارکـت Nasch Markt) بـوو. بالاخانەکـە نـوێ بـوو مـن لـە نهۆمـی یەکـەم دەژییـام و هونەرمەنـدی گۆرانیبێـژ و نوکتەچـی بەناوبانگـی نەمسـاش (پێتـەر ئەلێکسـاندەر Peter Alexander) ئەویـش لـە نهۆمـی چوارەمـدا دەژییـا. زۆر جـار کـە لەبـەر دەرگا یـان لەسـەر پلیکانەکانـا تووشـی یـەک دەبوویـن سـلاومان لـە یەکتـری دەکـرد. خـاوەن ماڵەکـەی مـن ژن و مێردێـک بـوون بـە نـاوی (پیرکـەر Pirker) و کـچ و کوڕێکـی شـەش حـەوت سـاڵانیان هەبـوو (دۆلۆرێـس Dolores و ڤێرنـەر Werner). پیاوەکـە کۆمونیسـت بـوو بۆیـە منـی زۆر خـۆش دەویسـت منیـش کـە زانیـم ئـەو کۆمونیسـتە پەیکەرێکـی گەچـی بچکۆلـەی لێنینـم کـە لـە کاتـی خۆیـا لـە مۆسـکۆ کڕیبـوو دەرم هێنـا و لەسـەر مێزەکـەی ژووری خۆمـا دامنـا. ژوورەکـەم بـە پێچەوانـەی ئەوانـەی پێشـووم زۆر بـە مۆبیلیـای مۆدێـرن ڕاخرابـوو هەچەنـدە کـە شـتێکی کەمیشـی تیـا بـوو بـەلام لـە هەمـووی خۆشـتر گەرمـاوی ماڵەکـە لـە ژوورەکـەی منـا بـوو و کـە مـن لەمـاڵ نەبـووام ئینجـا ئـەوان بەکاریـان دەهێنـا.

لێـرە کێشـەی مـن لەگـەڵ فـراو پیرکـەرا دوو جـۆر بـوو. یەکێکیـان ئـەوە بـوو کـە دەیگـوت هـەر کچێکـی دۆسـتی هەتبـێ لاریـم نییـە بـەڕۆژ ، بەشـەو بەسـەردان بێتـە لات بـەلام چـون مـن منالـی وردم هەیـە قەبـوول ناکـەم کـەس شـەو تـا بەیانـی لات بمێنێتـەوە. شـەوێکیان لەگـەڵ کچێـکا خەومـان لـێ کەوتبـوو و تـا بەیانـی بەئـاگا نەهاتبوویـن. کـە بەیانـی فـراو پیرکـەر کچەکـەی بینـی هـەزار قسـەی سـووکی پـێ گـوت بـە دەسـتیش ئیشـارەی بـۆ کـرد کـە هـەر ئێسـتا بچێتـە دەرەوە. لەگـەڵ منیشـا کـردی بـە شـەڕ و گوتـی تـۆش بـە زووتریـن کات شـوێنێکی کـە بـۆ خـۆت ئەدۆزیتـەوە. بـەلام بـاش بـوو دواتـر مێردەکـەی کـە منـی خـۆش دەویسـت ئاشـتی کردینـەوە. کێشـەی دووەمـم لەگـەڵ ژنەکـەی جگارەکێشـان بـوو.

دەیگوت نابێ لەم ماڵە جگارە بکێشیت. منیش دەمگوت من تەنها لەژوورەکەی خۆما دەیکێشم بەڵام دەیگوت ئاخر هەموو پەردە و قەنەفە و دیوارەکان بۆنی دووکەڵ دەگرن.

ئێ، لەوێش هەڵم نەکرد هەرچەندە کە خۆشترین ژووریشم بوو لە ڤیەننا.

ئەمجارە گواستمەوە بۆ شوێنێکی زۆر گونجاو کە هەر چەند سەت مەترێک لە زانکۆ (کە دەوامیشم نەدەکرد) و لە بورگ تیاتەری بەناوبانگی ڤیەننا و لە پارکی فۆلکسگارتن و دانس کلەبە خۆشەکەی دوور بوو (کە زیاتر لەوێ دەوامم دەکرد). ئەم لای ماڵەکەم راتهاوس Rathaus (= باڵاخانەی شارەوانی) و لایەکەی ترم باڵاخانەی پارلەمان بوو، دوو لە جوانترین بینای بە ئاکیتێکتووری سەدەی نۆزدەی شار. هەڵکەوتەی شوێنەکە گونجاوترین هەڵکەوتە بوو بۆ هەموو شوێنێکی شار هەرچەندە کە خودی ژوورەکەم وەک ئەوەی پێشووم خۆش نەبوو. تەختێکی نووستن و کاوچێک کە ئەویش بۆ نووستن دەستی دەدا لەگەڵ کانتۆر و کورسی و مێزێکی نووسینی لێ بوو و چەند تابلۆیەکی جوانی سەردەمانی کۆنیش بە دیوارەکانا هەڵواسرابوون. خاوەن ماڵەکەم پیرێژنێک بوو (فراو ئاشاوەر Frau Aschauer) کە بە تەنیا دەژیا و ژوورەکەی لەولای ئەوەی منا بوو. کافێیەکی کلاسیکی سەردەمی کایزەر فرانس یۆزێف (کافێ سلوکا Cafe Sluka) دیواری بە دیواری باڵاخانەی ماڵەکەی ئێمەوە بوو و بۆ من جێ ژوانێکی زۆر گونجاو بوو.

یەکێک لە برادەرە نزیک و خۆشەویستەکانم (مالک سید حمید الیاسري) بوو کە لە بنەماڵەیەکی خانەدانی ناوچەی قەزای المشخاب بوو لە پارێزگای دیوانیة و لە ڤیەننا بووین بە برادەر. باپیری مالک (سید علوان الیاسري) یەکێک بووە لە ڕێبەرانی (ثورة العشرین) لە عیراق.

جارێکیان مالک ئەویش ماڵی دەگواستەوە بەڵام هێشتا شوێنێکی

بەدڵی خۆی دەست نەكەوتبوو گوتی تۆ كاوچێكی زیادت هەیە بۆ نووستن دێم بۆ ماوەیەكی كورت لای تۆ دەمێنمەوە تا ژوورێكی باشم دەست دەكەوێ. ئیتر نزیكەی دە دوانزدە رۆژێك دەبوو مالك شەوان بۆ نووستن دەهاتەوە لای من. شەوێكیان كە گەڕاینەوە بۆ ماڵ بینیم كاوچەكەی ژوورەكەم نەماوە. ئێ باشە مالیكی داماو بەم ناوەختە لە كوێ بنوێ ؟ شەو درەنگیش بوو بەڵام چووم لە دەرگای فراو ئاشاوەرم دا و پرسیاری كاوچەكەم لێ كرد. گوتی من لامبرد چونكە من ئەو ژوورەم تەنها بۆ یەك كەس بەكرێ داوە كەچی ئەوە ماوەیەكە نەفەرێكی دیكەشت هێناوە و بوون بە دوو كەس یانەوەتا دەبێ كرێكەم بۆ زیاد كەیت بۆ ئەو نەفەرە زیادە یان من قەبوڵ ناكەم لە تۆ بەولا كەسی كە لێرە بژیت. گوتم خانم گیان ئەوە بەتەما نییە لێرە بژیت تەنها بۆ چەند رۆژێك میوانی منە تا خۆی ژووری دەست دەكەوێت و دەڕوا، ئەوە ژووری خۆمە من مافی ئەوەم هەیە بۆ چەند رۆژێك میوانێك راگرم. بەو شەوە لێمان بوو بە مشتومڕ و پێك هاتین كە برێك پارەی بدەینێ تا مالك شوێنێك ئەدۆزێتەوە. بەم پێكهاتنە كاوچەكەی داینەوە و پێم وایە مالك هەر پانزە رۆژێك لای من مایەوە.

ئەمە سەرو سەربردەی من بوو لەو چوار ماڵەی كە لە قۆناخی یەكەمی ژیانی ڤیەننام (مایسی 57 - ئەیلوولی 59) لێیان دەژییام. ئێستا كە بیری لێ دەكەمەوە بە خۆشی و ناخۆشییان، بە شیرینی و تاڵیشیان تیریژی فرمێسكی نۆستالگیام بۆ رۆژانی جەوانیم لە كونجی چاوەكانما دەبریسكێنەوە.

دوای ئەوە بەنابەدڵی بارم كرد بۆ میونیخ لە ئاڵمانیا.

له راستەوە: عیسمەت شەریف ، رەشید عارف، هۆمەر دزەیی ، وریا رەواندزی.
ڤیەننا 1950

له کۆنگرەکەی ڤیەننا 1959 دانشتووەکان لەراستەوە: سدقی دزەیی،
هۆمەر دزەیی، دریە عونی ، کەمال فوئاد. ریزی دواوە لەراستەوە: تەحسین
هەورامی، حەسەن سلێمان زەهاوی، جەمشید بەدرخان.

هۆمەر دزەیی و سەردار رەمزی فتاح له ئاهەنگێک بۆ کوردەکانی له کوردستانی
عیراقەوە هاتوو ، ڤیەننا

کۆمیتەی بەڕێوەبەری گشتی کۆمەڵە لە چەپەوە: هۆمەر دزەیی، کەمال فوئاد ، عیسمەت شەریف، وریا رەواندزی (باش دەرنەکەوتووە)، سەعدی دزەیی (برای هۆمەر) ، کاوس قەفتان .

هۆمەر دزەیی و برادەری دێرینی کیسرا ئەدیب ، ڤیەننا 1959

سەردار رەمزی فەتاح (1937 - 2008)

سەباحی نووری بەگی بابان (1940 - 2000)

دزەییەکانی میونیخ لە کۆنگرەیەکی کۆمەڵەدا بە جلی کوردییەوە. لەچەپەوە: عزەدین دزەیی (ئەمیان لە ئینسبروکەوە هاتبوو)، برایم دزەیی، عەلی دزەیی ، عەزیز دزەیی.

هونەرمەندی خۆشەویستی نەمساوی
پیتەر ئەلیکساندەر (1926 - 2011)

برادەری دێرینم مالک الیاسری
(1934 - 2004)

ماڵەکەی لای (فراو ئاشاوەر)م لە گەڕەکی
یەکەمی ڤیەننا 1959

ماڵەکەی لای(فراو سایدڵ )م لەگەڕەکی
دووەمی ڤیەننا 1958-1957

ماڵەکەی لای (فراو پیرکەر)م لە گەڕەکی
چوارەمی ڤیەننا 1958

ماڵەکەی لای(فراو بێرگەر)م لەگەڕەکی چوارەمی
ڤیەننا 1957

دوای نزیکەی 60 ساڵ لە (کافێ سلوکا) ی تەنیشت ماڵەکەم کە زۆر جار جێژوانم بوو

هونەرمەندی ئەمەریکی پۆڵ رۆبسن

میر کامەران بەدرخان

دۆرۆتیۆم، دامەزراوەی ناوداری نەمسا بۆ رهونات و کڕین و فرۆتن و هەراجکردنی هەموو شتێک

عبدالکریم قاسم لەگەڵ شاندێکی عەشایری کورد

جەمال عبدالناصر لەگەڵ لیۆنید برێژنێف لە مۆسکۆ

عەبدوڵا گۆران (1904 - 1962)

الوصي عبد الاله معلقا ومقطع
بسكاكين الشاورما

الباشا نوري السعيد مسحولا

چواردەی تەمووزی 1958

# بەشی 15

## دوو ساڵی ئەڵمانیام لە میونیخ

پایزی 59 بوو گەیشتمە میونیخ و پێشتر لەگەڵ مەحمود کانەبی دزەیی ئامۆزام رێک کەوتبووین بچمە ئەو ماڵەی کە خۆیشی ژوورێکی هەر لەوێ لای ژنێکی زۆر باشی ناو فراو هارکە Frau Harke بەکرێ گرتبوو.

ماڵەکە لە گەڕەکی پازینگ Pasing بوو و بە تراموای نیوسەعاتێک لە ناوشارەوە دوور بوو. خانووەکە گەورە بوو و نەک هەر مەحمود خۆی بگرە هەموو خزمە دزەییەکانی تریشم کە لە میونیخ بوون ئەوانیش هەموویان هەر نەبێ بۆ ماوەیەک لەو ماڵە دەژییان و بۆ ئێمە وەک خەوخانەی قوتابییانی لێ هاتبوو. فراو هارکە بێوەژنێکی تا بڵێیت لەگەڵمانا چاک بوو و لەگەڵ ئوتا Uttaی کچی کە نەوجوانێکی خرپنەی جوانکیلە بوو و ڤێرنەر Wernerی کوڕێژگەیا پێکەوە دەژیان. بەکورتی ماڵی فراو هارکە بۆ ئێمە قۆناغ بوو و وەک ماڵی دایکی خۆمان وا بوو و هەر میوانێکی تریشمان بۆ ماوەیەکی کورت هەبوایە فراو هارکە جێی بۆ ئەویش دەکردەوە. سەرەڕای ئەوەش مەحمود زۆر جار خۆی لێ تووڕە دەکرد و پوورە هارکە خواخوای بوو ئێمە لەگەڵیا ئاشتی بکەینەوە. ئەگەر جاروبار کرێشمان درەنگ بدابایە لای گرینگ نەبوو نازانم چۆن وابوو هەرگیز لە ئاڵمان نەدەچوو.

ئەو دزەییانەی لە میونیخ مانەوە هەموومان دەستمان بە کار کرد لە بینایەکی نزیک ماڵەکەی خۆمان و کاری قوڕکاریمان دەکرد یان چاکترە بڵێم چەمەنتۆکاری چونکە لە ئەورووپا قوڕ بۆ بینا بەکار نایە.

لەو ماوەیەدا جارێکیان مام جەلال لە سەفەرێکی ئەورووپای دێت بۆ میونیخیش و سۆراخی من دەکا. نەیدەزانی قوڕکاری دەکەم. کە هێنایان بۆ سەر بیناکە و چاوی بە من کەوت بە جزمەی ناو لیتەی چەمەنتۆ و جل و دەست و دەموچاوی گەچاوی و چەمەنتۆواوی زۆر حەپەسا و دڵی دەدامەوە دەیگوت هەر بگەڕێمەوە بۆ هەولێر دەچم کاک ئەحمەدی کاکت دەبینم چۆن دڵی دێ لێ بگەڕێ هۆمەرە نازدارەکەی خۆمان قوڕکاری بکات!

پاش ماوەیەک کارەکەمان گۆڕی بۆ کارخانەیەکی بیرە و کارەکەی ئەوێ ئاسانتر بوو. ئێواران کە دەستیشمان بەردەبوو هەر کرێکارێک مافی هەبوو دوو شووشە بیرە لەگەڵ خۆیا باتەوە.

ساڵ سووڕایەوە بووە ساڵی 1960 و نەورۆز هات. ئێمەش کوردەکانی میونیخ کە بە ژمار لە کوردی شارەکانی تری ئاڵمانیا زۆرتر بووین و بەندەش بۆ سروودی نەورۆز و گۆرانیی تر و سەپەرشتیکردنی تیپی هەڵپەڕکێ لە میونیخ بووم، بڕیار درا ئاهەنگێکی گەورەی نەورۆز لەو شارە بگیرێت و ئەوەی لە شارەکانی تریش بتوانن بێن ئەوە باشتر. ئەوانەی کە لەبیرم مابن ئەمانە بوون کە زۆریان برا فەیلییەکانی بەغدا بوون بۆ خوێندن هاتبوونە ئەڵمانیا بەڵام بە مەبەست خۆیان لەبەرچاوی عەرەبەکانا بە کوردی ئێران دەناساند چونکە قوتابیی کوردی ئێرانمان ئەوانەی کە پەیوەندییان بە کۆمەڵەوە هەبوو زۆر کەم بوون. ئێمە دەمانویست بە بێگانە پیشان بدەین کە ئەم کۆمەڵەیە کوردی هەموو پارچەکانی کوردستان دەگرێتە خۆی جا لە فەیلییەکان: فازیل گەنجەلی (گەنج عەلی)، جەمیل سوهراب، عەدنان خودادا، شەوکەت... حافز... و ئەسکەندەر حەمە (ئەم دووانە خانەقینی بوون و لە شاری ئینسبروکی نەمساوە

دەهاتــن). لــە کوردەکانــی ســووریاش مەحمــود شــێخموس و جەمشــید بەدرخـان و محەمـەد سالح جومعـەش لـە میونیـخ بـوون. لـە کوردەکانـی ئێـران عەلـی قـازی کـوڕی شـەهید قـازی محەمـەد کـە بـە (کـوڕی ڕەش) دەناسـرا، حەسـەنی حەسـەنی، مستەفای نوورانـی، هۆشـەنگی ئیفتیخـاری و هەندێکـی تریـش کـە ناوەکانیانـم لەبیـر نەمـاوە. کـوردی عێـراق کـە لـە میونیـخ بوویـن: مەحمـود کانەبـی دزەیـی، برایـم دزەیـی، عەلـی دزەیـی، عەزیـز دزەیـی، عزەدیـن دزەیـی (ئەمیـان لـە شـاری ئینسـبروکی نەمسـاوە دەهـات چونکـە نزیـک بـوو)، ئینجـا خـۆم هۆمـەری دزەیـی. جگـە لـە دزەییـەکان لـە کـوردە عێراقییەکانـی تریـش بێجگـە لـە فەیلییەکانـی کـە لـە سـەرەوە نـاوم هێنـاون، ئەرجومەنـد سـدیق، حەمەجـەلال سـالح، هیـوا مستەفا بەهجـەت، عەبـدوڵا قـادر، پێـم وایـە نەجیـب خەفافیـش لـە میونیـخ بـوو یـان لـە شـارێکی کـەوە هاتبـوو، سـەلاح ئەترووشـی، فوئـاد تاڵەبانـی، دارای مەجیـد یـاوەر لـە شـارێکی کـەوە دەهـات و راجـح البـدراوی کـە ئەویـش لـە شـارێکی تـر دەیخوێنـد. بـۆ ئاهەنگـی نەورۆزەکـە سـەرداری ڕەمـزی فەتـاح خـۆی و ڤیۆلینەکـەی و سـەباحی نـووری بەگـی بابانیـش لـە ڤیەننـاوە هاتـن.

ئێمـە هەنـدێ کـوردی عێراقـی پەیوەندییەکـی باشیشـمان لەگـەڵ عەرەبە عێراقیـیـە چەپڕەوەکانــی ئاڵمانیاشــا هەبــوو کــە هەندێکیــان کۆمونیســت بــوون. بــە تایبەتــی مەحمــود کانەبــی و خــۆم کــە پێشــتر لــە ســاڵانی چلەکانــا ئێمەیــش شــیوعیی عێراقــی بوویــن، جــا ئێمــە لــە نزیکتــرەوە تێکەڵیمـان لەگـەڵ ئـەو عیراقییانـە هەبـوو کـە زۆریـان کـوڕی زۆر چـاک بـوون وەک: محمـود المعمـار، منـذر البیاتـي، محمـود الحـلاوي، عبداللـه الزبیـر و هەندێکـی تریـش.

بـۆ ریکلامـی ئاهەنگی نـەورۆز چەند ڕۆژنامەیەکی میونیـخ هەواڵەکەیان بـڵاو کـردەوە و هەنـدێ ڕۆژنامـەوان هاتـن و بـوون بـە دۆسـتمان. لـەو میوانانـەی کـە هاتبـوون یەکێکیـان گۆتفریـد یۆهانیـس میوللـەر Gottfried Johannes Mueller بـوو. مـن باسـی ئـەو پیـاوەم بە وردی لە بەشـەکانی

پێشوومدا کردووه. لێره هەر بۆ وەبیرهێنانەوه و بۆ ئەو خوێنەرانەی کە بەشەکانی زووتریان بەسەرا تێپەڕیوه دەمەوێ بڵێم کە میوللەر ئەو ئەفسەرە نازیەی زەمانی هیتلەر بوو کە لەگەڵ رۆڵەی نیشتمان پەروەری کورد رەمزی نافیع ئاغا لە سەرەتای چلەکانا بە پاراشووت لە کورستان دابەزین {بڕوانە هەندێ لە بەشەکانی پێشوو}. جا میوللەر کتێبێکی بەئاڵمانی لەسەر ئەو چیرۆکەی خۆی و رەمزی نووسیبوو بە ناوی (لە رۆژهەلاتی گڕگرتوودا Im brennenden Orient) کە بەدران حەبیب لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی. میوللەر دڵی زۆر خۆش بووبوو کە لە رۆژنامەکاندا خوێندبوویەوە قوتابییانی کورد لە میونیخ هەن و ئاهەنگی جەژنی نەورۆز دەکەن و یەکسەر هات بۆ ئاهەنگەکە. کە زانی من خەڵکی هەولێرم لەگەڵما دانیشت و لێی پرسیم ئەگەر ماڵی رەمزی بناسم؟ من لەو زیاتر گەشامەوه و پێم راگەیاند کە نەک هەر دەیانناسم بەڵکوو هەر تەواوی ئەو بنەماڵە کوردپەروەرە خزم و برادەری نزیکی بنەماڵەی ئێمەشن.

میوللەر سەرپەرشتیی رێکخراوێکی خێرەومەندی دەکرد بە ناوی (برایەتی سالیم Bruederschaft Salem) و داوای لە ئێمە کرد ئەگەر قوتابییەک یان هەر کوردێکی بێ جێ و رێتان هەبێ با بێتە لای رێکخراوەکەی ئێمە ژووری بۆ دابین دەکەین. ئێمەش کوردێکی باکوورمان بۆ هاتبوو کە بە کوردیش شیعری جوانی دەنووسی (حوسێن ساریتاش) و کوردێکی تریش چاکم لەبیر نەماوە کێ بوو و خۆیشم کە لە قەرەباڵغیی ماڵەکەی فراو هارکە بێزار بووبووم منیش بڕیارم دا لەگەڵ ئەو دوو کوردە بچم بۆ ئەو شوێنە و جانتا و شڕوپڕم تێک نا و چووم. بەلام بینیم کە شوێنەکە هی ئەوە نییە منی لێ بحەوێتەوە. هەر دووکەس لە ژوورێکی زۆر تەنگ کە دوو قەروێڵەکان بەسەر یەکا بوون. کانتۆرێکی زۆر بچووک و باریک کە بەحاڵ جێی جلی یەک کەسی لێ دەبۆوه. نە مێز نە کورسییەک. جگارەکێشان قەدەغە بوو و ئەوانەی کە لە ئۆفیسی ئەو شوێنە کاریان

دەکرد هەموویان رووەکخۆر vegetarian بوون و لێ نەدەگەڕان کەس گۆشت و بەرهەمی ئاژەڵی بێنێتە ناو بیناکەوە. دەبوایە پاش سەعات 10:00ی شەویش کەس لە دانشتووەکان لە دەرەوە نەمێنێتەوە ئەگینا دەرگای لێ نەدەکرایەوە ئەگەر درەنگتر بهاتبایەوە. لا حەولە وەلا، خۆم تووشی چی کرد!

پێم جوان نەبوو هەر یەکسەر بە میوللەر بڵێم کە من ناتوانم لەو شوێنە بژیم بۆیە چەند رۆژێک بەخۆم وەستام و مامەوە ئینجا لەپاشان پێم گوت کە من خۆم شوێنم دۆزیوەتەوە و دوو کوردەکەی دی دەمێننەوە. سوپاسێکی زۆرم کرد و گەڕامەوە بۆ تەمەڵخانەکەی فراو هارکە بەڵام پەیوەندیم بە میوللەرەوە هەر بەردەوام بوو. دیارە میوللەر کتێبێکی دیکەشی لە سەر کوردستان نووسیوە بەناوی (Einbruch ins verschlossene Kurdistan) کە کوردیەکەی دەبێتە شتێکی لەم بابەتە (خۆکردن بەناو کوردستانی داخراوا) یان (چوونە ناو کوردستانی داخراو) یان (کردنەوەی کوردستانی داخراو). من بەم دواییە لە گووگلا زانیم کە ئەم کتێبەشی لەسەر کورد نووسیوە کە هێشتا نەمدیوە.

## بوونم بە ئەندامی پارتی

کاک کەمال فوئاد، یادی بەخێر، بەرپرسی لکی ئەورووپای پارتی دیموکراتی کوردستان بوو. ئەو یەک دوو ساڵ دوای من هات بۆ ئەورووپا و لە بەرلین نیشتەجێ بوو. ئێمە پێشتر یەکتریمان نەدەناسی. کە من هێشتا لە ڤیەننا بووم و ئەویش تازە گەیشتبووە بەرلین، نامەیەکی دوورودرێژی بە کوردیی لاتین بۆ نووسیم و خۆی پێ ناساندم. ئەوسا زۆر لە ئێمە سەبارەت بە هەستی بەتینی نەتەوەپەروەریمان ئەلفبای عەرەبیمان لە نووسینەکانمانا بەکار نەدەهێنا بە لاتین دەماننووسی. تا بۆشمان بکرایە لە کاتی قسەکردنی ناوخۆمان بەتایبەتی ئەگەر لەگەڵ عەرەبا دانیشتباین خۆمان لە بەکارهێنانی وشەی عەرەبی دوور دەخستەوە و بە کوردیی پەتی دەدواین. لەپاشان کە چووم بۆ میونیخ کەمال نامەیەکی تری بۆ ناردم لەگەڵ فۆرمێکی بوونەئەندام لە پارتی دیموکراتی کوردستان. لە نامەکەیدا بۆی روون کردبوومەوە کە خزمەتکردنی پرسی کوردم باشتر پێ دەکرێ ئەگەر چالاکیم لەناو پارتییا بێ. کەمال لە قسەکردنا توانایەکی سەیری هەبوو بۆ قانیعکردنی بەرامبەرەکەی. منیش هەرچەندە کە دوای ئەندامەتیی حزبی شیوعیی عیراقیم لە چلەکانا، وەک کەمال خۆیشی، بووبووم بە ناسیۆنالیستێکی توندڕەو، بەڵام حەزم نەدەکرد خۆم بە هیچ پارتییەکی سیاسییەوە ببەستمەوە. نامەکەی کەمال منیشی ئیقناع کرد فۆرمەکەم پڕ کردەوە و بووم بە ئەندامی پارتی.

هەر لەو دوو ساڵەی میونیخم هیوا مستەفا بەهجەتی برادەرمان کچێکی ئاڵمانی ناو هێلگای Helga ی مارە کردبوو و بە پێشنیاری من ئاهەنگێکی شایی زۆر کوردانەی بە دەستووری کوردەواریی جارانمان بۆ گێڕا.

هەر ئەو هاوینەش برادەرێکی زۆر لەمێژینی سالآنی قوتابخانەی سەرەتاییم لە هەولێر، موفید عەبدالرحمان جادر هاتە میونیخ. دوای چەند رۆژێک موفید گوتی بەنیازم ترومبێلێک بەکرێ بگرم حەز دەکەم بۆ چەند رۆژێک لەگەڵما بێیت بچینە سویسرا. من و وا بزانم هیوا مستەفا بەهجەت و عەدنان خودادادیش هەرچوارمان بۆ چەند رۆژێک لەگەڵیا چووین. بەلام من خواخوام بوو بە سەلامەتی بگەڕێینەوە چونکە موفید ئەوەندە شێتانە لێی دەخوڕی و تا بۆشی بکرایا بەرامبەر بە قانوونی ترافیکیش خۆی لە گێلی دەدا. پێم دەگوت موفید بەوخوایە تۆ رۆژێک هەر بە رووداوی ئۆتۆمۆبیل دەمریت.

بەداخەوە پێشبینییەکەم راست دەرچوو. موفید لە عیراق لە دەرەوەی بەغدا بە رووداوی ئۆتۆمۆبیل جوانەمەرگ بوو.

## کۆنگرەی پێنجەمی کۆمەڵە لە بەرلین بەشداریکردنی ئیحسان نوری پاشا

هاوینی سالی 60 کونگرەی پێنجەمی کۆمەڵەمان لە بەرلین بەست و یەکێک لە میوانە هەرە گرنگ و بەرێزەکانی کە بەتایبەتی لە ئێرانەوە هاتبوو (جەنراڵ ئیحسان نووری پاشا) ی رەهبەری شۆڕشی ئاگری لە دژی مستەفا کەمال ئەتاتورک کە وەک پەنابەر لە ئێران دەژیا. ئەو کە لە ئێرانەوە هاتبوو" یان نێردرابوو "، هەر چۆنێکی بێ بەبێ مۆڵەتی حکومەتی شا نەدەکرا بێت چونکە دەشگەڕایەوە بۆ ئێران، سروشتانە دەبوایە مەرج و رێنمایەکانی پەناهەندەیی سیاسی جیهانی لەبەرچاو بگرێت و نەدەکرا وەک ئێمەمانان هێرش بکاتە سەر رژێمی شا کە مافی پەناهەندەیی پێ بەخشیوە. بە زمانێکی دیپلۆماتیکیش ویستی پیشانی کونگرەکە بدات کە بە بەراورد لەگەڵ سیاسەتی رژێمەکانی تورک و عەرەبا سیاسەتی حکوومەتی شای

ئاریامهـر بەرامبـەر بـە کـورد زۆر باشـترە. بـەڵام کـەی گەنجـی خوێـن گەرمـی بـێ ئەزموونـی وەک زۆرێـک لـە ئێمـەی ئـەو سـەردەمە لـەو زەمانە دیپلۆماتیکە دەگەیشت! قسەکانی بەدڵـی کـوردە کۆمونیسـتەکان و هەنـدێ لـە کـوردە ناسیۆنالیستەکانیش نەبوو و کردیـان بـە هـەرا لەسـەریا و بەگشـتی کەشـێکی چاوەڕوانەکـراوی زۆر ئاڵـۆزی بـۆ ئـەو دانیشـتنە ئافرانـد. کـە ئـەو هەواڵە گەیشـتەوە کوردسـتان ڕۆژنامـەی (خەبات)یش کە ئۆرگانی پارتـی بـوو و عێراقـی قاسـمیش لەگـەڵ ئێرانی حەمە ڕەزاشـا هەر شـەڕە جنێویـان بـوو ئەویـش گلەیەکـی مەیلـەو هێرشـبەرانەی کـردە سـەر جەنابـی ئیحسـان نـوری پاشا. بەدەر لـە تێکنەگەیشـتنمان لەگـەڵ ئیحسـان پاشـا، کەمـال فوئـادی سـکرتێری کۆمەڵەکـەی خۆشـمان نامەیەکـی زۆر نادیپلۆماتیکانـەی بـە نـاوی کۆمەڵـە بـۆ ڕۆژنامـەی (کوردسـتان) هەنـارد کـە حکوومەتـی ئێـران بـە چەنـد شـێوەزاری جیاجیـای کـوردی و بـە فارسـییش بـڵاوی دەکـردەوە. نامەکـەی کەمـال بـە شـتێکی لـەم شـێوەیە دەسـتی پـێ دەکـرد: "... بـۆ ڕۆژنامـەی کوردسـتان بلوێرژەنـی هەتیوەکـەی حەمـە ڕەزاخـان..." ڕۆژنامەکـەش بـۆ سـووککردنی ئێمـە، بـۆ پیشـاندانی ئاسـتی ڕۆشـەنبیریی ئێمـە، بـێ لـێ بڕیـن، تـەواوی نامەکـەی کەمالـی بـڵاو کـردەوە.

کـە کۆنگـرە تـەواو بـوو پەرتەمـان لـێ کـرد و هـەر کەسـە دەگەڕایەوە بـۆ شـاری یـان وڵاتـی خـۆی ژمارەیـەک لـە بەشـداربووانی کۆنگـرە دەچوونـەوە بـۆ میونیـخ بـە داخـەوە باسـەکەیان لەسـەر ئۆتۆبـان وەرگـەڕا و برادەرێکـی زۆر خۆشەویسـت و کوردێکـی نیشـتمانپەروەری زۆر چالاکمـان (عەدنـان حوسـێن خـوداداد) جوانەمـەرگ بـوو.

منیـش لەپاش گەڕانـەوەم لـە کۆنگرەکـەی بەرلیـن بـاری داراییـم زۆر خـراپ تێـک چـوو. لـە ماڵـەوە یـەک فلـسـم بـۆ نەدەهـات. خۆشـم بێـزار بووبـووم لـە کارکـردن. تووشـی قەردوفەردێکـی زۆری خـزم و بـرادەران بووبـووم. نەشـم دەویسـت بگەڕێمـەوە بـۆ عێـراق و کوردسـتان. ئیتـر بـەم حاڵـە کـە وەک دەڵێـن کافـر بەحاڵـم نەبـێ، نـە خوێندنـێ، نـە کارێ، خۆم

لەبەر چاو کەوتبوو و نەمدەزانی دەکەومە رۆژێکی وەها رەشەوە. بە نامە هەزار قسەی ناشیرینم حەواڵەی براکانم دەکرد لە هەولێر. وەرامی ئەوانیش، ئەگەر وەرامیان بدابایەوە، هەر ئەوە بوو: وەرەوە.

## بووم بە یاری ( عەشیقی) ماریا

دەڵێن خوا لە یێکەسان غافل نییە. لە فێستڤاڵی ساڵانەی ناوداری شاری میونیخ کە ئۆکتۆبەر فێست Oktoberfest ی پێ دەڵێن و پایزان بۆ دوو هەفتە لە کۆتایی مانگی سێپتێمبەر و بەرایی ئۆکتۆبەرا دەگیرێ، ژنێکی بە روخسار و بەژن و باڵا جوان بەڵام بە تەمەن زۆر لە خۆم گەورەتر حەزی لێ کردم و داوای لێ کردم بچم لە ماڵی ئەو لەگەڵیا بژیم.

ئۆکتۆبەر فێست زۆر بەناوبانگە لەو شارە و لە ماوەی ئەو دوو هەفتەیە خواردن و بیرەیەکی بێ ژمار دەفرۆشرێت و گۆشتی سەدان بەراز و جوانەگا دەخورێت. لەو بۆنەیەدا خەڵکی شار و گەڕۆکی شارەکانی تریش روو دەکەنە شوێنی رووداوەکە کە ناوی (تێرێزیەن ڤیزە Theresienwiese)یە و شەوان تا درەنگانی شەو هەر خەریکی خواردن و بیرەخواردنەوە و گۆرانی گوتن و بەزم و رەزم دەبن. ژنەکە (ماریا Maria) لەگەڵ گرووپێکی برادەرانی خۆی دەیانخواردەوە و منیش لە سەر مێزەکەی تەنیشت ئەوانا لەگەڵ گرووپی خۆمان کە لەبیرم نەماوە کێ و کێ بووین دانیشتبووین بیرەمان دەخواردەوە. ماریا هەر تەماشای دەکردم ناوەناوەش پەرداخە زلە بە قوڵپەکەی بیرەکەی خۆی بڵند دەکرد و دوور بە دووری لەگەڵ منا پێکی لێک دەدا. خولاسە، بە ئاماژە بانگی کردم و چووم بۆ لای و ژمارەی تەلەفۆنمان ئاڵوگۆڕ کرد کە رۆژی پاشتر قسە لەگەڵ یەکدا بکەین. ماریا هەرگیز تەمەنی خۆی بە من نەگوت و بە مەزەندەی خۆم

رەنگە لە دەوروبەری 55 - 60 ساڵیا دەبوو کە بۆ منی ئەوسا 23 ساڵی "پیرێژن" بوو بەڵام "پیرێژنێکی" بەڕاستی هەم بە رەنگو ڕوخسار جوان هەم بە بەژنوباڵا شۆڕەژن و هەم نەرم و نیان و لەسەرەخۆ. گوتی من بەتەنیا دەژیم بۆ نایەیت لەگەڵ منا بژیت و تۆ پێویست ناکات جارێ کار بکەیت، وا من کارمەندم و کارەکەم هەردووکمان بەئاسانی دەژیێنێ.

ئێ ئەوە بۆ منێکی لاتی بێکاری بەرەڵا بەڕاستی دوو شەش بوو. هەر واشمان کرد و ئەمجارە گواستمەوە بۆ لای ماریا.ماڵێکی چکۆلانەی جوانکیلەی بەچێژ راخراوی هەبوو لە نهۆمی ئەرزی باڵاخانەیەکی ناوشار کە بریتی بوو لە ژوورێکی نووستنی تەختێکی پانی دوونەفەری لێ و ژووری دانیشتن و نانخواردنیش لەناو یەکا بوون. کلیلێکی ماڵەکەی دا بەمن و بەیانییان ئەو دەڕۆیشت بۆ سەرکاری خۆی و منیش دواتر هەڵدەستام قاوەڵتییەکم بۆ خۆم ساز دەکرد و دەچوومە دەرەوە بۆ لای خزمەکانم و ئێوارانیش دەگەڕامەوە لای ئەو و هەندێ جار نانی ئێوارەمان پێکەوە دەخوارد. هەڵبەت ماریا لە ژیانا زۆر لە من بە ئەزموونتر بوو و ئازادیی تەواوی دابوومێ ئێواران ئەگەر حەز بکەم بێ ئەو بچمە دەرەوە بەڵام بۆ شەو بگەڕێمەوە بۆ لای. هەر واشم دەکرد. خۆشم دۆستێکی زۆر جوانی دیکەم هەبوو (لۆرێ Laure) بەڵام راستییەکەی لە لاتییان ناچار خۆم لێ دوور دەخستەوە.

ماوەیەکی باش بەم شێوەیە بە رێگای ماریاوە خۆم بەڕێوە برد پاش ئەوەی کە لە یارمەتیی دارایی ماڵەوە بە تەواوی نائومێد بوویووم و لە کارکردنیش زۆر بێزار و وەڕس بووبووم. بەڵام وەک هەموو گەنجێکی چاولەدەر دوای ماوەیەک ئۆقرەم نەگرت و لە ماریاش بێزار بووم. بیانوویەکم دۆزییەوە و بە ماریام گوت بەتەمام بگەڕێمەوە بۆ عێراق. هەستی دەکرد راست ناکەم بەڵام زیرەک بوو پێشبینیی دەکرد کە ئەو پەیوەندییە لاسەنگەی ئێمە تا سەر نابێت و

دەیزانی کە رەنگە هەر پەڵەهەورێکی هاوینە بێت و هیچی لێ سەوز نەبێت. ماریام بەجێ هێشت و دەرگای ماڵی فراو هارکەش وەک جاری جاران هەمیشە ئاوەڵا بوو.

ئەوەی راستی بێ، لەو دوو ساڵەی میونیخم خۆشییەکی وەهام لە ژیانی خۆما نەدی و وردە وردە دەهاتمە ئەو دەرئەنجامە کە ژیانم وا بەلای رێڕەوێکا تێ دەبێتەوە کە هەرگیز لە پلان و خەون و خەیاڵی مندا نەبووە.

خۆی میونیخ شارێکی خۆش بوو و مێژوویەکی سیاسی و کولتووریی تێروتەسەلی هەبوو هی سەردەمی هیتلەر و نازییەکان و زووتریش هی سەردەمی شا لودڤیگی دووەم (Ludwig der Zweite) شای ولاتی باڤاریا لە سەدەی نۆزدەهەما کە ئاشق و شەیدای موزیک و ئۆپراکانی ریچارد ڤاگنەر (Richard Wagner) بوو و ئۆپراخانەیەکی خنجیلانەی لە شاری بایرۆیت (Bayreuth) بۆ ئەو هونەرمەندە گەورەیە دروست کردبوو. نەک هەر خودی میونیخ خۆی شارێکی خۆشە بەڵکوو ولاتی باڤاریاش کە بە ئاڵمانی پێی دەڵێن (بایەرن Bayern) بەتایبەتیش ناوچە شاخاوییەکەی (ئۆبەر بایەرن Oberbayern). ئەو ناوچەیە پڕە لە گوند و دەریاچەی جوان جوان و لەوەڕگای گاگەلی لاپاڵ کێوەکان و بزنەکێویی قۆچ لوولی ناو دار و دارستانەکانی و کیژۆڵە لادێییەکانی بەبەرگی میللییانەوە کە بە ئاڵمانی پێی دەڵێن (دیرندل Dirndl) ئیتر ئەمانە هەر هەمووی سەرچاوە و هەوێنی هەڵبەست و ئاوازن بۆ شاعیران و هونەرمەندان. بەڵام لەو دوو ساڵەی میونیخیشم ژمارەیەکی زۆر لە دۆست و برادەری خۆشەویستم دەست کەوت هەم لە کورد و هەم لە عیراقیی چەپڕەوی لە خۆمەوە نزیک. هەر بۆ نموونە لە کوردەکان مەحموود شێخ مووسی خەڵکی شاری (عامودە)ی رۆژئاوا و عەلی قازی کوڕی پێشەوا قازی محەمەد و حەسەن ئاغای حەسەنی کوردانی رۆژهەڵات و حەمەجەلال سالح و هیوا بەهجەت و برا فەیلییەکانی وەک عەدنان خودادادی رەحمەتی

و فازیـل گەنجەلـی و ئەرجومونـد سـدیقی بـرادەری لەمێژینـی سـاڵانی ناوەندیـی کەرکووکـم، ئەمانە کـوردی عیـراق. لـە عەرەبـە عیراقییەکانیـش هـەر بـۆ نموونـە کازم حەبیـب و مەحمـود المعمـار و منـذر البیاتـی و ئـی تریـش.

جارێکیـان شـارەوانیی میونیـخ (هانـس یۆخـن فـۆگل Hans Jochen Vogel) بانگهێشـتی هەمـوو کۆمەڵـە قوتابییـە بێگانەکانـی کـرد بچـن بـە فڕۆکـە لـە هـەواوە شـاری میونیـخ ببینـن. کۆمەڵـەی خوێندکارانـی کوردیـش یەکێـک لـەو بانگکراوانـە بـوو. کـە چوویـن فڕۆکـەی سـپۆرتی زۆر بچووکیـان هێنـا کـە پیاوێـک هـەر بـە تەنـاف لـە گەراجەکەیـەوە رای دەکێشـا و دەری هێنـا ئەوەنـدە بچـووک بـوو. فڕۆکەکـە تەنهـا جێـی دوو کەسـی لـێ بـوو پایلۆتەکـە (فڕۆکـەوان) و سـوارێکی تـر کـە ئەمیـان لـە پێشـەوە و پایلۆتەکـەش لـە پشـت ئـەو دادەنیشـت. هـەر فڕینێـک نزیکـەی دە دوانـزە چرکـەی دەخایانـد و دەنیشـتەوە و خوێندکارێکـی تـری هەڵدەگـرت. بـەم جـۆرە هەموومـان ئـەو دەرفەتەمـان بـۆ رەخسـا لـە ئاسـمانەوە سـەیری ئـەو شـارە جوانـە بکەیـن. بـەڵام فڕینەکـە زۆر بەتـرس بـوو و مـن وام بیـر دەکـردەوە ئـەو فڕۆکـە بچکۆلەیـە لـەو ئاسـمانە پـان و بەرینـەدا چـۆن خـۆی رادەگرێـت و لـە دڵـی خۆمـا دەمگـوت خـۆ ئەگـەر بایەکـی بەهێـز بێـت رەنگـە هـەزار تەقڵـە بـە فڕۆکەکەمـان بـدات. دوای تەواوبوونـی گەشـتە هەواییەکەمـان ئینجـا فراڤینمـان لەگـەڵ جەنابـی شـارەوان کـردەوە.

هـەر لـەو دوو سـاڵەی میونیخـم جارێکیـان برادەرێکـی زۆر لەمێژینـی بنەماڵەکـەی ئێمـە ئەویـش وەک مـام جـەلال هاتـە ئـەو شـارە، کاک عەونـی یوسـفی کوردپـەروەری ناسـراو و ئەندامـی سـەرکردایەتیی پارتـی دیموکراتـی کوردسـتان. کاک عەونـی ئەوسـا وەزیـری کار و نیشـتەجێکردن بـوو لـە حکوومەتـی عبدالکریـم قاسـم لـە بەغـدا و زۆر نزیکـی رابـەری کـورد مـەلا مستەفای بارزانـی بـوو کـە ئـەو کردبـووی بـە یەکـەم وەزیـری پارتـی لـە بەغـدا.

دیار بوو کاک عەونی بە سەردانی دیوانی (رەسمی) بۆ یەکیەتیی سۆڤیەت بانگهێشت کرابوو و لە گەڕانەوەی بۆ عێراق حەزی کردبوو بە میونیخدا رەت بێ. ئێمەش کوردەکانی میونیخ پێشوازییەکی زۆر گەرممان لێ کرد و ئێوارەیەک بردمان بۆ بیرەخانەی بەناوبانگی میونیخ (هۆفبرۆی هاوس Hofbraeu Haus) کە لە کاتی خۆی هەولێک درابوو هیتلەر لەوێ بکوژن بەلام سەری نەگرت.

دەلێن قسە قسە رادەکێشێت. بارزانی لەناو هەموو ئەندامانی سەرکردایەتیی پارتی کە هەندێکیان زۆر لە کاک عەونی لەپێشتریش بوون ئەوی بۆ وەزیری هەلبژاردبوو. ئەندامەکانی تری سەرکردایەتیی پارتی ئەو بڕیارەی بارزانییان ئەوەندە بەدل نەبوو چونکە ماوەیەک بوو پێش چواردەی تەمووزی 58 و پێش هاتنەوەی بارزانی لە پەناهەندەیی سۆڤیەت ناکۆکی لەسەر هەندێ شتی شەخسی لەنێوان سەرکردایەتیی پارتی کە هەمزە عەبدولا سکرتێری بوو و عەونی یوسفا رووی دابوو و ئەمیان دوور خستبۆوە. کە بارزانییش گەڕایەوە دوای ماوەیەکی کورت ئەویش لە هەمزە عەبدولا کەوتە گومان کە دەگوترا مەیلی زۆری هەیە پارتی بەرەو حزبی شیوعیی عیراقییەوە بپات بە ئەندازەیەک کە لەناو حزبی شیوعیا بیتوێنێتەوە. جا بارزانی لە رکان هەلستا عەونی یوسفی دوورخراوەی هێنایەوە، متمانەی پێ بەخشییەوە و کردیشی بە وەزیر لە بەغدا. هەر بەوەش نەوەستا ئەمجارە هەمزە عەبدولای هەر لە پۆستی سکرتێری پارتییش لابرد و برایم ئەحمەدی لە شوێنی دانا. رەخنە لەملاو لەولا لە بارزانی دەگیرا کە ئەم بڕیارانەی لابردن و دانانی سکرتێری پارتی هەمووی بڕیاری تاکڕەوین و بێ گوێدان بە رێبازی دیمۆکراتیک هیچ پرس و ڕایەکی بە مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتیی پارتی نەکردووە کە حزبەکەشیان ناوی پارتی دیمۆکراتە. ئەمە وابوو، بەلام ئاخر پیاو دەبێ ئاوڕێک لە زانستی سۆسیۆلۆژی بداتەوە ئینجا دەتوانێ بە واقیعی و بە ویژدان شت هەلسەنگێنێ. خۆ هەموومان دەزانین مەلا مستەفای بارزانی پێش

پەنا بردنی بۆ سۆڤیەتستان لەناو جەرگەی فەرهەنگی رێ و پیک قووڵ داکوتراوی میللەتەکەی خۆیەوە سەری هەڵدابوو و نوقمی کولتوورێکی رەسەنی کوردەواری بوو کە هێشتا "شۆڕەسوارێکی سیلاحشوری عەگید a knight in shining arms" زۆر گرنگتر و کاریگەرتر بووە لە سەرتاپای حزبەکەی یان بزووتنەوەکەی. چما شێخ مەحمودیش هەروا نەبووە ؟ بەڵێ راستە بارزانی باک گراوندێکی دیموکراتیکی نەبووە و نەشدەبوا هەیبێ. ئەرێ کاکە کێمان هەمانبوو؟ کامە رەهبەر و سەرکردە و سیاسەتکاری ولاتانی رۆژهەلاتی ناوەڕاستی ئەو زەمانە پەیڕەوی پرەنسیپی دیمۆکراسیی دەکرد کە ئەمڕۆش هەر کەمە؟ هەموو سیاسەتکارانی ئەو زەمانە و زۆرترایەتیی ئەمڕۆش پێش هاتنە سەر دەسەلات باسی دیمۆکراسی دەکەن و ناوی دیمۆکراتیش لە حزبەکانیان دەنێن، بەلام کە دەسەلات بەدەست دێنن فڕیان بەسەر دیمۆکراسییەوە نامێنێ. ئینجا لەپاشان لە پانزدە ساڵ پەناهەندەیی لە ولاتێکی سیستەم تۆتالیتاریی وەک یەکیەتیی سۆڤیەتیش ئایا وانەی دیمۆکراسییان بە بارزانی دەگوتەوە؟ ئاخر شتێک کە لە شوێنێکا هەبوونی نەبێ چۆن فێری ببی؟ باشە کە میللەتانی روسیا خۆیان نە لە زەمانی تزارەکان و نە لە زەمانی سۆڤیەتیش یەک دانە رۆژیش تامی دیموکراسییان نەکردبێ ئەدی مەلا مستەفا لە کوێ وەری گرێ ! بۆیە بە تێگەیشتنی من شێوەی رێبەرایەتیی مەلا مستەفا بۆ سەردەمی خۆی، دەلێم بۆ سەردەمی خۆی، کالای پڕ بە بالای سەردەمەکە بووە. ئەو زەمانە خەلک بە دوای سەرکردەیەکی کاریزماتیک دەکەوت نەک "قیادە جەماعیەکی"بێ رەنگ و بۆ. بە بۆچوونی من زۆرێک لە سەرکردایەتیی پارتی ئەو زەمانی حیسابی کولتووریان هەر بەخەیاڵیشدا نەدەهات. ئەوان بەو پەڕی سادەیی و بێ ئەزموونی وایان دەزانی دیموکراسی یان هەر ئایدیۆلۆژییەک وەک بلێی بەناو رەحەتیدا ئەوها بەئاسانی دەچۆڕدرێتەوە ناو کەللەی سەری ئینسانەوە و ئیتر ئەو ئینسانە فەرهەنگی پێشینی بەتەواوی لەبیر دەچێتەوە و

دەبێتە مرۆڤێکی نوێ. سروشتانە، بارزانی بە ڕادەیەک لە کاروباری حزبایەتی دڵی سارد بووبووە کە لە کۆنگرەی پێنجەمی پارتی ساڵی 1959 لە بەغدا رای گەیاند ئیتر هەر نایەوێ خۆی بۆ سەرۆکایەتیی پارتییش کاندید بکاتەوە. بارزانی گونجاوی حزب حزبێن نەبوو، ئەو سەرۆکی میللەتێک بوو نەک هی تاکە حزبێک. هەر چۆنێکی بێ لەپاش تکا و پاڕانەوەیەکی زۆری سەرجەمی کۆنگرەکە ئینجا پێیان سەلماند رازی ببێت بکرێتەوە بە سەرۆکی پارتی. دەڵێن لە کۆنگرەکە لەپاش تووڕەبوون و رشتبوونی بارزانی لەسەر خۆکاندیدنەکردنەوەی، ساڵح شێرەی نوێنەری ناوداری جوتیاران لەناو پارتی بە برایم ئەحمەد دەڵێ: " ئێ کاکە کە نەیکا خۆ زۆری لێ ناکەین با یەکێکی تر هەڵبژێرین بۆ سەرۆکایەتی." گوایا برایم ئەحمەدیش لە وەراما پێی گوتووە: " ساڵح، لە سەدا نەوەتی میللەتەکەمان بە دوو ناوی بارزانی کەوتووە نەک هی پارتی، ئەو لەناو حزبا نەمێنێ کەسمان لەگەڵ نامێنێ. " راستی کردووە کاک برایم.

جا بەلای منەوە ئەو هەست نەکردنە بە هێزی کولتوور لەلایەن هەندێک لە سەرکردایەتیی پارتی هەر لە 59وە ئەوە سەرایی کاڵە دووکەڵێ بووە کە دواتر لە ناوەڕاستی شەستەکانا گڕی ئاگرێکی چڕی لە نێوان بارزانی و باڵی مەکتەبی سیاسیی لێ کەوتەوە کە لەناو خەڵکا بە مەلایی و جەلالی بلاو بووەوە.

میونیخ نەورۆزی 1960 تیپی گۆڤەندی کوردی لە چەپەوە: هۆمەر دزەیی، کچە ئاڵمانێک، حەمە جەلال ساڵح ، کچە ئاڵمانێک، هیوا بەهجەت، ئەرجومەند سدیق، عەلی دزەیی

میونیخ نەورۆزی 1960 هۆمەر و تیپی گۆرانی لە چەپەوە: عەلی دزەیی، هیوا بەهجەت، ئەرجومەند سدیق، حەمە جەلال ساڵح، هۆمەر زەیی

زەماوەندی هیوا و هێلگا لە میونیخ 1960 لە چەپەوە: عەدنان خودادادە، هیوا بەهجەت،
هۆمەر دزەیی (لە پشتەوە)، هێلگا بەهجەت، حەمە جەلال ساڵح

ئاهەنگی نەورۆزی 1960 لە مونیخ

مارەیی هیوا و هێلگا لە مونیخ 1960 لەچەپەوە: هۆمەر دزەیی، هێلگا بەهجەت، هیوا بەهجەت، نەناسراو، مەحمود کانەبی دزەیی

هۆمەر بەدیار گاگەلی ئۆبەربایەرن لە ئاڵمانیا

لە چەپەوە: عەزیز دزەیی ، ئەرجومەند سدیق، هیوا بەهجەت، مەحمود کانەبی دزەیی، عەونی یوسف ، عزەدین دزەیی، هۆمەر دزەیی، عەلی دزەیی. میونیخ 1960

دووم کەس لە چەپەوە: ماریا.

لەراستەوە: عەدنان خوداداد، مفید عبدالرحمان جادر، کچێکی نەمساوی، دایکی کچەکە، هۆمەر دزەیی، دەریاچەی بۆدن زێ لە نەمسا 1960

**میونیخ 1960 لەڕاستەوە دووەم کەس هۆمەر دزەیی ، سێیەم محمود المعمار.**
**هیوا بەهجەتیش بەرامبەریانە پایپ دائەگیرسێنێ**

**20 / 8/ 2017 لەگەڵ ئامۆزام مەحمود کانەبی دزەیی لە شاری کۆڵن لە ئاڵمانیا**

تێکۆشەری کوردپەروەر رەمزی نافیع ئاغا

هەمزە عەبدوڵا سکرتێری پارتی دیمۆکراتی کوردستان

دۆستی کورد گۆتفرید یۆهانێس میوللەر 2009 - 1914

ڕێبەری مێژوویی کورد مەلا مستەفای
بارزانی 1903 - 1978

ئیبراهیم ئەحمەد (1914 - 2000) سکرتێری
پارتی دێمۆکراتی کوردستان

ئیحسان نووری پاشا 1976 - 1892 لەگەڵ هاوسەرەکەی لە تاران.

# بەشی 16

## ساڵانی فرانسام پاریس، بیزانسۆن، ئینگە فرانکە، ئێکس

دوای جیابوونـەوەی دۆسـتانەم لـە ماریـا و گەڕانـەوەم بـۆ ماڵـی فـراو هارکـە بـاش بـوو ئەمجـارە ئەوەندە لـەوێ نەمامـەوە. میر کامـەران بەدرخان کـە لـە پاریـس دادەنیشـت و پەیوەندییەکـی باشـی بـە هەندێ کاربەدەسـتی حکوومەتـی فرانسـییەوە هەبـوو کورسـی خوێندنـی بـۆ چـوار خوێنـدکاری کـورد وەرگـرت بچـن خوێندنـی زانکۆیـان لـە فرانسـە تـەواو بکـەن. میـر بەدرخـان داوای لـە کۆمەڵـەی خویندکارانـی کـورد لـە ئەوروپـا KSSE کـرد چـوار کەسـی بـۆ پێشـنیار بـکات. لـە هەولێـر هۆمـەر دزەیـی، لـە سـلەیمانی سـەباح بابـان، لـە بادینـان رەفعـەت شـەهوانی ئامێـدی و لـە رۆژئاواشـەوە جەمیـل وەقـاس خەڵکـی عەفریـن ئـەم چـوارە دەستنیشـان کـران کـە هـەر هەمووشـمان لـە ئەوروپـا بوویـن.

سـاڵ 1961 بـوو و هەریەکـە لەلای خۆیـەوە رێـی پاریسـی گرتـە بـەر. فرانسـای ئـەو سـەردەمە بـەدەر لـە میـر بەدرخـان خـۆی و خاتـوو دریـة عەونـي هیـچ کوردێکـی تـری لـێ نەبـوو. دریـە کچـی مێژوونـووس و رۆشـەنبیری کـوردی میسـری محەمـەد عەلـی عەونـی بـوو و لـە پاریـس دەسـتبەکار بـوو. محەمـەد عەلـی عەونـی باوکـی کـە بـە ڕەچەڵـەک خەڵکـی دیاربەکـر بـوو لـە دیوانـی مەلیـک فوئـاد و پێـم وایـە هـی فاروقیشـا سـەرۆکی بەشـی تەرجومانـی بـووە.

ئێمە میر بەدرخانمان لە نزیکەوە دەناسی کە ساڵی 59 بەشداریی لە گۆنگرەی چوارەمی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد کردبوو لە ڤیەننا. لە پاریس دریە خان پێشوازیی لێ کردین و لە ئوتێلێکی دامەزراندین. لەپاشان ئێمەی برد بۆ خزمەت میر کە لەگەڵ (ناتوشکا)ی هاوسەرە بە بنەچە پۆلۆنییەکەی لە خانوویکی زۆر چکۆلانە دەژییان: یەک ژووری زۆر بچووکی نووستن و یەک ژووری زۆر بچووکی دانیشتن و خواردن لەگەڵ کونجێکی بچووکیش وەک ناندین. ناتوشکا خانم خواردنێکی سووکی بۆ ساز کردبووین و زۆر سوپاسی میرمان کرد و لەگەڵ دریە رۆیشتین.

هەڵبەت پاریس خەونی هەموو گەنجێکی جیهانە ببینێت. بەڵام ئێمە تەنها چەند رۆژێک لەوێ ماینەوە ئینجا سەرپەرشتکاری کاروباری بورس کە (مسیۆ رۆسی) ناوێک بوو ئێمە هەر چوارمانی نارد بۆ شاری بیزانسۆن لە نزیک سنووری سویسرا بۆ ئەوەی جارێ بۆ ماوەی ساڵێکی سکۆلار فێری زمانی فرانسی ببین ئینجا دوای ئەوە هەر یەکە بڕیاری خۆی بدات چ رشتەیەک بخوێنێ.

بیزانسۆن شارێکی بچووکی خنجیلانەی زانکۆیی بوو و کۆلێژێکی تایبەتی لە زانکۆکەی بۆ زمان و شارستانییەتی فرانسی تەرخان بوو. ئێمەیان لە ئوتێلێکی نزیک زانکۆ دامەزراند و کاروباری تۆمارکردن لە زانکۆ و هەروەها ناسنامەی مۆڵەتی مانەوەمان لە فرانسا لای پۆلیس تەواو کرد و بلیتی نانی نیوەڕۆ و ئێوارەمان لە زانکۆ هەمووی وەرگرت و مانگانەش پارەی ژیانیان بۆ بڕینەوە کە بیرم نەماوە چەند بوو. چون کۆلێژەکەمان هی فێربوونی زمان و شارستانییەتی فرانسی بوو (langue et civilisations Francaises) سرووشتانە پڕ بوو لە خوێندکاری بێگانە کە لە وڵاتانی جیاجیاوە هاتبوون. ئێمە دوو مامۆستای زمان و ئەدەبیاتمان هەبوو (مادمۆزێل شیکلێ) کە بەڕاستیش ژیکەڵ بوو و (مادمۆزێل ئیگۆنێ) کە وا نەبوو.

رۆژانـە دەوامـی خۆمـان بـە رێکوپێکـی دەکـرد و سیسـتەمی فێربوونـی زمانیـش مێتـۆدی (ئۆدیـۆ ڤیزوێـل audio visual) بـوو کـە هـەم بـە بینینـی فیلـم و هـەم بـە گوێگرتنـی ( دەنگبەنـد tape recorder)یـک دەنگەکانمـان بەچاکـی پێ بەلێو دەکـرا (بەلێوکـردن = pronunciation). ئەمـن بەبـێ بەخۆداهەڵگوتـن لـە بەلێوکردنـی دەنگـە فرانسـیەکان نـەک کێشـەم نەبـوو بەڵکـوو هیـچ یەکێـک لـە خوێندکارەکانـی دی نـە لەنـاو بیانییـەکان نـە لـە کوردەکانـی خۆشـمان لـەم رووەوە نەدەگەیشـتنە مـن. من هـەر یـەک جـار گوێـم لـە وشـەیەک بوایـە ئیتـر یەکسـەر کتومـت وەک فرانسـیەک بەلێـوم دەکـرد و دەرم دەبـڕی. رۆژێکیـان مادمۆزێـل شـیکلێ هاتـە بەردەمـم و لێـی پرسـیم ئەگـەر مـن موزیکـژەن یـان دەنگبێـژ بـم! پێـم گـوت راسـتە مـن هونەرمەنـدی دەنگـم بـەڵام چۆنـت زانـی بۆچـی ئـەم پرسـیارە هـەر لـە مـن ئەکەیـت؟ گوتـی ئاخـر مـن کـە مامۆسـتای زمانـم بـە زانسـت یـەکلا بووەتـەوە ئەوانـەی کـە هونەرمەنـدی دەنـگ و موزیکـن ئەوانـە گوێچکەیـان بـۆ فێربوونـی زمـان و بەلێوکردنـی دەنگـی تیپەکانـی وشـە زۆر هەسـتیارترە تـا خەڵکـی تـر واتـا گوێچکەیەکـی موزیکاڵیـان هەیـە. گوتـم دیـارە وایـە چونکـە ئێسـتا کـەوا فرانسـیش فێـر دەبـم ئـەوە دەبێتـە شەشـەمین زمـان کـە دەیانزانـم و تەمەنیشـم تـازە خـۆی لـە 24 سـاڵی داوە. گوتـم مـن بێجگـە لـە زمانـی دایـک کـە کوردییـە، عەرەبـی، تورکـی، ئاڵمانـی، ئینگلیـزی دەزانـم و بـە فارسـییش خـۆم دەربـاز دەکـەم. گوتـی هـەر لـە رۆژی یەکەمـەوە هەسـتم کـرد دەبـێ تـۆ هونەرمەنـد بیـت. هەڵبـەت مـن خـۆم ئەمـەم نەدەزانـی و لـەو مامۆسـتایەم فێـر بـووم کـە پەیوەنـدی هەیـە لەنێـوان کوێچکـەی موزیـکاڵ و فێربوونـی زمـان.

ژیانـی خوێندکاریـم لـە ژینگـەی زانکـۆدا زۆر خـۆش بـوو. ئێـواران هەمیشـە بۆنەیەکـی پـڕ لـە بـەزم و رەزم هـەر دەبـوو کـە ئـەو هەمـوو خوێنـدکارە بیانـی و فرانسـیانە تێکـەڵ بـە یەکتـری دەبـوون و دەبـوو بـە دانـس و گۆرانـی و حەزحەزۆکـێ. کۆڵێـک گۆرانیـی میللیـی فرانسـی لـەو بۆنانـە فێـر بـووم کـە ئێسـتاش هەندێکیانـم لـە بیـر مـاوە.

ئەو ساڵەی بیزانسۆنیشم یەکێک لە ساڵە خۆشەکانی ژیانی ئەورووپام بوو. لە سێ لاوە دڵم ئاسوودە و ئارام بوو: خوێندنێکی خۆش کە چێژم لێ وەردەگرت، مووچەیەکی رێکوپێک کە هەموو مانگێ بەبێ دواکەوتن وەرمان دەگرت و پەیوەندیەکی خۆشەویستیشم لەگەڵ کچە ئاڵمانێک (ئینگە فرانکە Inge Franke) کە ئەویش بۆ ساڵێک هاتبوو زمان و ئەدەبیاتی فرانسی بخوێنێ.

ئەوەی کە دڵی زۆر خۆش دەکردم ئەوە بوو کە لەو ساڵەی خوێندنی زمانم لە بیزانسۆن تەنها وانەی زمانی فرانسیان پێ نەدەگوتین بەڵکوو کورتەیەکی مێژووی ئەدەبیاتی فرانسیش قۆناخ بە قۆناخ لە رێنێسانسەوە تا سەدەی بیستەم. ئەوە بۆ من و لەگەڵ حەز و ئارەزووی من پڕ بەپێستی خۆی بوو. ئەو ساڵە کەوتمە ناو ژیانی شاعیرانی ناوداری فرانسی و چێژێکی زۆرم لە شیعرەکانیان و لە چیرۆکی ژیانی تایبەتیان وەردەگرت. لەلایەکی تریشەوە ئینگە فرانکەی کچە ئاڵمانی دۆستم ئەویش ئاشقی شیعر و ئەدەبیات بوو و ئەویش لەلای خۆیەوە خۆشەویستیی شیعری رۆمانتیکی ئاڵمانی لە هەست و هۆشمدا رواند.

جا ئێستا با ئەم لایەنە بنێین بە لاوە. بەڵام لە بوارێکی ترا جۆرە بەدبەختیەکی دیکە رووی لە من کردبوو. ئەمن سەرەڕای ئەوەی کە مانگانەی بورسەکەم بە رێکوپێکی وەردەگرت و گرفتی بێ پارەیم نەبوو کەچی نەمدەزانی چۆن چۆنی پارە خەرج بکەم. هەر کە مانگانەکەم وەردەگرت یەکسەر تاوم دەدا کڕینی کتێب و قەوان و جلی جوان و هەر چییەکی دڵم ئارەزووی بکردایە. دوانزدە فۆلیومی کتێبێکی زۆر جوان لەچاپدراوی (مێژووی ئەدەبیاتی فرانسی)م کڕی بە 1200 فرانک بە قیستی مانگانە. چون بیزانسۆن لە شاری لۆزانی سویسریشەوە زۆر نزیک بوو و عیسمەت شەریفی سەرۆکی کۆمەڵەکەی خوێندکارانمان لەوێ دەژیا ئیتر زوو زوو بە شەمەندەفەر سەردانیم دەکرد و ویکئێندان لەوێ لە ئوتێلێک دەمامەوە.

ئاخر ئەمە بۆ خوێندکارێکی بورس وەرگر هەمووی گران دەوەستا. بە کورتی هەتا بڵێیت بێ سەروبەر و کەمزان بووم لە ڕێکخستنی باری دارایی خۆم و لەناوەڕاستی مانگا پارەم لێ دەبڕا. بەڵام چون سەرەمانگ نزیک بوو قەرزکردنیش ئاسان بوو. زۆر درەنگتر لە کتێبان بۆم دەرکەوت کە هونەرمەند بە گشتی چەند سەرکەوتوو بن لە هونەرەکەیان ئەوەندەش دواکەوتوون لە ڕێکخستنی گیزدانی پارە و پووڵیان. هونەرمەندی گەورەی موزیک مۆزارت یەکێک بووە لە نموونەی بێسەروبەری لە پارە خەرج کردنا. هەرچی دەستی دەکەوت - باشیشی دەست دەکەوت - یەکسەر تەواوی دەکرد و دەکەوتە قەرزکردن لە برادەرانی. ژنەکەی نەبوا بە لاتی و قەرزاری دەمرد. ئەمنیش لەم ڕووەوە کتومت وەک مۆزارت بووم. هەتا رووناس گیانی هاوسەرم مارە نەکردبوو هەرچەندە کە زۆریش لە خۆم بچووکترە حاڵم حاڵی مۆزارت بوو بۆیە هێندەی یەک دونیا منەتباری فێرست لێیدی خۆمم کە تەرازووە لاسەنگەکەی بودجەی بۆ هاوسەنگ کردمەوە.

ساڵی خوێندنی بیزانسۆن بە ئەنجام گەیشت. هاوین داهات و منیش بارم کرد بۆ پاریس بۆ ئەوەی لەوێ لە چەند مانگی هاوینیشا لە قوتابخانەی بەناوبانگی فێربوونی زمانی فرانسی (ئەلیانس فرانسێز Alliance Francaise) دەوام بە کۆرسەکانی زمان بدەم بۆ باشتر فێربوونی. ئەوەش هەمووی لەسەر حیسابی حکوومەتی فرانسی بوو. بەڵام قوتابخانە چۆن قوتابخانەیەک ! جوانترین کچی دونیا لە هەموو رەسەن و رەگەزێکا کە تا ئێستا لە ژیانی خۆما بینیبیەتم لەو قوتابخانەیەت بەدی دەکرد. پیشەی شارەزایانی فیلمی سینەمایی فرانسی و ئی هۆلیودیش بوو کە ناوە ناوە دەهاتنە ئەو قوتابخانەیە و لە کافتریاکەیدا خۆیان مەڵاس دەدا، بە دوای کچی جوان جوان دەگەڕان بیانقۆزنەوە بیانکەن بە ئاکتریسی سینەما.

لـە پاریـس چەندیـن خەوخانـەی خوێنـدکاران (dormitory) هەبـوو کـە هەندێکیـان لەنـاو شـار و هەندێکیـان کەمێـک لـە دەرەوەی شـار بـوون بـە تایبەتـی لـە ناوچـەی (ئانتۆنـی Antony). هاوینـان چونکـە زۆرێـک لـە خوێنـدکاران ئەوێیـان چـۆڵ دەکـرد دەگەڕانـەوە بـۆ ماڵـە باوانیـان ژوورێکـی زۆر دەمانـەوە بـۆ کـرێ و کرێکـەش کـەم بـوو. ئەوە بـوو کـە ژوورێکـی باشـم دەسـت کـەوت لـە خەوخانـەی بەناوبانگـی خوێنـدکاران بـەناوی (سیـتێ ئونیڤەرسیتێـر Cite Universitaire) واتا شاری زانکۆ لە (شـەقامی ژووردان Boulevard Jourdain). خواردنیـش لـەو خەوخانانـە زۆر هـەرزان بـوو و دەبوایـە بلیتـی رۆژانـە، هەفتانـە، یـان مانگانـە بکڕیـن بـۆ نانخـواردن.

دیسـان دەتوانـم بڵێـم کـە ژیـان لـەو خەوخانانـە بەڕاسـتی خـۆش بـوو، کـچ و کـوڕ تێکـەڵاو بـوون و هەمـوو ئێوارانیـش بۆنەیەکـی موزیـک و گۆرانـی و دانسـکردن یـان نمایشـکردنی فیلمـی سینەمایی لـە یەکێـک لـە باڵاخانـە زۆرەکانـی خەوخانەکانـا هەبـوو.

میـر بەدرخـان لـەو بـاوەڕەدا بـوو کـە چونکـە ئەوەنـدە حەزم لـە هونەرە و چونکـە خوێندنـی موزیکیـش تـازە بـەم تەمەنـەم و بـە باکگراوندێکـی سـفر لـە موزیـکا لـە هیـچ شـوێنێکا وەرناگیرێـم بۆیـە پێشـنیاری بـۆ کـردم سـینەماتۆگرافی (سـینەماکاری) بخوێنـم. بـەڵام مـن ئـەوەم بـەدڵ نەبـوو و دەمویسـت زانسـتی سیاسـی کـە لـە ڤیەننـا دەسـتم پـێ کردبـوو هـەر ئـەوە تـەواو بکـەم.

بیـرم نەمـاوە هـەر ئەوسـاڵە بـوو یـان سـاڵ سـووڕابۆوە بـۆ 62 کـە کۆنـە دۆستە جوانەکـەی ئیسـلاندیم (ئەلیزابێـت ئێرلینگسـدۆتیر) کـە لـە مۆسـکۆ بووبوویـن بـە دۆسـت و گـراوی یەکتـری نامەیەکـی بـۆ نـاردم دەیـەوێ سـەردانم بـکات لـە پاریـس. مـن ژووری خـۆم لـە خەوخانـە بـوو و بـۆم نەدەبـوو نەفەرێکـی تـر بـە میـوان راگـرم هەرچەنـدە کـە زۆر لـە کـچ و کـوڕەکان شـەوان بـە فڕوفێـڵ بەیەکـەوە دەمانـەوە. بۆیـە ژوورێکـم لـە ئوتێلێکـی (بولڤـار سـان میشـێل Bld St.Michel) لـە گەڕەکـی لاتینـی بـۆ

ئەلیزابێت بەکرێ گرت و بە گوڵێکی سوورەوە چوومە فرۆکەخانەی ئۆرلی Orly بۆ پێشوازیکردنی. ئەلیزابێت جووتێ قۆپچەی زیوینی قۆڵی کراس و زنجیرێکی کلیلی بە نەخشەی ئیسلاندی بە دیاری بۆ هێنابووم. ئەو چەند شەوەی لە پاریس مایەوە ئەمن میوانی شەوانی ئەو بووم. ئەلیزابێت پێی گوتم کە باوکی پێی گوتووە مادام ئەو کوڕەت هێندە خۆش دەوێ دەتنێرم بۆ لای لە پاریس ئەگەر پێک هاتن بۆخۆتان هاوسەرگیری ببەستن و منیش پیرۆزبایی‌اتن لێ دەکەم. جا ئەلیزابێت گوتی وا من بۆ ئەوە هاتووم.

ئێ ئەمن بەڕاستی تووشی ئیحراجییەکی گەورە بووم چونکە جارێ چ بە نیازی ژنهێنان نەبووم. با لەوەش راشکاوتر بم: لە پاریس ئەوەندە کەوتبوومە نێو کچی جوان جوانی ئەلیانس فرانسێز کە دۆستەکانی پێشووم هەر بە نامە گۆڕینەوە بەخۆما بەستبوونەوە ئەگینا چ بەتەمای پەیوەندیی جددی نەمابووم لەگەڵیانا. بە ئەلیزابێتم گوت کە من جارێ هێشتا خوێندکارم و ناتوانم ژن بێنم بۆیە باشترە کە بگەڕێتەوە بۆ ئیسلاند و ئەگەر هەلی شووکردنی بە یەکێکی تر بۆ هەڵکەوت با لەبەر من هەلەکە لەدەست خۆی نەدات و شوو بکات. ئەوەشم پێ گوت کە بزووتنەوەی چەکدارییش وا لەنێوان کورد و بەغدا بەرپا بووە و ئیتر نازانم بارودۆخی خوێندن و دارایی منیش بە چ کەرخێکا لار ئەبێتەوە. بەم جۆرە و بە داخێکی زۆریشەوە ئەلیزابێتم بە دڵشکاوی و بە چاوی پڕ لە گریانییەوە رەوانەی رێیکاڤیک Rejkavik کردەوە. هەر بۆ زانیاریش: دایکی ئەلیزابێت خوشکی ژنی سەرەک کۆماری ئەوساکەی ئیسلاندا بوو. دە تۆ وەرە سەیری ئەم بەدبەختییەی من بکە: کچێکی ئەوەندە جوان، لە خانەوادەیەکی ئەوەندە بەڕێز، وا بە پێی خۆی بۆت هاتووە داوات لێ دەکات مێردت پێ بکات ئێ کوڕێ بابم ئەتۆیەکی لادێیی، لە کوردستانێکی دواکەوتووەوە هاتوو، کە گرد و هەرد و تەلانی دووگردکانێکی رەقوتەق نەما بە پای پەتی نەیپێویت و دڕکە زەردە و قونجرکەی ئەو دەشتە نەما لە بنی پێی

خاوست رانەچێ، هێشتا ئەتۆ بە کیژۆڵەیەکی ناسکونازداری ولاتێکی سکاندیناڤیای پێشکەوتوو سەرگرانی! کورە دە لێ گەڕێ با کۆنە برینم نەکولێنەوە. ئەلیزابێتم بەڕێ کرد و لەوێشەوە بەدوا وردە وردە ئیتر نامە گۆڕینەوەشمان کەم بوەوە تا بە تەواوی پەیوەندیمان پچڕا. لەم ساڵانەی دوایی بەدوایدا گەڕام و دۆزیمەوە بەڵام با ئەمە بمێنێ بۆ گێڕانەوەی چیرۆکەکانی دواتر چونکە ئەگەر زۆر پەیوەندیدار نەبێ نامەوێ بەسەر زنجیرەی تەمەنا باز بدەم.

برادەرێکی دێرینی ساڵانی چلەکانم (زۆزک رەواندزی) برای وریا رەواندزی برادەری ڤیەننام هاتە پاریس بۆ خوێندنی دکتۆرا لە قانوون. زۆزک لە زانکۆی شاری (ئێکس ئان پرۆڤانس Aix en Provence) وەرگیرابوو دکتۆراکەی تەواو بکات. ئەو منیشی ئیقناع کرد لەگەڵیا بچم بۆ ئەوێ و لەوێ زانستی سیاسییەکەم بخوێنم. زۆزک دەیگوت عومەر گیان، بەو خوایە هەتا لە پاریس بیت لەبەر ئەو کەشەی کە بەدڵی هەموو گەنجێکی نێرینە و مێیینەی دونیا بوو رەنگە لەبەر ئەو هەموو کچە جوانانە خوێندنت پێ نەکرێ. قسەکانی زۆزکم پێ راست بوو و پێکەوە چووینە ئێکس ئان پرۆڤانس.

## شارە خنجیلانەکەی ئێکس ئان پرۆڤانس

لـەوێ زۆزک دەسـتی بـە خوێنـدن کـرد و منیـش لـە کۆلێـژی زانسـتە سیاسـیەکان، بـە فەرەنسـی Sciences Politiques خـۆم تۆمـار کـرد. بـەڵام ئەوەنـدی دەمکـرد نەدەکەوتمـەوە سـەر خوێنـدن. شـاری ئێکـس ئـان پرۆڤانـس زاگـەی هونەرمەنـدی بۆیـەکاری فرانسـی پـۆڵ سـێزان Paul Cezanne بـوو و چالاکیـی کولتووریـی زۆری لـێ بـوو. بەندەرشـاری مارسـێلیا لـە ئێمـەوە نزیـک بـوو و رابواردنـی شـەوانی ئـەوێ زۆر خۆشـتر بـوو تـا لـە شـارەکەی ئێمـە. بۆیـە ویکێنـدان بـە زۆری دەچوومـە مارسـێلیا. دوو عەرەبـی عیراقیـش لـە زانکـۆی ئێکـس ئـان پرۆڤانـس ئەوانیـش وەک زۆزک دکتـۆرای قانوونیـان دەکـرد، اقبـال الفلوجي کـە قەومیەکـی عەرەبـی بـوو و خەزعـەل ناوێکیـش کـە مەیلـی شـیوعیەتی هەبـوو و هەردووکیـان زۆر رکیـان لـە یەکتـری دەبـۆوە. جاروبـار لەگەڵیانـا دادەنیشـتین بـەڵام مـن زیاتـر لـە زۆزک چونکـە ئـەو لەبـەر خوێنـدن چوونـە دەرەوەی کـەم بـوو.

بـۆ ئـەوەی بورسـی خوێندنەکـەم بـەردەوام بێـت دەبوایـە کۆتایی سـاڵی خوێنـدن فۆرمێـک پـڕ بکەمـەوە و تێیـدا هەرچییەکـی خوێندوومـە تۆمـار بکـەم. مـن هیچـم نەبـوو و لەپڕێـکا بورسـەکەیان لـێ بریـم. ئەمجـارە چارم نەمـا هاوینـی 62 گەڕامـەوە بـۆ کوردسـتان و شـەڕێکی گـەورەم لەسـەر پـارە لەگـەڵ براکانـم کـرد کـە وەک دەبینـن هـەر خۆشـم گوناهبـار بـووم. هەوڵێکـی زۆرم دا بـە رێـگای برادەرێکـی بنەماڵەکەمانـەوە (عومـەی مەولـود عـەدێ) یـادی بەخێـر، بەشـە مولکـی خـۆم بفرۆشـم بـەڵام بـۆم نەکـرا. هـەر چۆنێکـی بـێ هەنـدێ پارەیـان دامـێ کـە هەرنەبـێ بەشـێکی خوێندنەکەمـی پـێ تـەواو بکـەم بەڵکـوو بورسـەکەم پـێ بدەنـەوە و ئیتـر بـە رێـگای ئەسـتەمبۆڵ دیسـان گەڕامـەوە بـۆ پاریـس. لـە ئەسـتەمبۆڵ

ئامۆزایەکی خۆمی لێ بوو بۆ خوێندن (موحسین عەلی دزەیی) چەند رۆژێک لەگەڵ ئەودا مامەوە و رێی پاریسم گرتەوە بەر.

پایزی 62 گەڕامەوە بۆ پاریس و نەچوومەوە بۆ تەواوکردنی خوێندنم لە زانکۆی ئێکس ئان پرۆڤانس. پاریس بوو کە هەمیشە رایدەکێشام. ئەمجارە و بۆ ئەوەی مافی مانەوەم وەک خوێندکارێکی بیانی لە فرانسا پێ بدرێت چووم خۆم تۆمار کرد لە بەشی کوردی (قوتابخانەی نەتەوەیی زمانە رۆژهەلاتیە زیندووەکان Ecole Nationale des Langues Orientales Vivantes) کە بەم کورتکراوەییە (لانگزۆ langueso) لەناو خەڵکا باو بوو. بەشی کوردی بەشێکی زۆر بچووک و دەسکورت بوو لە ناو زمانە رۆژهەلاتیەکانی دیکە و خوێندنیش بە شێوەزاری کرمانجی بوو. مامۆستامان تەنها میر کامەران بەدرخان خۆی بوو. قوتابیش لە زەمانی من هەر چوار پێنج کەس بووین، من و جەمیل وەقاس و دواتر زۆزگ رەواندزی و عەباس و خانمێکی فرانسی (جۆیس بلۆ Joice Blau) و کوڕێکی تری فرانسیش. دواتر دوای چەند ساڵێک کە میر بەدرخان کۆچی دوایی کرد بیستم کە هەڵکەوت حەکیم و (جۆیس بلۆ)ش بەڕێوەبردنی بەشە کوردیەکەیان پێ سپێردرابوو. بەرنامەی خوێندنیش فێربوونی زمانی کوردی کرمانجی بە ئەلفبای لاتین بوو لەگەڵ هەندێ نامیلکەی چیرۆک و ئەدەبیاتی کوردی. هەموو ئەو بەرنامانە جەنابی میر بەدرخان خۆی ئامادەی دەکردن بە چاپی دەگەیاندن و سەرەڕای تەمەنی گەورەشی بەڕاستی ئەرکێکی زۆری دەکێشا. جەنابی میر ساڵانە دەبوایە هەوڵی زۆریش بدات خوێندکار پەیا بکات دەنا بەشە کوردیەکە لەو کۆلێژە دادەخرا. هەر چۆنێکی بێ من سوودێکی زۆر باشم لەو خوێندنە وەرگرت و شێوەزار و رێزمانی کوردی کرمانجی بەجوانی فێر بووم کە شانازیی پێوە دەکەم.

بزووتنەوە چەکداریەکەی کورد لە کوردستانی عێراق لە دژی حکوومەتی عەبدولکەریم قاسم رۆژ بەڕۆژ گەرمتر دەبوو.

ئێمـەی کـوردی ئەورووپـاش چالاکییەکـی گەرموگوڕمـان لـە دەرەوە دەکـرد بـۆ پشـتیوانیی بزووتنەوەکـە کـە وردە وردە خەریـک بـوو ببـێ بە شۆڕشێکی نەتەوەیـی گـەورە لـە تـەواوی کوردسـتانی عێراقـا. زۆر لـە ئێمـەی کـوردی ئەوروپـا کـە چالاکیـی سیاسـیمان هەبـوو باڵوێزخانەکانـی عێـراق لـە ئەوروپـا یـان پاسـپۆرتیان بـۆ تـازە نەدەکردنـەوە یـان هـەر لێشـی دەسـەندنەوە. کاک سـەعدیی بـرام کـە لـە ئینگلتـەرە دەیخوێنـد بـۆی نووسـیم ئـاگام لـە خـۆم بێـت نەچـم بـۆ باڵوێزخانـەی عێـراق چونکـە ناوی خـۆی و هـی منیـش لەنـاو لیسـتەی ئـەو ناوانـەن کـە حکوومەتـی عێـراق بڕیـاری پاسـپۆرت لێسـەندنەوەیانی داوە. کاک سـەعدی ئـەم هەواڵـەی لـە کاک (تەهـا محێدیـن)ەوە پـێ درابـوو کـە ئەوسـا دیپلۆماتێکـی عێـراق بـوو لـە باڵوێزخانـەی عێراقـی لـە لەنـدەن. کاک تەهـا، یـادی بەخێـر کوردپەروەرێکـی زۆر دڵسـۆزی بزووتنـەوە چەکدارییەکـەی کـورد بـوو، هەڵبەتـا لـە ژێـرەوە و وێ دەچـێ پەیوەندیـی نهێنییشـی بـە مـام جەلالـەوە بووبـێ.

هۆمەر و ئینگە فرانکە 1961

هۆمەر و ئینگە لە بیزانسۆن 1961

هۆمەر و ئینگە لەگەڵ برادەرانیان لە کافتریای زانکۆی بیزانسۆن 1961

لە چەپەوە: هۆمەر دزەیی، رەفعەت ئامێدی، سەباح بابان لە بیزانسۆن 1961

لە راستەوە: ئینگە، هۆمەر، ئیرمهیلد، ئێڤا، ماکارثی 1961 لە بیزانسۆن

هۆمەر و ئینگە لە سویسرا 1961

هۆمەر و ئینگە لە دەریاچەی لیمان لە سویسرا 1961

من و موحسین عەلی دزەیی ئامۆزام لە
ئەستەمبوڵ، پایزی 1962

لە راستەوە: هۆمەر ، سیمۆن ، زۆزگ رەواندزی
لە ئێکس ئان پرۆڤانس کۆتایی ساڵی 61 یان 62

من و سیمۆنی دۆستم لە ئێکس ئان پرۆڤانس ساڵی کۆتایی 61 یان 62

شاری بیزانسۆن لە فرانسا

تابلۆی «کارتبازان » هی پۆڵ سێزان، رۆڵەی شاری ئێکس ئان پرۆڤانس

ئەلیاس فرانسێز، قوتابخانەی ناوداری زمانی فرانسی لە پاریس. کچی جوانی دونیا وا لە وێن

دیمەنێکی شاری ئێکس ئان پرۆڤانس لە باشووری فرانسا

# بەشی 17

## دیسان گەڕانەوەم بۆ عیراق

ساڵ سووڕایەوە بۆ 1963 و کودەتا سەربازییەکەی حزبی بەعسی عەرەبی لە ڕۆژی 8/2 سەرکەوت، قاسمیان کوشت و دەسەڵاتیان گرتە دەست. یەکسەر شەڕیان لەگەڵ کوردا ڕاگرت و داوای دان و سەندنیان لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆڕشا کرد. چالاکوانە کوردەکانی دەرەوەی عێراقیش لێبووردنی گشتیان بۆ دەرچوو و توانییان سەردانی کەسوکاریان لە کوردستان بکەنەوە.

منیش کە لە ژیانی قەرەج ئاسای خۆم ڕادەمام، بێ ئامانج، هەر ڕۆژە لە شارێک، زۆر جار بە لاتی بەڵام هەر بە تموحاتێکی زۆرەوە، تموحاتێکیش کە ئاسۆی بەدیهاتنی هەر لێم دوور دەکەوتەوە. بەڕاستی خۆم خۆمم سووک دەهاتە بەرچاو و سەرم لە خۆم شێواندبوو و نەمدەزانی چیم دەوێت و چۆن چارەیەک بۆ ئەو بارە ئاڵۆز و تێکقڕاوەی دەروونم بدۆزمەوە. کە لە پاریس دەچوومە کۆنسێرتەکانی ئێدیت پیاف Edith Piaf و ژولێیت گرێکۆ Juliette Greco و ئیف مۆنتان Yves Montand و شارل ئازناڤور Charles Aznavour و میرەی ماتیۆ Mireille Mathieu ئەوەندەی دڵم پێ خۆش دەبوو هێندەش خەفەتم دەخوارد بۆچی منیش وا نەبووم کە بە تێگەیشتنی خۆم دەشکرا ببم. ئەم هەموو بیر و خەیاڵە تێکەڵ و پێکەڵانە پاڵیان پێوە نام هەڵێم، ڕاکەم، دوور کەومەوە لەو کەش و ژینگە کوشندەیە. ئەوە بوو کە بڕیارم دا دیسان سەردانێکی وڵات بکەمەوە هەرچەندە کە لە پایزی پێشتریش لەوێ بووم.

گەیشتمەوە کوردستان و بینیم ئەمجارە خەڵکەکە بە ئازادی و سەربڵندییەوە دەتوانن قسە بکەن. جۆشی کوردایەتی گڕی سەندبوو چونکە دیار بوو بەغدا بۆی دەر کەوتبوو دەرەقەتی کورد نایەت و بۆی دانواندووە.

حکوومەتی بەعس داوای لە سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد کردبوو دەلەگاسیۆنێک بۆ وتووێژ بنێرێ بۆ بەغدا.

جا پێم وایە لە کۆتایی مانگی رەشەمە یان سەرەتای مانگی نەورۆز بوو کە سەرکردایەتیی شۆڕش بڕیاری دا کۆبوونەوەیەکی گەورە لە شاری کۆیە بکات و لەوێ دەلەگاسیۆنەکە بۆ بەغدا هەڵبژێرن.

ئەمن لە هەولێر بووم و چ بە تەمای بەشداریکردنی ئەو کۆبوونەوەی کۆیە نەبووم. رۆژی پێش کۆبوونەوەکە کە بیرم نەماوە چ رۆژێک بوو لەپڕێکا فوئاد ئەحمەد عوسمانی پوورزام لەگەڵ تەحسین هەورامی برادەری سالانی ئەورووپام لە بەغداوە هاتبوون لێم پەیا بوون و گوتیان هەڵسە لەگەڵمان بچینە کۆیە بۆ بەشداریکردن لەو کۆبوونەوە گرنگە گەورەیە کە یەکەم جارە سەرکردایەتیی شۆڕش بە رەزامەندیی حکوومەتی عێراق ئەنجامی دەدا. منیش زۆرم پێ خۆش بوو و هەرسێکمان بە ئۆتۆمۆبیلە فۆرد فالکۆنە رەنگ سەوزە تاریکەکەی فوئاد کەوتینە رێ بۆ کۆیە. هەر من چاوساغیان بووم و شارەزای ئەو ناوە بووم ئەوان ئەو ناوەیان کەم دیبوو و تەحسین هەورامی هەر نەیدیبوو. رێوبانی ئەو زەمانی وەک ئەوانەی ئەمڕۆ هەمووی قیرتاو نەبوون و بە جرەجر خۆمان گەیاندە کۆیە. لەوێ سەرپەرشتکارانی کۆبوونەوەکە میوانەکانیان بەسەر ئۆتێل و مالاندا دابەش دەکرد. باش بوو بەرپرسی ئێمە کاک کەمال محێدینی خزم و برادەری خۆم بوو. ئەو ئێمەی برد بۆ ماڵی کاک تایەر عەزیز لەوێ دایمەزراندین. بۆ مێژوو: کاک تایەر یادی بەخێر کە کوردپەروەرێکی کەم وێنەی سەردەمی خۆی بوو بە خاوخێزانەوە

بەو پەڕی چاوتێرییەوە میواندارییان کردین. کاک تایەر هەروەها بابی کاک هەڵشۆیە کە هەم راوێژکاری جەنابی مام جەلال بوو و هەم ئی جەنابی دکتۆر فوئاد مەعسومیشە لە سەرۆکایەتی کۆماری عێراقا.

ڕۆژی دواتر چووین بۆ کۆبوونەوەکە کە لە قوتابخانەیەک دەگیرا. بۆ من ئەوە یەکەمجار بوو رابەری ئەفسانەیی کورد مەلا مستەفای بارزانی ببینم. هۆڵی گەورەی قوتابخانەکە جمەی دەهات لە دانیشتووان. شوێنی دانیشتنی ئێمە هەرسێکمان و کاک کەمال محێدینیش لەگەڵمانا لە ریزی پشت ناوەڕاستا بوو نە زۆر دوور نە زۆر نزیک لە ستێگەکەوە. هەرچوار دەوری قوتابخانەکەش بە پێشمەرگە ئابلۆقە درابوو. کۆیەش بە کووچە و کۆڵان و بازاڕیەوە پڕ بوو لە پێشمەرگە و هەستێکی شانازی بوو بۆ هەر کوردێکی لەوێ بوایە.

ستێگێکی جوانیان رازاندبۆوە و شوێنی دانیشتنی پانزدە بیست کەسێکی لێ داندرابوو لە سەرکردەکانی شۆڕش و پیاوماقوولانی دیکەش کە پشتیوانی شۆڕش بوون. ئەوانەی لەبیرم مابن ئەمانە بوون: مەلا مستەفای بارزانی، شێخ لەتیفی شێخ مەحمود، کاکەزیادی حەماغای کۆیە، حەمەرەشید خانی بانە، جەنابی مەلا مەعسوم (باوکی دکتۆر فوئادی سەرکۆماری ئێستای عێراق)، پێم وایە کاکەحسێنی سەید ئەحمەدی خانەقا و و کاکەحەمەی برای، شێخ حوسێنی بۆسکین، عەباسی مامەند ئاغا و ئیبراهیم ئەحمەد و مام جەلال و پێم وایە هەندێ لە ئەندامانی تری مەکتەبی سیاسی پارتیش.

مام جەلال هەڵسووڕێنەری کۆبوونەوەکە بوو و ئەو بە پێوە بوو لە لایەکی ستێگەکە بە مایکرۆفۆن قسەی دەکرد. هەڵوێستێکی حەمە رەشید خانی بانەم هێشتا چاک لەبەر چاوە کە هەڵسایەوە تفەنگەکەی بەرز کردەوە گوتی: "مەلا مستەفا من خۆم و عەشرەتەکەم بە دڵ و بە گیان لەگەڵتایین." ئینجا لەپاشان هەڵبژاردن بۆ دەسنیشانکردنی ئەندامانی دەلەگاسیۆنەکە بە شێوەیەکی دیمۆکراتیکانە کرا. کەمال محێدین کە بە تەنشتمەوە دانیشتبوو بە منی گوت منیش پێشنیاری

تـۆ دەکـەم وەک نوێنـەری کۆمەڵـەی خوێندکارانـی کـورد لـە ئەوروپـا ئەندامـی دەلەگاسـیۆنەکە بێـت. مـن پێـم خـۆش نەبـوو و داوام لـێ کـرد نـاوی مـن نەهێنـێ. بـەڵام کاک کەمـال هەڵسـایەوە پێشـنیارەکەی هـەر کـرد. پێشـنیارەکە دەنگـی کەمـی هێنـا و ڕەت کرایـەوە چونکـە گوتیـان نامانـەوێ ئاسـتی دەلەگاسـیۆنەکە دابەزێنیـن بـۆ ئاسـتی خوێندکارانـەوە.

لەپاش کۆبوونەوەکـە مـام جـەلال دوای چاکوچۆنییەکـی گـەرم پێـی گوتـم وا سـبەینی هێلیۆکۆپتەرمـان لـە بەغـداوە بـۆ دێ وەرە لەگەڵمـا چونکـە بەتەمایـن نەورۆزێکـی ڕەسـمیی زۆر گـەورە لـە بەغـدا بکەیـن. پێـم گـوت مـام جـەلال تـازە هاتوومەتـەوە، هێشـتا دایـک و خوشـک و کەسـوکارم بـە چاکـی نەدیـوە سـبەی نـا ئەگـەر توانیـم دواتـر ئـاگادارت دەکـەم و خـۆم دێـم بـۆ بەغـدا. نەشـچووم.

شایەسـتەی ئاماژەیـە کـە لـەو کۆبوونـەوەدا ئەمـن هەسـتم بـە جـۆرە سـاردییەک دەکـرد لەنێـوان بارزانـی و ئەندامانـی مەکتەبـی سیاسـی پارتیـدا. مـام جـەلال نەبـێ کـە هەمیشـە بزێـو بـوو ئەوانـی تـر پەردەیەکـی گوماناوییـان بـە ڕووەوە دیـار بـوو. بارزانـی ڕووی خـۆی زیاتـر دەدایـە سـەرەک عەشـایەرەکان تـا "ئەفەندیلـە سـەر ڕووتەکانـی" حزبەکـەی خـۆی.

کۆبوونـەوە کۆتایـی هـات، دەلەگاسـیۆن دانـدرا، مـن و فوئـادی پـوورزام و تەحسـین هەورامـی بـەڕێ کەوتینـەوە، منیـان لـە هەولێـر دانـا و خۆیـان گەڕانـەوە بـۆ بەغـدا.

چەندیـن کۆبوونـەوە کـرا لـە بەغـدا و چەندیـن دەلەگاسـیۆنی جیاجیای کـورد هـەم لـە بەشـداربووانی شـۆڕش هـەم لـە پیاوماقووڵانـی کـوردی دانیشـتووی بەغـدا و شـارەکانی تریـش لەگـەڵ کاربەدەسـتانی بەعسـا وتووێژیـان دەکـرد بەڵام نەگەیشـتنە یەک. بەعس دەیگـوت داخوازییەکانی کـورد (مطالـب تعجیزیـة) واتـا (لەتوانـای کەسـدا نییـە قەبووڵـی بـکات). هەڵبـەت ئەمـە وا نەبـوو و داخوازییەکانـی شـۆڕش مافێکـی زۆر ئاسـایی بـوو: دیمۆکراسـی بـۆ عێـراق و ئۆتۆنۆمـی بـۆ کوردسـتان. بـەڵام دیـار بـوو

حزبی بەعس پلانی دانابوو کە جارێ خۆی باش بچەسپێنێت ئینجا دەست بە هێرش بکاتەوە. ئەو پێشمەرگانەی کە لە ماوەی ئاگربەستا بۆ پشوو گەڕابوونەوە ناو کەسوکاریان هەموویان روویان کردەوە ناو شاخەکان. کەشێکی رەش و ترسناک دیسان باڵی بەسەر کوردستانا داکشاند و زۆرێک لە خەڵکی سیڤیلی ناو شار و دێهاتەکانی کە لە ماوەی وتووێژا ئاشکرا بووبوون لەگەڵ شۆڕشن ئەوانیش هەموو خۆیان دەشاردەوە یان بەگەڵ شۆڕش دەکەوتن. کاک ئەحمەدی براگەورەم لەگەڵ چەند چەکدارێک لە خزم و پیاوە نزیکەکانی خۆی ئەوانیش لە مانگی نەورۆزەوە خۆیان گەیاندبووە هێزی دەشتی هەولێر کە بنکەیەکی لە چیای قەرەچووغ و بنکەیەکیش لە ناوچەی گوندی قەشقە دانابوو.

لە بەغداش حزبی بەعس هەر خەریکی رەشبگیرییەکەی خۆی بوو و کوشتارێکی دڕندانەی نابۆوە و بەردەوامیش بوو لەناو ئەندامانی حزبی شیوعیی عیراقی و هەر عیراقییەکی تریش گومانی لێ بکردایە دژی بەعس و دژی (وحدة عربية)کەی جەمال عبدالناسر بن.

ئەوە بوو کە رۆژی 10ی مانگی شەشی ساڵی 1963 بوو کە حکوومەتی بەعسی بەغدا هێرشە بەدناوەکەی کردەوە سەر تەواوی کوردستان. جەنراڵ سالح مەهدی عەماش کە وەزیری بەرگریی بەعس بوو بەیاننامەیەکی بڵاو کردەوە گوتی شاڵاوی لەشکری عیراقی بۆ سەر موتەمەریدەکان تەنها "نزهة ترفيهية" واتا پیاسەیەکی رابواردنە. بەعس دەیگوت قاسم نەیزانیوە چۆن مامەڵە لەگەڵ موتەمەریدەکانا بکات ئێمە خۆمان دەزانین چۆن لەناویان دەبەین. دامودەزگا میدیاکانی دەوڵەت هەمووی تەرخان کرا رۆژانە راپۆرتەکانی شەڕ دووبارە و سێبارە بکەنەوە هەڵبەتا کە هەمووشی پڕ بوو لە درۆ و دەلەسە و پێوەنان. فڕۆکە جەنگییەکانی بەعس بە شێوەیەکی وەحشییانە دێهاتیان بۆردومان دەکرد، دەغڵودانی تەڕ و وشکیان دەسووتاند و ژن و کەسوکاری هەر پێشمەرگەیەکی کوردیش دەپەسترانە ناو زیندانانەوە.

وەک دەگێڕنـەوە لـە سـلێمانی (زەعیـم سـدیق)ی بەدنـاوی کیـن لـەدڵ بەرامبـەر بـە کـورد ژمارەیەکـی زۆری ڕۆشـەنبیرانی ئـەو شـارەی گـرت و ڕیـزی کردبـوون. وێنەیەکـی مـەلا مستەفای بارزانییـان دەبـردە بـەردەم یەکـە یەکەیـان کـە ئەگـەر سـووکایەتی پـێ بـکات (تفێـک لـە وێنەکـە بـکات) ئـەوا بـەری دەدەن وەگـەر نـا هەموویان لـەوێ گوللەبـاران دەکەن. یـەک تاکـە کـەس ئـەوەی نەکـرد و فیعلـەن لەسـەر ئـەوە هـەر هەموویـان لـەوێ گوللەبـاران کـران و شـەهید کـران. ئـەوەی کـە لەبیـرم مابـێ حاجی باقیـی کۆیـی یەکێـک لـەو شـەهیدانە بـوو کـە ئەوسـا مامۆسـتا بـوو لـە سـلێمانی.

سیاسـەتی بەعـس رووی خـۆی بـە تـەواوی ئاشـکرا کـرد کـە لـە پلانی دایـە کوردسـتان - یـان ئەگـەر بـۆی نەکـرا هەرنەبـێ ناوچـە نەفتییەکانـی کوردسـتان -تەعریـب بـکات (بیانعەرەبێنـێ). ئـەوە بـوو کـە لـە گەرمیـان و لـە دەشـتی کەندێنـاوەی دزەییـان کـە وەک دەڵێـن لەسـەر دەریایەکـی نەفتدایـە بـە زۆرەملـێ دانشـتووانی هەمـوو گوندەکانیـان گواسـتەوە بـۆ شـارەکان، عەرەبیـان لـە جێیانـدا دادەمەزرانـد، هەمـوو بەروبوومـی زەوی و زاری جووتیـارە کوردەکانیشـیان بـە خـەڵات دانـێ و بـە تاپـۆ کردنیـان بـە خاوەنـی ئـەو موڵـک و گوندانـە. عەشـرەتی حـواس کنعـان السـدید و مالـك کنعـان السـدیدی بـرای گوندەکانـی دەشـتی کەندێنـاوەی کوردانیان لەلایـەن بەعسـەوە پـێ درا کـە زۆریـان گونـدی ئامۆزاکانـی مـن بـوون.

یەکیەتیـی سـۆڤیەت ئـەم هێرشـەی بەعسـی بـە هـەل زانـی تۆڵـەی خـۆی بکاتـەوە بـۆ ئـەو کوشـتارەی کـە بەعسـییەکان دەرهـەق بـە شـیوعییە عیراقییەکانیـان کردبـوو. مۆسـکۆ خـۆی نـا، بـەڵام وڵاتـی مۆنگۆلیـای کـە کۆمونیسـت بـوو ڕاسـپارد کێشـەی کـورد لـە ئەنجومەنـی ئاسایشـی نەتـەوە یەکگرتووەکانـا بورووژێنێـت. ئـەوە کـرا بـەڵام چـون ئەوسـا شـەڕی سـارد لەنێـوان بـەرەی سۆسیالیسـت و بـەرەی کاپیتالیسـتا لـە گەرمەیـدا بـوو بۆیـە پێشـنیارەکەی مۆنگۆلیـا بەهەنـد وەرنەگیـرا و سـەری نەگـرت. خـۆ مۆسـکۆ خۆیشـی دەیزانـی سـەر ناگرێـت بـەڵام هـەر دەیویسـت شـتێک

بۆ مێژوو تۆمار بکات. مۆسکۆ نەیدەویست خۆی ئەو پێشنیارە بکات و جەمال عبدالناسر و بزووتنەوەکەی لە خۆی بتۆرێنێ بۆیە خۆی بەو کارە هەڵنەستا بەڵکوو بە وڵاتێکی دوورەپەرێزی بێ بایەخی وەک مۆنگۆلیای کرد کە هیچ بەرژەوەندییەکی وای لەگەڵ وڵاتانی عەرەبیدا نەبوو.

حەرەس قەومییەکانی حزبی بەعس ماڵ بە ماڵ لە شار و دێهاتی کوردستانا دەگەڕان و شەلمکوێرانە خەڵکیان دەگرت.

کاک موحسینی برام کە هەواڵێکی نهێنیی پێ گەیشتبوو فەرمانی گرتنی دەرچووە، ڕۆژی پێنجی ئەو مانگی شەشە بۆی دەرچوو خۆی گەیاندە ناو پێشمەرگە لە گوندی حەسارۆک و لەوێشەوە خۆی گەیاندە کۆیە و چووە ماڵی کاکەزیاد. من کە هەر بە سەردان لە فرانساوە گەڕابوومەوە بۆ کوردستان و دامنابوو بچمەوە پاریس نەوێرام بچمە بەغدا بۆ سەفەر و سەفەری ئەو زەمانیش بۆ دەرەوە هەر بە ڕێگای بەغداوە دەبوو. ئەوە بوو کە لەگەڵ وریای برازام ئێمەش بۆ چەند ڕۆژێک خۆمان شاردەوە تا ڕێگایەک دەدۆزینەوە خۆمان بگەیەنینە ناو پێشمەرگە. چەند ڕۆژێک لەگەڵ وریا لە تەکیەی خاڵە شێ محێدین خۆمان حەشار دا بەو حیسابەی کە حەرەس قەومی ناچێتە ناو تەکیە و مزگەوتەکانەوە. لە تەکیەکەش ئێمە خۆمان لای هەموو کەسێک ئاشکرا نەدەکرد و نەدەچووینە ناو میوانانی تەکیەکەوە بەڵکوو ژوورێکی بنەبانیان بۆ تەرخان کردبووین و هەر لەوێش سێ ژەمە نانیان بۆ دەهێناین. تاکوتەرا هەندێ لە خزمە نزیکەکانمان سەردانیان دەکردین. بەڵام دیار بوو ئاشکرا بووبووین بۆیە تەکیەمان جێ هێشت و ڕوومان کردە ماڵی خاڵم (شێخ جەوادی باوکی شێخ خالیس) ماوەیەکی زۆر کورتیش لەوێ گیر بووین، ئینجا گواستمانەوە بۆ ماڵی عەلی مام مستەفای مەلای ئامۆزام. هەڵبەت لەو ماوەیەش هەر بە ڕێگای ئەو خزمانەوە هەوڵ دەدرا ترومبێلێکمان بۆ بدۆزنەوە بمانگەیەنێتە بنکەیەکی پێشمەرگە. بەو ڕۆژی وا ڕەش هێچ تاکسییەک

نەدەویرا بە ریگای ئاسایی بە خالی پشکنیندا بچیت. ریگاکانی تریش هەمووی کەند و کۆسپە بوون کە کەم شوفیریک دلی دەهات تاکسی بن نزمی ئەو زەمانی خۆی پیدا ببات. حاجی سلیمان یادی بەخیر کە خەلکی گوندی قشاغلو بوو و تاکسییەکی فۆردی رەنگ شینی سەر سپیی هەبوو ئەو ئامادەیی خۆی پیشان دابوو گوتبووی هیچ خەمیان نەبێ ریگای وا دەناسێ کە هیچ عەرەبیک پەی پێ نابات و بەسەلامەتی دەمانبات بۆ بنکەی پیشمەرگە لە گوندی قەشقە. هەر حاجی سلیمانیش بوو کە چەند رۆژێ پیشتر کاک موحسینی براشمی گەیاندبووە گوندی حەسارۆک.

هەر واش کرا. لەگەل وریا خۆمان گەیاندە مالی کاک ئاغای رەحمان ئاغای ئامۆزام کە خالی وریاش بوو. جلی کوردیمان لەبەر کرد و هەندێ شروپری پێویست و چەند پاکێتیک بسکیت و خواردەمەنیی دیکەمان کردە ناو جانتایەکی بچووکەوە و ناوی خوامان لێ هێنا لەگەل حاجی سلیمان کەوتینە رێ. واقیعەن حاجی زۆر شارەزای ئەو دەشتە بوو. ئێمەی بە ریچکۆلەی پەنا گرد و گوندی وەهادا دەبرد کە من تەنها لە حەیرانان ناوەکانیانم بیستبوو.

ئۆخەی سەت ئۆخەی، بەبێ گرفت گەیشتینە گوندی قەشقە کە پڕ بوو لە پیشمەرگە. بەرپرسی پارتی لە بنکەکە حەمەی حاجی تایەری کۆیی بوو. کاک ئەحمەدی برام بابی وریا، سابیر ئاغای عەزیزی ئامۆزام، عومەری عەلی ئاغای ئامۆزام، تەلعەتی مشیری برایماغای ئامۆزام و هەندێ خزمی تریشم ئەوانەش هەموویان لەوێ پیشمەرگە بوون. بەداخەوە چەند هەفتەیەک پیشتر کەمالی رەشید ئاغای ئامۆزام هەر لەوناوە لە نزیک گوندی جل بەسەر شەوێکیان شەوگەرد پێیوە دابوو و گیانی لەدەست دابوو.

فرۆکە جەنگییەکانی بەعس رۆژانە دەهاتنە سەرمان و شوێنی جیاجیای ئەو ناوەیان بۆردومان دەکرد. ئێمە و دانشتووانی گوندیش خۆمان لە بنگەوەری کەند و کەندەلانەکانی ئەو ناوە مات دەکرد

تا فڕۆکەکە خۆی لە دەسرێژەکەی خاڵی دەکرد و دەڕۆیشت ئینجا ئێمەش لە کونێ دەهاتینە دەرەوە. بە داخەوە لە یەکێک لەو دەسرێژانەی فرۆکەکان پێشمەرگەیەکی دلێرمان شەهید بوو، حەسەنی برای مەلا عەولای ناسراو بە مەلا ماتۆڕ.

سەردەمی پێشمەرگایەتی 1964 لەچەپەوە: موحسین دزەیی، مارگریت جۆرج، هۆمەر دزەیی، عومەر میراو،حەیدەر پیرداود ، قادر مامە

وریا ئەحمەد حەمەدەمین برازای هۆمەر دزەیی، سەرەتای شۆڕشی ئەیلول

لە راستەوە: روشدی عەلی شەریف، کەمال محێدین، حەمەی حاجی تایەر ، هۆمەر دزەیی لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی بۆری لە دەرەوەی بەغدا

هۆمەر و تەحسین هەورامی لە ڤیەننا 1958

کاک ئەحمەد و کاک موحسین برایانی هۆمەر دزەیی سەردەمی پێشمەرگایەتی سەرەتای شۆڕشی ئەیلول.

سەردەمی پێشمەرگایەتی لە چەپەوە: سالح شێرە ، ئەحمەد حەمەدەمین برای هۆمەر، مەلا عەولاّ ناسراو بە مەلا ماتۆر.

لە ڕاستەوە: هۆمەر دزەیی، مام جەلال، عومەر هەڵمەت، عومەری سەید عەلی. کۆتایی نەوەدەکان لە ماڵی عومەر هەڵمەت لە مێریلاند، ئەمەریکا.

لە چەپەوە: هۆمەر دزەیی، مام جەلال ، سەرباخ هاوسەری دکتۆر بەرهەم ، دکتۆر بەرهەم سالح لە ماڵی دکتۆر بەرهەم لە ڤێرجینا ، ئەمەریکا کۆتایی نەوەدەکان.

# بەشی 18

## ساڵی پێشمەرگایەتیم و رادیۆی دەنگی کوردستان

لەگەڵ وریای برازام پێم وایە ماوەیەکی کورت لە بنکەی قەشقە ماینەوە. دیار بوو حەمەی حاجی تایەری بەرپرسی پارتی لەو بنکەیە مەکتەبی سیاسیی لە هاتنی من ئاگادار کردبوو. جا لەوێوە بۆیان نووسیبوو کە من رەوانەی لای ئەوان بکات چونکە رۆژنامەوانی بیانییان زۆر دەچنە لا و پێویستیان بە تەرجومانی زمان هەیە و منیش چەندین زمانی بیانیم دەزانی. تفەنگێکی، کە وابزانم دوانزدە میلیان پێ دەگوت، دامێ و لەگەڵ وریا و چەند پێشمەرگەیەکی دیکە قەشقەمان جێ هێشت بۆ بنکەیەکی تری پێشمەرگە لە حاجی قەلایێ. هەڵبەت سەفەرمان هەمووی بە پێیان بوو. بۆ ئێوارە گەیشتینە گوندی بانە مورد کە یەکێک بوو لە گوندە زۆرەکانی کاکەزیادی کۆیە. کاکەزیادی پیاوە ناودار و نازدارەکەی ئەو ناوچەیە بەدەر لە پەیوەندیی زۆر نزیکی هەر لە سەردەمانی حەماغای بابیەوە لەگەڵ بنەماڵەی ئێمەی دزەییدا یەکێک لە هاوسەرەکانیشی (دلارام خان) ئامۆزای دایکم بوو. مام نەجم سەرکاری کاکەزیاد بوو و ئێمەی ناسی نەیهێشت بڕۆین کاوڕێکی بۆ سەربڕین گوتی ئەو مێگەلەش هەمووی هی کاکەزیادە و دەزانم پەیوەندیی بنەماڵەی ئێوە لەگەڵ کاکەزیادا چۆنە بۆیە ئێرە وەک ماڵی خۆتان دابنێن. شەو لەوێ ماینەوە ماڵی ئاوا میوانداریەکی زۆر پیاوانەی کردین. بۆ بەیانی لەگەڵ مەلابانگدانێ رێمان گرتەوە بەر تا گەیشتینە حاجی قەلا. دیارە وریا لەمن باشتری لەبیر ماوە

كە دەڵێ دكتۆر خالید سەعید و خالید دلێری هونەرمەند و عوسمان سەرسوور دزەیی ئامۆزامان لەو بنكەیە بوون. چەند رۆژێكیش لەوێ ماینەوە ئینجا من ماڵاواییم لە وریا و لە برادەرانی دیكەی پێشمەرگە كرد لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەكی تر دیسان بە پێیان كەوتینەوە رێ بۆ مەكتەبی سیاسی كە بارەگاكەی لە گوندی عیساوێ لە نزیك ناحیەی ماوەت دانابوو زۆر دووریش نەبوو لە سنووری ئێران.

بیرمە گەیشتینە گوندی بێتواتەی خۆشناوان كە گوندێكی بە ئاو و رووباری زۆر و رەزو باخی مێوەداری هەمەجۆری لێ بوو كە بۆ ئێمەی لە دەشتی هەولێری رەق و وشكاهاتوو بەتایبەتی بەو قرچەی گەرمای هاوینە وەك بەهەشت وا بوو. خاوەنی گوند ئەنوەر بەگی بێتواتە بوو كە دایكی ئەویش (خەجاوە خان) ئامۆزایەكی دایكم بوو، كچی شێ محێدینی مامی دایكم. عەلی شەعبان بەرپرسی بنكەكە بوو و كاك موحسینی برام و مەلا عەولا (مەلا ماتۆڕ) ئەوانیش لەو بنكەیە بوون و وابزانم چەند شەوێكیش لەوێ مامەوە. رۆژێكیان كاك عومەر دەبابە بە سواری ئەسپێكی سپی و بە چەند پێشمەرگەیەكەوە پەیدا بوو. تێم گەیاند كە هاتووم بچم بۆ لای مەكتەبی سیاسی گوتی زۆر باشە منیش وا بەرەو ئەوێ دەڕۆم وەرە لەگەڵ منا.

دیسان بەیانییەك سەر لەزوو بەرێ كەوتین كاك عومەر بە سواری ئەسپە سپییەكەی و ئێمەی پێشمەرگەكانی تریش بە پیادەیی. جاروبار بەرێوە كە كاك عومەر دەیدی ئەمن بەسەر ئەو هەموو هەورازانە وا هەنكە هەنكمە ئەو دادەبەزی و ئەسپەكەی خۆی دەدا من بۆ ماوەیەك سوار بم ئیتر بەم جۆرە تا گەیشتینە دواقۆناخ بە نۆرە سوار دەبووین. ئێستاش لەبیرمە كە نۆرەی من دەهات ئەسپەكەم بەركەوێ تا مەودایەكی دوور خۆم لەگێلی دەدا و لەبیر خۆم دەبردەوە كە ئیتر بەسە كاتی نۆرەگۆڕی هاتووە. ناچار كاعومەر لێم بەجواب دەهات دەیگوت: " ئەرێ ئەوجا بەس نەبێ، ماڵت بە قوڕ نەگیرێ، ئیتر نۆبەی من نەهاتووە؟" منیش دەمگوت هەر لەو هەورازە دەرباز

بیـن ئەسـپەکەت دەدەمـەوە. ئیتـر دەمانکـردە پێکەنیـن و بـە نابەدڵییـەوە نۆرەگۆڕیمـان دەکـردەوە.

گەیشـتینە بـارەگای مەکتەبی سیاسـی کـە لـە دۆڵێـکا بـوو لـە دەرەوەی گونـدی عیسـاوێ. بەرامبـەر گوندەکـەش لووتکـە شـاخێکی سـەخت و دژوار رووەو ئاسـمان هەڵکشـابوو و خەڵکـی ناوچەکـە پێیـان دەگـوت گـردەڕەش. بـەڵام گـردی چـی کاکـە! یـەک ئەشـکەوتی لـێ بـوو کـە هەوارگـەی ورچ و بـەرازان بـوو و هـەر خەڵکـی ناوچەکـە دەیانگـوت قسـەیەکی کۆنیـان لـە بـاب و باپیرانیانـەوە بـۆ ماوەتـەوە کـە دەڵـێ: "قـەت نەکـەی بچیتـە راوی گـردە رەشـی."

ئەندامانـی مەکتەبـی سیاسـی ئەوانـەی کـە لەبیـرم مابـن بـەردەوام لـەوێ بـوون ئەمانـە بـوون: ئیبراهیـم ئەحمـەد (سـکرتێری پارتـی)، نوری شـاوێس، دکتـۆر سـەید عەزیـز شـەمزینی، سـەیدا سـالح یوسـفی، عەلـی عەبـدوڵا و پێـم وایـە عەبدولڕەحمـان زەبیحیـش. ئەندامەکانـی دیکـەی مەکتەبـی سیاسـی کـە پتـر لـە بـەرەی شـەڕدا بـوون و تەنهـا بـۆ کۆبوونـەوە دەهاتنەوە عیسـاوێ مـام جـەلال و عومـەر دەبابـە و مـەلا عـەولا و نـوری ئەحمـەد تەهـا بـوون. بنکەوانمـان عەلـی مـام رەزا بـوو و شـوێنی حەوانـەوەی مـن لەگـەڵ چەنـد پێشـمەرگەیەکی دیکـەی خوێنـدەوار لەسـەر رووبارێکـی زۆر خـۆش لـە نزیـک بـارەگای مەکتەبـی سیاسـی بـوو. هـەر لەوێشـا برادەراتیـم لەگـەڵ کوڕەکانـی کاک نـوری شـاوێس (رۆژ و رەنج) بەسـت کـە ئەوسـا هەردووکیـان لـە قۆناخـی خوێندنـی ناوەندیـان بـوون و بـە سـەردان هاتبوونـە لای باوکیـان. رۆژانـە لەگـەڵ رۆژ و رەنـج و هەڵـۆی برایـم ئەحمـەد کـە تەمەنـی ئەوسـا هـەر یانـزە دوانـزە سـاڵێک دەبـوو مەلەمـان لـە رووبارەکـەدا دەکـرد.

## چۆن ویستگهی رادیۆی دهنگی كوردستانمان دامهزراند

رۆژێكیان له مانگی ئهیلولا دوو گهنجی ئهوروپاییمان لێ پهیدا بوون. منیش گوتم دهبێ رۆژنامهوان بن. بهڵام هێندهی نهبرد كاك برایم ئهحمهد له بارهگای مهكتهبی سیاسییهوه دهركهوت و هات بۆ لای من. كاك برایم قۆڵی گرتم و تیی كردمهوه به لایهكا . پێی گوتم شتێك ههیه كه نابێ كهس پێی بزانێ. گوتی دهزگایهكی رادیۆمان له ئاڵمانیاوه بۆ هاتووه و ئهو دوو گهنجه ئاڵمانهش ئهندازیاری ویستگهن و بهتهماین له ئهشكهوتی گردهڕهش دایمهزرێنین. زۆر درهنگتر دوای چهند ساڵێك كاك سهعدی برام كه لهگهڵ كهمال فوئادا مهڵبهندی ئهوروپای پارتیان بهڕێوه دهبرد بۆی گێڕامهوه كه راسته باڵی مهكتهبی سیاسیی پارتی داوای لێ كردبوون دهزگایهكی رادیۆ بۆ شۆڕش بكرن. جا گوتی كه ئهو خۆی (سهعدی) راسپێردرابوو بچێته شاری میونیخ دهزگاكه بكرێت. ههر واش كرا.

كاك برایم به منی گوت تۆ كه ئهڵمانی ئهزانیت ههمیشه لهگهڵیانا دهبیت بهڵام لای خهڵك بڵێ ئهمانه رۆژنامهوانن با كهس نهزانێ كه خهریكی دامهزراندنی ویستگهی رادیۆین. ئیتر چهند رۆژێكی پێ چوو تا به نهێنییهكی زۆرهوه جێگا بۆ دهزگا و ویستگهكه لهناو ئهشكهوتی گردهڕهش ئاماده كرا. كاتی گواستنهوهی دهزگاكه بۆ ناو ئهشكهوتهكه هات كه له بهرزاییهكی زۆر سهختی سنگی كێوهكهدا بوو و هیچ رێ و بزنهڕێشی نهدهچوێ. دهزگاكهش چون زۆر قورس بوو ههمووی پارچه پارچه جیاجیا له سندوقی دار زۆر به زانایی پێچرابوونهوه و لهسهر ئهندازیارهكان بوو ههموو پارچهكان له شوێنی دامهزراندنی بهپێی نهخشه بهیهكهوه ببهستنهوه. چهند هێسترێكیان هێنا

بارەکانیان سندوق سندوق لێ بار کردن بێ ئەوەی کەس بزانێ چییان تێدایە. زۆر کەس رەملی بۆ ئەوە دەچوو کە دەبێ چەک و تەقەمەنی بن. ئیتر ئێمە چەند خوێندەوارێک کە پێمان راگەیەندرابوو دەبینە ستافی وێستگەکە پێکەوە لەگەڵ دەستەیەک پێشمەرگەی چەکدار و چەند قەتارچییەک کە سەری ئێسترەکانیان رادەکێشا ناوی خوامان لێ هێنا بازۆ بۆ ئەشکەوتی ناو گابەرد و گاشەبەردی هەزار بە هەزار. قەتارچییەکان چون شارەزای ئەو ناوە بوون بزنەڕێیەکی پێچ پێچ بەڵام هێشتا زۆر رکیان دۆزییەوە و زۆر لەسەرەخۆ هێدی هێدی و بە فاتیحا و قولوەڵاوە سەردەکەوتین نەوەکوو یەکێک لە هێسترەکان هەڵدێرێت و ئیتر ریسەکەمان هەمووی لێ ببێتەوە بە خوری.

هێستری بەستەزمان لەژێر باری گران و پێداهەڵگەڕانی هەورازی رک و گابەردی هەزار بەهەزار نقەنقیان بوو. قەتارچییەک هەمیشە دەستی بە بارەکەوە دەگرت نەوەکوو ئێستر رەت بەرێت و بە بارەوە هەڵدێرێ. جارناجاریش کە هێسترێک لە بارگرانییا مانی دەگرت و خەریک دەبوو پاشەوپاش بکشێتەوە، ناچار یەک دوانێکمان بەپەلە خۆمان دەگەیاندە دواوەی و بە چوار دەستان پاڵمان بە پاشەڵی وەدەنا و لە پێشەوەش قەتارچییەک قەوچەکەی بەتوندی رادەکێشا.

تاکە خۆشی و دڵخۆشکەرەوەی ئەو رێگا بە ترس و لەرزەمان قسە خۆشەکانی کاکە شێخ حسێن قەرەداغی رەحمەتی بوون. شێ حسێن کە براگەورەی دۆستی دێرینم رۆژنامەنووس و رووناکبیری ناسراو کامەران قەرەداغی بوو، ساڵانێکی درێژ لە بەشی کوردیی رادیۆی بەغدا کاری دەکرد و لەپاش کودەتاکەی بەعس ئەویش تەبای زۆر لە رۆشەنبیرانی کورد خۆی گەیاندبووە ناو شۆڕشەوە. هەر ئەو شێ حسێنەش بوو کە لە ساڵی 1954 منی برد بۆ وێستگەی رادیۆی کوردی لە بەغدا و بۆ یەکەم جار لە ژیانما چەند گۆرانییەکم بۆ تۆمار کردن. شێ حسێن زۆر قەڵەو بوو و بەو کێشەوەش سروشتانە زۆر نەوسن بوو و جگەرەیەکی زۆریشی دەکێشا و هەموو گیانیشی

هەر نوکتە بوو. جگەرەکانیشی بە دەفتەر و توتن خۆی تێی دەکرد. کە کەمێک بە شاخەکەدا هەڵزنایـن شـێ حسێن ئیتر پەکی کەوت و بۆی دانیشت. پێمان گوت کاکە حسێن دە هەڵسە وەختی دانیشتن نییە ئێستا تۆزێکی تر ئەگەینە ئەشکەوتەکە. گوتی نا کاکە ئێوە بڕۆن خواتان لەگەڵ بەخوا من لێرە نابزوێم با ورچێک بێ بمبات خۆ من خۆیشم هەر لە ورچ ئەچم و ڕەنگە ورچەکان وا بزانن منیش هەر یەکێکم لە خۆیان و یارمەتیم دەدەن، خۆ هەر نەبێ لای ورچەکان خواردنی باشتر و شتی تریشم دەس ئەکەوێ. من و یەک دوو برادەری تر لەگەڵیا دانیشتین بۆ سانەوە ئینجا کاحسێن گوتی: "ئەرێ کاکە ئێوە بۆ منیش وەک پارچەیەکی ئێزگەکە حسێب ناکەن بەخوا ئەگەر هێستریکیش بۆ من نەهێنن من لێرە هەڵناستم و بۆ خۆم وردە وردە دەگەڕێمەوە بۆ خوارەوە." گوتمان ئاخر کاحسێن هێستری فەقیر لە کوێ دەتوانێ تۆ هەڵگرێ خۆ تۆ لە هەموو بارەکان قورستریت." گوتی "دە باشە کاکە کەوابوو منیش وەک دەزگای وێستگەکە هەڵوەشێنن و پارچە پارچە لە هێسترەکانم بار کەن."

هەرچۆنێکی بێ دەزگاکە و کاکە حسێنیشمان بە سەلامەتی گەیاندە ناو ئەشکەوتەکەوە و پاش چەند ڕۆژێک هەردوو ئەندازیارە ئاڵمانەکان بە یارمەتیی ئەندازیارانی خۆمان سامی عەبدولڕەحمان و عەبدولخالیق مارف و ئەمجەد عەبدولواحید دەزگاکەیان دامەزراند و ئەنتێنە درێژەکەشیان لە دەرەوەی ئەشکەوت لە لاپاڵێکا داچەقاند. ئەڵبەت ستۆدیۆکەمان - ئەگەر بتوانم ناوی بنێم ستودیۆ - تا بڵێی سادە و ساکار بوو. دیوار و بنمیچەکەیمان بە بەتانی و پووش و پەلاش داپۆشیبوو. ستافی کارکردن لە وێستگەکە بەم جۆرە بوو: حەبیب محەمەد کەریم کە ئەندامی تێشووی کۆمیتەی ناوەندیی پارتی دیمۆکراتی کوردستان بوو ئەمیان بەڕێوەبەری وێستگە و نووسەری گوتار و کۆمێنتی سیاسی بە عەرەبی بوو. عوسمان عوزێری چەرمەگا کە شاعیر و نووسەرێکی لێهاتوو و دەنگێکی زوڵاڵی رادیۆیی هەبوو

بێـژەری بەشـی کـوردی سـۆرانی بـوو بـۆ پێشکەشـکردنی دەنگوبـاس و کۆمێنـت. جەلالـی شـێ عەبدولحەمیـد ئەتروشـی کـە ئەویـش دەنگێکـی نێرانـەی هەبـوو بێـژەری کوردیـی کرمانجـی بـوو. شـێخ لەتیفـی شـێخ حامیـدی بەرزنجـی چەمچەماڵـی کـە کۆلێـژی ئەدەبیاتـی بەشـی عەرەبیـی لـە بەغـدا تـەواو کردبـوو و عەرەبیزانێکـی بـاش بـوو و ئەویـش دەنگێکـی نێـری هەبـوو بێـژەری بەشـی عەرەبـی بـوو. شـێخ حسـێنی قەرەداغـی بەرنامەیەکـی تایبەتـی گاڵتـە و گەپـی هەبـوو بـە نـاوی (هەمانـەی درۆ) کـە بـە نوکتـە و گاڵتەجارییەکـی خۆشـەوە راپۆرتـە سـەربازییەکانی رۆژانـەی رادیـۆی بەغـدای بـە درۆ دەخسـتەوە و گاڵتەیەکـی زۆریشـی بـە جاشـە کـوردەکان دەکـرد. هۆمـەری دزەیـی نووسـەر و بێـژەری گوتـار و کۆمێنتـی بەشـی کوردیـی سـۆرانی بـوو و پێشکەشـکاری بەرنامـە هونەرییەکانیـش بـوو. سـاڵح حەیـدەری و زوهێـر عەبدولمالـک فەیلـی و سـامی عەبدولڕەحمـان نووسـەری گوتـار و کۆمێنتـی بـە زمانـی عەرەبـی بـوون. زۆرێـک لـە کۆمێنتـە سیاسـییەکان لەلایـەن کاک حەبیـب و کاک سـاڵح حەیـدەری و کاک سـامییەوە بـە عەرەبـی دەنووسـران و بەعەرەبـی و بـە کـوردی پێشـکەش دەکـران. دواتـر حەمیـد باخـەوان کۆیـی هاتـە لامان کـە گەنجێکـی دەنگخـۆش بـوو لـە گۆرانـی گوتنـا. سـتافی تەکنیکیـی دەزگاکـەش هـەر ئـەو سـێ ئەندازیـارەی خۆمـان سـامی و عەبدولخالیـق و ئەمجـەد بـوون. وەسـتای جەنرێتەرەکەمـان (مولیـدە)ی ئەلەکتریـک وەسـتا عەبـاس فەیلـی بـوو و کابانیشـمان جـۆرج مەگەردیجـی ئەرمەنـی بـوو. دەسـتەیەکی پێشـمەرگەی چەکداریـش بـۆ پاراسـتن لەلامـان بـوو.

مـاوەی بەخشـمان پێـم وایـە کاتژمێرێـک بـوو کـە ئێـواران بڵاومـان دەکـردەوە و بریتـی بـوو لە دەنگوباس، گوتاری سیاسـی، کۆمێنتی سیاسـی، بەرنامـەی تایبـەت بـە گۆرانـی و موزیـک و ئەدەبیـات و بەرنامەیەکیـش تایبـەت بـە گاڵتەو گەپ و هەمیشـە مارشـی سەربازیـشـمان لـێ دەدا. کاک برایـم ئەحمـەد دوو پارچـە هۆنـراوەی خـۆی بـۆ ناردیـن بـۆ بڵاوکردنـەوە یەکێکیـان بـە نـاوی (مـن پێشـمەرگەی کوردسـتانم... ئامـادەی جەرگـەی

مەیدانم... بە سەرو ماڵ و ژیانم... ئەیپارێزم نیشتمانم.. دەس لە چەکم هەڵناگرم... یا سەر ئەکەوم یا ئەمرم). ئەمن ئێوارەیەک لە پەنا داربەڕوویەک دانیشتبووم ئاوازێکی مارشم بۆ ئەم هەڵبەستە دانا کە بە یارمەتیی کۆرسێکی خۆمان رۆژانە لە رادیۆکەی خۆمان بڵاومان دەکردەوە و دواتریش بە یاوەریی تیپی موزیکی کوردی جیاجیا ناوبانگی دەرکرد و تا ئێستاش خۆشەویستە. پارچە هەڵبەستەکەی تری کاک برایم لەسەر جاشەکان بوو و ئاوا دەستی پێ دەکرد (هەی جاش... هەی جاش... جاشی عەفلەق... پیسی زیانداری گوێ لەق... تینووی کوتەک و بەندەیی... عەزرەتی بارکێشان و شەق... کەی تۆی جاشی کەری فەقیر... دایک دێڵەی... باوک مشیر).

لە سووچێکی ئەشکەوتەکە چاپخانەی کوردستانیش دامەزرێندرابوو و هەموو چاپەمەنییەکانی شۆڕش و پارتی لەوێ لەچاپ دەدران. ئەو کارمەندانەی کە لەو چاپخانەیە دەستبەکار بوون کاک ئەحمەد دەشتی و کاک مستەفا رابەر بوون بەڵام بەداخەوە ناوی کارگێڕەکەیانم لەبیر نەماوە.

مەودای بڕی پەخشەکەمان بەداخەوە زۆر کورت بوو، تەنها لە گوندەکانی دەوروپشتی خۆمان بەروونی گوێیان لێ دەبوو بەڵام لە شارەکانی کوردستانا دەبوایە رادیۆی ترانسیستەری زۆر چاکیان هەبێ ئەگینا نەیاندەبیست یان بە خشەخشێکی زۆرەوە دەیانبیست. حکوومەتیش کە زانیبووی شۆڕش رادیۆی هەیە ئەویش تەشویشێکی زۆری خستبووە سەر کە لەناو خەڵکا بە هانی هانی باو بوو چونکە حکوومەت لە کاتی بەخشەکەی ئێمە گۆرانییەکی ئینگلیزیی ناوداری ئەو زەمانی بە ناوی هانی هانی honey honey دەخستە سەر هەمان شەپۆل و هەمان فریکوێنسی کە بەسەر بەرنامەکەی ئێمەدا زاڵ دەبوو و ئیتر کەس هیچی لێ تێ نەدەگەیشت.

جا لەبەر ئەوە بۆ تەکنیکارەکانمان دەرکەوت کە وێستگەکە چونکە لە ئەشکەوتە و ئەنتێنەکەشی هەر لەلاپاڵ شاخایە بۆیە لەوە

زیاتر برِ ناکات. ئەمە وای لێ کردن داوا لە مەکتەبی سیاسی بکەن دەزگاکە دەبێ بگوازرێتەوە بۆ بەرزترین لووتکەی کێوەکە.

گواستنەوەی وێستگەکە بۆ سەر لووتکەی چیاکە لە رووی ئاسایشەوە ئاسان نەبوو. لەوێ بەو ئەنتێنە درێژەوە لەسەر لووتکەی شاخا زۆر ئاسان دەبوو بۆ فرۆکە جەنگییەکانی بەغدا کەشفی بکەن و ئێمەش بەئاسانی بۆردومان بکرێین. بەڵام وا بڕیار درا کە خانوو لەژێر ئەرزا هەم بۆ وێستگەکە و هەم بۆ ئێمەی ستافیش دروست بکرێن و ئەنتێنەکەش بە گەڵای داران بپێچرێتەوە. خۆشبەختانە سەرشاخەکەش بە دارستانی چڕی داربەڕوو و گوێژ داپۆشرابووو. ئیتر بەو سەرما و سۆڵەی زستانی سەختی ئەو شاخە بارمان کرد بۆ سەر لووتکەکەی و ئەشکەوتەکەمان چۆڵ کردەوە بۆ (سوکانی ئەسلی) خۆی کە بەراز و ورچی داماو بوون. ئەمن کە هێشتا لەوێ بووین بەزەییم بەو ئاژەڵە کێوییانە دەهاتەوە کە ئێواران رەوەی بەراز بەگورِ بەلامانا رەت دەبوون و بەچاوی خۆیان دەیاندی کە ماڵ لە خانەخوێ حەرام کراوە.

برِی رادیۆکەمان لەوێ باشتر بوو بەڵام هێشتا بەدڵی ئێمە نەبوو. پێم وایە کە دەزگاکە هەر خۆی بچووک بوو و لەوە زیاتر نەدەرۆیشت.

بە زستان ژیانی سەر لووتکەی شاخەکە تا بڵێی سەخت و ناخۆش بوو. بەفر تا ناوکان دەکەوت و رێی خوارێ دەگیرا و هەندێ جار بۆ چەند رۆژێک ئاوکێشەکەمان نەیدەتوانی بێت نان و ئاومان بۆ بێنێت و ناچار نانی کۆنی کەرِوودارمان دەخوارد و بەفریشمان دەتواندەوە بۆ ئاوی خواردنەوە و چێشت. وەکوو پێشتر گوتم ئێمە کابانمان بۆ چێشت لێنان هەبوو بەڵام نان و ئاو دەبوایە هەر چەند رۆژ جارێک ئاوکێشێک لە خوارەوە بۆمانی بێنێت. بۆ خۆشتنیش دەبوایە مانگی جارێک بە پێیان بچینە شارۆچکەی ماوەت کە گەرماوێکی گشتیی لێ بوو و دەرفەتێکی باشیش دەبوو نان و کەبابێکی گەرمیشی بۆ بخۆین. چەندین جار فرۆکە بۆمباوێژەکانی ئێراقی کە هەستیان

کردبوو شتێک لەو شاخەدا هەیە بەلاماندا دەفڕین بەڵام شوێنەکەیان بە چاکی بۆ کەشف نەدەکراو بۆمباکانیان لە شوێنێکی دوور لە ئێمەوە فڕێ دەدا. لە ئەنجامی خراپخۆراکی malnutrition (سوئی تەغزیە) هەندێکمان ماکی سپی وەک وشکەبیرۆمان لە لامل و روومەتمان لێ پەیا بوو. هەروەها چونکە درەنگ درەنگ خۆمان دەشووشت و لەبەر باری نالەباری پاکسازی شوێنەکەمان ئەسپێیەکی زۆریشمان تێ کەوت. لەبیرمە ئێواران لەگەڵ عەبدولخالیق مارف و لەتیفی شێخ حامید دادەنیشتین راوەئەسپێمان دەکرد. دەمانژمارد کێ زیاتر لەوی تر ئەسپێی کوشتووە. رۆژێکیان کاک دارا تۆفیق هاتە لامان و شەو مایەوە. منیش لە تەنیشت خۆم بەتانیم بۆ ڕاخست بەڵام تا بەیانی نە ئەو نە من لە بەر ئەسپێ و خۆخوراندن خەومان لێ نەکەوت. لەو میوانانەی کە سەردانی ئێزگەکەمانیان دەکرد جگە لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی پارتی چەند ئەفسەرێکی عەرەبی عیراقیی کۆمونیست یان مارکسیستیش بوون کە لەدەست بەعسییەکان هانایان وەبەر شۆڕشی کوردەوە بردبوو وەک سەلیم فەخري و سەعید مەتەر و موسا الجبوري.

من هیوایەتێکم هەبوو کە بەناو ئەو دار و درەختانەدا پیاسەم دەکرد ناوە ناوە کۆلکەداری شکاوی کۆنم بەدی دەکرد کە هەندێکیان لە شێوەی کەللەی سەری ئینسانێک یان حەیوانێک بوون و یەکسەر هەڵم دەگرتەوە. ئەمانەم هەموو لای سەرینگانی شوێنی نووستنکەم کەڵەکە کردبوو و هەندێکیشیانم بە دیوارەوە هەڵواسیبوو و ناوم نابوون فۆلکلۆر و هونەری سوریالیزم. واشم دانابوو ئەگەر بارودۆخی سیاسی و سەربازی ئاسایی بێتەوە هەندێکیان لەگەڵ خۆما ببەمەوە بۆ ئەورووپا. بەڵام کە بەفرێکی زۆر دەکەوت و دارمان بۆ سووتەمەنی لەژێر بەفرا بۆ دەرنەدەهات برادەران تکایان لە من دەکرد کە یەک دوو پارچە دارە فۆلکلۆرییەکەی من بخەنە ناو زۆپاکەوە. چارم نەبوو و بە نابەدڵییەکی زۆرەوە دەبوایە دەسبەرداری هەندێکیان ببم.

دەبا ئەوجا ئەم قسە خۆشەی شێ حسێن قەرەداخیتان بۆ بگێڕمەوە. پێشتر باسم کرد کە بەو سەرماو سۆڵی زستانە جاری وا دەبوو کە بۆ ماوەی چەند رۆژێ نانی کەرووودار بخۆین. ئێوارەیەک دوای بەرنامەکانی رادیۆکەمان و پێش ئەوەی تاریکی باڵی بەسەر شاخەکەمانا بکێشێت بینیم شێ حسێن ردێنی جوان تاشیوە بۆنگولاوێکی خۆشی لە خۆی داوە، ئەو چەند تاڵەمووەی بە سەریەوە مابوون بەرێکوپێکی شانەی کردوون و بە قوتووی جگەرەکانیەوە هات بۆ لام گوتی عومەر زووکە هەڵسە لەگەڵما تا خۆر ئاوا نەبووە. گوتم کاحسێن بۆ کوێ بڕۆین ئەوە چی بووە وا خۆت رازاندووەتەوە، ئەوە بۆ کێتە کێ هەیە لەم چۆڵەوارییە بمانبینێ؟ گوتی دە تۆ جارێ هەڵسە با بڕۆین ئینجا پێت دەڵێم بۆ کوێ. رۆیشتین و بەناو ئەو دارو درەختانەدا پیاسەمان دەکرد گوتی عومەر من لە حیکایەتی کۆنی ئەفسانەی کوردیدا بیستوومە کە ورچی مێینە هەیە حەز لە پیاو ئەکات ئەیرفێنێت و ئەیبا بۆ کونە شاخی خۆی هەرچی خواردنی خۆش هەیە لە هەنگوێن و رۆن و میوەجاتی جۆراوجۆر و ئەگەر جگەرەکێش بێ تووتنیشی بۆ دەهێنێ هەر بۆ ئەوەی پیاوەکە ببێ بە مێردی. گوتی کە بەڕۆژیش ورچەخان دەڕوا بە دوای خۆراکی خۆشا ئەگەڕێت گاشەبەردێکی زۆر زل بە کونی شاخەکەوە دەنێ نەبادا "مێردەکەی" رابکات یان رەدوو کەوێت بۆ ژنێکی کە. گوتی ئێ باشە عومەر گیان توخوا ئەمە حاڵە ئێمەی تیاین ؟ توخوا لەوە باشتر هەیە هەم خواردن هەم کردنمان مسۆگەر ببێت ؟ جا بۆیە لەم رۆ بە دوا با ئێواران پیاسەیەکی بۆ بکەین بەڵکو خاتوو ورچێک دەمانڕفێنێت. گوتم باشە کا حسێن کێ ئەڵێ ئێمە تووشی ماورچ دەبین، ئەگەر تووشی نێرە ورچێ بووین چی بکەین؟ گوتی وەڵا ئەگەر وای لێ بێ خۆ منیان ناوێ، ورچی وەکوو منیان زۆرە تۆ لە من جوانتریت تۆیان دەدەمێ جا خۆت چۆن لەگەڵیا پێک دێیت ئەوە کەیفی خۆتە. ئەمە هەندێ لە قسە خۆشەکانی کاکە شێ

حسێنی قەرەداخی بوو هەزار بار یادی بەخێر. زۆر جار شێ حسێنم ئەدی لە سووچێکا دانشتووەوە فرمێسک بەچاویا دێتە خوارەوە و هەر ناوی کورە بچکۆلەکەی لەسەر زارا بوو کە پێم وایە وریا بوو چونکە هەر دەیگوت: "ولی گیان ولی گیان". منیش لەگەڵیا دادەنیشتم دڵم ئەدایەوە.

ئا ئەوها (دەنگی کوردستان)ی ئازیزمان دامەزراند و بەڕێوە برد کە خۆم نەک هەر لە یەکەم رۆژی پەخشی بەرنامەکانی بەڵکوو هەروەکوو باسم کردووە لە یەکەم رۆژی لەناو سندوق دەرهێنانی دەزگاکەش بست بە بست ئاگام لێ بووە. تا بەعسییەکان لە مانگی یانزدەی 63 رووخان و سەرکردایەتیی رژێمی نوێی ئیراق ئاگربەستی راگەیاند و داوای وتووێژی لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردا کرد. مەکتەبی سیاسییش داوای لە ئێمە کرد جارێ هێرشی سەر حکوومەت راگرین و تەنها مارش و موزیک و دەنگوباسی ئاسایی بڵاو بکەینەوە.

بەڵام مانگێک پێشتر کاک موحسینی برام گەیشتبووە ماوەت و لەوێ وەک دادوەری شۆڕش دامەزرابوو. دەستەیەکی دادوەرانی شۆڕش لە ماوەت دەستبەکار بوون کە بریتی بوو لەمانە: عومەر حەبیب کۆیی (سەرۆکی دەستەکە)، موحسین دزەیی برام، کەمال مستەفا، رۆبیتان جاف، مەلا جەمیل رۆژبەیانی (بۆ کاروباری شەرعیی ئیسلامی) نازانم ئەگەر تەها بابانیش لەگەڵیانا بوو چونکە وێنەیەکی جوانم لەگەڵیا هەیە کە لە ماوەت گرتوومانە.

ماوەت بەندیخانەیەکی شۆڕشیشی لێ بوو کە هەندێ سەربازی عەرەبی عیراقی بە دیل گیراو و هەندێ کارمەندی حکوومەت و چەند جاشێکیشی لێ بوو. شەوێکیان لە مانگی کانوونێ و بە شەوی دەیجونێ کە دنیا لەژێر بەفرا بزر بووبوو دوو لەو کارمەندە بەعسییە زیندانیانە رایانکردبوو. یەکێکیان ئەفسەری پۆلیس ئیبراهیم الطائی بوو کە شاری کۆیە لەلایەن پێشمەرگەوە گیرا خۆی ڕادەست کردبوو و

ئەوی تریشیان کە ناوەکەیم لەبیر نەماوە بەرپرسی حزبی بەعس بوو لە مەخموور و ئەویش لە پەلامارێکی پێشمەرگە بۆ سەر بارەگاکەیان دیل کرابوو.

ئیبراهیم الطائی کە پیاوێکی بالأبەرزی تێکسمراوی سووروسپی بوو لەگەڵ کابراکەی دی بەو نیوەشەوە ئەنگوستەچاوە لەسەر بانی زیندانەکەوە خۆیان بۆ لای پشتەوەی هەڵدابووە خوارەوە. ئیبراهیمی بەدبەخت چونکە قەڵەو بوو لاقێکی ورد بوو و هەر لەوێ بە ئازار و هاوارێکی زۆرەوە دەستبەسەر کرایەوە. کابرای دی بەو شەوە تاریکە بۆی دەرچووبوو و کەس نەیزانی بۆ کامە لا رای کردووە. بۆ بەیانی شوان و گاوان لاشەکەیان بە هەڵتوتکاوی لە پەنا دارێکدا دۆزیبووەوە کە لە سەرما رەق هەڵگەڕابوو و گیانی لەدەست دابوو. ئیبراهیم الطائیش بۆ ماوەیەک تیمار کرا بەڵام دیار بوو برینەکەی کاری بوو و لێی کردبوو بە گانگرین. شۆڕشیش ئەو دەرمانە باشانەی نەبوو چاری بکات و پاش ماوەیەک ئەویش گیانی لەدەست دا. بەدبەختی ئیبراهیم الطائی لەوەشدا بوو کە کاک موحسینی برام چەند رۆژێک پێشتر چووبوو بۆ قەڵادزێ و لەوێ فەرمانی ئازادکردنی لەلایەن دادگای بەرزی شۆڕشەوە بۆ دەرچووبوو و بڕیار بوو بەری بدەن. ئەو یەک رۆژ پێش گەڕانەوەی کاک موحسین و هێنانی فەرمانی ئازادکردنی رای کردبوو و ئەو سەرەنجامەی بە خۆی گەیاندبوو.

پێشمەرگە دێرینەکان لە راستەوە: عومەر دەبابە ، کەمال محێدین ، کۆیە 1963

پێشمەرگە دێرینەکان لە چەپەوە: عومەر دەبابە و برایانی هۆمەر: سەعدی دزەیی و
ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی، رێی بەرلین 1967

لە راستەوە: برایم ئەحمەد ، عەلی عەبدولا ، عەلی عەسکەری .

لەراستەوە: کەمال محێدین ، خالید دلێر

پێشمەرگە دێرینەکان لەچەپەوە:
موحسین دزەیی برای هۆمەر ، عەلی عەسکەری.

پێشمەرگەی دێرین لە چەپەوە: عوسمان
سەرسۆر دزەیی ئامۆزای هۆمەر لەگەڵ
کێخوا سمایلی دووگردگان ناسراو بە کاکە سمە.

پێشمەرگەی دێرین دکتۆر خالید سەعید غەفوری

سەردەمی پێشمەرگایەتی، شارۆچکەی ماوەت 1963 یان 64 لە راستەوە: هۆمەر دزەیی، تەها بابان، مەلا جەمیل رۆژبەیانی

شێخ حسێن قەرەداغی (1923 - 1972)

شێخ حسێن قەرەداغی (1923 - 1972) و خێزانەکەی

پێشمەرگەی دێرین شێخ حسێن قەرەداغی (1972 - 1923)

سەردەمی پێشمەرگایەتی ، وەستاوەکان لە راستەوە: عەبدوڵا کانیمارانی ، موحسین دزەیی برای هۆمەر، عومەر میراو ، یوسف میران ، ...؟ دانشتوەکان لە راستەوە: شوان دزەیی برازای هۆمەر، هۆمەر دزەیی ، مارگریت جۆرج

پێشمەرگە دێرینەکان لە چەپەوە: دکتۆر مەحمود عوسمان ، مام جەلال تالەبانی ، موحسین دزەیی برای هۆمەر ، سامی عەبدولڕەحمان

پێشمەرگەی دێرین ساڵح حەیدەری
1922 - 2001

پێشمەرگەی دێرین شێخ حسێن قەرەداغی
1923 - 1972

پێشمەرگەی دێرین عەبدولخالق مارف (1935 - 1985)

شوێنی کەوتنی بۆمبایەکی فڕۆکە بۆمباوێژەکانی عیراقی

# بەشی 19

## ساڵی 1963 شادی و شین: بەعس ڕووخا، دایکم مرد

ڕووخانی بەعس لە مانگی نۆڤەمبەری 1963 هەناسەیەکی پڕ لە ئۆخەی بوو بۆ کورد. لە ماوەی وتوویژکردنی سەرکردایەتیی شۆڕش لەگەڵ ڕژیمی نوێی عیراقا بە سەرۆکایەتیی جەنراڵ عبدالسلام عارف ئێمەی ستافی رادیۆی دەنگی کوردستان ڕێنماییمان لە مەکتەبی سیاسیی پارتییەوە بۆ هات جارێ هێرشمان بۆ سەر حکوومەتی نوێی عیراق رابگرین و تەنیا دەنگوباسی ئاسایی و گۆرانی و موزیک و مارش بڵاو بکەینەوە لەگەڵ هەندێ بەرنامەی گاڵتەجاڕی بە جاشەکان. دوای دڵنیابوونیش کە نامانگرن دەرفەتمان بۆ رەخسا ناوە ناوە بۆ چەند رۆژێک بگەڕێینەوە بۆ ناو شارەکان و سەر لە کەسوکارمان بدەین.

بەڵام بۆ من ئەم خۆشییەی ڕووخانی بەعس تا سەر نەبوو. دایکی خۆشەویستم (کافیەخانی شێخ مارفی بەرزنجی) لە شەوی هەینی ڕێکەوتی بیست و حەوتی مانگی دوانزدەی ساڵی 1963، هەر مانگێک دوای ئاگربەستی نێوان کورد و حکوومەتی نوێی بەغدا، لە هەولێر کۆچی دوایی کردبوو. دایکم لە باوکیەوە کۆیی و لە دایکیشیەوە کانی کەوەیی بوو بەڵام هەردوو لای باوانی نەوەی شێ حەسەنی گڵەزەردە و شێخ سمایلی ولیانی بوون. دایکم لە نۆ منداڵ پێنج کوڕ و کچێکی مابوون. لە نۆیەکە سیانیان هەر بە منداڵی مردبوون. لەوانەی ماشبووین کاک ئەنوەر و کاک سەعدیم لە ئاڵمانیا دەژییان، منیش لە پاریس بووم بەڵام دوای ڕووخانی ڕژیمی قاسم بەسەردان گەڕابوومەوە بۆ کوردستان، هەرچی کاک ئەحمەد و کاک موحسینی

بـرام و قەدریەخانـی خوشکیشـم بـوون ئـەوان هـەر لـە کوردسـتان دەژییان. وەکوو پێشـتر باسـم کـردووە ئێمـە ئـەو سـێ برایـەی کـە لـە وڵات بوویـن لەپێـش و لەپـاش دەسـپێکردنەوەی شـەڕ لەگـەڵ بەعسـیان لـە مانگـی شەشـی هـەر ئـەو سـاڵە بووبوویـن بـە پیشـمەرگە. لـە تۆڵـە، بەعسـیەکان بـە یارمەتیـی جاشـەکان ماڵـی ئێمەیـان لـە گونـدی دووگـردکان سـەرتا بەخـوار سـووتاندبوو، مەڕوماڵاتیـان بەتـاڵان بردبوویـن و دایکـم و دوو لـە براژنەکانـم و منداڵەکانیـان ئـاوارەی شـاری هەولێـر بووبـوون. خاڵـە شـێ محێدینـی شـێخ سـاڵحی بەرزنجـی خزمـی دایکـم خانووێکـی دوو ژوور و هەیوانێکـی لـە تەنیشـت ماڵەکـەی خـۆی لـە هەولێـر بـۆ دابیـن کردبـوون وەک هەوارێکـی کاتەکـی تـا خـوا دەرگایـەک دەکاتـەوە. جـا کـە هێشـتا بەعسـیەکان نەڕووخابـوون و لەگەرمـەی هێرشـیان بـوون بـۆ سـەر کوردسـتان و رادیۆکانـی بەعـس لـە راپۆرتـی سـەربازیی رۆژانەیـان بڵاویـان دەکـردەوە کـە ئەمـڕۆ ئەوەنـدە متمردەیـان کوشـتووە، دایکـم بـەو هەواڵانـە کەوتبـووە بـن بـاری خەفەتـان، نـە مـاڵ مـا نە سۆراخێکی راسـتی دەزانـی لـە کوڕەکانییـەوە و تووشـی نەخۆشـییەکی کوشـندە بووبـوو کـە هێنـدەی مۆڵـەت نەدابـوێ چـاوی پێمـان بکەوێـت و هـەر بـە ماوەیەکـی کـورت دوای رووخانـی بەعـس بـە نامـرادی سـەری نابـووەوە. دەبـێ چ جـۆرە ئەشـکەنجەی دەروونـی بـێ بـۆ دایکێـک کـە لـە سـەرەمەرگا بێـت و نـەک لـە پێنـج کـوڕا هیـچ کامێکیانـی لـە سـەرینگاندا نەبـێ بەڵکـوو هـەر نەشـزانێ چییـان بەسـەر هاتـووە! دایکـم بـەو دیـدار عەزرەتـەوە مـرد.

دایکـم - بەتایبەتـی بـۆ مـن - دایکوبـاوک بـوو. ئەمـن کـە لـە هەمـوو خوشـک و براکانـم بچووکتـر بـووم پـاش بـاب بـووم. دایکـم منـی لـە سـکدا دەبـێ کـە بابـم لـە هاوینـی سـاڵی 1936 دەمـرێ. هیـچ وێنەیەکـی بابیشـم لەپـاش خـۆی بەجـێ نەمابـوو. ئـەو زەمانـە وێنەگرتـن، بەتایبەتـی لـە لادێ، زۆر دەگمـەن بـوو و هـەر وێنەیەکـی بنەماڵـەی ئێمـە هەبووایـە ئـەوە لای ئینگلیـزەکان دەسـت دەکـەوت کـە لـە سـەرەتای بیسـتەکانی سـەدەی رابـردوودا پەیوەندیەکـی زۆر نزیکیـان لەگـەڵ سـەرانی عەشـیرەتی دزەییدا

هەبوو و ئەوانیش رۆیشتبوون و گەڕابوونەوە بۆ وڵاتی خۆیان. بۆیە جیهانی منداڵیی من، لە ماڵ بوام یان لە دەرەوە، هەر بریتی بوو لە روخسارە جوانەکەی دایکم. نەمدەزانی تامی هەبوونی باوک چییە چونکە ئەم بۆشاییەی بێ بابی کە دەبوا لە ژیانمدا بیچێژم دایکم بۆی پڕ کردبوومەوە.

## چۆن بە مەرگی دایکمم زانی ؟

رۆژێکیان ئێمەی ستافی رادیۆی دەنگی کوردستان وەک نەریتی رۆژانەی خۆمان دانیشتبووین و باسی حکوومەتی نوێی عیراق و ئاگربەست و پلان و تەگبیری وتوویژمان دەکرد لەنێوان شۆڕش و بەغدا. نازانم ساڵ سووراپۆوە بۆ 1964 یان هێشتا چەند رۆژێک لە ساڵی 63دا مابوو.

یەکێک لە هاوکارەکانم کە بیرم نەماوە کامەیان بوو هاتە لام گوتی کاعومەر کاک حەبیب لە ژوورەکەی خۆیەتی حەز دەکا بتبینێ. کاک حەبیب محەمەد کەریمی فەیلی بەڕێوەبەری رادیۆکەمان بوو. منیش چووم بۆ لای کە بە تەنیا دانیشتبوو. دوای چای خواردنەوەیەک زۆر بە نەرمی رێی دڵنەوایی خۆش کرد و گوتی تۆ لە دەرەوە ژیاویت لە ئێمە واقیعیتری. ئینجا گوتی کە بەداخەوە دایکت کۆچی دوایی کردووە و کاک موحسینی برات لە ماوەت چاوەڕێتە بچیت بۆ لای. من شۆک بووم هیچم بۆ نەهات بیڵێم. برادەرانی دیش هاتن بۆ لامان و هەریەکە سەرەخۆشیی لێ کردم و بە قسەی خۆش هەوڵیان دەدا دڵم بدەنەوە. دوای ئەوە ئیتر خۆم لەوان دابڕی و چووم لەپەنا داربەڕوویەک بەو سەرما و بەفرە خۆم لوول دا بۆی دانیشتم و بەکوڵ بۆ خۆم گریام. سەردەمی منداڵیی خۆمم لەگەڵ دایکم وەک فیلمی سینەمایی دەهاتەوە بەر چاو.

چووم بۆ لای کاک موحسینی برام کە لە ماوەت حاکم بوو. ئەویش دیار بوو هەردوو چاوی پوت بووبوون بە گریانی پەنهانی. یەکتریمان لە باوەش گرت و لەگەڵ هەندێ لە حاکمەکانی تریش دانیشتین و کەوتینە قسەو باسی ئاسایی.

## تەقینەوەی ناکۆکی لە نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی پارتی

لەلایەکی کەش دەنگوباس هەر لەبارەی دانوسەندنی کورد و بەغدا بوو. لێرەشدا ناکۆکیی نێوان مەلا مستەفا و باڵی مەکتەبی سیاسی ئەمجارەیان سەبارەت بە داخوازییەکانی شۆڕش لە حکومەت و چۆنیەتیی پێکهێنانی دەلەگاسیۆنی کوردیش بۆ وتووێژ لەگەڵ بەغدا سەری هەڵدایەوە. چەندین شاندی حکومەت کە بیرمە یەکێکیان بە سەرۆکایەتیی پارێزگاری سلێمانی محمود عبدالرزاق ناوێک بوو کە لەگەڵ خۆیا چەند سنووقێک سێو و پرتەقاڵی وەک موجامەلە بە دیاری بۆ مەلا مستەفا هێنابوو. لە ئەنجامی وتووێژەکانا داخوازییەکانی مەلا مستەفا بەدڵی مەکتەبی سیاسی نەبوو. داخوازییەکان زیاتر بۆ ئاسایکردنەوەی بارودۆخ بوون وەک لێبووردنی گشتی بۆ هەر کوردێک کە بەشداریی لە شۆڕشا کردبێ، وەرگرتنەوەی هەموو ئەو کارمەند و قوتابییانەی کە لەسەر کوردایەتی لە پۆستی خۆیان و لە قوتابخانەکانیان دەرکرابوون و هەڵگرتنی بلۆکاد لەسەر گەیشتنی کاڵا و کەلوپەل بۆ شارە کوردییەکان و هەندێ داخوازیی تریش کە پەیوەندییان بە زمانی کوردی و سیستەمی پەروەردەوە هەبوو لە کوردستان. ڕەنگە هەندێ داخوازیی تریش هەبووبن بەڵام من هەر ئەوەندەم لەبیرە. باڵی مەکتەبی سیاسی دەیگوت ئەم داخوازیانە هیچ پەیوەندییەکیان بە کێشەی کوردەوە نییە و ئەگەر شۆڕشمان نەکردایە

خـۆ نـە کـەس دەگیـرا تـا لێبوردنـی بـۆ دەرچێـت نـە قوتابییەکیـش دەردەکـرا تـا بیگەڕێننـەوە بـۆ قوتابخانەکـەی. چەندیـن دانیشـتنی هەنـدێ ئەندامانـی مەکتەبـی سیاسـی لەگـەڵ مـەلا مسـتەفا کـرا کـە بـە بیـروڕای ئـەوان ئەمانـە (مطالـب) نیـن کـە شۆڕشـیان بـۆ کـراوە. بـەڵام بۆچوونـی مـەلا مسـتەفا ئەوهـا بـوو کـە خەڵک مانـدوو بـوون، کارمەنـد و قوتابییەکی زۆر دەرکـراون و خوێندنیـان لەدەسـت دەڕوات، جوتیـاری کـورد بـە ئـازادی کاری خـۆی بـۆ نەدەچـووە سـەر بۆیـە دەیگـوت پێویسـتیمان بـە پشـوو و حەسـانەوەیەک هەیـە و هـەر کاتـێ وەزعەکەمـان بـەدڵ نەبـوو دەتوانیـن سـەرلەنوێ سـەر هەڵدەینـەوە، خـۆ ئێمـە چەکەکانمـان دانانێیـن. ئەمـە ڕای مـەلا مسـتەفا بـوو. بـەڵام بـە بۆچوونـی هەنـدێ چاوەدێـری سیاسـی کـە زۆر دواتـر لـە گوتـار و کتێبـی بیانییەکانـا دەمانخوێنـدەوە ئەمەریـکا و شـای ئێـران لـە پشـت ئـەو نەخشـە سیاسـییە بـوون کـە مـەلا مسـتەفا پیـادەی دەکـرد هەرچەنـدە کـە لەسـەرەوە و لـە ڕۆژنامەکانیانا مەلا مستەفایان بـە (The Red Mulla) واتـا مـەلای سـوور دادەنـا کـە گوایـا پیـاوی سـۆڤیەتە، چونکـە 11 سـاڵ لـەوێ پەنابـەر بـووە. بـەڵام ڕاسـتییەکە ئەوەیـە کـە مـەلا مسـتەفا هیـچ کاتێـک "سـوور" نەبـووە بەڵکـوو بـە پێچەوانـەوە ئـەوە ئەندامانـی مەکتەبـی سیاسـی بـوون کـە هـەر هەموویـان سـوور و چەپـڕەو بـوون. خولاسـە کۆبوونەوەکانـی نێـوان مـەلا مسـتەفا و مەکتەبـی سیاسـی بـێ ئەنجـام بـوون و دەگێڕنـەوە لـە یەکێـک لـەو کۆبوونەوانـەدا لەگـەڵ مـەلا مسـتەفا کـە (عەقیـد کافـی)ش بەشـداریی تیـا کردبـوو ئەمیـان گوتبـووی: "مـام جـەلال، سـەرمان چووەتـە قەبـری باوکمـان دەبـا پشـوویەک وەرگریـن و کەمێـک بحەسـێینەوە" گۆیـا مـام جەلالیـش بـە پێکەنینـەوە کڵاوەکـەی خـۆی لەسـەری کردووەتـەوە و بـە سـەری ڕووت بـە عەقیـد کافیـی گوتـووە: "وەڵـڵا کاکـە ئـا ئەوەتـا ئێمـە چ سـەرمان نەچووەتـە قەبـری باوکمـان."

ئـەو بەهــارەی 64 كــە شــەڕ و پێكــدادان لەنێــوان شــۆڕش و بەغــدا ڕاگیرابـوو كاك موحسـین و مـن دەرفەتمـان بـۆ ڕەخسـا چەندیـن جـار بچینـە سـلێمانی كـە لـە ماوەتـەوە نزیـك بـوو. لـە سـلێمانی لـە ماڵـی كاك عەلــی فەتــاح دزەیــی ئامۆزامــان دادەبەزیــن كــە بەڕێوەبــەری ناحیـەی مەركـەز بـوو لـە سـلێمانی یـان هـی عەربـەت بـوو بـەڵام بـەڕۆژ دەگەڕایــەوە بــۆ ماڵەكــەی لــە ســلێمانی. هەروەهــا كوڵێــك بــرادەری دیكەشــمان لــە شــار بەســەر دەكــردەوە. چەنــد شــەوێكی زۆر خۆشــمان، هــەر شــەوە لــە ماڵێــك، لەگــەڵ كاك عەلــی و ئــەو برادەرانــە لــە سـلێمانی بەســەر بــرد. لەوانــەی كــە لەبیــرم مابــن و زۆریــان هونەرمەنــد و شــاعیر و ڕۆشــەنبیر بــوون ئەمانــە بــوون: حەمەســاڵح دیــلان، ڕەفیــق چــالاك، نەجاتـی عەبـدە، حاتـەم سـەعید، نـوری وەشـتی، تەهـا بابـان، كاك ئەمیـن شــەوكەت، ئەحمــەد گوڵــزار خاوەنــی كــۆگای گوڵــزار و ئــی تریــش.

قســە و قســەڵۆكیش لــە بــازاڕ زوو زوو بــڵاو دەبوونــەوە لــە باســی پەیوەندیــی شــۆڕش و بەغــدا لەلایــەك و ناوماڵــە لێــك ترازاوەكــەی شۆڕشـیش لەلایەكـی دیكـەوە. تـا ئێوارەیەكیـان كـە كاك موحسـین و منیـش هێشـتا لـە سـلێمانی بوویـن دەنگۆیەكـی زۆر ترسـناك بـڵاو بـووەوە كـە گۆیـا ئەمشـەو (ئەقلێشـیتەوە)، حكوومـەت بەسـەر سـلێمانیدا دەدات و دیسـان كوشـتارێكی زۆر خـراپ بەسـەر دانیشـتووانی ئـەو شـارە دێنـێ. ئیسـتیلاحی (ئەقلێشـیتەوە) لـە سـلێمانی بـۆ ئـەو جـۆرە شەوەڕەشـانە بـەكار دەهـات كـە حكوومـەت وەك زەمانـی زەعیـم سـدیق شـەلم كوێرانـە مـاڵ بەمـاڵ ئەگەڕێـت خەڵـك ئەكوژێـت و ئەیانگـرێ. ئیتـر بـەم شـەوەزەنگە كەسـمان لەنـاو شـارا نەمایـن، شـار چـۆڵ بـوو. هەڵبـەت ئەوسـا نـە هەمـوو كـەس ئۆتۆمۆبیلـی هەبـوو نـە ئەوەنـدە تاكسـییەش هەبـوون بۆیـە تـەواوی ئەهلـی شـار بـە مـاڵ و منداڵـەوە بـە پیـادە و بـە ئۆتۆمۆبیـل و ماتـۆڕ و بایسـكلیش ڕوومـان كـردە ڕێـی عەربـەت و لـە گونـدی كانـی ماسـی سـەرڕێمان تێـك قژایـن و وەك پوورەهەنـگ هـەر وژەوژمـان بـوو،

کوشتارەکەی زەعیم سدیقمان دەهاتەوە بەرچاو و نەماندەزانی چی بکەین و روو لە کوێ بکەین. پێم وایە کاتی نیوەشەو بوو چەند ئۆتۆمۆبیلێک پەیا بوون کەریم قەرەنی موتەسەرفی (پارێزگار)ی تیابوو. ئەوسا حکوومەت وەک نیەتپاکی بەرامبەر بە کورد موتەسەرفە عەرەبەکەی سلێمانیی گۆڕیبوو و موقەدەم کەریم قەرەنیی کوردی لە شوێنەکەی دانابوو. کەریم قەرەنی دابەزی و رووی کردە ئەو ئاپۆرە و حەشاماتە کە بگەڕێنەوە هیچ نیە لە گۆڕێ و هیچیش نابێ و گوتی ئەمە تەنها قسە و قسەلۆکی ناو بازاڕە تکاتان لێ دەکەم بگەڕێنەوە. گوتی کاکە خۆ منیش خەڵکی سلێمانیم ئێوە هەموو دایک و خوشک و برای منن تکاتان لێ دەکەم بەم سەرما و سۆڵە ئەم منداڵانە پەرگەندەی ئەم چۆڵەوارییە مەکەن بگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆتان. ئەوە بوو کە بە قسەکانی دڵنیا بووینەوە و گەڕاینەوە. بەڕاستیش هیچ شتێک لە گۆڕێ نەبوو و شار وەکوو خۆی هێمن و ئارام بوو. هەندێ فشەباز هەر بۆ گاڵتە ئەم قڵێشانەوەیان بەناو شارا بڵاو کردبۆوە و ئەو خەڵکەیان لە سلێمانی دەرپەڕاندبوو.

کۆبوونەوە زۆرەکانی نێوان مەلا مستەفا و مەکتەبی سیاسی و چەندین ناوبژیکردنی کەسایەتیی کوردی ناوداری وەک فوئاد عارف سەریان نەگرت. مەلا مستەفا و بەغدا پێکهاتن و بەیاننامەیەکی هاوبەشیان لە رادیۆ بڵاو کردەوە کە وەک پێشتر باسم کرد بە بیروڕای مەکتەبی سیاسی هیچ داخوازییەکی وا گرنگی تیا نەبوو کە شۆڕشی بۆ کرابوو و خەڵکێکی زۆری لەپێناو بە شەهید چووبوون. لە بەیاننامەکەدا مەلا مستەفا داوای لە خەڵک کردبوو: "بگەڕێنەوە بۆ ناو ماڵ و عەیاڵی خۆ." پێکهاتنەکە بەو شێوەیە دڵی چینی رۆشەنبیری کوردی شارەکانیشی سارد کردەوە و ئەوەی من پێی بزانم زۆریان باڵی مەکتەبی سیاسیان بە راستتر دەزانی. یەکێک لەوانە خۆم بووم. بەپێی کاک کەمال محێدینی برادەری دێرین و خزمی خۆم، کە

ئـەو بەهـارەی 64 کـە شـەڕ و پێکـدادان لەنێـوان شـۆڕش و بەغـدا ڕاگیرابـوو کاک موحسـین و مـن دەرفەتمـان بـۆ ڕەخسـا چەندیـن جـار بچینـە سـلێمانی کـە لـە ماوەتـەوە نزیـک بـوو. لـە سـلێمانی لـە ماڵـی کاک عەلـی فەتـاح دزەیـی ئامۆزامـان دادەبەزیـن کـە بەڕێوەبـەری ناحیـەی مەرکـەز بـوو لـە سلێمانی یـان هـی عەربـەت بوو بـەڵام بەڕۆژ دەگەڕایـەوە بـۆ ماڵەکـەی لـە سـلێمانی. هەروەهـا کۆڵێـک بـرادەری دیکەشـمان لـە شـار بەسـەر دەکـردەوە. چەنـد شـەوێکی زۆر خۆشـمان، هـەر شـەوە لـە ماڵێـک، لەگـەڵ کاک عەلـی و ئـەو برادەرانـە لـە سـلێمانی بەسـەر بـرد. لەوانـەی کـە لەبیـرم مابـن و زۆریـان هونەرمەنـد و شـاعیر و ڕۆشـەنبیر بـوون ئەمانـە بـوون: حەمەسـاڵح دیـلان، ڕەفیـق چـالاک، نەجاتـی عەبـدە، حاتـەم سـەعید، نـوری وەشـتی، تەهـا بابـان، کاک ئەمیـن شـەوکەت، ئەحمـەد گوڵـزار خاوەنـی کـۆگای گوڵـزار و ئـی تریـش.

قسـە و قسـەڵۆکیش لـە بـازاڕ زوو زوو بـڵاو دەبوونـەوە لـە باسـی پەیوەندیـی شـۆڕش و بەغـدا لەلایـەک و ناوماڵـە لێـک ترازاوەکـەی شۆڕشـیش لەلایەکـی دیکـەوە. تـا ئێوارەیەکیـان کـە کاک موحسـین و منیـش هێشـتا لـە سـلێمانی بوویـن دەنگۆیەکـی زۆر ترسـناک بـڵاو بـووەوە کـە گۆیـا ئەمشـەو (ئەقلێشـێتەوە)، حکوومـەت بەسـەر سـلێمانیدا دەدات و دیسـان کوشـتارێکی زۆر خـراپ بەسـەر دانیشـتووانی ئـەو شـارە دێنـێ. ئیسـتیلاحی (ئەقلێشـێتەوە) لـە سـلێمانی بـۆ ئـەو جـۆرە شەوەڕەشـانە بـەکار دەهـات کـە حکوومـەت وەک زەمانـی زەعیـم سـدیق شـەلم کوێرانـە مـاڵ بەمـاڵ ئەگەڕێـت خەڵـک ئەکوژێـت و ئەیانگـرێ. ئیتـر بـەم شـەوەزەنگە کەسـمان لەنـاو شـارا نەمایـن، شـار چـۆڵ بـوو. هەڵبـەت ئەوسـا نـە هەمـوو کـەس ئۆتۆمۆبیلـی هەبـوو نـە ئەوەنـدە تاکسـییەش هەبـوون بۆیـە تـەواوی ئەهلـی شـار بـە مـاڵ و منداڵـەوە بـە پیـادە و بـە ئۆتۆمۆبیـل و ماتـۆڕ و بایسـکلیش ڕوومـان کـردە ڕێـی عەربـەت و لـە گونـدی کانـی ماسـی سـەرڕێمان تێـک قژایـن و وەک پوورەهەنـگ هـەر وژەوژمـان بـوو،

کوشتارەکەی زەعیم سدیقمان دەهاتەوە بەرچاو و نەماندەزانی چی بکەین و روو لە کوێ بکەین. پێم وایە کاتی نیوەشەو بوو چەند ئۆتۆمۆبیلێک پەیا بوون کەریم قەرەنی موتەسەڕفی (پارێزگار)ی تیابوو. ئەوسا حکوومەت وەک نیەتپاکی‌بەرامبەر بە کورد موتەسەڕفە عەرەبەکەی سلێمانیی گۆڕیبوو و موقەددەم کەریم قەرەنیی کوردی لە شوێنەکەی دانابوو. کەریم قەرەنی دابەزی و رووی کردە ئەو ئاپۆرە و حەشاماتە کە بگەڕێنەوە هیچ نییە لە گۆڕێ و هیچیش نابێ و گوتی ئەمە تەنها قسە و قسەلۆکی ناو بازاڕە تکاتان لێ دەکەم بگەڕێنەوە. گوتی کاکە خۆ منیش خەڵکی سلێمانیم ئێوە هەموو دایک و خوشک و برای منن تکاتان لێ دەکەم بەم سەرما و سۆڵە ئەم منداڵانە پەرگەندەی ئەم چۆڵەوارییە مەکەن بگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆتان. ئەوە بوو کە بە قسەکانی دڵنیا بووینەوە و گەڕاینەوە. بەراستیش هیچ شتێک لە گۆڕێ نەبوو و شار وەکوو خۆی هێمن و ئارام بوو. هەندێ فشەباز هەر بۆ گاڵتە ئەم قلێشانەوەیان بەناو شارا بڵاو کردبۆوە و ئەو خەڵکەیان لە سلێمانی دەرپەڕاندبوو.

کۆبوونەوە زۆرەکانی نێوان مەلا مستەفا و مەکتەبی سیاسی و چەندین ناوبژیکردنی کەسایەتیی کوردی ناوداری وەک فوئاد عارف سەریان نەگرت. مەلا مستەفا و بەغدا پێکهاتن و بەیاننامەیەکی هاوبەشیان لە رادیۆ بڵاو کردەوە کە وەک پێشتر باسم کرد بە بیروڕای مەکتەبی سیاسی هیچ داخوازییەکی وا گرنگی تیا نەبوو کە شۆڕشی بۆ کرابوو و خەڵکێکی زۆری لەپێناو بە شەهید چووبوون. لە بەیاننامەکەدا مەلا مستەفا داوای لە خەڵک کردبوو: "بگەڕێنەوە بۆ ناو ماڵ و عەیاڵی خۆ." پێکهاتنەکە بەو شێوەیە دڵی چینی رۆشەنبیری کوردی شارەکانیشی سارد کردەوە و ئەوەی من پێی بزانم زۆریان باڵی مەکتەبی سیاسییان بە راستتر دەزانی. یەکێک لەوانە خۆم بووم. بەپێی کاک کەمال محێدینی برادەری دێرین و خزمی خۆم، کە

لـە نزیکـەوە ئـاگاداری بـاری سیاسـی و رووداوەکانـی ئـەو سـەردەمە بـوو، هەنـدێ لـە ئەندامانـی مەکتەبـی سیاسـی کـە لـە مـاوەت دەبـن ئەوانیـش لای خۆیانـەوە لـە 1964/4/4 کـۆ دەبنـەوە و روونکردنەوەیـەک لـە دژی پێکهاتنەکـەی مـەلا مسـتەفا و حکوومـەت بـڵاو دەکەنـەوە. ئەمـن تایتلـی دەقـە عەرەبییەکـەی ئـەو روونکردنەوەیـەم لەبیـر مـاوە کـە ئەمـە بـوو " اتفاقیـة البارزانـي - عـارف أسـلم ام استسـلام ؟" واتـا " پێکهاتنەکـەی بارزانی-عـارف ئاشـتییە یـان خۆڕادەسـتکردنە ؟". روونکردنەوەکـە زۆر تونـد بـوو و رەخنـە و هێرشـێکی زۆری لـە مـەلا مسـتەفا و بـۆ سـەر مـەلا مسـتەفا تێدابـوو. باڵـی مەکتەبـی سیاسـی ئـەم قسانەشـیان بەنـاو خەڵـکا بـڵاو دەکـردەوە کـە مـەلا مسـتەفا کوردسـتانی بـە سـێو و پرتەقـاڵ فرۆشـتووە. مەبەسـتیان لەمـە ئـەوە بـوو کـە پارێـزگارە عەرەبەکـەی سـلێمانی محمـود عبدالـرزاق لـە سـەردانێکی بـۆ لای مـەلا مسـتەفا چەنـد کارتۆنێـک سـێو و پرتەقاڵـی وەک موجامەلـە بـۆ مـەلا مسـتەفا بردبـوو. کاک کەمـال محێدیـن دەڵـێ دوا هەوڵـی مەکتەبـی سیاسـی بـۆ دانوسـەندن لەگـەڵ مـەلا مسـتەفا ناردنـی حەبیـب محەمـەد کەریمـی فەیلـی بـوو بـۆ لای بـەڵام دەڵـێ مـەلا مسـتەفا حەبیبـی لای خـۆی گل دایـەوە و پێـی گـوت مەگەڕێـوە بـۆ لای ئـەو جاسـوس و خائینانـە مـن لـە جێـی برایـم ئەحمـەد ئەتکـەم بـە سـکرتێری پارتـی. هـەر واشـی لـێ هـات.

بەپێـی کاک موحسـینی براشـم لێکدابڕانـی هـەردوولا تـا دەهـات تیرتـر دەبـوو و کەسـایەتیی کـوردی نـاوداری بەغـداش وەک فۆئـاد عـارف و رەوفـە ڕەش و کەسـایەتیی عەشـایریش وەک کاکـە زیـادی کۆیـە و عەباسـی مامەنـد ئاغـا و شـێخ حسـێنی بۆسـکێن ئەوانـەش هەمیشـە لـە جموجۆڵـی ناوبژیکردنـا بـوون. کاک موحسـین دەڵـێ ئیتـر ئـەوە بـوو کـە پارتـی بڕیـاری دا کۆنگـرەی شەشـەمی لـە مانگـی شەشـا ببەسـتێت (یـان لـە رانیـە بـوو یـان قـەڵادزێ). کاک موحسـین هەروەهـا دەڵـێ مـەلا مسـتەفا داوای کردبـوو بـەدەر لـە برایـم ئەحمـەد و مـەلا عـەولا (مـەلا

ماتـۆڕ) بـا هەمـوو ئەندامانــی دیکــەی کۆمیتــەی ناوەنــدی و مەکتەبــی سیاسـی بەشـداری لـە کۆنگرەکـەدا بکـەن. ئیتـر نازانـم کێیـان چووبـوو کێیــان نەچووبــوو بــەڵام لــە کۆنگرەکــە هــەردوو کۆمیتــەی ناوەنــدی و مەکتەبـی سیاسـی پێشـوو هەڵوەشـێندرانەوە، هـی نوێیـان هەڵبـژارد و حەبیـب محەمـەد کەریمـیش لـە جێـی برایـم ئەحمـەد کـرا بـە سـکرتێری نوێـی پارتـی. بەپێـی کاک کەمـال محێدیـن هـەر لـەو بەینـەش و بەرامبـەر بـەو هەڵوێسـتەی مـەلا مسـتەفا مەکتەبـە سیاسیە کۆنەکـە کـە هـەر ئـەوان خۆیـان بـە شـەرعی دەزانـی ئەوانیـش لای خۆیانـەوە بەیانێکیـان دەرکـرد و مـەلا مسـتەفایان لـە سـەرۆکایەتیی پارتـی تەزانـد (تەجمیدیـان کـرد). جـا کاک کەمـال دەڵـێ مـەلا مسـتەفاش هێزێکـی نـاردە سـەریان و دوای شـەڕێکی کـورت هەنـدێ لـەو ئەندامانـەی مەکتەبـی سیاسـی کـە کاک کەمـال دەڵـێ پەلەیـان کردبـوو و مەلامسـتەفایان لـە سـەرۆکایەتیی پارتـی تەزاندبـوو لەگـەڵ 500 پێشـمەرگەیەک ئاودیـوی سـنوور بـوون بـۆ ئێـران و کاربەدەسـتانی ئێـران لـە هەمـەدان دایانمەزرانـدن.

لەوێـوە ئیتـر ئیسـتیلاحی جەلالـی و مەلایـی کەوتـە سـەر زاری خەڵکـی کوردسـتان لـە کاتێکـدا کـە مـام جـەلال هـەر لەوێـش نەبـووە کـە هەنـدێ لـە ئەندامانـی مەکتەبـی سیاسـی لـە مـاوەت ئـەو بڕیـارە بەپەلەیـان دابـوو. پێشـمەرگەی دێرینـی قسـەخۆش سـاڵح شـێرە کـە ئەوسـا جەلالـی بـوو بـە ئەندامانـی مەکتەبـە سیاسـیەکەی خۆیانـی دەگـوت: "ئـەرێ کاکـە پێـم ناڵێـن ئـەوە ئێمـە مـەلا مسـتەفامان تەزانـدووە یـان ئـەو ئێمـەی تەزانـدووە؟ خـۆ کـون نەمـاوە ئێمـە خۆمانـی لـێ بشـارینەوە و هەمـوو ڕێگایەکـم لـێ گیـراوە بچمـەوە هەولێـر سـەرێکی منداڵەکانـم بـدەم."

هەڵبــەت کوردەکانــی ئێــران بــەوە زۆر دڵگــران بووبــوون کــە جەلالیـەکان ڕوویـان کردووەتـە شـای ئێرانـی دوژمنـی کـورد. بەمـەش تـای تـەرازووی مەلایـەکان لای کـوردی ئێرانـێ زۆر لاسـەنگتر بـوو تـا پێشـوو. هـەژاری شـاعیر هەڵبەسـتە بەناوبانگەکـەی برایـم ئەحمـەد (شـیرین

بەهارە)ی دەسکاری کرد و بە شێوەیەکی گاڵتە پێکردن بەو "جاشانەی شا" سەرلەنوێ دایڕشتەوە. بە پێی کاک موحسینی برام ساواکی ئێران بە چەک و تەقەمەنی یارمەتیی ئەو تاقمەی دابوو بگەڕێنەوە و شەڕی مەلامستەفا بکەن. هەر واشی لێ هات و گەڕانەوە بەڵام هەر لەسەر سنوور هێزی مەلاییەکان بەرەنگاریان بوون و سەرلەنوێ ئاودیوی ئێرانیان کردنەوە و مەلا مستەفا هۆشداریی بە کاربەدەستانی ئێرانیش دا چیدی یارمەتیی ئەم تاقمە نەدەن. ئەڵبەت لە بەرژەوەندیی دەوڵەتی ئێراندا بوو و هەر لە پلانیشیدا بووە ناکۆکی و شەڕی براکوژی لەناو شۆڕشی کوردا بنێتەوە.

هەر چۆنێکی بێ کاک موحسینی برام دەڵێ پاش ماوەیەکی زۆر دیسان بە ناوبژیکردنی کەسایەتیی کوردی عەشایر و ئەوانەی دانیشتووی بەغداش مەلا مستەفا لێیان خۆش بوو کە بگەڕێنەوە و جارێ بۆ ماوەیەکی کاتەکی لای عەباسی مامەند ئاغا لە گوندی دۆڵەڕەقە دانیشن. هەر واش کرا.

بە درێژایی ئاگربەستی نێوان شۆڕش و بەغدا ناوەندی قورسایی سیاسی و پێشمەرگایەتی کەوتبووە سەر هێڵی ڕێی رانیە - سەنگەسەر - قەڵادزێ. ئەم شارانە لە سنووری ئێرانەوە نزیک بوون و تا ئەندازەیەک لەژێر کۆنترۆڵی پێشمەرگەشدا بوون. وردە وردەش دەردەکەوت کە سەرکردایەتیی شۆڕش پەیوەندیی نهێنیی بە حکوومەتی ئێرانەوە هەیە و یارمەتیی مادی و مەعنەویشی لەوەوە بۆ دێ. کوردی عێراق دڵی بەو پەیوەندییە خۆش بوو چونکە وا باو بوو کە ئێرانت لە پشت بێت دیارە ئەمریکات لە پشتە. بازاڕەکانی ئەو سێ شارە هەمیشە پڕ بوون لە کەلوپەل و کاڵای ئێرانی و هاتوچۆی بێ پاسپۆرتی هاووڵاتیانی کوردی عێراق بۆ ئێران بەو هێڵەدا زۆر ئاسایی بوو. خودی مەلا مستەفا ناوە ناوە دەهاتە ئەم ناوچانە و ماوەیەک دەمایەوە و کۆنگرەی شەشەمی پارتیش هەر لێرە گیرا.

جا کاک ئەحمەد و کاک موحسینی براکانم و خۆشم هاوینەکەی ئەم ساڵی 64مان لە رانیە بەسەر برد و لە خانووێکی شێخ حەمیدی شێخ سەدری ئامۆزای دایکم دامەزراین. شێخ حەمید خانووێکی لاچەپی بۆ پێشمەرگەی میوان تەرخان کردبوو کە هەمیشە دەبووە قۆناخی رابەرانی شۆڕش هەم بۆ کۆبوونەوە هەم بۆ مانەوەیەکی کاتەکی. جاروبار مام جەلال و هەندێ لە ئەندامە لادراوەکانی تری مەکتەبی سیاسی ئەوانیش دەهاتنە ئەو قۆناخەی شێخ حەمید و بۆ چەند شەوێک دەمانەوە.

دامەزرێنەرانی عیراقی کۆماری عبدالکریم قاسم (ڕاست) و عبالسلام عارف

هۆمەر و کافیەخانی دایکی و ناسکەی برازای لە ناوەڕاستی پەنجاکان لە دووگردکان

هۆمەر و کافیەخانی دایکی (هەولێر 1949)

مەلا مستەفای بارزانی و فوئاد عارف

لە چەپەوە: کەریم قەرەنی، لوقمانی مەلا مستەفا، مام جەلال ، ....؟

پێشمەرگەی دێرین موحسین دزەیی برای هۆمەر

کەسایەتی کورد جەنرال فوئاد عارف.

پێشمەرگە دێرینەکان لە چەپەوە: کەمال محێدین، عومەر جوڕلی، دارا عەتار. زرگوێز 1967

# بەشی 20

## من و مارگریت جۆرج

ناوی مارگەریت جۆرجم بیستبوو کە کچە نەوجەوانێکی ئاشووریی کوردستانە، بەرگی پێشمەرگەی پۆشیوە و یەکەم کچی کوردستان بووە ببێ بە پێشمەرگە. ئێمەی کورد پێشتر ناوی کچە چالاکوانی الجزایری (جمیلە بوحیرد)مان بیستبوو کە چۆن بەرهەڵستی کۆلۆنیالیستە فرانسییەکانی دەکرد لە شەڕی سەربەخۆیی الجزایرا. بۆیە شانازییەکی زۆرمان بەو کیژۆڵە جوانکیلەی خۆمان (مارگەریت جۆرج)ەوە دەکرد و هەندێک نازناوی (جەمیلە بوحەیرەد)ی کوردیشیان لێ نابوو.

لە ماوەی ئاگربەست و ئاشتیی نێوان شۆڕش و بەغدا مارگەریت لەگەڵ باوکی لە بادینانەوە هاتبوونە رانیە بۆ ئەوەی لە ناوەندی جموجۆڵی سیاسییەوە نزیک بینەوە و ئاگاداری شت ببن. وەک من، ئەوانیش لە رانیە لە خانووێکا دامەزرێندرابوون. مارگەریت زوو زوو دەهاتە قۆناخەکەی شێخ حەمیدی شێخ سەدری ئامۆزای دایکم (1924-2003) کە من و کاک ئەحمەد و کاک موحسینی براشمی لێ بووین و بووبووە ناوەندێکی دەنگوباسی سیاسی بۆ ئەوەی دواترین هەواڵی شۆڕش و بەغدا بزانێت. لەوێ بۆ یەکەمجار چاومان پێک کەوت و هەر بە یەکەم نواڕینە ناو چاوی یەکتریش یەکسەر بێ دەرگا لێدان خۆمان کرد بەناو قووڵایی دڵی یەکتریەوە.

مارگەریت کچێکی تا بڵێیت جوان و رووخۆش و هەمیشە دەم بەپێکەنین بوو. جلی پێشمەرگایەتیی زۆر لێ دەوەشایەوە. کە جاروبار

دەرفەتمان دەدی دوو قسەی بەینی خۆمان بکەین کە زۆر کەمیش وا هەڵدەکەوت، بیرمان لە هاوسەرگیری دەکردەوە. پێشتر ئەمن دامنابوو کە لەو ماوەی وتووێژی شۆڕش لەگەڵ بەغدا هەوڵ بدەم بگەڕێمەوە بۆ پاریس. مارگەریت سوور بوو لەسەر ئەوەی کە هەر لەوێ لە رانیە مارەییمان ببڕین و پێکەوە بڕۆین بۆ پاریس. بەڵام من بیرۆکەکەیم پێ باش نەبوو و پێم دەگوت ئاخر مارگەریت ئێمە جارێ نازانین وتوویژ لەگەڵ بەغدا بە کوێ دەگات و ئەگەر لەگەڵ خۆشما بتبەم بۆ پاریس خۆ جارێ نازانم خۆم چۆن بژێنم جا ژنیشم لەگەڵا بێ! بەڵام دیار بوو ئەو دڵی خەبەری دەدایێ کە ئەگەر پێکەوە نەڕۆین جارێکی تر چاومان بە یەکدی ناکەوێتەوە. دڵی لەگەڵیا راستگۆ بووە.

چونکە ئەو زەمانە دیدەنیی کچ و کوڕی گراوی یەکتری وەک ئەمڕۆ وا ئاسان نەبوو و ئایفۆن و شتی وا نەبوون بۆیە نێوانی من و مارگەریت زیاتر بە پەیوەندیی نامە گۆڕینەوە بوو کە لە پەناوە نامەیەکی دەدامێ و منیش هەر وەها. یان هەندێ جار نامەی بە دەستی منالێک بۆ دەناردم. ئەمانەی خوارەوە هەندێکن لەو نامانەی کە تا ئێستا وەک یادگارێکی بەنرخ و پڕ لە سۆز و خرۆشی رۆژانی جەوانیم هەڵمگرتوون. هەڵبەت نازانم نامەکانی منیش بۆ ئەو چییان بەسەر هاتووە. مارگەریت نامەکانی بە عەرەبی دەنووسی هەرچەندە کە عەرەبییەکەشی زۆر تێکشکاو بوو. هەنگی لە ناوچەی ئاشوورستان لە گوندەکانی بادینان قوتابخانەی کوردیان نەبوو، زمانی دایکی خۆیشی ئاشووری بوو. ئەمن کە بۆ پایزی هەر ئەو ساڵە 1964 گەڕامەوە بۆ پاریس بەرلەوەی عیراق بەجێ بێڵم لەناو هەموو نامەکانی مارگەریتا کە بۆی نووسیبووم و لەگەڵ خۆما بردبووم ئیستیلاحی (کوردستان یان نەمان) و وشەی (پارتی) و (شۆڕش) و (کوردستان) و (رانیە)م کوژاندەوە نەوەکوو لە فڕۆکەخانەی بەغدا نامەکان بخوێننەوە و لێم ببێ بە گرفت و کێشە.

مـن کـەوا لێـرەدا ئـەم چەنـد نووسـینەی مارگەریـت بـە عەرەبییـە تێکشـکاوەکەی و شێوازی نووسـینە سادەکەیەوە بـڵاو دەکەمـەوە نامـەوێ ئـەو هەسـتە ناسـکەی کـە لـەم نووسـینانەدا دەری بڕیـون لەپـاش خـۆی بین بـە بـەردی بـن گۆمـێ. ئەمـن پێـم سـتەمە ئـەم ڕۆمانسـە کورتخایەنـە پـاک و بـێ گـەردەی مـن و مارگەریـت لـە دەفتـەری مێـژووی مرۆڤایەتیـدا هەتـا هەتایـە بسـڕێتەوە. دەزانـم کـە خوێنـەری بەڕێزیـش مافـی تـەواوی خۆیەتی هەمـوو وردەکارییـەک لەبـارەی ژیانـی کەسـانێکا بزانـێ کـە ناوێکیـان هەیـە لەنـاو لاپەڕەکانـی مێـژوودا، لەهـەر بوارێـکا بووبـێ، بەتایبەتـی ئەگـەر ئـەو کەسـانە کـورد بـن. لـەوەش گرنگتـر، بـە ئەرکـی ئەخلاقیـی دەزانـم ئـەم چەنـد وشـەیە لەسـەر مارگەریتـی نامـرادی خێـر لەخـۆ نەدیـو بخەمـە نێـو دەفتـەری مێـژووەوە. لـە هـەر دەور و زەمانێـکا ئەگـەر دوو گـراو بـە داوێنپاکـی دڵیـان چووبێتـە یـەک نـە بـێ شـەرعیە نـە شـوورەییە.

مـن و مارگەریـت کەوتینـە داوی حەزلێککردنێکـی دەتوانـم بڵێم نیمچە پلاتۆنـی. مارگەریـت کچێکـی جەوانـی ئاشـووری بـوو لـە بنەماڵەیەکـی زۆر بەڕێـزی ناوچـەی خۆیـان لـە بادینـان. بەڵـێ مـن و مارگەریـت حەزمـان لێـک دەکـرد بـەڵام، خـوا ئـاگای لێیـە، حەزلێککردنێکـی کـڕ و بـێ دەنـگ کـە زیاتـر بـە نامەگۆڕکـێ هەسـتی گڕگرتـووی نـاو دڵمـان بـۆ یەکتـری هەڵدەڕشـت و هـەر زووبـەزووش بڕیـاری هاوسـەرگیریمان دا. ئـەو تەنانـەت پێشـنیاری کـرد کـە - تـا زووتـر باشـتر - هـەر لـە ڕانیـە بچمە لای مـام جۆرجـی باوکـی و خوازبێنیـی بکـەم چونکـە ئەونـدە بەڕێـز بـوو زۆر لای گـران بـوو بەبـێ مارەیـی ئەوهـا یەکـدی بیبنیـن. ئەوهـا بـوو ئـەو مارگەریتـەی کـە هەرچەنـدە کـە کوردیـش نەبـوو ئاشـووری بـوو بـەڵام هەسـتی کوردسـتانچیاتی وای لـێ کردبـوو بەرگـی پێشـمەرگە بپۆشـێت و چـەک هەڵگـرێ. کـە گەڕامـەوە بـۆ پاریـس ئینجـا پـاش ماوەیـەک هەواڵـی دڵتەزێنـی مەرگـی مارگەریتـم زانـی.

یـادی بەخێـر و هـەزار ڕەحمـەت لـە گڵکـۆی ئـەو کچـە نـازدارە کـە ئێسـتاش سـەیری وێنـە و نامەکانـی دەکـەم گریـان لەنـاو دڵمـا پەنـگ

ئەخواتەوە. هیوادارم خوێنەرانی بەڕێزی ئەم نامانەش سەری ڕێز و نەوازشت بۆ ئارامگەی ئەم نەوجەوانە بە مراز نەگەیشتووە دابنەوێنن. فەرموون لەگەڵ نامەکان بە عەرەبی. من وەرم گێڕاونەتە سەر کوردی، بەڵام کوردییەکی کەمێ ڕێکوپێکتر لە عەرەبییە سەروگوێلاک شکاوەکەی ئەو.

نامە ژمارە - 1

کوردستان یان نەمان (من خەتم بەسەر ئەم چەند وشانەدا کێشاوە - هۆمەر)

الى حضرة جناب محبوب عندي و نور العيني كاک عمر المحترم

تحية ثورية و تحية صادقة

قبل أتناول قلم ليدي لأكتب لشخصک الكريم، هذه الورقة مليان من حب وخير وعافية وأتمنى لک عمرا مديدا.

كاک عمر.. اذا تتمكن تحضر لعندي فی دار علي بک والوالدي ليس موجود هنا، فأرجوک انا بكثيرا مشتاقة لرؤيتک فارجو اذا تتمكن تتوجه لعندي.

وأرجوک: جواب مع حامل الرسالة. واذا وصل تصويري، ارسلني مع حامل ورقة. مع تصويرک جميل ذلک التصوير أهديتني به.

أحفظ برسالة رجاء بوحدک حتى لا يعرف أحد بيها. وهذه دمتم سالمين.

واژۆ

کوردییەکەی نامە ژمارە - 1

کوردستان یان نەمان (من خەتم بەسەر ئەم چەند وشانەدا کێشاوە - هۆمەر)

بۆ حەزرەتی جەنابی خۆشەویستی لام و ڕووناکیی چاوم کاک عومەری

بەڕێز

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانه و سڵاوێکی له دڵەوه

پێش ئەوەی قەڵەم بگرمە دەست تا ئەم کاغەزە پڕ لە خۆشەویستی و خێر و تەندروستی بۆ تۆی بەڕێز بنووسم و ئاواتی تەمەنی درێژت بۆ بکەم.

کاک عومەر ئەگەر بتوانیت بێیتە لام لە ماڵی عەلی بەگ و باوکیشم لە ماڵ نییە بۆیە تکات لێ دەکەم من زۆر پەرۆشی بینینتم تکات لێ دەکەم ئەگەر دەتوانیت بێیتە لام.

تکاشت لێ دەکەم وەرامم بە دەستی هەڵگری ئەم کاغەزە بۆ بنێرە. ئەگەر وێنەکەشم گەیشتووە ئەویشم لەگەڵ هەڵگری کاغەزەکە بۆ ڕەوانە بکە لەگەڵ وێنەی خۆت چەند جوانە ئەو وێنەیەی بەدیاری داوتە من.

تکایە ئەم نامەیە تەنها بۆ خۆت هەڵگرە با کەس نەیبینێ. ئیتر هەر لەخۆشیدا بمێنیت.

واژۆ

نامە ژمارە - 2

کوردستان یان نەمان (من خەتم بەسەر ئەم چەند وشانەدا کێشاوە - هۆمەر)

64\6\16

الى حضرة محبوب عندي ونور العيني ويبتعد عني

تحية صادقة و أشواق قلبية.

قبل أتناول قلم ليدي لأكتب لك هذه الرسالة أول مرة في حياتي، ولكن قوة حبك تدفعني لاكتب لشخصكم هذه الرسالة الرقيقة مليانا من حب و خير وانتسار.

أطلب من ألله الرحيم ان يوفقكم وينقذك (ئەم وشەیە بە ڕوونی ناخوێندرێتەوە - هۆمەر) من أيد الخونة الظالمين. والفاسدين. وأتمنى

لـک عمـرا مديـدا وتوفيقـا دائمـا و فرحـا فـی طـول عمـرک و اذا يتشـرف جنابـک للسـؤال عنـي الحمدلله انـا بصحـة جيـدا وليـس لـي اي قصـور مـن بعـد فراقـي عنـک. وياليتنـي لـم رأيتـک وياليتنـي لـم أعرفتـک و أنـا دومـا أقـول يـا رب كيـف نفتـرق و كيـف نلتقـي بلحبـاب.

لمـا كتبـت هـذه المكتـوب كان قلبـي مليـان مـن حـزن و بـكاء و قهـر. السـبب افتراقـي عنـک يـا محبـوب و لـم أنسـى أيـام الحلـوة الـذي قضيناهـا سـويا فـی رانيـة، أرجـو منـک لا تنسـاني للأبـد و اذا أنـا بعيـدة ولكـن قلبـي قريـب عنـک و سـوف نلتقـي ونرجـع الـی أيـام الماضيـة و نتجـدد أيـام الاتيـة و نعيـش سـويا فأرجـوک اذا انـت ذاهبـا الـی خـارج العـراق، فأرسـلني رسـائل حتـی أتمكـن اعيـش هنـا و بـأي وقـت تطلبنـي مـن الحـزب (مـن خەتـم بەسـەر ئـەم وشـەیەدا کێشـاوە - هۆمـەر) سـوف أجيـک بـدون تاخيـر. و هـذه سـوف اغـادر ارض رانيـة (مـن خەتـم بەسـەر ئـەم وشـەیەدا کێشـاوە - هۆمـەر) متوجهتـا الـی منطقـة بادينـا.

حبـک أصبحـة أثـرا فـی قلبـي و جرحـا فـی كبـدي و أحبـک محبـة الحقـول الربيـع و هـذه المكتـوب يبقـی عنـدک لتذكاريـة ولمـا تسـافر الـی خـارج تكـون رسـالتي معـک لتذكرنـي.

لا تنسـاک للأبد مرگريت

الـی اللقـاء و قدومـي لعنـدک لا تنسـی أيـام الحلـوة الـذي قضيناهـا سـويا فـی رانيـة (مـن خەتـم بەسـەر ئـەم وشـەیەدا کێشـاوە - هۆمـەر)

يـا عالـم الأسـرار علـم اليقيـن. يـا كاشـف الـذر (ئەم دوو وشـەیەم بـە روونـی بـۆ نەخوێندراونەتـەوە - هۆمـەر) علـی البائسـين صديقتـک الصادقة للمـوت معـک جنبـا بجنـب. احفـظ بهـذه المكتـوب رجـاء. رسـالة خالـدة لـک للتـذكار

الحب أقوى من النار

کوردییەکەی نامە ژمارە - 2

کوردستان یان نەمان (من خەتم بەسەر ئەم چەند وشانەدا کێشاوە - هۆمەر)

64\6\16

بۆ حەزرەتی خۆشەویست لام و رووناکیی چاوم کە لێم دوور دەکەویتەوە

سلاوێکی لە دڵەوە و لە دڵەوە پەرۆشی دیدەنیت

پێش ئەوەی قەڵەم بگرمە دەستم تا ئەم نامەیەت بۆ بنووسم بۆ یەکەمجار لە ژیانما، بەلام هێزی خۆشەویستیت پاڵم پێوە دەنێ ئەم نامە ناسکە بۆ شەخسی تۆ بنووسم کە پڕە لە خۆشەویستی و خێر و سەرکەوتن.

داوا لە خوای میهرەبان دەکەم سەرکەوتووت بکات و لە دەستی خائینان و ستەمکاران و گەندەڵان بتپارێزێ. هەروەها داوای تەمەنی درێژ و سەرکەوتنی هەمیشەیی و شادیت بۆ دەکەم بە درێژایی ژیانت. وە ئەگەر جەنابت لە من بپرسیت پەنا بەخوا من تەندروستیم باشە و هیچ کەموکورییەکم نییە دوای دابڕانم لە تۆ. بریا تۆم هەر نەدیبا، بریا تۆم هەر نەناسیبا و من هەمیشە دەڵێم خودایە چۆن دەبێ لێک جیابینەوە و چۆن دیسان لەگەڵ خۆشەویستان یەکدیگر ببینەوە.

کاتێ کە ئەم نامەم دەنووسی دڵم پڕ دەبوو لە خەم و گریان و خەفەت و هۆیەکەشی ئەوەیە کە لە تۆ دادەبڕێم ئەی خۆشەویستەکەم. ئەمن هەرگیز ئەو رۆژە شیرینانە لەبیر ناکەم کە بەیەکەوە لە رانیە رامان دەبوارد تکات لێ دەکەم تاهەتایە لەبیرم مەکە هەرچەندە کە من لێشت دوور دەبم بەلام دڵم هەر لە تۆ نزیک دەبێت و رۆژێک هەر پێک دەگەینەوە و دەگەڕێینەوە بۆ ئەم رۆژە رابردووانە و رۆژانی داهاتووش نوێ دەکەینەوە و پێکەوە دەژین. جا تکات لێ دەکەم ئەگەر تۆ دەڕۆیت بۆ دەرەوەی عیراق نامەم بۆ بنێرە تا بتوانم بژیم لێرە. وە هەر کاتێکی داوام لێ بکەیت یەکسەر بەبێ گیربوون دێم

بـۆ لات. جـا وا مـن بەتەمـام رانیـە بەجـێ بێڵـم و بـەرەو ناوچـەی بادینـان ڕێ بگرمـەوە بـەر.

خۆشەویستیی تـۆ کاری لـە دڵـم کـردووە و زامـی لە جگـەرم ناوەتەوە. خۆشەویسـتیی مـن بـۆ تـۆ وەک خۆشەویسـتیی زەوی و زارە بـۆ بەهـار. بـا ئـەم نامەیـەش بـۆ یـادگاری لات بمێنێـت و کـە سـەفەری دەرەوەشـت کـرد بـا نامەکـەم هـەر لات بێـت تـا یـادم بکەیتـەوە.

هەرگیز لەبیرت ناکات مارگەریت
تا بەیەک دەگەینەوە و دێم بۆ لات
لەبیر نەکەی ئەو ڕۆژە خۆشانەی کە پێکەوە لە رانیە بووین.
یا عالم السرار علم اليقين . يا كاشف ال... على البائسين.
دۆستی بەڕاستیت و لەگەڵتا تا مردن لە پاڵ یەکتر
تکایە ئەم نامەیە بپارێزە.
نامەیەکی نەمرە بۆ تۆ بۆ یادکردنەوە

(مارگەریـت دامەنـی ئـەم نامەیـەی بـە وێنەیەکـی خـۆی لەنـاو دڵ و گـوڵ و گوڵزارێـکا رازاندووەتـەوە و ئەمەشـی لەنـاودا نووسـیوە: خۆشەویسـتی لـە ئاگـر بەهێزتـرە - هۆمـەر).

نامە - ژمارە 3

(ئـەم نامەیـە زیاتـر قسـەی کتێبانـە لەسـەر خۆشەویسـتی کـە کۆپیـی کـردووە تەنهـا پاراگرافی دوایـی نەبـێ کـە قسـەی خۆیەتی. ئەمـن هەندێ لـە جوانتریـن گوتـە وەرگیراوەکانـی کتێبـان ئینجـا تـەواوی قسـەکانی خـۆی بـڵاو دەکەمـەوە - هۆمـەر):

....والأن قـد قضـى الأمـر فمـاذا نفعـل، قـل لـي مـاذا نفعـل و كيـف نفتـرق والـى متـى نلتقـي، هـل نحسـب الحـب ضيفـا غريبـا أتـى بـه المسـاء وأبعـده الصبـاح.

وأنـا سـأجعل روحـي غلافـا لروحـك. وقلبـي بيتـا لجمالـك و صـدري قبـرا لأحزانـك. سـوف أحبـك محبـة الحقـول للربيـع وسـوف أحـي بـك

حياة اللأزهار بحرارة الشمس و يسير بي الى ساحة العالم حيث الجهاد والقتال انت الى الحياة وانا الى النزاع وانت الى الأنس و الألفة و أنا الى وحشة والانفراد ولكنني سأرفع في وادي ظل والموت تمثالا للحب و اعبده.

(ئەوەی سەرەوە لەوە دەچێ قسەی ناو کتێبان بێت لەبارەی عیشق و ئەو وەری گرتبێت. بەڵام ئەمەی خوارەوە ئیتر قسەی خۆیەتی - هۆمەر)

وهذه الرسالة تبقى عندک تذکارية للأبد و أرجو منک بأي طريق تتمکن تاخذني الى خارج، فخذني رجاء بطريق الحزب (من خەتم بەسەر ئەم وشەیەدا کێشاوە - هۆمەر) وأنا قدمت أريضة الى الحزب (من خەتم بەسەر ئەم وشەیەدا کێشاوە - هۆمەر) حتى أشترک في.... ( خەتم بەسەر دوو وشەدا کێشاوە کە بەداخەوە نازانم چین - هۆمەر) و أقوم بخدمة... (بۆم ناخوێندرێتەوە - هۆمەر) فأرجوک خذني يا سپورت حتى التحق و أجي الي خارج الوطن و اذا جئت عندک سوف أسجل في مدرسة او تتعلمني انت قراءة والکتابة بلوغة فرنسي أو انجليزي و کوردي و الى اللقاء معک يا محبوب عند لم انساک للموت..

صديقتک صادقة من صميم قلبي

واژۆ

کوردییەکەی بەشێکی نامە ژمارە - 3

.... ئێستاش وا کار لە کار ترازاوە جا چی بکەین پێم بڵێ چی بکەین و چۆن لێک دابڕێین و کەی پێک دەگەینەوە ئایا دەبێ تەماشای خۆشەویستی بکەین وەک میوانێکی لایدە کە ئێوارە هێنای و سبەینەش بردیەوە.

ئەمن گیانی خۆم دەکەمە بەرگی گیانی تۆ. دڵی خۆم دەکەمەماڵی جوانیی تۆ و سنگم دەکەمە گۆڕی خەم و خەفەتەکانی تۆ. تۆم

خـۆش دەوێ وەک خۆشەویسـتیی زەوی و زار بـۆ بەهـار. ئەمـن وەک ئـەو گولالانـە دەژیـم کـە بەبێ گەرمایـی هەتـاو ناتوانـن بژیـن و دەمبـەن بۆ مەیدانـی جیهانـی پـڕ لـە شـەڕ و تێکۆشـان. ئەتۆ بـەرەو ژیـان و منیـش بـەرەو تێـک گیرسـان، ئەتـۆ بـۆ نـاو کەیـف و سـەفا و منیـش بـۆ بێـزاری و تەنیایـی بـەلام لـە دۆلـی..... پەیکەرێکـی خۆشەویسـتی دادەچەقێنـم و دەیپەرسـتم.

(ئەمەی خوارەوە ئیتر دیارە قسەی خۆیەتی - هۆمەر)

ئـەم نامەیـەت بـا لا بێ بـۆ یادەوەریـی تـا هەتایـە. تکاشـت لـێ دەکـەم بـە هـەر چ ڕێگایەکـی لـە تواناتـدا بێ بمبـە بـۆ دەرەوە جـا تکایـە بمبـە بـە ڕێـگای حـزب (مـن خەتێکـم بەسـەر ئـەم وشـەیەدا کێشـاوە - هۆمـەر) و خۆیشـم عەریزەیەکـم داوەتـە حـزب (وەک پێشـوو - هۆمـەر) تاکـو بتوانـم بەشـداری لـە.... (خەتـم بەسـەریا کێشـاوە و ئێسـتا بـۆم ناخوێندرێتـەوە - هۆمـەر) و خزمەتێـک بکـەم. جـا تکایـە ئـەی سـپۆرت بمبـە تاکـوو بگـەم و بێمـە دەرەوەی ولات. جـا ئەگـەر هاتـم بـۆ لات خـۆم لـە قوتابخانەیـەک ناونـووس دەکـەم یـان تـۆ فێـری خوێنـدن و نووسـینم دەکەیـت بـە زمانـی فرانسـی یـان ئینگلیـزی و کـوردی. ئیتـر تـا پێـک دەگەینـەوە ئـەی خۆشەویسـتم کـە تـا مـردن لەبیـرت ناکـەم.

یاری بەڕاستیت لە قوولایی دڵمەوە

واژۆ

پایـزی 64 داهـات و بارودۆخـی نـە شـەڕ نـە ئاشـتی لـە نێـوان شـۆڕش و بەغـدا بـەردەوام بـوو. هاتوچـۆی پێشـمەرگە بـۆ ناوشـارەکان ئاسـایی بـوو هەرچەنـدە کـە لێـرەو لـەوێ جاروبـار کورتـە تەقوتۆقێـک هـەر ڕووی دەدا بەتایبەتـی لەگـەڵ جاشـەکان و هەنـدێ جـار لەپەنـاوە کوشتنیشـی لـێ دەکەوتـەوە بـەلام زوو چـارە دەکـرا و نەیاندەهێشـت گـەورە ببێـت. منیـش بڕیـارم دا بگەڕێمـەوە بـۆ پاریـس. براگەورەکانـم 600 پاوەنیـان دامـێ کـە بـۆ ئەوسـا زۆر بـوو و بچمـەوە ئەمجـارە خوێندنەکـەم تـەواو بکـەم.

مانگی پەنجا پاوەن زۆریش بوو کە کۆیەکەی دەبوایە بەشی نزیکەی سالێکم بکات. لە پێشانا چووم مالاواییم لە هاوکارانی رادیۆی دەنگی کوردستانم کرد. ئێستاش کەوا ئەم دێرانە دەنووسم ئەوە پەنجاوچوار دانە سال تێ دەپەرێت بەسەر دامەزراندنی ئەم دەنگە خۆش و خۆشەویستەی گەلی کورد ( رادیۆی دەنگی کوردستان) و چاوەکانم پڕ دەبن لە فرمێسک کە بیر لە وان رۆژان دەکەمەوە و ئەو هەموو بیرەوەریانەم دێتەوە بەرچاو. سەت مخابن کە زۆرێک لەو هاوکارە پێشمەرگانەم کە رادیۆکەمان پێکەوە دامەزراند و بەرێوەمان دەبرد ئێستا ئەم دنیایەیان بەجێ هێشتووە بەلام لەناو دلی ئێمەدا ماون و هەر دەمێنن، هەزار سلاو لە گیانی پاکیان. هەزار سلاو و دەسخۆشانەش لە برایانی ستافی ئەمرۆی دەنگی کوردستان بێت و هیوای سەرکەوتن و بەردەوامبوونی ئەم رادیۆیە مێژووییەی کوردستانیان بۆ دەخوازم.

ئینجا گەرامەوە بۆ رانیە مالاوایی لە مارگەریتی لە دوو لاوە نامراد بکەم: نە ئازادیی کوردستانی بە چاوی خۆی دی نە خەونی هاوسەرگیری لەگەل یارەکەی جارانی هاتە دی. دەرفەتمان رەخساند خۆمان بۆ ماوەیەکی کورت دابڕێنین و یەکتری ببینین. بە کول گریا و منیشی گریاند. کە بینیم چاوی گریانی پێوە دیارە پێم گوت مارگەریت جارێ مەچۆرەوە بۆ لای باوکت با نەزانێ گریاویت. بەلام ئەمجارە ئەو بەوپەری بێباکی و بە دوو چاوی پڕ لە پرشنگی ئەسرینەوە پێی گوتم نا نا لەمێژە پێم گوتووە حەزم لە تۆ کردووە. دیسان دای لە قولپی گریان سەری بە سنگم وەنا و فرمێسکە گەرمەکانیم بە پەنجەکانم بۆ دەسریەوە.

دوا مالاواییم لە رانیە و قۆناخە هەمیشە بە هەرمێنەکەی شێخ حەمید دەسلەملانەیەکی گەرم وگورم بوو لەگەل خانەخوێی قۆناخەکە کاکەشێخ حەمیدی شێخ سەدری کۆیی (1924-2003) ئامۆزای دایکم کە یەکێک بوو لە خالوانە هەرە خۆشەویستەکانی ئێمەی منالانی کافیە خانی شێخ مارفی بەرزنجی. بیرمە کاک حەمید هەر لە

سەرەتای چلەکانی سەدەی رابردوو هەر جارێکی لە کۆیەوە بهاتایە هەولێر بێ سەردانی ئێمە نەدەگەڕایەوە و دڵی ئێمەی ئەوسا منداڵی بە سەردانەکانی و قسەخۆشەکانی زۆر خۆش دەکرد. هەروەها بیرمە کاک حەمید گەنجێکی زۆر شۆخ و شەنگ و قۆز و شیکپۆش بوو و بە چێژێکی زۆر بەرزەوە بەرگە کوردییەکانی خۆی هەڵدەبژارد و جوانیشی لێ دەهات. هەزار جار یادت بەخێر ــ بە ئیستیلاحی دایکم ــ "کاک حەمیدی مامە سەدرم". بەڵام خۆ کاکە شێخ حەمید هەر تەنیا خۆی نا، بگرە هەموو براکانیشی (کاکە شێخ فاتیحی براگەورەی و کاعومەر و کاک مەزهەر و بابەکەریم) هەر هەموویان قسەخۆش و نوکتەزان وخزمدۆست بوون، یادیان بەخێر. داخی گرانم لەو پێنج برایە ئەمڕۆ کەسیان نەمایە، زۆریان هەر لە بەهارا گەڵای زەردیان هەڵوەری.

مارگەریتی پێشمەرگە شانازی خەڵکی کوردستان بە سڤیل و پۆلیس و گەورە و بچووکەوە

هۆمەر دزەیی و مارگەریت جۆرج - ڕانیە، 1964

پێشمەرگەی دێرین مارگەریت جۆرج

پێشمەرگە دێرینەکان مام جەلال و مارگەریت جۆرج - ڕانیە، 1964

لەچەپەوە: تەحسین شێخ حەمید شێخ سەدر، شێخ حەمید شێخ سەدر
(ئامۆزای دایکی هۆمەر)، سالار شێخ حەمید شێخ سەدر

شێخ حەمیدی
شێخ سەدری بەرزنجی
ئامۆزای دایکی هۆمەر

# بەشی 21

## گەڕانەوەم بۆ پاریس

رانیەم جێ هێشت و گەڕامەوە بۆ هەولێر، چووم بۆ دووگردکان بۆ سەر ئارامگای دایکم و بەکوڵ گریام. ماڵاواییم لە خزم و کەسان و دانشتوانی دووگردکان کرد و ڕێی بەغدام گرتە بەر تا لەوێوە بچمەوە بۆ پاریس. ماڵی کاکە زەید ئەحمەد عوسمانی پوورزام لە بەغدا بوو و سەردانێکی ئەویشم کرد بۆ ماڵاوایی. لەوێ هاتینە سەر ئەو باسە کە پێش هاتنەوەم بۆ کوردستان بورس (زەمالە) ی خوێندنم هەبوو بەڵام ئەوە ساڵ و نیوێکە وا لە کوردستانم بێ گومان ئێستا دەبێ بورسەکەم لێ بڕابێت و دەبێ بچمەوە هەوڵ بدەم پێیان بسەلمێنم بە ویستی خۆم نەبووە کە لە عیراقا گیرم خواردبوو. کاک زەید گوتی من بالیۆزی فرانسی باش دەناسم دەتبەم بۆ لای و وەزعەکەی تۆی بۆ روون دەکەینەوە. وامان کردو سەردانەکەمان سەری گرت. لە بالیۆزخانە نامەیەکیان دامێ بۆ (مسیۆ رۆسی) لە پاریس کە بەرپرسی کاری خوێندکارانی بیانی بوو و گوتیان ئێمە خۆشمان بۆی دەنووسین و دڵنیا بە بورسەکەت بە مسۆگەری بۆ نوێ دەکرێتەوە.

ئەوەی کاک زەید بۆی کردم هەرگیز لەبیر ناکرێت، گۆڕی پڕ لە نوور بێ. یەکسەر بلیتی فڕۆکەم بڕی بۆ پاریس بەڵام بە ڕێگای ئەسینا لە یۆنان چونکە دەمویست چەند ڕۆژێک لای کاک خوسرەوی رەشید جەودەت لادەم کە خۆی و تەواوی بنەماڵەکەیان

دۆستی دێرینی بنەماڵەی ئێمە بوون. کاک خوسرۆ ڕەبەن بوو و دیپلۆمات بوو لە باڵیۆزخانەی عیراقی لە ئەسینا و بە تاکی تەنیا لە ئەپارتمانێکی زۆر ڕێکوپێکدا دەژییا و میوانی ئەو بووم. چەند شەو و ڕۆژێکی زۆر خۆشمان لە ئەسینا پێکەوە بەسەر برد. کوردێکی تریش کە بەداخەوە ناوەکەیم لەبیر نەماوە بەڵام پێم وایە لە بنەماڵەی خەفاف بوو ئەویش خۆی و هاوسەرەکەی کە هێشتا لە مانگی هەنگوینا بوون ئەوانیش لەوێ بوون. ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم ئەو برادەرە پۆستی پاشکۆی کولتووری (ملحق ثقافي) ی لە باڵیۆزخانەی عیراق لە ئەسینا هەبوو. شەوێکیان کاک خوسرەو من و ئەوانی بردە بارێکی زۆر خۆش لە گەڕەکی پلاکا کە لەوێ هەڵپەڕکێی میللی یۆنانییان نمایش دەکرد. هەر بەم بۆنەیەوە حەز دەکەم دوو فرمێسکی یاداوەری بەیادی ئەو پیاوە جوامێرە چاوتێرە بڕێژم کە بە داخەوە لە تافی لاوییدا ئەم دونیایەی بەجێ هێشت، خوسرۆ ڕەشید جەودەت کە هەر دەتوت کوڕە میرە. هەزار جار یادی بەخێر کە تا هەتایە لەناو دڵی دۆست و یارانیدا جێگیرە.

گەڕامەوە بۆ پاریس و یەکسەر چووم بۆ ئۆفیسی بورسەکان و (مسیۆ ڕۆسی) م بینی نامەکەی باڵیۆزخانەی فرانسیم لە بەغدا دایێ. بورسەکەم وەرگرتەوە و ئەمجارەیان خۆم لە (کۆلێژی باڵای وەرگێڕانی زارەکی و نووسراوەیی Ecole Superieure d`interpretes et de traducteurs) تۆمار کرد و بەشی تەرجومەی فرانسی ئاڵمانی عەرەبیم هەڵبژارد.

ساڵ گەڕابووەوە بۆ 1965. ڕۆژێکیان لە شەقامی شانزلیزێ ی لە جیهانا بەناوبانگ پیاسەم دەکرد و بە بەردەم ساڵۆنێکی نمایشکردنی ئۆتۆمۆبیلی ترایەمف (Triumph)ی بریتانیدا ڕەت دەبووم . لە جامخانە پانەکەدا مۆدێلێکی زۆر جوانی ترایەمف سپیتفایەر (Triumph Spitfire)ی سپۆرتی دوو نەفەری سەر کراوەی ڕەنگ سوورم بەدی کرد کە یەکسەر سەرنجی ڕاکێشام. نرخەکەشی لەسەرا نووسرابوو بۆ

خەڵکی بیانی ئەگەر تا ماوەی ساڵێکیش لە فرانسا بمێننەوە مافیان هەیە بێ گومرگ دان بیکڕن و تەنها 625 پاوەنی ستێرلینی بوو. سەیری گیزدانی خۆم کرد لەو 600 پاوەنەی لەگەڵ خۆما هێنابووم هێشتا 500م مابوو چونکە مانگانەی بورسم هەبوو و جارێ دەستم لە پارەکەی خۆم نەدابوو. یەکسەر چووم بۆ لای کاک زۆزگ رەواندزی برادەرم و پێم گوت کە پیویستیم بە 125پاوەن هەیە بۆ کڕینی ئەو ئۆتۆمۆبیلەی خەونەکانم و پێم گوت پارەکەشت وردە وردە مانگانە لە مووچەی بورسەکەما دەدەمەوە. زۆزگ کە لە خەرجکردنا وەک من دەسبڵاو و بێ سەروبەر نەبوو زۆر پیاوانە و برادەرانە یەکسەر پارەکەی لە بانک بۆ دەرهێنام. ئۆتۆمۆبیلەکەیان لەناو کاغەزا بۆ دەرهێنام (ترایەمف سپیتفایەر) سپۆرتی رەنگ سووری سەرکراوەی دوو نەفەری هەر جێی خۆم و کیژۆڵەیەکی جوانکیلەی لێ دەبووەوە.

ئێ برا و برادەرینە، هۆ خوێنەرانی خۆشەویستی ئەم نووسینانەم! من خۆم هیچ ناڵێم، ئێوە خۆتان قسە بکەن: توخوا تۆش لە جێی من بوایت، لە تافی لاویتا، بە ئۆتۆمۆبیلێکی سپۆرتی سووری دوونەفەریی نوێوە، بە مانگانەیەکی مسۆگەری دەوڵەتی فرانسییەوە، وەک خوێندکاری کۆلێژێکی ناوداری زانکۆی پاریس و لە شاری پاریسی پڕ لە کچی شۆخوشەنگی هەموو دونیا باشە کاکە توخوا چۆن خوێندنت پێ بکرێت؟!!!

ئەم چەند کوپلەی هەڵبەستە بەناوبانگەکەی مامۆستا برایم ئەحمەد (یادگار و هیوا) هەر ئەتوت بۆ من داندراوە:

ژیام سەردەمێ بە کەیفخۆشی
بەشادیم کڕی بە غەمفرۆشی
هەتا توانیم روومەتم مژی
هەتا پێم کرا شەرابم نۆشی.

## ئه‌مجاره‌یان كه‌وتمه داوی خۆشه‌ویستیی
## ماجدة توفيق عمر

(كۆلێژی باڵای وه‌رگێڕانی زاره‌كی و نووسراوه‌یی) له پاریس كه ئه‌وسا له بولڤار سان میشێل بوو به كچی جوانی له هه‌موو ره‌نگ و ره‌گه‌زێكه‌وه ناودار بوو. كیژان به‌گشتی و به‌تایبه‌تی ئه‌وانه‌ی كه بێجگه له زمانی دایك زمانێكی تریش ده‌زانن حه‌زیان له كاری وه‌رگێڕانه و به ئاواتی ئه‌وه‌ن كه به بڕوانامه‌ی وه‌رگێڕان له یه‌كێك له رێكخراوه زۆره‌كانی نه‌ته‌وه یه‌كگرتووه‌كانا UN وه‌ربگیرێن كه له‌وێ پاره‌ی باشیان ده‌س ده‌كه‌وێ. منیش كه هه‌ر له ته‌مه‌نێكی زووه‌وه له‌ته‌ك موزیك حه‌زم له فێربوونی زمان و زمانه‌وانیش بوو ده‌ستم له خوێندنه‌كه‌ی پێشووم ( علومی سیاسی) هه‌ڵكرت و له‌و كۆلێژه خۆم ناونووس كرد. له‌وێ به‌و ئۆتۆمۆبیله سپۆرته‌وه ببوومه مایه‌ی سه‌رنجی كیژه جوانه‌كانی كۆلێژ. ئه‌و زه‌مانه یه‌كێك به‌و ته‌مه‌نه لاوییه ئه‌گه‌ر كوڕه ده‌وڵه‌مه‌ند نه‌بوایه ئه‌وهای رانه‌ده‌بوارد. كچی نه‌وجوانیش له هه‌موو ده‌ور و زه‌مانێكا هه‌ر خه‌ون به‌و جۆره كوڕانه‌وه ده‌بینن و وه‌كوو ئاكته‌ری سینه‌ما ده‌یانڕواننێ. زۆر وریاشن نایانه‌وێ هه‌لی وا زێڕین له‌ده‌ست خۆیان بده‌ن بۆیه زوو هه‌وڵ ده‌ده‌ن به ماره‌بڕین به‌خۆیانی ببه‌ستنه‌وه نه‌وه‌كو كچێكی تر خۆی بگه‌یه‌نێتێ و حیجزی بكات. راسته له وڵاتی خۆما ئێمه پێشتر به بنه‌ماڵه ده‌وڵه‌مه‌ند بووین به‌ڵام من خۆم له ده‌ره‌وه‌ی وڵات هه‌رچه‌ندی هه‌شمبوا به ماوه‌یه‌كی كورت ته‌واوم ده‌كرد و به‌لاتی ده‌مامه‌وه ئیتر تا سه‌ره‌مانگ ده‌هاته‌وه به قه‌رزوفه‌رز پێكم ده‌هێنا. پێشتریش نووسیومه، ئه‌من له پاره خه‌رجكردنا زۆر بێسه‌روبه‌ر بووم. جاری وا ده‌بوو پاره‌ی به‌نزینی ترومبێله سپۆرته‌كه‌شم نه‌ده‌ما و له ماڵه‌وه ده‌مبه‌ستایه‌وه به پیاده‌یی

دەگەڕام. لەسەرەوە چ عەیبم نەبوو بەڵام کورد گوتەنی (سەرقۆزی بن ئاڵۆز) بووم. پارتیی تایبەتی دانسکردن و خواردنەوە و هەڵبەت حەزحەزۆکێ لەلایەن کوڕ و کچانەوە هەر جارە لە ماڵی یەکێکیان دەکران ئەگەر باوانیان لە سەفەرا بوان. زۆرترایەتیی بانگکراوان بۆ ئەو جۆرە پارتییانە کچ و کوڕی پارتنەر (دەنک)ی یەکتری بوون بەڵام کچ و کوڕی تاکانەش هەبوون کە بانگ دەکران بۆ ئەوەی لەوێ یەکتر بناسن. جا دیسان کورد گوتەنی "دەستم کەوتبووە ناو رۆنەوە"، پارتی نەما یەکێک لەو کیژە جوانانە من وەک پارتنەر لەگەڵ خۆیا نەبات. بەڵام لە کۆلێژەکەما کچێکی میسری لەڕادەبەدەر جوانی هاوکلاسم هەبوو کە هەستم دەکرد مەیلی هەیە، (ماجدة "ماگدە" تۆفیق عمر)ی تەنها حەڤدە ساڵی. بەر لەوەی قسە بکەین و ناوی بزانم من هەر وام دەزانی کە ئیتالی یان هی وڵاتێکی ئەمەریکای لاتینە. تۆفیق عومەری باوکی ماگدە باڵوێزی میسر بوو لە رێکخراوی یونێسکۆ UNESCO کە بارەگاکەی لە پاریس بوو و ئێستاش هەر لەوێیە.

منیش لەناو ئەو هەموو کیژۆڵە جوانانەی رەگەز جیاجیا ماگدەی رەنگ هەناریم لە هەموویان پێ خوێن شیرینتر بوو و یەکسەر چووە ناو دڵمەوە.

وەکوو گوتم رەنگ و روخساری ماگدە تێکەڵەیەکی لاتین و رۆژهەڵاتی بوو. داخی بەجەرگم هیچ وێنەیەکی ماگدەم نییە بەڵام ئێستاش ئەو رەنگ و روخسارە کلاسیک ئاکارە هێشتا وەک دوێنێ بووبێ وا لەبەر چاومایە. بیرم نەماوە پەیوەندیمان چۆن دەستی پێکرد بەڵام سەردەمێکمان بە کەیفخۆشی و خۆشەویستی لە پاریس بردە سەر. دێتەوە یادم دڵی زۆر خۆش دەبوو کە ئێواران بە ئۆتۆمۆبیلە سپۆرتە سەرکراوەکەی خۆم بە شەقامی شانزلیزێدا دەمگێڕا و شنەی با لەچکەکەی سەری دەهێنایە فڕەفڕ یان کە لە درەنگانی ئێوارانا دەمگەیاندەوە ماڵە بابی. پێشتر دەبوایە هەر بە مێترۆ بڕواتەوە. ماگدە

دەیگوت ئەوەی من لە تۆی ئەبینم ئەوە لای ئێمە لە میسر ژیانی (اولاد الزوات)ی پێ دەڵێن. دەیگوت لێرە لە پاریس کە باوکم باڵوێزیشە ئێمە لەتوانامانـدا نییە بەم (بحبوحە)یەی تۆ بژین چونکە باری دارایی و ئابووری لە میسر ئێستا لە سفرایە و مووچەی باوکیشم ئەوەندە نییە. بۆیە دیار بوو ناسینی من بۆ ماگدە وەک دۆزینەوەیەک بوو بۆی چونکە دەیویست شوو بە کوڕێکی موسڵمان بکات ئەگەر میسریش نەبێ هی هەر وڵاتێکی دیکەی عەرەبی بێت و ئەگەر ئەوها خۆشگوزەرانیش بێت ئەوە باشتر هەرچەندە کە من هەر بە رواڵەت ئەوەم پێوە دیار بوو. بۆیە من بۆ وی ئەو کوڕەلاوە خەون پێ بینراوە بووم. ئێوارەیەکیان لە کەناری رووباری سێن Seine دەس لەناو دەس گوزەرمان دەکرد و بە فرانسی و بە عەرەبیش قسەمان دەکرد ماگدە ئەوەی کە دیار بوو لەمێژ بوو لەناو دڵیا هەڵیگرتبوو دریکاندی. بە عەرەبی پێی گوتم من و تۆ کە ئەوەندە یەکدیمان خۆش دەوێ بۆچی بەڕەسمی نەبین بە دەسگیران. گوتی من ناتوانم هەموو ئێواران درەنگ بگەڕێمەوە بۆ ماڵ و باوانم هەست بکەن کە دۆستم هەیە بۆیە ئەگەر ئەوان بتناسن و ببین بە دەسگیران ئەوە ئەو کێشەیەمان نامێنێ.

کاردانەوەکە و وەرامی من بۆ "خوازبێنیم" لەلایەن ماگدەوە کە ئێستا بیری لێ دەکەمەوە بەڕاستی زۆر ناشارستانی بوو. بۆ منێکی لای خۆی رۆشەنبیری دنیادیتە وەرامەکەم زۆر دواکەوتووانە بوو. گوتم ماگدە تۆ چاک دەزانی من تۆم چەند خۆش دەوێ. گوتم بەڵام من کێشەیەکی ئیلتیزاماتی قەومیم هەیە کە ناتوانم بایپاسی بکەم. گوتم با لێت نەشارمەوە ئەمن وەک کوردێکی زۆر ناسیۆنالیست بەڕاستی حەز ناکەم دایکی منداڵەکانم عەرەب بێ. کە وام گوت بە دوو چاوی پڕ لە شۆکەوە نواڕییە ناو چاوم و گوتی: ئەوە بەڕاستیتە؟ گوتم: ئا بەڕاستیمە. دوای ماوەیەک بێدەنگی و دامان و رامان ئینجا رووی تێ

کردمەوە گوتی هەرگیز باوەڕم نەدەکرد جۆری بیرکردنەوەی بابایەکی وەک تۆ بەم ئەندازەیە پارێزیار و کۆنەپەرستانە بێت. ڕاستییەکەی خۆیشم یەکسەر پێی هەستیام کە هەڵەم کرد و زۆر بەسەر خۆمدا شکامەوە چونکە زانیم قسەکەم سووککردنی عەرەبی تیابوو نەدەبوا بیکەم. ئەوەی کە زیاتریش نیگەرانی کردم هەستم کرد ماگدە بەو حەڤدە ساڵییەی خۆی هێشتا ئەو لەمن گەیوترە. با لەوەش ڕاستگۆتر بم: خۆی ئەوەی کە پێم گوت تەنها بەشێکی ڕاستییەکە بوو نەک تەواوی ڕاستییەکە. ڕاستییە بەڕاستییەکە ئەوەبوو کە ئەوسا تا بناگوێم کەوتبوومە ناو ڕابواردنی شەوانی پاریس و ژنهێنانم هەر بەخەیاڵدا نەدەهات. جا دیارە ویستوومە بەرگێکی فەلسەفەی ناسیۆنالیزمی کوردایەتی بکەمە بەر وەرامەکەم و بەسەر ئەو کیژۆڵە بێ ئەزموونە - بەڵام لەخۆم ئاقڵترە - پیادەی بکەم.

لەپاش چیرۆکی ئەلیزابێتی کچە ئیسلاندی - ئەویش هەر حەڤدە ساڵی - و دواتریش چیرۆکی مارگەریتی ئاشووری وا بە چیرۆکی ماگدەی میسری و، دواتریش چەندەها چیرۆکی تریش، دەبێتە چەندین جار کە "خوازبێنیم" لەلایەن کچانەوە ڕەت کردووەتەوە و لە هەموو حاڵەتەکانیشا پاساوی جیاجیام بۆ هێناونەتەوە. ڕاستییەکەی، ئەوسا ئەمن خۆم خوازبێنیی کەسم نەدەکرد و کەسم بەتەما نەدەکرد، دڵی من ڕەوشتی پەپوولە و هەنگ و بولبولی هەبوو. ئەوها بوو تەمەنی بێباکی و سەرەڕۆیی نەوجوانیم.

ئەمن لە هەڵبەستێکی خۆما کە کردوومە بە گۆرانییش بەڵام هێشتا بڵاو نەکراوەتەوە و ئەمە بەشێکیەتی بەم شێوەیە باسی ساڵانی نەوجەوانیی خۆمم کردووە:

برادەران دوێنێ کە جوان بووم
نەمدەزانی غەم چییە
نەمدەزانی ماندوبوون و
خەو و واتای دەم چییە
تێپەڕی کاتی جوانی و
ژیانی بێباکی من
دەرپەڕی تیری کەوانی
تەکانی لاوچاکی من
برادەران برادەران برادەران
وەک پەپوولە و هەنگ و بولبول
شیلەم ئەمژی گوڵ بە گوڵ
شەو هەتا سۆزەی بەیانان
دەم لەناو دەم دەس لە مل
ئێستەش وا ئەستێرەی ژینم
زەرد و کز ئەبێتەوە
رۆیی رۆیی رۆیی ئاخ
جارێکی تر نایێتەوە
برادەران دوێنێ کە جوان بووم

ئیتر دوای ئەوە دیسان بلێسەی مۆمی رۆمانسێکی کورتخایەنی ترم ئەمجارەیان لەگەڵ (ماجدة توفيق عمر)ا وردە وردە زەرد و کز دەبووەوە تا مۆمەکە بەتەواوی توایەوە و بلێسەکە سەری نایەوە..

پاش گەڕانەوەم لە کوردستان بۆ پاریس لە پایزی ساڵی 1964 بینیم کە چەند خوێندکارێکی کوردی نوێ هاتبوون. لەیلا بوجاک و زۆزان بوجاک دوو کچە ئامۆزای یەکتری کوردی باکوور بوون، محەمەدی موهتەدی ئیلخانیزادەی دێبوکری کوردی رۆژهەلات و حەمید سەینۆی کوردی رۆژئاڤا و عەباسی خەڵکی سلێمانی و

یوسفی خەڵکی بادینان و ناجی کەتانی ئامێدی کە خزمێکی نزیکی دکتۆر عیسمەت کەتانی بوو. لەگەڵ لەیلا و زۆزان و محەممەدا بووین بە برادەری نزیکی یەکتری هەرچەندە کە لەگەڵ محەممەد هەمیشە دەمەقاڵێشمان لەسەر سیاسەت دەبوو. من جەلالی بووم ئەو مەلایی. ئەو دەیگوت مادام جەلالییەکان هانایان وەبەر شای ئێرانێ برد و چوون لە هەمەدان دانیشتن کەواتە بوونەتە جاشی ئێرانێ. هەرچەندی هەولم لەگەڵی دەدا کە مەسەلەکە هەروا بەو سادەییە لێک نادرێتەوە بەڵام بێ سوود بوو لەگەڵیا. محەممەد میر کامەران بەدرخانی نیشتەجێی پاریسیشی خۆش نەدەویست دەیگوت ئەویش پیاوی شای ئێرانێ یە. جارێکیان لەگەڵ محەممەد موهتەدی چووین بۆ سەردانی (محەممەد موکری) کە کوردێکی زۆر رۆشەنبیری کرماشان بوو و لە پاریس نیشتەجێ بوو و زۆر دژی رژێیمی شای ئێرانێ بوو. ئاغایی موکری ئەندامی جەبهەی میللی بوو کە کەریم سنجابی کورد سەرۆکی بوو. لەبیرمە هەرچوار دیواری دیوی کتێبخانەیماڵەکەی موکری پڕ بوو لە کتێبی فارسی و کوردی و بە زمانی تریش. ئەویش رکی زۆری لە کامەران بەدرخان بوو و هەر بەینیشیان نەبوو. هەردوو محەممەد چەپڕەو بوون. هەرچی میر کامەران بەدرخانە ئەمیان کوردێکی پارێزیاری تا مۆختی ناسیۆنالیست بوو کە زۆر سروشتانە بوو بۆ میرزادەیەکی وەک ئەو کە تەواوی بنەماڵەکەیان لەسەر کوردایەتی ئاوارەی شام و ئەورووپا بووبوون. میر بەدرخان زیاتر باوەڕی بە رۆژئاوا بوو بۆ کێشەی کورد و پەیوەندیی زۆر دۆستانەی لەگەڵ حکوومەتی فرانسی و ئێرانیشا هەبوو. ئەو کە پەروەردەکارێکی زمانە هیندۆ - ئەورووپییەکان بوو بە چاوێکی ئاریانییەوە دەیڕوانیە شای ئێرانێی ئاریامیهر. ئیتر ئەوە وای کردبوو کە کوردە چەپڕەوەکان خۆیانی لێ دوور راگرن. لای ئەوانە کوردایەتی دەبێ تەنیا بە چەپڕەوێ بکرێت. لەپاش وەرگەڕانی تەختی شا ساڵی 1979 و راگەیاندنی کۆماری ئیسلامی کەریم سنجابی کورد کرا بە وەزیری دەرەوەی ئێران و ئەویش محەممەد

موکری کردە باڵوێزی ئێران لە مۆسکۆ.

ساڵی 65 مام جەلال بۆ چەند ڕۆژێک هاتە پاریس و من و زۆزگ ڕەواندزی و دریە محەمەد عەلی عەونی ئەو چەند ڕۆژەمان لەگەڵیا زۆر بەخۆشی بردە سەر. کێشەکەمان هەر ئەوە بوو کە هەرچوارمان پێکەوە دەبووین جێمان نەدەبۆوە لەناو ماشینە سپۆرتەکەی من کە تەنها بۆ دوو سوار کرابوو. بەڵام هەندێ جار زۆزگ خۆی لەپشت دوو کورسییەکە کرژ دەکردەوە و دریەش خۆی دەپەستایە نێوان مام جەلال و من منیش بە ترسولەرزەوە لێم دەخوڕی چونکە پۆلیس بیدیبایەن قەبووڵی نەدەکرد چوار کەس سواری ترومبێلێکی سپۆرتی دوو نەفەری بن. مام جەلال داوای لێ کردم پێکەوە بچین بۆ بارەگای ڕۆژنامەی لومانیتێ L'humanite ئۆرگانی پارتی کۆمونیستی فرانسی کە پێم وایە ئەوسا ڤالدێک ڕۆشێ Waldeck Roche سکرتێری بوو. مام جەلال یەک دوو ڕۆژ پێشتر چاوپێکەتنێکی لەگەڵ ڕۆژنامەی لو فیگارۆ Le Figaro ی زۆر ڕاستڕەو کردبوو و بڵاویش کرابووەوە. جا کابرای لومانیتێی کۆمونیست کە تەنها زمانی فرانسیی دەزانی بە منی گوت بە مام جەلال بڵێم بۆچی پێشتر چووەتە لای ڕۆژنامەی لوفیگارۆی کۆنەپەرست و هەموو قسەکانی خۆی بۆ ئەوان هەڵڕشتووە کە پێشتر بڵاو کراوەتەوە، گوتی تازە بەتازە وا دێتە لای ئێمە چاوپێکەوتنی لەگەڵا بکەین! مام جەلالی هەمیشە وەرام لە باخەڵیشا بە زەردەخەنەکەیەوە گوتی هۆمەر پێی بڵێ ئێمە لە کوردەواریدا قسەیەکی کۆنمان هەیە دەڵێ: "بەپایان بگرە بێپا هی خۆمانە." گوتی پێی بڵێ پارتی کۆمونیست هی خۆمانە کێشەی ئێمە لەگەڵ ڕاستڕەوە کۆنەپەرستەکانە با جارێ ئەوان ئیقناع بکەین شتێکمان لەسەر بنووسن ئێوە بۆ ئێمە دۆستی مسۆگەرن و ئەمن کە ئێستا وا لێرە دانیشتووم ئێرە وەک ماڵی خۆم دەزانم. مام جەلال بە قسەی خۆش بە کابرای سەلماند و چاو پێکەوتنەکەشیان ئەنجام دا.

ساڵی 65 یش تەواو بوو ئەمن دیسان لەبەر رابواردن خوێندنەکەم پشتگوێ خستبوو و سروشتانە لە کۆتایی ساڵ هیچم بە هیچ نەکردبوو و دیسان بورسەکەم لێ برا.

ئەمجارە زانیم هیچ چارم نەماوە و تازە دەبێ دەست لە بورسەکەم بشۆم و دەمزانی لە کوردستانیش کە باری ئابووریی ماڵەوەمان هەر بەرەو خراپی دەڕۆیشت چیدی یارمەتیم بۆ نایە ترسام رۆژی رەشم لەپێش بێت بریارم دا دیسان بگەڕێمەوە بۆ ئاڵمانیا چونکە لەوێ کاردەسکەوتن ئاسانتر بوو.

لە چەپەوە: خوسرەو رەشید جەودەت، هۆمەر دزەیی، ژن و مێردێک برادەرانی خوسرەو، لە بارێک لە گەڕەکی پلاکا، ئەسینا، یۆنان - پایزی 1964

دیارەکان لە چەپەوە: عیسمەت شەریف، هۆمەر دزەیی، دریە عەونی، دارا ئەدیب. نادیارەکان: کەمال فوئاد، وریا رەواندزی، کۆنگرەی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا ساڵی 60 لە بەرلین

هۆمەر و ئۆتۆمۆبیلە سپۆرتەکەی

میر کامەران بەدرخان و هاوسەرە پۆلۆنییەکەی ناتاشا

محەمەد مۆهتەدی

مام جەلال لە نێوان هۆمەر دزەیی و زۆزک ڕەواندزی بەم دواییانە لە سلێمانی کە هەرسێکمان پیر بووین

l'Humanité

EDITION SPECIALE

DEUIL POUR TOUS LES PEUPLES

LE GRAND STALINE

VEL' D'HIV' DE DEUIL MARDI

ڕۆژنامەی لومانیتێ ئۆرگانی پارتی کۆمونیستی فرانسی.

ئارامگای کافیە خانی دایکی هۆمەر لە گوندی دووگردکان

کلاسێکی خوێندن لە کۆلێژی باڵای وەرگێڕانی زارەکی و نووسراوەیی لە پاریس.
سەرنجێ بدە ڕێژەی کیژان لەچاو هی کوڕان.

شەقامی بەناوبانگی شانزلیزێ لە پاریس بە شەو

مەیدانی سان میشێل لە گەڕەکی کارتیێ لاتان لە پاریس

شەقامی بەناوبانگی شانزلیزێ لە پاریس بە رۆژ

کەنارێکی زێی سێن لە پاریس

# بەشی 22

## بارم کردەوە بۆ میونیخ، ئەڵمانیا

ژیانە قەرەج ئاساکەی جارانم دیسان بەرۆکی گرتمەوە. زۆرێک لەو شرووپڕەی کە هەمبوو لەگەڵ کتێبێکی زۆریش هەموویم لە شوێنی هەڵگرتنی کەلوپەلی خوێندکارانی سەفەرکردوو لە خەوخانەکەی کە لێی بووم لەوێم دانا بە ئومێدی ئەوەی کە پاش ماوەیەک دەچمەوە و وەریان دەگرمەوە. بەڵام وەک کە لە ساڵی 1959بەسەرم هاتبوو کە ڤیەننام بۆ میونیخ بەجێ هێشت ئەمجارە لە پاریسیش هەمان بەزمم بەسەر خۆم هێنایەوە کە زۆر شتم بەجێ هێشت و تا ئەمڕۆش چاوم پێیان نەکەوتەوە. باری خۆم سووک کرد بۆ ناو ماشینە سپۆرتە چکۆلانەکەم و ڕێی میونیخم گرتەوە بەر.

باش بوو لە میونیخ کاک مەحمود کانەبیی ئامۆزام کۆمپانیایەکی بچووکی بازرگانیی ئۆتۆمۆبیلی بەکارهاتووی هەبوو و یەکسەر لای ئەو دامەزرام و ژوورێکیشم لە ماڵێکا بەکرێ گرت.

لە میونیخ وێڕای کۆنە برادەرە کوردەکان و عیراقییەکانیشم برادەرێکی کوردی دیکەش لە هەولێرەوە بۆ خوێندن هاتبوو، شەهیر نورەدین ئاغا کە تەواوی بنەماڵەکەی لە هەولێر دۆستی نزیکی بنەماڵەی ئێمە بوون.

دوای ماوەیەک لەگەڵ شەهیرا بووین بە برادەری شەو و ڕۆژی یەکتری. ئەوسا دۆستایەتیم لەگەڵ کچێکی جوانکیلەشا (کارین مایەر) بەستبوو کە خەڵکی باکووری ئاڵمانیا بوو و لە میونیخ کاری دەکرد.

بەپێی پەیمانێکی نێونەتەوەیی لەوەتی دووەم جەنگی جیهانەوە ئەمەریکا هەندێ لە هێزی چەکداری خۆی لە ئاڵمانیا هەر هێشتبووەوە. بەشێک لەو هێزە (هێزی پاراشووتی airborne) بوو و بنکەکەشیان لە شارۆچکەی (باد تۆلتز Bad Toelz) بوو لە باڤاریای سەروو کە شەست کیلۆمەترێک لە میونیخەوە دوور بوو. قوتابخانەیەکی تایبەتیی فێربوونی زمانانی بێگانە بۆ سەربازە پاراشووتوانەکانی ئەو هێزە کرابووەوە لە گوندێکی نزیکی بنکەکەیان، گوندی (لێنگریز Lenggries). بیستم کە قوتابخانەکە بۆ سێ مانگەکەی هاوین پێویستیی بە مامۆستای زمانی عەرەبی هەیە بۆ سەربازەکانیان. من و شەهیر پەیوەندیمان پێوە کردن و هەردووکیان دامەزراندین. مووچەکەیان بۆ ئەو زەمانە زۆر باش بوو. لەگەڵ شەهیرا بارمان کرد بۆ گوندی لێنگریز و پێکەوە خانووێکی زۆر خنجیلانەمان دەستکەوت بە مانگانەیەکی زۆر هەرزانیش.

## لە گوندی لینگریز Lenggries

لەگەڵ شەهیرا بەیانیان دەچووینە قوتابخانەکە و تا دوای نیوەڕۆ وانەی زمانی عەرەبیمان بە سەربازە ئەمەریکییەکان دەگوتەوە. هەر چەند سەربازێك بە ئارەزووی خۆیان یەکێک لەو زمانانەیان هەڵدەبژارد فێری ببن کە لە قوتابخانەکەدا دەگوترایەوە. ئەو زمانانەی کە لە کاتی بوونی شەهیر و من لەوێ دەگوترانەوە ئەمانە بوون: (رووسی، بولگاری، عەرەبی، یۆنانی، تورکی، فینلاندی) و پێم وایە یەک دوانێکی تریش و مامۆستاکانیش ژن و پیاوی بە رەچەڵەک خەڵکی ئەو وڵاتانە بوون. قوتابخانەکە لەلایەن دامەزراوی بەناوبانگی (بێرلیتز Berlitz School of Languages)ەوە بۆ فێربوونی زمان بەڕێوە دەبردرا و هەموو کتێبەکانیش بەو زمانە جیاجیایانە لەلایەن ئەوانەوە بەردەستی ئێمە مامۆستاکان دەکران. سەربازەکان کانتینی

تایبەتی خۆیان هەبوو کە هەموو شتێکی پێویستی تیابوو بە نرخێکی زۆر هەرزان بۆ ئەوان و ئێمەی مامۆستاکانیش پارەمان دەدانێ بۆ ئێمەشیان دەکرێ. شەوانی ویکێێندیش هەر لەناو کامپی سەربازەکان دەبووە موزیک و گۆرانی و دانس و خواردنەوە. شەهیر و منیش ئەگەر نەچووباین بۆ شاری میونیخ ئێوارەکەمان لەو دانس کڵەبەی ئەوانا بەسەر دەبرد. لەبیرمە ئەو سەربازانە ئەوەندە مەشروبیان دەخواردەوە کە هەندێکیان هەر لەوێ دەکەوتن و تا کاتی داخستنی کڵەب ئەوان هەر پرخەی خەویان دەهات.

کارین مایەری دۆستم گەڕابووەوە بۆ شارۆچکەکەی خۆی لە باکووری ئاڵمانیا کە پێم وایە ناوی (بوکەبورگ Bueckeburg) بوو بەڵام جاروبار بۆ چەند شەو و رۆژێ دەهاتەوە سەردانم.

## رۆمانسێکی ترم ئەمجارەیان لەگەڵ داگمار Dagmar

لە لێنگریز ئاشنایيم لەگەڵ کچێکی ترا پەیا کرد، داگمار Dagmar. داگمار کچێکی قژزەردی خرپنەی کەمێک تێکسمراوی سێکسی بوو. داگمار خۆی خەڵکی شاری میونیخ بوو بەڵام لە لێنگریز کاری ئاگاداریی لە خانووێکی ماڵە خانەدانێکا پێ سپێردرابوو. خانووەکە دوور لە ئاوەدانیی گوندی لێنگریز لەناو دارستانێکا بوو و خێزانەکە خۆیان لەوێ نەدەژیان ئەو کچەیان بەکرێ گرتبوو ئاگای لە ماڵەکەیان بێ. ئەو ماڵە گەورەیە بە چێژێکی زۆر بەرز راخرابوو و هەر ژوورێک یان شوێنی دانیشتنێک بە ستایلێکی جیا فەرش کرابوو. ژێرزەمینەکەشی پڕ بوو لە باشترین شەرابی فرانسی و ئیتالی و ئاڵمانی کە ئازادیيان دابووە داگمار بە ئارەزووی خۆی لێی بنۆشێت. لێرەش سەرلەنوێ دەستم کەوتەوە ناو رۆن. ئەو ماڵە گەورەیە بوو بە ماڵی من و داگمار. شەوان نەیدەهێشت بگەڕێمەوە بۆ ماڵەکەی خۆم، خواردنی بۆ هەردووکمان ساز دەکرد و لەسەر ئەرزا لەبەردەم

ئاگردانـی یەکێـک لـە ژوورەکانـی دانیشـتن لەسـەر شـەپۆلی موزیکـی کلاسـیکی رۆمانتیـک باشـترین شـەرابی لەعلـی روممانیمـان دەنۆشـی.

گەوزە گەوز و ماچ ماچانێ

دە باوەش داگمارە جوانێ

لەسەر ئاوازی موزیک و

بۆنسۆی داری ئاگردانێ

لەلای من گەلێک خۆشتر بوو

لە چارپایەی شای ئێرانێ

دیـار بـوو داگمـار دەنگـی منیشـی زۆر پـێ خـۆش بـوو بـە تایبەتـی کـە شانسـۆنی فرانسـیم بـۆ دەچـڕی. یەکێـک لـەو شانسـۆنە فرانسـییە بەناوبانگانـەی کـە داگمـار بەتایبەتـی حـەزی لـێ دەکـرد (لـێ فۆیـی مـۆرت Les Feuilles Mortes) بـوو واتـا (گـەڵا مـردووەکان). ئەمـن رێـک پەنجـا دانـە سـاڵ دواتـر بـە یـادی شـەوانی جوانیـم لەباوەشـی گـەرم و نەرمـی داگمـارا وشـەی کوردیـم بـۆ ئـەو ئـاوازە دڵڕفێنـە فرانسـییە دانا بەنـاوی (گـەڵا وەریـوەکان) و پارەکـە جارێکیـان لەگـەڵ گیتاریسـتی لێهاتـوو بـژار دیـلان لـە هەولێـر و جارێکیـش لەگـەڵ هونەرمەنـدی گـەورە دکتـۆر ع.ج سـەگرمە لـە سـلێمانی تۆمـارم کـردن بـەڵام لەبـەر بـاری نالەبـاری دارایـی هێشـتا بـڵاو نەکراونەتـەوە. لـە بنەڕەتـدا ئـەم گۆرانییـە بـە موزیـک و لیریکـەوە لـە سـاڵی 1945 دانـدراوە و بـە ژمارەیەکـی زۆر لـە زمانانـی دونیـا بـڵاو بووەتـەوە. بـە ئینگلیـزی تایتلـی (ئۆتـۆم لیڤـز autumn leaves) واتـا (گەڵاکانـی پایـز)ی بـۆ دانـدراوە.

ئـەم وێنانـەی کـەوا لـەم بەشـەدا بڵاویـان دەکەمـەوە گشـتیان داگمـار بـە دەسـتی خـۆی گرتبوونـی و لەنـاو ئەلبوومێکـی خنجیلانـەدا لـە پایـزی 67 بـۆی ناردمـە ڤیەننـا و لەوسـاوە و تـا ئەمـڕۆش ئیتـر چاومـان پێـک نەکەوتـەوە و رۆمانسـەکەمان بـوو بـە مێـژوو.

گۆرانییەکەی من بەم جۆرەیە:

## گەڵا وەریوەکان

ئاواز: ژۆزێف کۆزما (کۆمپۆزەرێکی فرانسیی بە بنەچە هەنگاری)

لیریکی ئۆریجینالی فرەنسی: ژاک پریڤێر

لیریکی کوردی: هۆمەر دزەیی

ئۆ نۆستالجیا بۆ ئەو زەمانەی پڕ لە جۆش بووین
نۆستاجیا بۆ باوەشی گەرمت کە سەرخۆش بووین
بیرم ئەڕوا بۆ ئەو ئاوازە سێنتیمێنتالەی
لە مەیخانان بۆ بیستنی پەرۆش بووین

***

بیرت ئەکەم، رۆژانی نەوجوانی
بیرت ئەکەم، رۆژانی نەوجوانی
پڕ لە ژیان، پڕ لە هیوا و
دڵخۆش بووین

***

پایز هەمووی پێچایەوە
کردییە ناو چاڵی کۆتایی
ئەوەی کە بۆ من مایەوە
ژینێکی تار و تەنیایی

***

گەڵای وەریو لەو دیو پەنجەرەم
ئەرژێنە خوار بەبێ ئەژمار
لە دارستان لەژێر پێم دەردێ
ورشەی گەڵای هەزار هەزار

***

لەو رۆژەوەی تۆ بەجێت هێشتووم
شەوگار لەمن نابڕێتەوە
ئای کە چەندت بیر ئەکەم، رابردوو
هەر ساڵ کە پایز دێتەوە

قوتابخانەکەی زمان بۆ سەربازانی ئەمریکی تەنیا بۆ مانگەکانی هاوین بوو و منیش هەردوو هاوینی 66 و 67 لەوێ دەستبەکار بووم و پارەیەکی باشم دەست کەوت بەڵام هەر هەلم بۆ بڕەخسایە بۆ چەند رۆژێک دەچوومە ڤیەننا کە شەهیری برادەریشم گواستبوویەوە بۆ ئەوێ و بەتەمابوو خوێندنەکەی لەوێ تەواو بکات.

ساڵی 66 بۆ من وەرچەرخانێکی سیاسیش بوو. هەنگی ئەمن هێشتا هەر لە میونیخ بووم. لە کوردستان چەندین هەوڵی ناوبژیکردن دەدرا لەلایەن کەسایەتیی کوردی رۆشەنبیری ناسراو و هەندێ کەسایەتی عەشایریشەوە بۆ ویکهێنانەوەی دوو باڵە لێکترازاوەکەی شۆڕشی کورد بەڵام هەوڵەکان هیچیان لێ سەوز نەدەبوو. یەکێک لەو ناوبژیکارانە کاک ئەحمەد حەمەدەمینی برا گەورەی من بوو کە ئەو بە رێگای شێخ ئەحمەدی خودانێ بارزان، برا گەورەی مەلا مستەفا هەوڵی بێ وچانی ئاشتبوونەوەی دەدا. لەم بارەیەوە مام جەلال دەڵێ: " کاک ئەحمەد لە راستیدا پەیوەندییەکی تایبەتی هەبوو لەگەڵ بارزان، لەگەڵ خوالێخۆشبوو شێخ ئەحمەدی نەمر زۆر دۆست بوو، شێخ ئەحمەدی نەمر زۆری خۆش دەویست وە باوەڕی پێی هەبوو... کاک ئەحمەد هەزار رەحمەتی لێ بێ هەوڵی دەدا دووبەرەکی نەبێ لەناو ئەو حزبە... چەند جارێک چووە خزمەت شێخ ئەحمەد وە شێخ ئەحمەدیشی وا لێ کرد لایەنگری ئەوە بێت و داوا لە مەلا مستەفا بکات هەزار رەحمەت لەویش بێ کە تەفرەقە روو نەدا لەبەینی پارتی و مەلا مستەفا. کە دووبەرەکییەکە دەستی پێ کرد ئەو هەوڵی دا نەتەقێتەوە، هەوڵی دا پێک بێنەوە... هاتوچۆی بارزانیی چەندجارێک کرد..." {مام جەلال، لە بەرنامەی یادیان بەخێر، ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی، کوردسات تی ڤی ساڵی 2000}.

بەڵام وەک گوتم هەموو هەوڵەکان بێهوودە بوون و لێکترازان تەقییەوە.

بەپێـی چەنـد سـەرچاوەیەکی باڵـی جەلالـی: " مـەلا مسـتەفا بڕیـاری دابـوو سـەرانی ئـەو باڵـە لەنـاو ببـات". کاک کەمـال محێدیـن دەڵـێ ئەوسـا سـەرانی ئـەو باڵـە هەندێکیـان لای عەباسـی مامەنـد ئاغـا لـە گونـدی دۆڵەڕەقـە نیشـتەجێ کرابـوون و هەندێکیشـیان لـە کەرکـووک و لـە بەغـدا بـوون و مـام جـەلال لـە قاهیـرە بـووە و برایـم ئەحمەدیـش لـە تـاران. جـا ئەوانـەی کـە لای عەبـاس ئاغـا بـوون و هەواڵـی گۆیـا پلانەکـەی مـەلا مستەفایان پـێ گەیشـتبوو ئەوانیـش بـە یارمەتیـی عەبـاس ئاغـا رایانکـرد و خۆیـان گەیانـدە ناوچەکانـی ژێـر دەسـەڵاتی حکوومـەت. دیسـان هـەر بەپێـی ئـەو سـەرچاوانە، مەکتەبـی سیاسـی باڵـی جەلالـی - کـە هەمـوو ئەندامەکانـی ئامـادەش نەبووینـە بەڵکـوو هەریەکـە کەوتبـووە لایەکـەوە - بڕیـار دەدا پەیوەنـدی بـە حکوومەتـی بەغـداوە بـکات کـە جەنـرال عبدالڕەحمـان عـارف سـەرکۆمار بـوو. بەپێـی کاک کەمـال محێدیـن یەکـەم کەسـی کـە ئـەو پەیامـەی باڵـی جەلالیـی بـە خـودی سـەرکۆماری عیـراق گەیاندبـوو نووسـەر و ئەدیبـی کـورد محەمـەد مەولود مـەم بـوو و لەپاشـان دکتـۆر سـالم حەیـدەری بـوو بـە پێنـاوی سـەرەکی لەنێـوان هـەردوو لایـان. دکتـۆر سـالم حەیـدەری کـە هـەم بـرادەری سـەرکۆمار و هـەم هـی مـام جەلالیـش بـوو دەسـتی بـە هەماهەنگـی کـرد و پرۆسـەی ناوبژیکردنەکـەی بـە ئەنجـام گەیانـد. مـام جـەلال و سـالم حەیـدەری ماوەیـەک بـە مەبەسـتی جیـا جیـا لـە قاهیـرە دەژیـان و لـەوێ بووبـوون بـە بـرادەر و دوور نییـە هـەر لەوێـدا ئـەم پلانـی پەیوەندییەیـان لەگـەڵ بەغـدا تاوتـوێ کردبـێ. گۆیـا پلانـی سـەرۆکانی ئـەو باڵـە ئـەوە بـووە کـە بـە یارمەتیـی حکوومەتـی عیـراق شـەڕی باڵـی بارزانـی بکـەن، ئـەو باڵـە لەنـاو ببـەن و ئیتـر سـەرکردایەتیی بزووتنـەوەی کـورد بکەوێتـە دەسـت خۆیانـەوە و ئـەوان خۆیـان دان و سـەندن لەگـەڵ بەغـدا بکـەن بـۆ چارەسـەری کێشـەی کـورد.

بـرادەری دێرینـم کاک دکتـۆر فوئـاد بابـان لەبـارەی چۆنیەتـی پەیوەندیکردنـی سـاڵی 66 ی باڵـی جەلالـی بـە بەغـداوە ئەویـش ئـەم

زانیارییـە پەیوەندیـدارەی بۆ نـاردم کـە دەڵـێ " منیـش لـە سـاڵی 966 دا لـە بەغـدا بـووم وە وەک کاک کەمـال محێدیـن بـۆی گێڕاویتـەوە ئـەو پەیوەندییـە لـە ڕێـگای عولەمـا {عەبدولڕەحمـان زەبیحـی ـ هۆمـەر} و سـالم حەیدەرییـەوە بـوو وە پێـم وایـە خـوا لێخۆشـبوو حسێن شـێروانی ڕۆڵـی هەبـوو چونکـە مـن لـە 965 دا گیرابـووم لـە بەغـدا کـە بـەر بـووم ئـاگاداری ئـەو جموجۆڵـە بـووم."

خـۆی وردەکارییەکـەی کاک کەمـال محێدیـن لـەم بارەیـەوە بـە منـی دابـوو بـەم شـێوەیە بـوو کـە دەڵـێ "جارێکیـان بابەکـری مەحمـود ئاغـا و عەبـدوڵا کانیمارانـی و محەمـەد مەولـود مـەم سـەردانێکی سـەرکۆماری عیـراق دەکـەن. کـە لای ئـەو دەچنـە دەرەوە کاک مـەم چاویلکەکـەی لـەوێ لـێ بەجـێ دەمێنـێ - یـان بەمەبەسـت بەجێی دێڵێـت - و یەکسـەر دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوێ و ئیتـر هـەر بەپەلـە بەتەنیـا سـەرۆک عـارف دەبینێـت و پێـی رادەگەیەنـێ کـە باڵـی مەکتەبـی سیاسـی (جەلالـی) ئـارەزوو دەکـەن لەگـەڵ بەغـدا پێـک بێـن. ئینجـا دواتـر سـالم حەیـدەری پەیوەندییەکـە بـە ئەنجـام دەگەیەنـێ."

مامەنـد ئاغـای عەباسـی مامەنـد ئاغـاش بـە ڕێـگای رزگاری برازامـەوە پەیوەنـدی پێـوە کـردم گوتـی زۆرترایەتـی ئەندامانـی مەکتەبـی سیاسـی باڵـی جەلالـی کـە لـە گونـدی دۆڵەرەقـە لای بابـی دانیشـتبوون ئەمانـە بـوون: مـام جـەلال، عومـەر دەبابـە، نـوری ئەحمـەد تەهـا، عەلـی عەسـکەری، حیلمـی عەلـی شـەریف، نـوری شـاوێس، عەلـی عەبـدوڵا. دەڵـی مـام جـەلال لـە قاهیـرە نەبـوو، وەک مـن پێشـتر بـڵاوم کردبـۆوە، بەڵکـو ئەویـش لەگـەڵ ئەوانـی دی لای عەبـاس ئاغـا بـووە. جـا دەڵـێ لەمانـە تەنهـا کاک نـوری شـاوێس و کاک عەلـی عەبـدوڵا بڕیاریـان دا بمێننـەوە و ڕەگـەڵ بارزانـی بکەونـەوە، ئەوانـی دی هەموویـان ڕۆیشـتن و خۆیـان گەیانـدە ناوچـە حکومییـەکان.

ئـەوە بـوو کـە ئەو باڵە کۆنفەرانسـێکی لە کەلار گـرت و بەیاننامەیەکیان بـە کـوردی و بـە عەرەبـی بـڵاو کـردەوە کـە بەتەمـان لەگـەڵ بەغـدا

پێـک بێـن و بـە چـەک بەرهەڵسـتی باڵـی مەلایـی بکـەن. لەوێـوە ئیتـر ئیسـتیلاحی (جاشـی 66) کەوتـە سـەر زاری خەڵکـی کوردسـتانەوە. ئەمـن لـە میونیـخ بـووم و شـەش سـاڵ بـوو ئەندامـی پارتـی باڵـی جەلالـی بـووم. بەیاننامەکـە گەیشـتە ئێمـەی پارتـی لـە میونیـخ کـە ئێسـتاش رسـتەیەکی دەقـە عەرەبییەکەیـم لەبیـر مـاوە کـە ئەمـە بـوو " لقـد الینـا علـی انفسـنا ان نحطـم الصنـم الـذی صنعنـاه بایدینـا" کـە کوردییەکـەی بـەم جۆرەیـە " ئێمـە بەڵێنمـان بـە خۆمـان داوە ئـەو بتـە وردوخـاش بکەیـن کـە بـە دەسـتی خۆمـان دروسـتمان کـردووە"

جـا ئێمـەی ئەندامانـی پارتـی دانشـتوانی میونیـخ، مـن و ئەرجومەنـدی مەلاسـدیق و حەمەجـەلال سـاڵح و نازانـم کێـی تریـش بوویـن داوامـان لـێ کـرا بچیـن بـۆ بەرلیـن بـۆ کۆبوونەوەیەکـی گشـتیی پارتـی لـەو شـارە بـۆ ئـەوەی ئـەم پێشـهاتە تازانـە تاوتـوێ بکەیـن. ئەمـن کـە بـە خوێندنـەوەی بەیاننامەکـە شـۆک بووبـووم هـەر لـە میونیـخ هەوڵـم دەدا بـە ئەندامەکانـی تـری پارتـی بسـەلمێنم کـە لـە بەرلیـن دەبـێ هەڵوێسـت دژی بڕیارەکـەی مەکتەبـی سیاسـی و کۆنفەرانسـەکەی کـەلار بگریـن. ئەمـن تەنانـەت سـتوونێکم لەسـەر کۆنفەرانسـی کـەلار نووسـی بـە سـەرناوی (کۆنفەرانسـی شـەرمەزاری) بـەلام بـلاوم نەکـردەوە.

## کۆبۆونەوەی لکی ئەوروپای پارتی لە بەرلین

ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی پارتی لە ئاڵمانیا لە بەرلین کۆبووینەوە و کاک کەمال فوئادی بەرپرسی لکی ئەوروپا پێی ڕاگەیاندین کە پێویستە پشتگیری لە بڕیاری مەکتەبی سیاسیی باڵەکەی خۆمان، باڵی جەلالی، بکەین کە هەر ئەوەشمان بە ڕەوا و شەرعی دەزانی. بیرم نەماوە کێ لەگەڵ و کێ لەدژی ئەو سیاسەتە نوێیە بوو بەڵام من خۆم زۆر بەتوندی کەوتمە ڕەخنە و هێرش و ئەو سیاسەتەم بە جاشایەتی کردن شەرمەزار کرد. کاک کەمال فوئاد کە شەش ساڵ پێشتر ساڵی 1960 ئەو خۆی منی کردبوو بە ئەندامی پارتی لە وەراما ئەویش هێرشێکی توندی کردە سەر من و ئیتر لێمان بوو بە شەڕە وشە. من کە زانیم زۆرترایەتیی دانیشتنەکە لەگەڵ ڕەوتی مەکتەبی سیاسی دەڕۆن زۆر بە تووڕەییەوە کاغەزەکانی بەردەمم تێک نا و کردمنە ناو فایلەکەمەوە هەڵسامەوە گوتم لەمڕۆ بەدوا من شەرم ئەکەم لەناو ئەم حزبەی ئێوەدا بمێنمەوە و هۆڵەکەم بەجێ هێشت. هەر ئەو چوونە دەرەوەشم بوو کە ئیتر بەتەواوی وازم لە ئەندامەتیی هەموو حزبێک هێنا و کوردایەتی کردنم وەک تاکە کەسێکی ئازاد و سەربەخۆ پێ ڕاستتر بوو. کەمال فوئاد منی کردبوو بە پارتی و هەر لە ئەنجامی دەمەقاڵێشم لەگەڵ ئەوا بوو کە دەستم لە پارتی هەڵگرت. چەند خۆش بوو دوای ئەوە کە هەستم دەکرد وەک مەلێک بووبم و لە قەفەسا ئازاد کرابم.

ئێستا بیری لێ دەکەمەوە کە فیعلەن ڕاسترە بۆ توێژی هونەرمەند و شاعیر و خاوەن قەڵەم لە بواری کولتور و ئەدەبیاتا سەربەخۆ بن و خۆیان نەبەستنەوە بە پرۆگرام و سیاسەتی حزبێکەوە بە تایبەتی حزبەکانی جیهانی سێیەمی وەک ئێمەمانان. هەر ناشتوانن ئەوە بکەن

چونکە ئەو توێژە بە سروشت بیری ئازادە و پەیڕەو و ئەجێندای داسەپێنراوی حزبایەتی بەرئاوەژووی ئەو بیرە ئازادەیانە کە ئاسۆکەی بێ بنە و مەحاڵە کرژ بکرێتەوە تا لەناو حزبایەتیی تەسکدا جێی ببێتەوە.

## مەرگی عەباسی مامەند ئاغا (1966-1922)

بەرلەوەی ئەم بەشە بەجێ بێڵم ناتوانم چەند دێڕێک لەسەر کەسایەتییەکی نموونەی جوانی و شۆخی و شۆڕەسواری لە مێژووی کوردا نەنووسم: عەباسی مامەند ئاغای سەرخێڵی ئاکۆیان. کاکەباس، وەک کە دۆست و ئاشناکانی بانگیان دەکرد، نەک هەر باڵایەکی کەڵەگەتی راست و رێکی هەبوو بەڵکوو کەلەشێکی پڕی تێکسمراوی سەرنجکێش و رەنگ و روخسارێکی ئاکار ئەوەندە جوانیش کە دەتگوت فریشتە و پەری بە پەنجەکانی خۆیان نەخشەی جوانییان بۆ کێشاوە. هەر کەسێ بیدیبایە، دۆست و دوژمن و خەڵکی نەناسیش یەکسەر بە شۆخوشەنگی و کەسایەتیی عەباسی مامەند ئاغا دەحەپەساو ئەو زاتەی دەکەوتە ناو قووڵایی دڵییەوە و دەبووە بەشێک لە یادگارەکانی. ئەمن خۆم وەک هونەرمەند و شاعیر کە زۆر هەستیارم بەرامبەر بە جوانی - هەر جۆرە جوانییەک - کە بۆ یەکەمین جار ئەو پیاوەم دی کە پێم وایە لە هاوینی 64 لە قەڵادزێ یان لە رانیە بوو وێنەی جوانی وەک تابلۆیەک یەکسەر لەناو هەست و هۆشما گیر بوو و ئێستاش ئەو تابلۆیە هەر لەشوێنەکەی خۆیا جێگیرە. جا ئەگەر رای پیاوان لەسەر ئەم ئینسانە جوانە ئەوها بووبێ ئەدی ژنان چۆن ئاشقی نەبووبن! چاکم لەبیرە کە لە ساڵی 64 و دواتریش کە من هێشتا لە رانیە بووم، گفتوگۆ لەگەڵ بەغدا دەکرا ئەمن هەر بۆ نوکتە و پێکەنین دەمگوت هەقی وایە کورد شاندێکی لە پیاوانی فیلانی جوانی وەک کاک هەباسی هەڵبژێرن و بینێرن بۆ بەغدا تا

عیراقیەکان لێیان بترسن. دەمگوت خۆ مەرج نیە ئەمانە سیاسی بن بەڵکوو هەر بە ترساندن و تۆقاندنی عەرەبان گوڵە سیاسیەکەمان بۆ دەکەن. یادی بەخێر کاک حەبیب محەمەد کەریم بە قسەکانم زۆر پێ دەکەنی.

داخی گرانم ئەو کەسایەتیە نموونەیە تەنها 44 ساڵ ژیا کە بە نەخۆشیەکی کتوپڕ بردیان بۆ بەغدا و لەوێ سەری نایەوە. کێ دەڵێ بە نەخۆشیی خۆی مردووە! ئەمن لە میونیخ بووم کە هەواڵەکەم لە لاواندنەوەیەکی مەلا جەمیل رۆژبەیانی خوێندەوە کە وا بزانم ئەوسا لە ئێرانێ بوو و لە رۆژنامەیەکی کوردیدا بڵاوی کردبۆوە. هەزاران رەحمەت لە گۆڕی بێت، پێویستە پەیکەری بۆ بکرێت و جادە و مەیدانی بەناو بکرێن. رێز و خۆشەویستیی تایبەتی و هەمیشەییشم بە یادی کاکەباسی بۆ کوڕەکانی و تەواوی بنەماڵەکەی دەنێرم.

زۆر سوپاس بۆ کاک کەمال محێدین و کاک دکتۆر فوئاد بابان و کاک مامەند ئاغای کاک هەباسی و کاک رزگاری برازاشم بۆ ئەم زانیاریانەیان.

ساڵی 66 و تا پایزی 67 یش لە میونیخ بووم بەڵام هاوینەکانیان لە لێنگریز دەمامەوە و وەک پێشتر باسم کردووە ئەو دوو هاوینە لە قوتابخانەکەی سەربازانی سوپای ئەمریکی بۆ فێربوونی زمان لە ناوچەی لێنگریز مامۆستای زمان بووم. ئەو مووچەی لەوێ پێم دەدرا زۆر باش بوو و دەمتوانی بە کەمێک کاری لابەلاش تەواوی ساڵەکەی پێ بگوزەرێنم. زوو زووش سەردانی هەوارگەی دێرینی جارانم دەکرد، ڤیەننای ساڵانی سەرایی بیستەکانی تەمەنم.

کۆرسەکەی زمانی قوتابخانەکە لە کۆتایی هاوینی1967تەواو بوو. بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان میستەر رۆبێرتس Mr. Roberts کە خۆی بریتانی بوو و لەگەڵ ژنەکەیا پەیوەندیەکی زۆر نزیکیان بە منەوە هەبوو و دەیزانی من شارەزاییەکی باشم لە زمانەوانی هەیە و چەندین زمانی بێگانە دەزانم پێی راگەیاندم کە زۆر رای لە منە.

جا گوتی ئۆفەرێکم بۆ تۆ هەیە ئەگەر قەبووڵی بکەیت. گوتی ئۆفەرەکەش پۆستی پشکنیار (مفتش)ی قوتابخانەکانی زمانە بۆ سەربازە ئەمریکییەکان لە باشووری ئاڵمانیا. گوتی ئەگەر رازیت تا بتنێرم بۆ لای بەرپرسی ئەم بوارەی سوپای ئەمریکا لە باشووری ئاڵمانیا و ئەگەر ئەویش رای لێت بێ ئەوا دادەمەزرێیت. بۆ من ئەمە دووشەش بوو. لە رۆژی دیاریکراوا چووم بۆ لای ئەو بەرپرسە ئەمریکییە کە ناوەکەشیم دەزانی بەڵام لەبیرم نەماوە. ئۆفیسەکەی لەناو کامپی سەربازیی شێریدان (Sheridan Kaserne)ی ئەمریکیدا بوو. لە چاوپێکەوتنێکی کورتا چەند پرسیارێکی لێ کردم کە وەرامی هەموویانم بە رێکوپێکی دایەوە ئینجا دەستی خستە ناو دەستم گوتی تۆم بە دڵە و بەرێی کردم. بە دڵێکی پڕ لە خۆشی و هیوای دوارۆژێکی رووناکترەوە گەڕامەوە بۆ لای میستەر رۆبێرتس سوپاسێکی زۆرم کرد و ئەویش پیرۆزباییەکی گەرمی لێ کردم. مابوو وەرگرتنی رەزامەندی پۆلیسی ئاڵمانی بۆ کارکردنی بێگانان لە ئالمانیا. ئۆفیسی سەربازیی ئەمریکایی پەیوەندیدار نامەی هەڵبژاردنی من بۆ ئەو پۆستەیان بۆ نووسیم کە بیبەم بۆ پۆلیسی کاروباری بێگانان لە میونیخی پایتەختی باڤاریا. چووم بۆ لایان و نامەکەم پێشکەش بە کارمەندی پەیوەندیدار کرد. لەوێ تووشی شۆکێکی زۆر گەورە بووم. کابرا پاسپۆرتەکەی لێ وەرگرتم ئەم پەڕو ئەو پەڕی کرد ئینجا یەک مۆری زلی لێدا کە لە ماوەی پێم وایە چوار هەفتەدا دەبێ ئاڵمانیا بەجێ بێڵم. بە حەپەساوی لێم پرسی ئەوە چییە، بۆچی، چی بووە! گوتی تۆ کە هاتوویت بۆ ئاڵمانیا بە ڤیزەی توریست و سەردان هاتوویت و بەڵێننامەت واژۆ کردووە کە لێرە کار ناکەیت. ئێستا وا بەڵێن و قانوونی ئەم وڵاتەت شکاندووە و خەریکی لێرە کاری هەمیشەیی بکەیت. ئەوەندەی هەوڵم لەگەڵی دا کە هێشتا دەستم بە کارەکەم نەکردووە خۆ دەتوانم وەری نەگرم ئیتر بۆچی بار کەم. بەڵام کابرای پۆلیس زۆر سوور بوو لەسەر هەڵوێستی خۆی

و هەر دەیگوت بۆ ئێمە گرینگ ئەوەیە تۆ لەباتی ئەوەی کە هەر بۆ سەردان (visit) هاتبیت وا هاتوویت لە کار دەگەڕێیت.

بە دڵساردی و دڵشکاوییەوە چوومەوە بۆ لای میستەر ڕۆبێرتس، سەربردە خەماوییەکەمم بۆ گێرایەوە و مۆرەکەی پۆلیسم لەناو پاسپۆرتەکەم پیشان دا. ئەویش بەڕاستی زۆری پێ ناخۆش بوو بەڵام گوتی ئێمە نەماندەزانی تۆ بە ڤیزەی توریست لێرەیت و مافی کارکردنت نییە. گوتی لێم گەڕێ با لەگەڵ ئۆفیسی سەربازیی ئەمریکایی قسە بکەم بزانین ئەگەر بتوانین شتێکت بۆ بکەین. ئەمن کە دوو هاوین لای خۆیان مامۆستای زمان بووم چ ئەو گرفتەم نەبوو. دەبێ ئەو جۆرە (پارت تایم part time) و کارە کاتەکییانە، کە هەموو خوێندکارێکیش هاوینان ڕێی پێ دەدرا بیکات، وەک کارێکی کارمەندی هەمیشەیی ئەو ڕەزامەندییەی پۆلیسی پێویست نەبووبێ. بە هەر حاڵ، دیسان هەلێکی زێڕینم لەدەست چوو.

لە ئۆفیسە سەربازییەکەی ئەمریکی پێیان ڕاگەیاندم کە هاوخەمی منن لەبەر بڕیاری پۆلیسی ئاڵمان بەڵام گوتیشیان کە گوناهی خۆم بووە بەوانم نەگوتووە ڤیزەی کارکردنم نییە. گوتیان تازە ناکرێ بۆ ئێمە خۆمان تێکەڵ بە کاروباری قەوانینی ئاڵمانیا بکەین. بەڵام دیار بوو نەشیاندەویست منیان لە دەست بچێت پێشنیارێکی تریان بۆ کردم کە بمنێرن بۆ ئیتالیا لەوێ لە شاری ناپۆلی نیشتەجێ ببم کە کامپێکی سەربازیی خۆیان لەوێش هەیە و مانگانە بێمەوە بۆ ئاڵمانیا و بەسەر هەموو قوتابخانە سەربازییەکانی باشووری ئاڵمانیادا بگەڕێم بۆ پشکنینەوەیان. واتا ئۆفیسەکەم لە ئیتالیا دەبێت کە خۆیان پێشەکی ڤیزەی کارکردنم لە ئیتالیا بۆ وەردەگرن وەک کارمەندێکی ئەمریکی لە ئیتالیا دانیشم. هێشتا پێیان نەگوتبووم مووچەکەم چەندە بەڵام دەمزانی زۆر باشە و خەرجی سەفەرەکانی هاتوچۆ کردنیشم لە نێوان ئیتالیا و ئەڵمانیا هەمووی لەسەر ئەوان دەبوو. گوتم چەند ڕۆژێکم بدەنێ بیری لێ بکەمەوە.

کە لەگەڵ خۆما دانیشتم دیسان لەخۆم زۆر ناڕەزاو بێزار بووم کە قەرەج ئاسا هەر ساڵە لە ولاتێکا و لە شارێکا و ئەوەتا دوانزدە ساڵە لەئەورووپام لەبەر ژنان خوێندنەکەشم پشتگوێ خستووە وا تەمەنیشم گەیشتە سی ساڵی هێشتا ماڵ و خێزانێکیشم پێک وەنەناوە. ئەو بیر و دامان و رامانە ئاڵۆزییەکی خراپیان خستە ناو هەستمەوە و بڕیارم دا بگەڕێمەوە بۆ عیراق، ژن بێنم و خوێندنەکەشم هەر لە بەغدا بە ئەنجام بگەیێنم. راستییەکەی بە پلەی یەکەم خەمی خوێندنەکەم بوو کە لێم ببوو بە گرێیەکی رەوانی چونکە دەمزانی شایەستەی زۆر لەوە زیاترم کە خۆم بە خۆمم کردووە هەرچەندە کە بۆ دڵدانەوەی خۆم زۆرجاریش بەخۆمم دەگوت نەخێر ئەوە کاک ئەحمەدی براگەورەکەم بوو کە هەر لە بەراییدا منی خستە ئەم مەینەتەوە و ئیتر دڵم بەرامبەر بەویش پڕ دەبوو لە تووڕەیی و رک و کینە. هەر لەسەر ئەم بابەتە جارێکیان مام جەلالیش بە سەرزنشتی گُردنێکی زۆرەوە پێی گوتم " کورە چ خەتای کاکەحمەدی برات مەگرە، هەمووی خەتای خۆتە، دەبوایە ئێستا ئەتۆ هەڵگری دوو دکتۆرا بیت چونکە دەزانم ئەو توانایەت هەبووە." هەقیشی بوو.

ئەم بڕیارەم بە ئەمریکییەکان راگەیاند و خۆم ئامادە کرد بڕۆم بۆ ڤیەننا و لەوێشەوە بۆ بەغدا. بەڵام دواتر و تا ئێستاش کە لێی ورد دەبمەوە ئەو پۆستەی کە لە ناپۆلی بۆیان پێشنیار کردبووم پایەیەکی زۆر بەرێز و گوزەرانی و پاشەڕۆژێکی زۆر باشی بۆ دابین دەکردم و زمانی ئیتالیشم دەخستە سەر ئەو هەشت نۆ زمانانەی کە دەمزانین.

لەوانەیە ئەو ژیانە قەرەج ئاسا بێ بەرو بەرهەمەی ئەو زەمانەم بۆ ساڵانی هەرەتی لاویم کاڵای پڕ بە باڵا بوو بێت بەڵام لەژێرەوە بە خشکەیی ئاڵۆزی و شپرزەییەکی خراپیشی خستبووە ناو حاڵەتی نەفسیمەوە کە کاریگەریی نێگاتیڤی کردبووە سەر توانایی بڕیاردانم. ئەگینا ئەو پۆستە بەڕاستی (فرصة العمر) بوو کە ئەوسا هەستم پێ نەدەکرد. دیسان وەک چەندەها جاری پێشتر ئەمجارەش هەلێکی زێڕینم لە دەست خۆم دا.

پاش ئەوەی کە ئۆفەرە چەورەکەی پۆستی پشکنیاری قوتابخانەی زمان بۆ سوپای ئەمریکی، کە ئۆفیسەکەم لە شاری ناپۆلی ئیتالیا دەبوو رەت کردەوە، چوومەوە بۆ ڤیەننا و بۆ ماوەیەک لە ماڵی برادەری دێرینی عێراقیم (مالک الیاسري) مامەوە. مالک ئەوسا لە باڵوێزخانەی عێراق لە ڤیەنا وەک کارمەندی لۆکاڵ (خۆجێیی) بە مووچەیەکی باش دامەزرابوو. منیش هەر ئەو دەمە بیرم فڕی بۆ کارێکی لەو بابەتە بۆ خۆم.

ئەمن ئەوسا دوای کۆنفەرانسەکەی کەلاری باڵی جەلالی، وەک جەلالی (بە پێناسەی سیاسی) نەمابووم و بەبێ بوونە ئەندامی پارتی بووبوومە مەلایەکی سەربەخۆ، بەڵام دۆستایەتیی کەسێتیم لەگەڵ خودی مام جەلال و هەڵسان و دانیشتنم لەگەڵ جەلالییەکاندا لە ئەورووپا هەر وەک خۆی مابووەوە و لەناو مەلایەکاندا کەسێکی وام وەک برادەر نەبوو. جا نازانم یان هەر لە سەفەرێکی ساڵی 66م بوو بۆ ڤیەنا یان 67 بوو، کە مام جەلالم دی و دەرفەتێکی باش بوو بۆم گلی و گازاندەکانی خۆم بەو دۆستە دێرینە و کەسایەتییە سەرەکییەی جەلالییەکان بگەیەنم. ئەو کاتە ئەمن دوو کتێبی نووسەری یوگۆسلاڤ میلۆڤان جیلاس Milovan Djilas م خوێندبووەوە: The New Class= چینی نوێ) و Conversations with Stalin) = دەمەتەقێ لەگەڵ ستالینا). جیلاس کۆمونیست و شۆڕشگێڕ و سیاسەتکار و نووسەر بوو. سەرەتا بە تایبەتی لە کاتی دووەم جەنگی جیهان و دوای جەنگیش، جیلاس شێت و شەیدا و هۆگری کەسایەتیی ستالین بووە، بەڵام دوای سەردانێکی بۆ مۆسکۆ و دەمەتەقێیەکی دوور و درێژی لەگەڵ ستالینی رێبەری سۆڤیەت، دڵی لێی سارد دەبێتەوە و ئەو کتێبە دەنووسێ، کە پڕە لە هێرشی زۆر توند بۆ سەر دیکتاتۆری جیهانی کۆمۆنیزم. جا کە منیش لە ڤیەننا مام جەلالم بینی، لێم پرسی مام جەلال کتێبەکەی جیلاست لەسەر ستالین خوێندووەتەوە؟ مام جەلالی ئاشقی کتێب خوێندنەوە گوتی، بەڵێ بەڵێ ئەوەش و

کتێبەکەی پێشتریشیم (چینی نوێ) خوێندووەتەوە. گوتم جا مام جەلال ئێستا ئەمنیش بەرامبەر بە تۆ خۆم وەکوو جیلاس بەرامبەر بە ستالین دێتە بەرچاو، هەڵبەت بە هەندێ جیاوازییەوە. گوتم من کە تۆم خۆش ویستووە و هەر خۆشیشم دەوێیت، بەداخەوە وەک جیلاس لە ستالین منیش لە رووی سیاسییەوە - تەنیا لە رووی سیاسییەوە - دڵم لە تۆ سارد بووەتەوە، پاش ئەوەی ئەم کارە نابەجێیەتان کرد و لەگەڵ بەغدا چەکتان لە دژی پێشمەرگەی کورد هەڵگرتووە. مام جەلال ویستی پێم بسەلمێنێ، گوتی: "هۆمەر گیان ئێوە لەدەرەوەی وڵات ئاگاتان لە شت نییە و خراپی تێ گەیشتوون. ئێمە شەڕی پێشمەرگە ناکەین، بەڵکوو تەنیا شەڕی ئەو دەسەڵاتەی مەلا مستەفا دەکەین، کە شۆڕشی کوردی خستووەتە ژێر هەژموونی شای ئێرانەوە و پەیوەندیی بە ئیسرائیلیشەوە بەستووە." ئەوسا مام جەلال هێشتا خۆی هەر بە چەپڕەوێکی دڵسۆز بۆ بەرەی سۆسیالیست دەزانی و لاگرێکی توندی جەمال عەبدولناسر و بزووتنەوەکەی بوو.

هەر لەو کاتانەشدا بوو، کە لەگەڵ محەممەدی موهتەدی، برادەری ساڵانی پاریسم یەکدیمان دییەوە. منێکی کە بووبووم بە مەلایی و پێم خۆش بوو کە شۆڕشی کورد پەیوەندیی باشی لەگەڵ ئێران و ئەمریکا بەستووە، گوتم محەممەد لەبیرتە کە من و تۆ لە پاریس هەر شەڕمان بوو لەسەر مەلایی و جەلالی، ئێستا وا بۆم دەرکەوتووە ئەوسا کە تۆ مەلایی بوویت و من جەلالی، ئەتۆ راست بوویت و ئەمن بە هەڵەدا چووبووم. محەممەدیش کە پێی خۆش بوو جەلالییەکان وا لەگەڵ بەغدا رێک کەوتوون و دژایەتیی شای ئێرانێ دەکەن، ئەویش بووبووە جەلالی و گوتی کوڕە نە بەخوا ئەمن هەنگی بەهەڵەدا چووبووم، ئەتۆ راست بوویت. دیسان لێمان بوو بە شەڕە وشە، بەڵام ئەمجارە سەنگەرمان ئاڵوگۆڕ کردبوو.

ئەمەیە بنبەستە ئەزەلییەکەی کێشەی کورد، کە بەبێ ویستی خۆی لەگەڵ بزووتنەوەی رزگاریخوازی بەشەکانی تری کوردستانی

دابەشکراودا تووشی ئەم جۆرە بەرەواژییانە (تەناقوزاتانە) دەبێ. کوردی عێراق شای ئێرانیان خۆش دەویست، چونکە دژی سەدام بوو، کوردی ئێران سەدامیان خۆش دەویست چونکە دژی شا بوو. لە بەشەکانی دیکەی کوردستانیش هەمان بەزمی زەمانە. هەر بەشێکی کوردستان ناچار بووە بەپێی جیۆپۆلیتیکی وڵاتەکەی خۆی پلانی سیاسیی خۆی دابڕێژێت، کە زۆر جار لەگەڵ پلانی سیاسیی بەشەکانی تری کوردستاندا یەکدییان نەدەگرتەوە، یان رەنگە هەر دژبەری یەکتریش دەبوون.

شەهیر نورەدین ئاغا
1993 - 1944

هۆمەر لە دەرەوەی گوندی لێنگریز

ستافی قوتابخانەکە ، لەچەپەوە: دیمیترا (یۆنانی)، گاپۆ (بولگاری)، بیزدە (تورکی)، هۆمەر دزەیی (عەرەبی)، لویگ (؟)، رۆبێرتس (بەڕێوەبەر)، جێمس (؟)، شەهیر نورەدین (عەرەبی)، لێنگریز سێپتێمبەری 1966

کارین مایەر، یاری سالآنی 66 و 67 م لە میونیخ

داگمار بە فرانسی نووسیویە:«لێ فۆیی مۆرت »
واتا: گەڵا مردووەکان

لاپەڕەی یەکەمی ئەلبومەکەی داگمار بۆی ناردم کە بە ئاڵمانی نووسیویە: یادێکی لێنگریز پایزی 1967

داگمار

داگمار بە بەرگی نەتەوەیی ناوچەی باڤاریا کە بە ئاڵمانی پێی دەڵێن DIRNDL دیرنداڵ

داگمار پایزی 67 لە لێنگریر

خانووی ماڵە گەورەکە لە دوورەوەی دارستانەوە دیارە

شەرابی لەعلی روممانی لەبەردەم ئاگردانەکە

شوێنێکی دانیشتنمان لەگەڵ داگمار

ئێوارەیەک لە ماڵە گەورەکە داگمار ئەم وێنەیەی بۆ کێشام

دوای فەشەلم لەگەڵ کیژۆڵە گاوانەکە بە دەستبەتاڵی دەگەڕامەوە بۆ لای ئۆتۆمۆبیلەکەم

لە راستەوە : کەمال فوئاد ، مام جەلال ، سەعدی دزەیی برای هۆمەر

ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی براگەورەی هۆمەر (1976 - 1925)

مام جەلال و ئەحمەد حەمەدەمینی برای هۆمەر لە میوانداربیەکی باڵیۆرخانەی چین لە بەغدا.

دکتۆر سالم حەیدەری (1977 - 1926)

عەباسی مامەند ئاغا (1966 - 1922)

مام جەلال لەنێوان سێ عومەرا . لە چەپەوە : عومەری سەید عەلی ، عومەر هەڵمەت ، مام جەلال ، عومەر دزەیی (هۆمەر) لە کۆتایی نەوەدەکانا لە ماڵی عومەر هەڵمەت لە مێریلاند . ئەمریکا.

کەمال محێدین لە ئاهەنگێکی نەورۆزا لە سدة الهندیة، ساڵی 1958

دکتۆر فوئاد بابان لەگەڵ جەنابی مام جەلالی هەمیشە زیندوو

مامەندی عەباسی مامەند ئاغا لەنێوان هۆمەر دزەیی و رزگاری ئەحمەد حەمەدەمینی برازای هۆمەر

لە چەپەوە: کۆچەر هۆمەر دزەیی، هۆمەر دزەیی، مام جەلال، کاروان هۆمەر دزەیی، دێدەوانی برازای هۆمەر، ساڵی 87 یان 88 لە ماڵی هۆمەر لە ڤیەننا

لەراستەوە: هۆمەر دزەیی، مالک الیاسري، تیماتیوس بیجان - ڤیەننا 1957

باڵاخانەی شارەوانی لە شاری میونیخ

کتێبەکەی میلۆڤان جیلاس لەسەر ستالین

میلۆڤان جیلاس (1995 - 1911)

دیمەنێکی شارە جوانەکەی ناپۆلی لە ئیتالیا

کامپی سوپای ئەمریکی
(ئۆردوگای شێریدان) لە باشوری
ئاڵمانیا

# بەشی 23

## دیسان ڕێی عێراقم گرتەوە بەر

دوا پاییزی 67 بوو، دیسان کۆڵێک شڕوپڕم لە ڤیەننا بەجێ هێشت و باری خۆم سووک کرد و بە ئۆتۆمۆبیلە سپۆرتەکەم ڕێی عێراقم گرتە بەر. نزیکترین ڕێی ماشینان کە لە ڤیەنناوە بۆ عێراق دەچوو، بەم جۆرە بوو: ڤیەننا، بێلگراد، سۆفیا، پلۆڤدیڤ، مۆشتار، یۆنان، ئەدیرنە، ئیستانبوڵ، ئیتر لەوێوە یان بە ڕێی دیاربەکرا یەکسەر بۆ عێراق، یانیش بەناو سووریادا بۆ عێراق. من پلانی خۆم دانا گەشتەکەم وەک دەڵێن "بە لەوەڕ" بکەم، واتا لە هەر شارێکی سەر ڕێما ئەگەر برادەرێکمی لێ بوا وچانێکی بۆ بدەم. هەر واشم کرد. لە بێلگراد چەند ڕۆژێک لەگەڵ برادەری سالانی منداڵیم، کەمالی حەمەد بەگی خۆشناو، مامەوە کە لەوێ دەیخوێند. هەر لەو چەند ڕۆژەی ئەوێشا ئاشنایەتیم لەگەڵ کاک کەمال عەبدوڵا و بەیان ساحیبقڕانیشدا پەیدا کرد، کە ئەوانیش لەوێ خوێندکار بوون. زۆر درەنگتر کاک کەمال عەبدوڵام لە سلێمانی دیەوە، کە کارمەندی بەڕێوەبەرایەتیی گەشتوگوزار بوو و کۆڵێک باسی یادی جارانی ئەو چەند شەوەی بێلگرادمان کردەوە. لە سۆفیاش کوڕێکی زۆر باشی شەقڵاوەیی، سابیر خۆشناو، لەوێ دەیخوێند و لەوێش یەک دوو شەو مامەوە و حەزم دەکرد سەردانێکی مۆزۆلێیوم (ئارامگا)ی ڕێبەری گەورەی کۆمۆنیستی بولگاری، گیۆرگی دیمیترۆڤ، بکەم کە زۆرم لەسەری خوێندبووەوە و لەگەڵ کاک سابیر خۆشناو چووینە ئەوێش. ئینجا بەڕێ کەوتمەوە بۆ ئیستانبوڵ و لەوێش چەند خوێندکارێکی

هەولێریی لێ بوو، وەک هادی شێخ ڕەووفی برای مارف و سەلاحی برادەرانی سالانی منداڵیم لە قوتابخانەی سەرەتایی و جەودەتی عەلی ئاغای عوزێری، کە بە ژن خزمایەتیمان لەگەڵ بنەماڵە بەڕێزەکەیدا بەستبوو و پێم وایە جەمالی شێخ جەلالی برازای کاکە شێخ فەتحی شێخ جەمیلی برادەری منداڵیم ئەویش ئەوسا لەوێ دەیخوێند. دواتر ئەمانە هەموویان بوون بە دکتۆر، بەڵام بەداخەوە جەودەت زوو کۆچی دوایی کرد. لە ئیستانبوڵ سەیرم کرد پارەم کەم ماوە، چونکە ئاوی رادیتەی ئۆتۆمۆبیلەکەم لەژێر بەفرا بەستبووی و رادیتەکە تەقیبوو و ئیتر ئاوی لێ گیر نەدەبوو. ئەمن کە هێشتا پاییز مابوو، نەمدەزانی بەو زووە بەفر بەو ڕێژەیە لەوناوە دەکەوێت، بۆیە ئەنتی فریزم لە رادیتەی ماشینەکەم نەکردبوو. هەندێ پارەم لە کاک هادی شێخ ڕەووف وەرگرت، پاشان کە گەیشتمەوە هەولێر دامەوە کەسوکاری.

لە ئیستانبوولەوەش چوومە شام، کە چەند برادەرێکی کوردی فەیلیی بازرگانی ئۆتۆمۆبێل لەوێ بوون، سێ برا (سامی و سالم و فەوزی)، بەڵام تەنیا سامی و سالم لە شام بوون، فەوزی لە ئاڵمانیا بوو. چەند رۆژێکیش لە شام مامەوە و باش بوو لەوێ زانیم کە بردنەوەی ئۆتۆمۆبێل بۆ عێراق قەدەغە کراوە و ئەگەر بشیبەیت دەبێ لە شارۆچکەی سەر سنوور (روتبە) بەجێی بێلیت، خۆت بڕۆیتەوە بۆ بەغدا ئەگەر پێت کرا واسیتەیێ بکەیت، مۆڵەت وەرگریت ئینجا بچیت لە سنوور وەریگریتەوە بیبەیتەوە بۆ ناو عێراق. وەکوو باسی روتبەشیان بۆ دەکردم، ئەمن پێم حەیف بوو ئەم ئۆتۆمۆبیلە سپۆرتە جوانە سەرتەنتە نوێیە لە سەحرای روتبە لە گۆڕەپانێکی بێ سەروبەری پۆلیسی روتبە لەناو سەدان کۆنە لۆری و ترێلەری دەست بەسەرداگیراودا، کە یەک مەتر تۆزوگەردی بیابانیان لەسەردا نیشتووە بەجێ بێلم. بێجگەلەوەش، زۆرێک لە دەسگای بەکەڵکی ناو مەکینە و بۆدی ئەو چەرخدارە لەو گۆڕەپانە فڕێدراوانە دەدزران. بۆیە بە ئامۆژگاریی برادەرانم سامی و سالم، ماشینەکەم لە گەراجێکی

سەرداخراوی پاکدا، کە خاوەنەکەی دۆستی ئەو دوو برایە بوو، بەبێ بەرامبەریش لە دیمەشق بەجێ هێشت و بە ئۆتۆبوس گەڕامەوە بۆ بەغدا بچم واسیتەیێ بکەم و بگەڕێمەوە بۆ شام. هەر لە دیمەشق دەمزانی برادەری دێرینی عێراقیی ساڵانی ڤیەننام (فەیسەل الیاسري) لەوێیە، کە دەرهێنەرێکی بەناوبانگی شانۆ و سینەما بوو. چووم ئەویشم بەسەر کردەوە و ئێوارەیەک منی برد بۆ شانۆگەرییەک کە خۆی دەرهێنەری بوو.

## گەیشتمەوە بەغدا

ساڵ کۆتایی 67 بوو، گەیشتمەوە بەغدا و یەکسەر چوومە فندق المستنصر (ئۆتێل ترۆکادێرۆ Hotel Trocadero)ی جاران لە (شارع النهر). خاوەنی ئەو ئۆتێلە (عبد متي) خەڵکی تلکیف بوو و پیاوێکی زۆر خۆشەویستی بنەماڵەی دزەییەکان بوو، کە پێشتر لە چلەکانا لە هەولێر یانەی فەرمانبەرانی ئەوێی بەکرێ گرتبوو. جا دواتر کە گواستییەوە بۆ بەغدا، زۆرترایەتیی دزەییەکان و هەولێرییەکانیش کە دەچوونە بەغدا هەر لە ئۆتێلەکەی ئەوا دادەبەزین. هەڵکەوتەی ئۆتێلەکەش لە ناوەڕاستی بازاڕ و ناوەندی بازرگانیی بەغدا بوو، لایەکی شەقامی سەرەکیی بەغدا (شارع الرشید) کە ئۆرۆزدی باگی لێ بوو و لایەکەی تریشی زێی دیجلە بوو. (شارع النهر) لە بەغدا شەقامێکی بەهەرمێنی زیوینگران بوو، کە هەموویان سەر بە ئایینی (سابیئەی مەندائی)ن. پیاسەکردنی دەمی ئێواران بەو شەقامەدا زۆر خۆش بوو، چونکە جوانترین کچانی بەغدا بازاڕیان لەوێ دەکرد.

کە گەیشتمە ئۆتێلەکە، بینیم کاک ئەحمەدی براگەورەم و چەند خزمێکی دیکەی دزەیی لێ بوون. زۆر ئێوارانیش سەرانی باڵی جەلالی، وەک مام جەلال خۆی ئەگەر لە بەغدا بوایە و برایم ئەحمەد و عومەر دەبابە و کەمال موفتی و حیلمی عەلی شەریف و

عەباسەفەندی و کەمال محێدین و عەلی عەسکەری ئەگەر لە بەغدا بوایە و ئی تریش لەوێ دادەنیشتن. هەندێ لایەنگرانی ئەو باڵەش لە خێڵی پشدەر، وەک هەمزەی باپیر ئاغا و بابەکری مەحموود ئاغا، ئەوان لە ئۆتێل شپرد Hotel Shepherd دادەنیشتن و کاک مەسعود محەمەد و کاک عەبدوڵا کانی مارانییش هاتوچۆی ئۆتێلەکەی عەبد مەتییان دەکرد.

وەک پێشتریش باسم کردووە، ئەمن بە بیروباوەڕی سیاسی لەگەڵ جەلالییەکان نەمابووم، بەڵام وەک دۆست و برادەر پەیوەندیم لەگەڵیاندا هەر وەکوو پێشان مابووەوە.

هەرچەندە کە من بەدرێژایی ساڵانی پەروەردەییم و ئێستەشی لەگەڵدا بێ، لە دڵی خۆما ئۆباڵی دواکەوتنم لە خوێندندا دەخستە ئەستۆی کاک ئەحمەدی برا گەورەم، کە نەیهێشت موزیک بخوێنم و منی بەم ئاڵۆزییە دەروونییە گەیاند، بەڵام سەرەڕای ئەوەش، کە گەڕامەوە پێم ڕاگەیاند کە نامەوێ لەوە زیاتر تەمەنم بەبێ بەروبەرهەم بڕوات، ئێستا وا هاتوومەتەوە و دەمەوێ خۆم لە کۆلێژی ڕەوا ناونووس بکەم، ماڵ دابنێم و ئیتر بەسە، ئەوە بوو بە دوازدە ساڵ لە ژیانمدا کە بەهەدەر چووە. کاکم قسەکانمی زۆر پێ خۆش بوو. بەڵام ساڵ درەنگ بوو، خوێندن دەمێک بوو دەستی پێ کردبوو و ماوەی قەبوولکردن بەسەر چووبوو. مام جەلال گوتی، من نامەیەکت لە تاهیر یەحیای سەرەک وەزیرانی عێراق بۆ وەردەگرم، بیبە بۆ سەرۆکی زانکۆی بەغدا قەبووڵت دەکەن. هەر واشمان کرد و بە عەرزوحاڵێک و بەو نامەیەی هاوپێچیش، چووم بۆ لای سەرۆکی زانکۆ، کە ئەوسا (دکتۆر محمد رشید الفیل) بوو، سلاوم کرد و لەبەردەم مێزەکەی وەستام. ئەو خۆی خەریکی هەندێ نووسین بوو، بەڵام نامەکەی لێ وەرگرتم، بەپەلە خوێندییەوە و گوتی کوڕم ساڵ درەنگە، ماوەی وەرگیران لەمێژە بەسەر چووە، بڕۆ ساڵی داهاتوو وەرەوە. گوتم دکتۆر من وا لەدەرەوەی وڵات گەڕاومەتەوە، خوێندنم

لێرە لە وڵاتی خۆما تەواو بکەم، هەقی وایە یارمەتیم بدەیت، بۆچی ساڵێکم لەدەست بڕوات. گوتی رۆڵە دەڵێم ساڵ درەنگە، ئاخر لە کوێوە دەس پێ دەکەیت؟ ئینجا لێرەدا گوتم دکتۆر ئەمەیان نامەی سەرەک وەزیرانە بۆ جەنابتم هێناوە، تکا دەکەم یارمەتیم بدەیت. کە ئەمەم گوت زۆر تووڕە بوو و قەڵەمێکی سووری لەسەر مێزەکەی هەڵگرتەوە و یەک زەربی سەر تا بە خواری بە عەرزوحاڵەکەدا کێشا و بەگەورەییش لەسەری نووسی (یرفض) گوتی دەبڕۆ ئیتر درێژەی مەدەرێ ! هەر باش بوو لێشی نەدام.

دیسان وەک لای پۆلیسەکەی میونیخم بەسەر هات، کە لە ئاڵمانیا دەریانکردم.

چارم ناچار وازم هێنا و لەو کاتە لە دڵی خۆما زۆر پەشیمان بوومەوە کە گەڕاومەتەوە بۆ عێراق. چوومەوە بۆ هەولێر و سەردانی ئارامگەی دایکمم کرد لە دووگردکان. ماوەیەک لە هەولێر لە ماڵی کاک ئەحمەدی برام مامەوە تا نەورۆزی 68. بۆ نەورۆز برادەرانی جەلالیم لە بەغدا ناردیان بەدواما بچمەوە بەغدا بۆ ئاهەنگی نەورۆز.

ئەوسا بەغدا ژمارەیەکی زۆر لە خزمانی دزەیی خۆمی لێ بوو، کە لە زانکۆی بەغدا دەیانخوێند. ئەوانەی لەبیرم مابن: کاکە، دکتۆر دەشتی، عەلی سمایل ئاغا، عوسمانی حەسەن ئاغا (ناسراو بە عوسمان سەرسۆر) و رەمزیی برای، فوئاد مستەفا، حەیدەری قادر ئاغا. خوسرۆ عەبدولکەریم، ئەمانە دوو دوو و سێ سێ خانوویان پێکەوە گرتبوو و شەوانی هەینی منیش لەگەڵ هەندێکیان دادەنیشتم و تا درەنگانی شەو خواردن و خواردنەوە و گۆرانی بوو. کاکەی ئامۆزاشم لەگەڵ هونەرمەندی دەنگخۆش مەحمود محەمەد (خولەی حەمەی لەیلێ) سەرو ژووریان لە خانووێکدا بەکرێ گرتبوو و زۆربەی ئێواران لای ئەوان دادەنیشتم. ئەمن پێشتریش زۆر جار گوتوومە و ئێستاش بۆ مێژوو دەمەوێ دیسان دووپاتی بکەمەوە، کە سەرچاوەی دوو گۆرانیم (گوڵی خوێناوی و جوانی بێناو) کە من دواتر بەوانەوە ناوم دەرکرد،

ئـەو خولـەی حەمـەی لەیلـێ یـە بـوو، کـە لـە کۆتایـی چلەکانـدا بـە دەنگـە گـەرم و نەرمەکـەی خـۆی لـە رادیـۆی کـوردی بەغـدا تۆمـاری کردبـوون. مـن ئـەو دوو گۆرانییـە لـەو فێـر بـووم، بـەڵام زیاتـر لـە بیسـت سـاڵ دواتـر بـۆ تـی ڤـی بەغـدا و کەرکـووک بـە سـتایلی تایبەتـی خـۆم تۆمـارم کردنـەوە. یـادت بەخێـر و گـۆڕت پـڕ بـێ لـە نـوور خولـە گیـان.

ئەوسـا خوێندکارەکانـی کـوردی بەغـداش بووبـوون بـە دوو بـاڵ، جەلالـی و مەلایـی. خوێنـدکارە کـوردەکان ئاهەنگـی نـەورۆزی 68یـان لـە یەکێـک لـە کۆلێژەکانـدا کـردەوە و منیـش بـە گۆرانـی بەشـداریم تێـدا کـرد.

بێجگـە لەمانـە، پـوورزا و بنپـوورزا هەولێرییەکانـم (هەردوو بـرا مەحمود و فوئـاد عوسـمان و هـەردوو بـرا نەجـدەت و نەجاتـی موحسـین ئاغـا) و شـەهیری نورەدیـن ئاغـای بـرادەری میونیـخ و ڤیەننـام، کـە گەڕابـووەوە بۆ بەغـدا بـۆ خوێنـدن، ئەوانـەش هەمـوو لـەوێ لـە بەغـدا بـوون، کـە بـۆ مـن فەرامۆشـییەک بـوو.

## یادێکی دکتۆر خالید سەعید

لەوەتـەی سـەرانی باڵـی جەلالـی لـە سـاڵی 66ەوە لـە بەغـدا نیشـتەجێ بووبـوون، شـەڕ و پێکـدادان و رەشـەکوژیش لەنێـوان مەلایـی و جەلالییـان لێـرە و لـەوێ رووی دەدا. لـە یەکێـک لـەو شـەڕانە، هێزێکـی مەلایـی بـە سـەرکردایەتیی دکتـۆر خالیـد سـەعید، لەنزیـک گونـدی تـەلان لەلایـەن هێزێکـی هاوبەشـی عێراقـی و جەلالییـەوە ئابلۆقـە دەدرێـت، کـە هیـچ دەرفەتـی رزگاربوونیـان نابـێ، ناچـار خـۆ دەدەنـە دەسـت. وەکـوو ئەوسـا بـڵاو بووبـووەوە گۆیـا مـام جـەلال کـە دکتـۆر خالیـدی زۆر خـۆش دەویسـت و دەیزانـی کـە حکوومـەت بەبـێ سـێ و دوو لێکـردن دەیکـوژێ، تەگبیرێکـی باشـی بـە خەیاڵـدا دێـت و بـە سـەرکردایەتیی هێـزە عێراقیەکـە رادەگەیەنـێ، دەسـت لـە دکتـۆر خالیـد نـەدەن، چونکـە

خۆی زۆر پێشتر پەیوەندیی بە مام جەلالەوە کردووە، ویستبووی خۆی و پێشمەرگەکانی بێنەوە بۆ ناو (الصف الوطنی) عێراقییەوە. مام جەلال بەم فێڵە زیرەکانەیە دکتۆر خالید و پێشمەگەکانیشی لە کوشتنێکی مسۆگەر رزگار دەکات. ناچار دکتۆر خالید، بێ ئەوەی بیەوێ، لە بەغدا دانیشت و کەوتە ناو بازنەی سەرانی جەلالییەوە. ئەمن پێشتر لە سالانی پێشمەرگایەتیی 63 و 64مدا دۆستایەتییەکی نزیکم لەگەڵ دکتۆر خالیدا بەستبوو و زۆرم خۆش دەویست. هەر ئەوسا جارێکیان دکتۆر خالید جووتە کالەیەکی ئاوریشمینی کوردیی زۆر جوانی لەپێ بوو، کە زۆرم پێ جوان بوو و بە زمانی سووتاوم گوتم بەڕاستی جوانە، ئەویش هەر دەلحاز لەپێی خۆی کردەوە و هەرچەندی هەوڵم دا کە پیرۆزی خۆی بێ، بەڵام بەدیاری پێشکەشی کردم. ئەو کالەیەم بردەوە بۆ پاریس و ئێستاش هەر وەک یادگارێکی زۆر خۆشەویستی دکتۆر خالید هەڵمگرتووە. جا لە بەغدا کە یەکتریمان دەدی، پێیوە دیار بوو کە لەناو دڵیدا نهێنییەکی حەشار داوە. هەمیشە خەماوی دیار بوو. ئەو بیستبووی کە من راستە برادەری جەلالییەکانم، بەڵام دەشیزانی کە لە بیروباوەڕدا لەگەڵیاندا زۆر ناکۆکم. دەشیزانی ناوە ناوە سەردانی کاک موحسینی برام لەناو شاخا دەکرد، کە ئەو مەلایی بوو. رۆژێکیان دکتۆر خالید لە پەناوە پێی گوتم کاکە عومەر راسپاردەیەکی زۆر نهێنیم بۆ بگەیەنە بە سەرەوە (سەرکردایەتیی شۆڕش). پێیان بڵێ ئەمن بەناچاری کەوتوومەتە ناو ئەم وەزعەوە، پێیان بڵێ کە من هەڵوێستی جەلالییەکانم بەرامبەر بە شۆڕش بە هیچ جۆرێ قەبووڵ نییە. تکایە پێیان بڵێ ئەمن نەبوومەتە جاش، بەڵکوو هەر پێشمەرگەکەی جارانم و دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ ناویان، با ڕێگایەکم بۆ بدۆزنەوە کە بگەمەوە ئەوێ. منیش قسەکانیم بەڕاستی پێ خۆش بوو و دوای چەند رۆژێ چوومە سەرەوە بۆ ناو شاخ و راسپاردەکەم بە ئاستی بەرزی سەرکردایەتیی شۆڕش راگەیاند. چەند شەوێ لە چاوەڕوانیی وەرام مامەوە، ئینجا پێیان گوتم "پێی

بڵێ متمانەی پێ ناکەین، ئەگەر پێش هاتنەوەی یەک دووانێک لە سەرانی جەلالییەکان نەتۆپێنێ." من بەڕاستی بەم داخوازە شۆک بووم و کارێکی زۆر نێگاتیڤی تێ کردم. هەرچەندی بیری وردم لێ دەکردەوە، دەهاتمە سەر ئەو دەرەنجامە کە دیارە راستە کە دەگوترا دەسگای ساواکی ئێرانی ئەم جۆرە داخوازییانە لە سەرکردایەتیی شۆڕش دەکات، تاکو خوێنی زیاتر بکەوێتە بەینی باڵە جیاجیاکانی کورد و رێ لە یەکگرتنەوەیان بگیرێ. گەڕامەوە بۆ بەغدا، بەڵام نەمدەویست ئەم قسە ناخۆشە بگەیەنمەوە بە دکتۆر خالید و تا لە بەغدا بوام هەوڵم دەدا نەیبینم و بڕیاریشم دابوو ئەگەر بشیبینم، پێی بڵێم هێشتا ماوەم نەبووە سەفەری سەرەوە بکەم و راسپاردەکەی تۆم هێشتا نەگەیاندووە. ئیتر شتەکەم بەم جۆرە دیزە بە دەرخۆنە کرد و تا ئەمڕۆ لای کەسم نەدرکاندووە. بەڵام ئێستا کەوا کەوتوومەتە ناو تۆمارکردنی رۆژگارانی رابردوو و مێژوو بەسەر دەکەمەوە بە ئەرکی دەزانم لێرەدا دەرخۆنەکە هەڵدەمەوە.

لەچەپەوە: هۆمەر دزەیی، سامی فەیلی، سالم فەیلی برای،
شام - پاییزی 1967

دکتۆر کەمال خۆشناو.

دکتۆر هادی شێخ رەوف نەقشبەندی

دکتۆر خالید و مام جەلال

لە راستەوە : شەهیر نورەدین ، ماهر نورەدین ، هۆمەر دزەیی ، بەغدا ، 67 یان 68

له راستەوە : رەمزی حەسەن دزەیی، خوسرۆ عەبدولکەریم، عەلی ئیسماعیل دزەیی، هۆمەر دزەیی، عوسمان سەرسۆر دزەیی، بەغدا، نەورۆزی 1968

سەروبنی جووتە کالە کوردییەکەی کە دکتۆر خالید لە سەفەرێکی بە پیادەییمان ساڵی 64 لە عیساوێ بۆ قەڵادزێ لە پێی خۆی کردەوە و بە دیاری دایە من. ئێستاش هەندێ وردە بەردی ئەو ڕێگایە لە کەلێنی بنی کالەکاندا ماوە. بنەکەش لاستیکی تایەی ئۆتۆمۆبیلانە.

ڕێبەری بولگاریای کۆمونیست گیۆرگی دیمیترۆڤ
1882 - 1949

# بەشی 24

## بای bye ساڵانی جەوانی،
## های hi ژیانی خێزانی، ژنم مارە کرد

ئەو دوو مەبەستەی کە هانیان دابووم بگەڕێمەوە بۆ عیراق (خوێندن و هاوسەرگیری) یەکەمیان دیسان خوا جارێ بە نسیبی نەکرد، دووەمیان سەری گرت.

پێشان، لە تەمەنی هەرەتی لاویمدا، هێشتا سۆزی نیشتمان و غوربەت لەلای من زۆر گەرمتر بوو تا خۆشەویستی کیژۆڵەیەکی شۆخ و شەنگی بێگانە، دەڵێم بێگانە. هەرچەندە کە کچێکم خۆشیش ویستبا و هەر چەندە جوانیش بوا بەربەستێک دەهاتە بەرچاوم چۆن دەبێ منداڵەکانم نیوە _ کورد بن !! ئەم جیهانڕوانییەی Weltanschauung هەبێتیکەم هەڵبەتا لە ئەنجامی ئایدیۆلۆژی ناسیۆنالیزمێکی توندڕەوی منداڵانە بوو کە دواتر بیرم لێ دەکردەوە بە بێ ئەقڵی و دواکەوتوویم دەزانی. دواتر، زۆر درەنگتر، کە ئەمسەر و ئەوسەری دنیام کرد کەوتمە بەر هەژموونی رەنگێکی گلۆبالیزم و تا ئەندازەیەک کۆزمۆپۆلیتیزم کە دیار بوو لە زۆر بوارانـدا ناسیۆنالیزمە منداڵانییەکەی جارانمی وردە وردە سپیات دەکردەوە.

پێشتر ئەمن لە سەردانێکی 1962م لەپاریسەوە بۆ عیراق لەو ماڵە خزمانەی کە لە هەولێر بەسەرم دەکردنەوە ماڵی کاکە حوسێنی عەلی ئاغای بوو. کاک حوسێن و بەسەخانی هاوسەری ئامۆزای یەکدی بوون و هەردووکیشیان ئامۆزازای من بوون. ئەمن هەر لە تەمەنی منداڵیمەوە وا راهاتبووم کە ئەو خێزانە نزیکترین خزمی ماڵی ئێمەن

بەتایبەتی پەیوەندی زۆر نزیکی کاک حوسێن لەگەڵ کاک ئەحمەدی براگەورەی ئێمە. هەڵبەت لەو سەفەرەم بۆهەولێر سەرێکی ماڵی کاکە حوسێنم دا. کە لەناو منداڵەکانیا کیژۆڵەیەکی دە ساڵیی ناو رووناکم کەوتە بەر چاو یەکسەر وەک نەریتی هەمیشەم بە چاوێکی پسپۆڕی هونەرمەندییەوە لە ئەدگارەکانی روخساری ورد دەبوومەوە و لێکم دەدایەوە. دەمزانی ئەو کیژۆڵەیە پاش چەند ساڵێکی تر جوانێکی سەرنجکێشی لێ دەردەکەوێ.

جا کە لە سەرەتای ساڵی 1968دیسان لە هەولێر سەردانم کردنەوە ئەوەی کە چەند ساڵێ پێشتر پێشبینیم کردبوو وا دەرچوو. رووناک کە پۆلی دووی ناوەندی بۆ سێ بڕیبوو لە جوانییا شەڕی لەگەڵ ئەختەر دەکرد. بڕیارێکی بەپەلەم دا کە خوازبێنی بکەم ئەگەر شووم پێ بکات چونکە جیاوازیی تەمەنمان پانزدە ساڵێک دەبوو. بە رێگای براکانمەوە خوازبێنیم بۆ کرا و کچە و باوانیشی رازی بوون بە مەرجێ نەیگوازمەوە تا تەمەنی دەگاتە هەژدە ساڵان واتا تا ساڵی 1970 بوەستم. هەرواشمان کرد و مارەییم بڕی بەڵام تا ساڵی حەفتا هەر بە دەسگیران بووین.

لەو ماوەیە لە 1968/7/17 کودەتای دووەمی بەعسیەکان قەوماو دیسان دەست کرا بە وتووێژ لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کورد. مەلا مستەفای بارزانی داوای کرد پۆستی چوار وەزیر لە حکومەتی نوێی بەغدا بدرێ بە کورد و بەغدا رازی بوو. لەو چوارە حکومەت دوانی دا بە دەسنیشانکراوانی بارزانی (موحسین دزەیی برام و ئیحسان شێرزاد)، دووانەکەی تریش یەکێکیان دکتۆر عەبدوڵا نەقشبەندی بوو کە زانایەکی کوردی سەربەخۆ بوو و لە هەموو لایەنی کورد و عەرەبەوە رێزی لێ دەگیرا، ئەوی تریشیان موسلیح نەقشبەندی بوو کە پێشتریش هەر وەزیری کوردی سەر بە حکومەت بوو. دوو هەفتەیەکی پێچوو بەعسیەکان لە 7/30 دیسان کودەتایەکی تریان ئەمجارە بەسەر هەندێ لە جەماعەتی خۆیاندا کرد. لەم رووەوە

کاک موحسین دزەیی دەڵێ:" لە حکومەتی نوێ کە دامەزرا خۆم و ئیحسان شێرزاد ماینەوە، دکتۆر عەبدوڵڵا نەقشبەندی بە ئارەزووی خۆی لە حکومەت دەرچوو، موسلیحیش بەعس خۆی لای برد و ئەمجارەیان تەها محێدین کرا بە وەزیر کە زیاتر مەیلی جەلالییانی هەبوو." بەڵام مەلا مستەفا بەمە رازی نەبوو کە یەکێکی جەلالی لەسەر حیسابی بەشی کوردا لە وەزارەتا بێ. بۆیە وەک پرۆتێستۆ داوای لە وەزیرەکانی خۆی کرد دەوام نەکەن. هەر واشی لێ هات و دوو وەزیرەکەی شۆڕش، دزەیی و شێرزاد، بە رەسمی وەزیر بوون بەڵام دەوامیان نەدەکرد.

## بەدوای ئۆتۆمۆبیلەکەما چوومەوە بۆ شام

هەرچەندی هەوڵم دا نەمتوانی مۆڵەت بۆ هێنانەوەی ئۆتۆمۆبیلەکەم وەرگرم. ناچار چوومەوە بۆ شام لەوێ بیفرۆشم. برادەرە فەیلییەکانم برایان سامی و سالم هەر لەوێ بوون و ئۆتۆمۆبیلەکەم بە ساغ و سەلامەتی وەرگرتەوە. لەشام سەردانێکی (کافێ هاڤانا)م کرد کە دەمزانی زۆرێک لە رۆشنبیرانی کوردی شام لەوێ دادەنیشتن. قەدری جانی شاعیر و برایەکی کاک مەحمود شێخموس کە پێم وایە کاک سالح بوو و مامی کاک عومەر شێخمووس بوو ئەوانەم لەوێ دی و چەند دانیشتنێکمان پێکەوە کرد. ئێوارەیەکیان کاک سالح من و قەدری جانی بۆ خواردنی ئێوارە لە رێستۆرانتێکی رووسی زۆر خۆش بانگهێشت کرد. قەدری جان زۆر بە گلەیی بوو لە باڵی جەلالی کە چۆن ئەو کارەیان کرد و لەگەڵ حکومەتی بەغدا شەڕی میللەتی خۆیان دەکەن. قەدری جان کە شاعیرێکی لێهاتوو بوو پارچە هەڵبەستێکی لەسەر جەلالییان دانابوو کە هێشتا بڵاوی نەکردبۆوە داوای لە من کرد کە گەڕامەوە بۆ بەغدا بیدەم بە مام جەلال. جا هەر لە کافێ هاڤانا هەڵبەستەکەم کە قەدری جان خۆی

بـە ئەلفبـای لاتیـن نووسـیبووی منیـش هـەر بـە لاتیـن و بـە دەسـخەتی خـۆم لەسـەر پسـوولە کاغەزێـکا نووسـییەوە و تـا ئێسـتاش هەڵمگرتـووە کـە ئەمـە ئەلفبـا کوردییـە عەرەبیەکەیەتـی:

رووچکێ خوە رەش کرن
دلێ مە ژی ئێشاندن
ل مەمکێ دیبا خوە
خەنجەرا خوە کشاندن
ژ مەیدانا رووەتێ
مینا رۆڤی رەڤیان
ب چەکێن دوژمنێن خوە
خوینا برا رژاندن
شۆڕش بۆ وان نە خۆرت بوو
ب چوونا وان قەلس نابە
لێ ب ڤێ دووبەندیێ
دوژمن ب مە کەناندن
ئیرۆ بوونە گومگومۆک
پف دکن رۆنیا رۆژێ
مالا خوە کامباخ کرن
چرا خوە ڤەمراندن
ل دیرۆکا وەلات دا
ناڤ نیشانێ وان هەبوو
ژ شۆڕشا کوردستان
رووپەلێ خوە چڕاندن
هەر بژی شۆڕشا مە
شۆڕشا مە یێ بژی
بەرزانی و پێشمەرگە
هێڤیێ نوو ڤەژاندن

هەر لەو دانیشتنانەشا هەڵبەستێکی پڕ لە گازاندەی شاعیری گەورەی عیراقی الجواهری کە ساڵی 66 لە پراگ بۆ مام جەلالی نووسیبوو ئەوەشیان پیشان دام و من ئەوەشم بە دەستخەتی خۆم لەسەر پسوولە کاغەزێکا نووسییەوە. دیارە مام جەلال پێشتر نوکتەیەکی خۆشی بۆ الجواهری گێڕاوەتەوە کە ئەمیان زۆر بە دڵی بووە و کاتێ کە ئەم شیعرەی بۆ هاتووە نوکتەکەی مام جەلالیشی لەگەڵا تێکەڵ کردووە. مام جەلال دواتر خۆی نوکتەکەی بۆ ئێمەش دەگێڕایەوە و دڵی زۆر خۆش بوو بە شیعرە رەخنە ئامێزەکەی الجواهری کە ئەمەیانە:

شوقا جلال وكم بث وجدت به
عن كربة تسترق الروح تنفيسا
الفيت قلبي ما اشتد العناء به
بالذكريات من الاحباب مأنوسا
لقد حببتك حبا لا يليق به
حب المجاراة تمويها وتدليسا
اقصد جلال ولا تسرق وكن
حكما عدلا يميز شريرا وقديسا
كن خيزرانا طريا لا لكاسره هشا
وليس خشيب العود مأيوسا
حمار عيسى فويق النجم مربطه
فان تمثلت فاذكر ممتطى عيسى
ولا تفكر بمن هم دون حافره
ان الحمار لمظلوم اذا قيسا
فان تبالغ تزد منا ذوي لطف
لا يخلطون مع الرحمن أبليسا
وان تزاحف جحش صاد ارنبة
نزحف عليك بجحش صاد طاووسا
براغ 20\11\66

هەڵبەستەکە ساڵی 1966 دانراوە. ئەم دەقەی کەوا من لێرەدا بڵاوی دەکەمەوە هی ساڵی 1968ە و چەند وشەیەکی جیاوازە لەوەی کە کاک دکتۆر وریا عومەر ئەمین لە کتێبی "کردستان فی ضمیر الجواهری" ساڵی2015 بڵاوی کردووەتەوە ئینجا من نازانم کامە لەو وشانە ئەسلییەکەیە.

هەر لە شام خوێندکارێکی تری کوردی عیراقی لێ بوو، کاک نەوزاد لەتیف، کە چەند ئێوارەیەکی خۆشیشمان لەوێ پێکەوە بەسەر برد. بە پێشنیاری سامی و سالم فەیلی برای کە کڕیاری ئۆتۆمۆبیلی وەک ئەوەی من سپۆرت و جوان هەر لەناو کورە دەوڵەمەندەکانی بەیروتا دەست دەکەوێ بڕیارمان دا بیبەین لە بەیروت بیفرۆشین. لەوێ بە حەسرەتێکی زۆرەوە وابزانم بە 120دۆلار یان پاوەن فرۆشتمانە پیشانگایەکی ئۆتۆمۆبیلان و هەر لە بەیروتیشەوە گەڕامەوە بۆ بەغدا. ئەوها بوو حاڵی من لە بواری داراییەوە. بێ سەروبەر.

لەدوای کودەتاکەی 1968ی بەعسییان، ئەو دۆخەی نە شەڕ نە ئاشتی هەر بەردەوام بوو، تا ڕێککەوتنەکەی یازدەی ئاداری 1970. لەو دوو ساڵەدا حکوومەت بە جیاجیا پەیوەندی و ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕای بەردەوامی لەگەڵ هەردوو باڵی مەلایی و جەلالی بزووتنەوەی کورددا هەبوو و دەلەگاسیۆنی شاخ و بەغدا هاتوچۆی یەکترییان دەکرد.

## ئاهەنگی نەورۆزی 1969 لە بەغدا

لەو ساڵەدا حکوومەت مۆڵەتی دا بە کورد ئاهەنگێکی گەورەی نەورۆز لە هۆڵی خولد (قاعة الخلد) لە بەغدا بکرێت. بۆ ئەو ئاهەنگە کاربەدەستانی حکوومەت و حزبی بەعس و دیپلۆماتە بیانییەکانیش هەموو بانگهێشت کران. لەبیرمە کە نوێنەری حکوومەتی بەعس جەنەڕاڵ ساڵح مەهدی عەماش بوو، ژمارەیەکی زۆریش لە دیپلۆماتی بێگانە و عەرەب میوان بوون. ئەمن پێکەوە لەگەڵ تیپی موزیکاڵی سلێمانی، بە سەرپەرشتیی هونەرمەندی گەورە کاک ئەنوەر قەرەداخی، بۆ یەکەم جار گۆرانیی (جوانی بێناو)ی شیعری گۆرانمان بە ستایلێکی رۆژئاوایی زۆر سەرکەوتوو پێشکەش کرد و دەنگێکی زۆری دایەوە، چونکە ئەوە یەکەم جار بوو کە هونەرمەندێکی کورد ئەم ستایلە رۆژئاواییە بە ئامێری جازیشەوە بخاتە ناو هونەری گۆرانیی کوردییەوە، کە تا ئەوسا لەناو توێکڵی ئاوازی ترادیشناڵدا گیری خواردبوو. یادی بەخێر کاک شەوکەت رەشیدیش بە سەدای سۆزداری کلارینێتەکەی گۆرانییەکەی بە شێوەیەکی بەرچاو رەنگاندبوو. دواتر ئەم گۆرانییە جارەهای جار لە رادیۆی کوردی بەغدا و کەرکووک لێ دەدرا و لێ دەدرایەوە و ئێستاش بەو ستایلە لەسەر زاری خەڵکێکی زۆردا ماوەتەوە.

رووناکی حوسێنی عەلی ئاغا
هاوسەری هۆمەر بە 16 ساڵی

هۆمەر دزەیی و نەوزاد لەتیف لە دیمەشق 1968/10/30

وەستاوەکان لە ڕاستەوە: دووەم کەس قەدری جان و سێیەم هۆمەر دزەیی. لە چەپەوە: دووەم کەس مام جەلال - مۆسکۆ 1957

هۆمەر دزەیی و ئەنوەر قەرەداغی لە پاریس

کتێبەکەی دکتۆر وریا عمر
أمین لەسەر الجواهري

دەسنووسی هەڵبەستەکەی قەدری جان و ئەوەی الجواهري

## حمار عيسى

شوقا (جلال) وكم بثٌ وجدت به — عن كربة تسترقُ الروح تنفيسا

ألفيتُ قلبى ما اشتد العناء به — بالذكريات من الأحباب مأنوسا

لقد خَبَثُكَ حبا لا يليقُ به — حبُّ المجاراة تمويها وتدليسا

أقصد(جلال) ولا تُسرف، وكن حكما — عدلا يميز شريرا و قديسا

كن خيزرانا طريا لا لكاسر — هشا وليس خشيب العود مأيوسا (٨٣)

(حمار عيسى) فويقَ النجم مربطهُ! — فإن تمثلت فاذكر ممتطى عيسى

ولا تفكر بمن هم دون حافره..! — إن (الحمار) لمظلوم إذا قيسا

فإن تبالغ تجد منا ذوي نصف — لا يخلطون مع (الرحمن) إبليسا

وإن تزاحف بـ (جحش) صاد أرنبة! — نزحف عليك بجحش صاد (طاووسا)

براغ ١٩٦٦

هەڵبەستەکەی الجواهري لەسەر مام جەلال بە چاپکراوی کە چەند وشەیەکی جیایە لەوەی بە دەسخەتەکەی من

# بەشی 25

## ڕێککەوتنی 11ی ئادار

ساڵ سووڕایەوە بۆ 1970و ڕێککەوتنی 11ی ئادار لەنێوان حکوومەتی بەعس و سەرکردایەتیی شۆڕش بە ڕابەریی مەلا مستەفای بارزانی لە بەغدا ڕاگەیەندرا. کاک موحسین دزەیی برام لەم بارەیەوە دەڵێ: "جێگری سەرکۆماری عێراق، سەدام حوسێن، هاتە کوردستان و دوو شەو 9 و 10ی ئادار لای مەلا مستەفا لە ناوپردان مایەوە. لەوێ پێکەوە لەگەڵ مەلا مستەفا بەیاننامەکەیان واژۆ کرد. ئینجا دەلەگاسیۆنی کورد بە سەرۆکایەتیی کاک ئیدریس بارزانی ڕەحمەتی و کاک مەسعود بارزانی، گەیشتنە بەغدا و لەگەڵ سەرکۆمار ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر، ڕۆژی 11ی ئادار ڕێککەوتنەکەیان بەفەرمی ڕاگەیاند". ئەوسا ئەمن لە بەغدا بووم و بۆ ڕۆژەکانی پاشتر شەقامە سەرەکییەکانی بەغدا مۆنجەیان دەهات لە خۆپیشاندەرانی کورد و عەرەب، بۆ دەربڕینی خۆشیی خۆیان بەرامبەر بە ڕێککەوتنەکە. باڵی جەلالی، کە بەو پێکهاتنەی مەلا مستەفا و بەغدا کەوتنە هەڵوێستێکی لاوازەوە، بەڵام ژمارەیەکی زۆری ئەو باڵەش بەشدارییان لە خۆپیشاندانەکانی خۆشی لە شەقامەکانی بەغدا دەکرد. باڵی جەلالی بەوە رووزەرد بوون، چونکە ئەوەندەیان گوتبوو و نووسیبوو کە تا مەلا مستەفای بارزانی ڕێبەری شۆڕش بێ، کورد ناگات بە هیچ. کەچی بەیاننامەکە بۆ ئەو زەمانە پێ لێنانێکی فەرمیی حکوومەتی عێراق بوو بە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان، کە لە ماوەی چوار ساڵدا جێبەجێ بکرێت. بەپێی

کاک موحسین دزەیی، چارەسەریی کێشەی کەرکووکیشیان بۆ ماوەی ساڵێک دواخست، کە سەرژمێری لێ بکرێت و بەپێی ئەنجامەکەی بڕیاری لەسەر بدرێ. جا کاک موحسین دەڵێ بەغدا ئەو سەرژمێرەی هەر دوا دەخست و لەدواییدا هەر نەشیکرد، چونکە هەرچەندی فرۆفێڵیشیان دەکرد، دەیاندی ژمارەی کورد هەر زیاتر دەردەچوو.
بەپێی کاک کەمال محێدینیش، باڵی جەلالی بەپەلە لە کەرکووک کۆبوونەوە، کە کاک کەمال خۆیشی لەوێ بووە و دوای هەندێ ناکۆکی لە بیروباوەڕ و کەوتنەوەی دووبەرەکی لەسەر ئەوەی ئایا بەگەڵ مەلا مستەفا بکەونەوە یان هەر وەک ئۆپۆزیسیۆن بمێننەوە، بڕیار درا دواتر کۆنفەرانسێک ببەستن و ئەو کێشەیە لەوێ یەکلا بکەنەوە. جا کۆبوونەوەکەی کەرکووک بەیاننامەیەکی بە کەمێک پارێز و گلەییەوە دەرکرد، کە جەلالییەکان لەو ڕێککەوتنە پەراوێز کراون، بەڵام پیرۆزبایی و دەسخۆشانەشیان لە سەرکردایەتیی شۆڕش و حکوومەتی عێراق کرد. کاک کەمال دەڵێ، کە بەر لە بەستنی کۆنفەرانسەکە کاک فاخیر مێرگەسۆریی ڕەحمەتی، هاتوچۆیەکی زۆری ناوبژیکاری کرد و بەم جۆرە کە کۆنفەرانسەکەیان بەست، بڕیاریان دا بگەڕێنەوە بۆ ناو شۆڕش و تێکەڵ بە باڵی بارزانی ببنەوە. ئەوە بوو کە هەندێک لە سەرۆکەکانیان وەک برایم ئەحمەد و عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری گەڕانەوە و چوون لە شاخا لەنزیک چۆمان دانیشتن و پۆستی حزبی و سەربازییان بۆ دەستنیشان کرا. ئەوسا عەزیزی شێخ ڕەزا، نوێنەری شۆڕش بوو لە بەیروت. جا سەکردایەتیی شۆڕش بڕیاری دا مام جەلال ئەم پۆستە وەرگرێت و پێکەوە لەگەڵ کاک عەزیز کاری خۆیان لە بەیروت بکەن. حیلمی عەلی شەریف هەر لە بەغدا مایەوە.

دەنگۆش بڵاو بووبوەوە کە خودی مەلا مستەفا خۆی هەر لە بنەڕەتدا ڕازی نەبووبوو ئەو ڕێککەوتنە لەگەڵ بەغدا بکرێت، چونکە بە هیچ جۆرێ متمانەی بە حکوومەتی بەعس نەبووە. کاک موحسین

دزەیی لەم بارەیەوە دەڵێ: "مەلا مستەفا دەیگوت ئەمن یەک زەررە متمانەم بە حکوومەتی بەعس نییە، بەڵام لەبەر دوو هۆ ناچارم بە ڕێککەوتنەکە رازی بم، یەکەم چونکە ئێوە ئەندامانی سەرکردایەتی بە تێکڕای دەنگ لەگەڵ ڕێککەوتنداں و دووەمیش چونکە ئەوە یەکەم جارە بە فەرمی پێ لێنان بە حوکمی زاتی بۆ کوردستان دەکرێت".

دەشگوترا کە شای ئێرانیش ئەوەی نەدەویست، چونکە تەنیا مەبەستی ئەو لە پشتگرتنی شۆڕشی کورد لاوازکردنی عێراق بووە، بۆ ئەوەی ئێران بگاتە مرازی خۆی کە داپچڕاندنی بەشێکی (شەت ئەلعەرەب)ی عێراقی بوو لەگەڵ هەندێ ناوچەی تری سنووریی هەر لە کۆنەوە کێشە لەسەر، ئەمەیان لەلایەک و لە لایەکی تریشا ئێران و ئەمەریکا مەبەستیان بوو کێشە بۆ عێراق دروست بکەن، چونکە بەغدا تا دەهات دۆستایەتیی لەگەڵ مۆسکۆ پتەوتر دەکرد. ئەگینا شای ئێرانێ هەرگیز ئەوەی بۆ چاوی رەشی کورد نەکردووە کە کورد پێی بگا بە دەسکەوتێک . جا گوایا یەکێتیی سۆڤیەت گوشاری خستبووە سەر هەم مەلا مستەفا و هەم حکوومەتی بەعسیش کە پێک بێن. لە بەرژەوەندیی مۆسکۆدا بوو عێراق چەسپاو و سەقامگیر بێت و کوردیش بە مرازی خۆی بگات. هەر واش دەبوو ئەگەر حکوومەتی بەعس لەژێرەوە لەگەڵ کورد بە فێڵ نەبوایە. ئەوە بوو کە ئەندامە هێشتا مارکسییەکانی ناو سەرکردایەتیی پارتی، وەک نووری شاوێس و سامی عەبدولڕەحمان و دارا تۆفیق توانییان مەلا مستەفا و تەواوی سەرکردایەتیی پارتی و شۆڕش ئیقناع بکەن لەگەڵ بەغدا ڕێک کەون. جا بەم نابەدڵییەوە بوو و سوور دەشیزانی سەرناگرێ، کە مەلا مستەفا لەژێر گوشارێکی دوولایەنە (مۆسکۆ و حزبەکەی خۆی) شلی کرد و ڕێگای دا بەیاننامەی یازدەی ئادار واژۆ بکرێت.

## ئاهەنگی نەورۆزی 1970 له بەغدا

بە بۆنەی دەرکردنی بەیاننامەی یازدەی ئادار و ڕێککەوتنی کورد و عەرەبەوە، کوردەکان ئەم جارەیان ئاهەنگێکی زۆر لەوەی پار گەورەتری نەورۆزیان دیسان لە بەغدا لە (قاعة الخلد) ڕێک خست، کە من دیسان لەگەڵ کاک ئەنوەر قەرەداخی و گرووپی موزیکاڵەکەی و کۆرسێکی کچ و کوڕی خوێندکارانی کورد لە زانکۆی بەغدا، ئەمجارەیان گۆرانی (گوڵی خوێناوی)مان پێشکەش کرد. ئەم نمایشە بوو بە مایەی چەپڵە و فیکە فیکێکی دەستخۆشانە و دەمخۆشانەی بێ وێنەی ئامادەبووەکان، کە زۆرترایەتیان عەرەب و بیانی بوون نەک کورد. ئەمن بەم دوو گۆرانییەی کە لەو دوو ئاهەنگی نەورۆزەدا پێشکەشم کردن، ناوێکی بێ پێشینەم وەک هونەرمەندێکی نوێخواز پەیدا کرد. ئێستاش نەوەی ئەو ساڵانە هێشتا ئەم دوو گۆرانییە ستایل نوێیە بە یەکانێک لە خۆشترین ئاوازی مۆدێرنی گۆرانیی کوردی دادەنێن.

هەر لە ئەنجامی ئەو پێکهاتنەدا، کورد پۆستی ئاست بەرزی وەک وەزیر و باڵیۆز و چەندین پۆستی جۆراوجۆری تریشیان دەست کەوت و خەریکی دامەزراندنی دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمی بوون لەو سنوورەی کوردستان کە لەسەری ڕێک کەوتبوون. کاک موحسینی برام کرا بە باڵیۆزی عێراق لە پراگی پایتەختی چێکۆسلۆڤاکیا. ئەمنیش کە ماوەی سێ ساڵ بوو گەڕابوومەوە بۆ عێراق و زۆر بێزار بووبووم، بیری ئەورووپام دەکردەوە. جا کە بە خۆشم هەر لە کۆنەوە حەزم لە سیلکی دیپلۆماسی بوو، بەڵام پۆستی دیپلۆماسی بێ بڕوانامەی زانکۆ نەدەکرا بۆیە بیرم بۆ پۆستێکی کارمەندی لۆکاڵ (خۆجێیی) چوو لە ڤیەننا و داوام لە کاک موحسینی برام کرد واسیتەیەکم بۆ

بـکات بکرێـم بـە کارمەنـدی لـۆکاڵ بـۆ تەرجومـەکاری لـە باڵیۆزخانـەی عێـراق لـە ڤیەننـا، کـە (مالـک الیاسـري) برادەریشـم لـەوێ دامەزرابـوو. دەشـمزانی ئەگـەر بـەو پۆسـتە لـە شـوێنێکدا دابمەزرێـت، ئیتـر نەقڵیـش نابیـت بـۆ وڵاتێکـی کـە، چونکـە کارمەنـدی خۆجێیـی نەقـڵ ناکرێـت. بۆیـە وام بیرکـردەوە کـە ئـەوە باشـترین پۆسـتە بـۆ مـن. بڕیارەکـەم ئـەوە بـوو کـە دەسـتگیرانەکەم بگوازمـەوە و ئیتـر پێکـەوە لـە ڤیەننـا، لـە شـارە حەیاتەکـەی جارانـم دانیشـین.

هـەر واشـی لـێ هـات. ئەوسـا (عبدالکریم الشـیخلي) وەزیـری دەرەوەی عێـراق بـوو و کاکـە موحسـینم ئـەو داوایـەی لـێ کـرد کـە برایەکـی هەیـە چەندیـن زمانـی بێگانـە دەزانێـت و ماوەیەکـی زۆر لـە ئەورووپـا ژیـاوە، حـەز دەکا لـە باڵیۆزخانـەی عێـراق لـە ڤیەننـا بـە کارمەنـدی لـۆکاڵ بـۆ تەرجومـەکاری دابمەزرێـت. جەنابـی وەزیـر پیاوانـە یەکسـەر داخوازەکـەی کاک موحسـینی قەبـوڵ کـرد.

ئیتـر منیـش بـە ئۆفیسـی پەیوەندیـداری وەزارەتـی دەرەوەم ڕاگەیانـد، کـە بەتەمـای ژن گواسـتنەوەم، ئەگـەر بکـرێ بـا دەسـت بەکاربوونەکـەم لە ڤیەنـنـا بکەوێتـە سـەری پاییـز. هـەر واشـی لـێ هـات.

مەلا مستەفا بارزانی و سەدام حوسێن لە ناوپردان، کوردستان

مام جەلال و سەدام حوسێن لە بەغدا

سەرکۆماری چێکۆسلۆڤاکیا سڤۆبۆدا پێشوازی لە بالیۆزی عیراق لە پراگ موحسین دزەیی دەکات

# بەشی 26

## ژن گواستنەوەم و چوونمان بۆ ڤیەننا

لەبەر ئەوەی کە هەر لە منداڵیمەوە ئاشقی دابونەریت و کولتوور و فۆلکلۆری کوردی بووم، بۆیە هەر لەمێژ بوو لە خەیاڵی خۆمدا وام دانابوو ئەگەر رۆژێک ژنم گواستەوە، وا دەکەم ئاهەنگی رۆژی ژن گواستنەوەکەم بەپێی دەستووری کۆنی کوردەواری بێ. مەبەستم لە دەستووری کۆنی کوردەواری، لەم رووەوە ژنگواستنەوەی بە سواری وڵاخ بوو لەم دێ بۆ ئەو دێ. بەڵام چوون ماڵەبابی بووکێ و ماڵی ئێمەش لەگەڵ براکانم لە گوندەکانی خۆمان لە دەشتی دزەیی نەمابووین و لە هەولێر بووبووین بە شارستان، وام دانابوو کە بووک بچێتەوە بۆ گوندەکەی هەوەڵی ماڵەبابی، گوندی قەپران لە ناوچەی کەندێناوە، منیش بچمەوە لە گوندەکەی هەوەڵی خۆمان دووگردکان لە ناوچەی مرکیە (ملکیە) دانیشم و چاوەڕێی گەیشتنی کەژاوەی بووکێ بم، بە نەرمەغار و تەڕادانێی سوارئەسپان لەسەر ئاوازی فیقەی زوڕنا و رمبەی دەهۆڵ و تەقوتۆقی ماوزەڕ و جانبێزار و شەشاگران لە قەپرانەوە بیهێنن بۆ دووگردکان. ئەو زەمانە مەودای نێوان گوندی قەپران و گوندی دووگردکانیش بە سواریی وڵاخ نزیکەی دانە رۆژێک دەبوو. جا ئەم ئارەزووەم هەم بە ڕووناکی دەسگیرانم و هەم بە براکانم راگەیاند، کە دەمەوێ ئاهەنگی شاییەکەم بەم شێوەیە بێ. کاکە لە هەموو لایەکا لێم بوو بە هەرا و گاڵتە پێکردن! گوتیان کوڕە ئەوە دەڵێی چی! ئەتو شێت بووی، چما ئەوڕۆ هەموو کوردستان بکەیت چوار ئەسپت پێ پەیدا دەکرێ! کەی ئەم هەموو

ولاخه ماوه له كوردستان و لەپاشان پێت دەكرێ بەو هەموو میوانانه بلێیت برۆن ئەسپێك پەیدا كەن ئینجا وەرنە سەر شایی! گوتیان ئەتۆ هێشتا بە خەیاڵی رۆمانتیكی پەنجا ساڵ لەمەوپێش بیر دەكەیتەوە. ئیتر له هەموو لایەكەوە سەركۆنە كرام و رووناكی دەسگیرانم ئەویش گوتی بەو خوایە ئەمنیش لە قەپرانەوە بۆ دووگردكان سواری ولاخ نابم، چونكە هەموو جلەكانم و ماكیاجیشم لێ تێك دەچێ. ئیتر منیش ناچار بە داخ و دڵساردبوونەوەیەكی زۆرەوە شلم كرد، بەلام گوتیشم وەڵلاهی ئەمنیش تازە لێرە لە كوردستان هیچ ئاهەنگێكی شایی گواستنەوەكەم ناكەم، چونكە ئاهەنگەكانی شایی ئێرە نە شەرقینە و نە غەربینە، بوونەتە زرمۆدە، بۆیە بڕیارم داوە هەر یەكسەر بەبێ هیچ ئاهەنگێك بلێتی فرۆكە ببڕم و بڕۆین بۆ مانگی هەنگوین بۆ لای كاكە موحسینی برام لە شاری پراگ، كە لەوێ وەك باڵوێزی عێراق لە چێكۆسلۆڤاكیا دەستبەكار بوو. هەر واشم كرد.

هەر لە منداڵیشمەوە حەزم لە ناوی گوڵێكی سروشتی كوردستان دەكرد (رووناس) كە لە گۆرانییەكی كوردی زۆر كۆندا گوێم لێ دەبوو:

نازدار و نازدار
نازدارەی خاسی
پەرێ خەزێمێت
گورێ رووناسی
خۆ من زووم زانی
تۆ بۆ من خاسی

ئیتر بیرم كردەوە هەر نەبێ با ئەو حەزە كۆنەم بهێنمە دی، ناوی دەسگیرانەكەم (رووناك) بە رەسمی بگۆڕم بە (رووناس) و ئەگەر كچێكیشمان بوو ناوی بنێم (نازدار).

چووم بۆ ئۆفیسی (الاحوال المدنیة و الجنسیة) لە هەولێر ناوەكەیم گۆڕی و كە دواتر لە ڤیەننا نۆبەرەمان كچ بوو هەر بە یادی گۆرانییە

کۆنەکەوە ناوی ئەویشم نا (نازدار). ئەم دوو ئارەزووە کۆنەم هاتنە دی.

ئیتر من خەریکی خۆ ئامادەکردن بووم بە ژنەوە بڕۆین بۆ ڤیەننا، چونکە دەبوایە لە 1970/11/1لە باڵوێزخانەی عێراق لەوێ دەست بە دەوام بکەم. کەچی لەپڕێکا حەمەی برا گەورەی دەسگیرانەکەم کە ئەفسەری سوپای عێراق بوو و برادەری زۆر نزیکی منداڵیی خۆشم بوو، لێمان عیناد بوو کە نابێ خوشکەکەی ببەم بۆ دەرەوە. حەمە دەیگوت من عومەر دەناسم، ئەوە چەند ساڵە لە دەرەوەی وڵات ژیاوە، هەر خەریکی ژنان بووە و هەمیشە هەر چاو لەدەر بووە و هەر واش دەمێنێت. دەیگوت دوور نییە دوای رەنگە ساڵێک دەست لە خوشکەکەم بەردات و بۆمانی بنێرێتەوە. حەمە گوتبووی با عومەر نەڕوات بۆ دەرەوە و لێرە ماڵ دابنێ ئەوسا هیچ کێشەیەکمان نابێت. ماڵی ئێمە و ماڵی خۆیشیان هەوڵی زۆریان لەگەڵ حەمە دابوو "کوڕە داکت چا، بابت چا وا لەسەر سەفەرن، ئێستا وا لەپڕ ئەم عینادییەت لە چییە؟" بەڵام دیار بوو نەیسەلماندبوو. منیش کە ئەم هەواڵەم زانی زۆر تووڕە بووم و گوتم من پۆستێکی باشم لە ڤیەننا دەسکەوتووە، دەبێ سەری مانگ دەوام بکەم، کچەم دەدەنێ باشە، نامدەنێ من ناچارم بە تەنیا بڕۆم.

ئیتر لێرەوە لە هەولێرەوە تا ڤیەننا رۆژ بەرۆژ هەر چییەکی لەم بارەیەوە رووی داوە هەموویم لە دەفتەرێکدا یادداشت کردبوو، کە تا ئێستا هەڵمگرتووە. لێرەدا کۆپیی هەندێ لەو یادداشتانەم بە دەستنووسی خۆم، ئینجا بە تایپکراوی وا هەمووی بڵاو دەکەمەوە:

## بۆ پراک بۆ مانگی هەنگوین

### هەولێر 19.10.1970

ئەمڕۆ ئێوارێ کات 08:30 چووم بۆ ماڵی رووناس بۆ ماڵئاوایی کردن. پاش ئەوەی من و رووناس و دایکی لە دیوەخانەکە کۆبوونەوەیەکی کورتمان بۆ کرد، نەگەیشتین بە ئەنجام. ئەوە بوو کە من بە زوێری و ئەوان بە دڵشکاوی، ئیتر بەبێ خواحافیزی رۆیشتم. چوومەوە ماڵ بەتەنیا دانیشتم، چارەکێک ویسکیم خواردەوە، لە پاشان وریا هاتەوە و باسی خۆمم بۆ گێڕایەوە و پێم گوت کە سبەینێ دەڕۆم.

### 20.10.1970

ئەوەبوو کە ئەمڕۆکە زوو لەخەو هەستام و خۆم ئامادە کرد و بە کەسم نەگوت. ناردم تاکسیم بۆ هات و چوومە گەراجی بەغدا و بە کڕ و بێ دەنگی رۆیشتم بەرەو بەغدا، کات 09:30 بوو، بەڵام دوێنێ ئێوارەش و ئەوڕۆکەش زۆر کز و مات بووم، چونکە رووناسم بە گریانەوە بەجێ هێشتبوو.

## بەغدا 20.10.1970

کات 2ی پاش نیوەڕۆ گەیشتمە بەغدا، سەعدی و شلێر لە ماڵ بوون، بۆ سەعدیم باس کرد کە بۆ بە تەنیا ئەڕۆم. ئیتر هەتا ئێوارە سەعات 08:30 هەر وەک خۆم هەر مات و بەخەم بووم. کاتێ، جوانی ئەنوەر بەگ هات گوتی عومەر لە هەولێرەوە تۆیان داوا کردووە. کە چووم وریا بوو، گوتی سبەینێ لەگەڵ کاکم رووناس دێنین و دێن بۆ بەغدا. ئیتر بەتەواوی گۆڕام و گەشامەوە.

## بەغدا 21.10.1970

ئەمڕۆکە هەندێ ئیشوکارم جێبەجێ کرد و هەندێ شتم کڕی، ئیتر بۆ دەوری سەعات 3ی پاش نیوەڕۆ حەمەش لە هەولێرەوە هاتەوە بەغدا و گوتی کە ئەمڕۆ دێن. ئیتر سەعدی و حەمە چوون بۆ سینەما شلێریش خەریکی ماڵ پاککردنەوە بوو، خۆشم خەریکی خۆپۆشتەکردن بووم. ئێوارە کات 07:30 بە ترومبێلی مامم کانەبی هاتن. رووناس جلی کوردیی لەبەردا بوو. ئیتر دانیشتین و پاش حەسانەوەیەکی کورت من و رووناس و شلێر و وریا چووین (مەزگوف)مان بەڕادان دا و نەختێ بە ترومبێل پیاسەمان کرد. لەپاشان گەڕاینەوە ماڵەوە و نانمان خوارد، بەڵام ئەبوایە من تیلمە تیلمە ئێسقانی ماسییەکە دەربێنم، نەبادا ئەزیەتی رووناس بدا. لەپاشان جەمیل سەبری هات، ئێمە، من و کاکم و سەعدی و وریا و جەمیل پێکەوە دانیشتین و رووناس و شلێر و جوان و ئاوازیش لە تارمە دانیشتبوون. ئیتر لەپاشان من و رووناس لە تارمە ماینەوە و نەختێ قسەمان کرد. ئینجا رووناس چوو لە ژووری شلێر نووست و ئێمەش لەگەڵ کاکموان لە دیوەخانەکە.

## بەغدا 22.10.1970

ئەمرۆ من و رووناس زوو هەستاین. رووناس کراسی شلێری لەبەر کرد و بە ترومبێلی سەعدی چووینە لای خەیات. لەپاشان چووین بۆ شارع (النهر) و ناو بازاڕ هەندێ شتمان کڕی. نیوەڕۆ گەڕاینەوە کەس لەماڵ نەبوو و دەرگا داخرابوو، لەبەردەمی دەرگاکە دانیشتین هەتا شلێر هاتەوە، ئیتر مریشکمان خوارد. بۆ ئێوارە من و وریا چووین بیتاقە بکڕین و پارە بگۆڕینەوە، هەروەها شرووپڕ بۆ موحسین بکڕین. رووناس و شلێریش چوون بۆ شت کڕین. سەعات 9 چووین بۆ لای خەیات جلەکانمان هێنایەوە. ئیتر من و رووناس دەستمان کرد بە جانتا بەستانەوە. لەپاشان شەمەخان و ئەنوەر بەگ هاتن، ئەنوەر بەگ لەگەڵ کاکم و سەعدی لە دیوەخان ئەیانخواردەوە، سەعات 12 عومەری مام حوسێن و سلێمان هاتن کە کاکە و حاجیش لە ئوتێلن.

## بەغدا 23.10.1970

سەعات 03:45 لە خەو هەستام و ڕووناسم هوشیار کردەوە، ئیتر ئێمە بە ترومبێلی سەعدی ڕۆیشتین بۆ مەتار و جانتاکانمان کێشا (30 کگم)مان زیاد بوو، بەڵام بە بەلاش جێبەجێ کرا. لە مەتار دانیشتین هەتا کاکموان هاتن. ڕووناس کراسێکی سووفی سپی لەبەر بوو، ئەمن قاتێکی ڕەساسیی موقەلەم سپی. ئەوانەی کە هاتبوون بۆ مەتار ئەمانە بوون:

کاکم، سعدی، وریا، شلێر، کاکە، حاجی، عمر، سلێمان مهندس.

ئیتر خواحافیزیمان کرد و چووین لە ژووری مسافران دانیشتین، تەیارەکە سەعاتێک تاخیر بوو، لەو کاتە حەمە گەیشتە مەتار و هاتە ناو ژووری مسافران، باش بوو لامان دانیشت هەتا ڕۆیشتین. چاک بوو موەزەفێکی ختووتی جەوی کە دەماناسی، وای کرد کە لە دەرجەی یەکەم دانیشین، چونکە بە کاپتانی تەیارە چیکییەکەی گوت، کە برای سەفیری عێراقم لە پراگ. جگە لە ئێمە تەنیا کچێکی دی و پیاوێکی دیکەی تێدابوو. ئیتر کات 07:40 بە ئاسمان کەوتین. بەسەر حەبانییەدا ڕەت بووین. ئەمن هەموو شتێکم بۆ ڕووناس ڕوون ئەکردەوە. ڕووناس هیچ تێک نەچوو و زۆر تەبیعی بوو، سەعات 9 بە وەختی عیراق گەیشتینە شام. نیو سەعات لە مەتار ماینەوە، مەتارەکە زۆر خۆش و خاوێن بوو، ڕوناک گیزدانێکی پارەی کری بە (3 لیرە)، ئیتر سەعات 09:30 دووبارە فڕینەوە و بەسەر بەحردا تێپەڕین، زۆر جەزیرەی شاخاویمان دەهاتە پێش چاو، هی تورکیا بوون، ئیتر لێرەوە ناو تەیارەکە دەستی پێ کرد زۆر سارد بێ، بەتانیەیان داینێ لە خۆمان لوول بدەین، نزیکی ئیستانبوڵ لەبەر زۆر تەماشاکردنی بەحر هەردووکمان نەختێ گێژ بووین. ڕووناس زگی نەختێ دەستی بە ژان کرد.

## ئیستانبوڵ

گەیشتینە ئێرە، بەڵام نەیانهێشت لەناو تەیارە دابەزین، چونکە لە تورکیا نەخۆشیی کۆلێرا بڵاو ببووەوە. ئیتر بەم جۆرە 40 دەقیقە لەناو تەیارە ماینەوە و سحەتمان نەختێ چاکتر بوو. لەپاشان دووبارە کەوتینەوە ئاسمان بەرەو پراگ. خواردنی نیوەڕۆیان بۆ هێناین، بەڵام ڕووناس زۆر کەمی خوارد. ئەوی تر هەموو ئەمن خواردم. هەڵبەتا

لـە ڕێـگا سـەرمان پێـک وەنابـوو و خۆمـان لـە بەتانـی لـوول دابـوو، ئیتـر قسـەی خـۆش خۆشـمان ئەکـرد و مـن عـادەت و ئیتیکێتـی ئەورووپـام بـۆ ڕوونـاس بـاس دەکـرد.

## پراگ 23.10.1970

سـەعات 3ی وەختـی عێـراق (1ی پـراگ) گەیشـتین. لـە پەنجـەرەی تەیارەکـە سـەیرمان کـرد خەڵکـی پاڵتۆیـان لەبـەر بوو و دەسـتیان خسـتبووە نـاو گیرفانیـان و خۆیـان کـرژ کردبـووەوە. پرسـیمان گوتیـان دەرەجـەی گەرمایـی (6 +)ە، دیاربـوو زەوییـش تـەڕ بـوو و پێشـتر بـاران بـاری بـوو، چونکـە ئێمـە لەسـەر چیکۆسـلۆڤاکیا هـەر لەنـاو هـەوردا ئەفڕیـن. کـە دابەزیـن ئێمـە پاڵتۆمـان پـێ نەبـوو، بـەڵام زۆر سـەرما نەبـوو. کـە گەیشـتینە لای کۆنترۆڵـی پاسـپۆرت، کچێـک کـە سـەیری پاسـپۆرتەکەمانی کـرد گوتـی ترومبێلـی سـەفارەت وا چاوەڕێتـان ئـەکا.

لەپاشــان موحســن و کوڕێکــی ســەفارەتەکەی پەیــدا بــوون. زۆر هەوڵمـان دا کـە پـارە نەگۆڕینـەوە، بـەڵام 10 دۆلاریـان پـێ گۆڕینـەوە بـۆ هەردووکمـان بـۆ 1 ڕۆژ. ئینجـا چوویـن بـۆ ماڵـی موحسـن و ژوورێکیـان بـۆ سـاز کردیـن. لەپاشـان موحسـن چـوو بـۆ محەتـە میوانـی دەهاتـن، دوا بـەدوای ئـەوان دکتـۆر عەبدولرەحمـان قاسـملۆ هـات بـۆ لامـان. ئیتـر ئێـوارە ئێمـە زۆر مانـدوو بوویـن. ڕوونـاس هێشـتا زگـی بـاش چـا نەبووبـوو. لەگـەڵ موحسـن و میوانەکانـی دانیشـتین، لەپاشـان ئـەوان چوونـە دەرەوە، بـەڵام ئێمـە مانـدوو بوویـن نەچوویـن.

**پراگ 24.10.1970**

بەیانی هەر لە ماڵ بووین. وەختی نیوەڕۆ من و ڕووناس و دۆرینا و میلا چووین بۆ پیاسە و نەختێ گۆریەمان کڕی بۆ ڕووناس. بۆ خواردنی نیوەڕۆ لەگەڵ موحسن و میوانەکان چووینە ڕیستۆرانی (Albatros) کە بریتییە لە پاپۆڕێک لەناو زێ. لەپاشان گەڕاینەوە ماڵ، دکتۆر عەبدولرەحمان و خوشکە نەسرینی خێزانی هاتن بۆ لامان و گوڵیان بۆ ڕووناس هێنابوو و بۆ ئێوارە دەعوەتیان کردین بۆ ڕیستۆرانی (Monika) کە باندێکی Gipsy زۆر خۆشی لێ بوو. ئیتر ئەو ئێوارەمان وا ڕابوارد.

**پراگ 25.1.1970**

وەکو ڕۆژان لە خەو هەستاین و لەگەڵ موحسن قاوەڵتیمان (نانی بەیانی) کردەوە. ئینجا هەرسێکمان چووینە گەڕان لەناو شار. هەندێ شتمان کڕی بۆ ڕووناس. نیوەڕۆ هاتینەوە کابانەکە ماسی بۆ کردبووین. ئیتر من چووم محەمەد موهتەدی و حاجیم دیت. ڕووناس ژانەزگەکەی هەر مابوو، دەمانویست ئێوارە نەچینە دەرەوە، بەڵام موحسن گوتی دەبێ بچینە یالتا زۆر خۆشە.

**پراگ 26.1.1970**

محسن چوو بۆ دائیرە، من و ڕووناسیش چووین بۆ ناو شار هەندێ شتمان کڕی، نیوەڕۆ هاتینەوە (فازان)مان خوارد. سەعات 4 چووین بۆ سیرکوس (بوخارێست). ئێوارە چووینە (لوتسیرنا).

## پراگ 27.10.1970

بەیانی من زوو و ڕووناک زۆر درەنگ هەستا، جانتاکانمان ڕێک خست، موحسن لە دائیرە هاتەوە و نانمان خوارد و چووین بۆ محەتە. سەعات 02:50 بەڕێ کەوتین بەرەو ڤیەنا و جێگاکانمان زۆر خۆش بوون. ڕووناس قیتاری زۆر پێ خۆش بوو، لە ڕێگا دیمەنی زۆر جوان جوانمان ئەدی. لە فارگۆنەکە لەتەنیشتمان پیرەژنێک و پیرەمێردێک دانیشتبوون، هەر شتیان دەخوارد، کچێکی دیکەش هەبوو پانتۆڵ لەبەر، هەر قسەی لەگەڵ هەموو کەسێک دەکرد. لە مەتعەم دانیشتین، سەعات 08:30ی ئێوارە گەیشتینە ڤیەنا.

## ڤیەنا 27.10.1970

پێش هەموو شتێک، هەموو جانتاکانمان لە محەتە هەڵگرت. خۆمان نەختێ پارەمان لە محەتە گۆڕییەوە و چووین لە ئوتێل بگەڕێین. گەلێک گەڕاین هیچ نەبوو، لەپاشان (پانسیۆن اوستریام) بەبیر هاتەوە، تاکسیمان گرت و چووینە ئەوێ و جێگامان گرت، ژوورێکی دوونەفەری بە 176 شلن. لەپاشان چووین لای محەتەی فرانس یۆزێف نانمان خوارد. دووبارە ئەشیاکانمان بە تاکسی بردەوە پانسیۆن، بەڵام شەوی ئەوەڵ ژوورەکەمان زۆر سارد بوو، بەڵام شەوی دووەم پێمان گوتن و بۆیان گواستینەوە.

## ڤیەنا 28.10.1970

لـە خـەو هەسـتاین و لـە قاوەخانەیەکـی تەنشـت پانسـیۆنەکە نانـی بەیانییمـان خـوارد. لەپاشـان یەکسـەر چوویـن قاپووتمـان بـۆ هەردووکمـان کـڕی، لەگـەڵ ئەشـیای تـر.

ئـا لێـرەدا ئیتـر کۆتایـم بـە نووسـینەوەی ڕۆژ بـە ڕۆژی بیرەوەرییەکانـم هێنـاوە. لەبیرمـە کـە سـاڵی 1957یـش، کـە ئەوسـاش بـە شـەمەندەفەر لـە شـاری ڤینیسـیای ئیتاڵیـاوە گەیشـتمە ڤیەننـا و پێشـتر لـە ڕۆژی دەرچوونـم لـە عێـراق ڕۆژ بـە ڕۆژ هەموویـم یادداشـت کردبـوو، بـەڵام کـە گەیشـتمە ڤیەنـا ئیتـر لەوێـوە وەسـتام. ئەمجـارەش سـێزدە سـاڵ دواتـر دیسـان لـە عێراقـەوە تـا ڤیەنـا ڕۆژانـە هەموویـم دەنووسـییەوە و دیسـان کـە گەیشـتمە ڤیەنـا ئیتـر وەسـتام. مانگـی هەنگوینیـش تـەواو، ئیتـر ژیانـی نوێـی خێزانی و کاری ڕۆژانـەی فەرمانبـەری دەسـتی پـێ کـرد.

بـەڵام نامـەوێ شـارە جوانەکـەی پـراگ بەجـێ بێڵـم و چەند وشـەیەکی لەبارەیـەوە نەنووسـم. پـراگ و ڤیەنـا و بوداپێسـت سـێ لالەی درەوشـاوەی چراخانـی ئیمپراتۆراتـی ئەوسـترۆ - هەنـگاری بوون. شـارێکی پڕ لـە بناياتی مێژوویـی جـوان جوانـە و ڕووبـاری مۆڵـداو (بـە زمانـی چێکـی: ڤڵتاڤـا) بـە ناوەڕاسـتیا ڕەت دەبێـت، کـە کۆمپـۆزەری نـاوداری چێـک بێدریـچ شـمێتانا ئاوازێکـی زۆر دڵڕفێنـی بـۆ دانـاوە. وڵاتـی چێکۆسـلۆڤاکیای جاران ژمارەیەکـی زۆری لـە نووسـەر و هونەرمەنـدی لـە ئاسـتی جیهانـی لـێ هەڵکەوتـوون، هـەر بـۆ نموونـە: فرانـس کافـکا، کارێـل چاپێـک، میـلان کوندێـرا و ڤاتسـلاڤ هاڤێـل لـە بـواری ئەدەبیـات و ئانتۆنیـن دڤـۆرژاک، بێدریـچ شـمێتانا، گوسـتاف مالـەر و لێیـۆش یاناچێـک لـە بـواری موزیـکا.

## ڤیەننا پایزی 1970

چەند شەوێک لە پانسیۆن (ئەوستریا) ماینەوە، ئینجا دکتۆر وریا رواندزی، برادەری دێرینم پیرێژن و پیرەمێردێکی دەناسی و ژوورێکی لای ئەوان لە گەڕەکی نۆیەمی شار بۆ گرتین هەر لە نزیک وێستگەی شەمەندەفەری فرانس یۆزێف، کە لە پراگەوە هاتبووین لێی دابەزیبووین. تەلەفۆنم بۆ برادەرە عێراقییەکانی جارانی ڤیەنناشم کرد، وەک (مالک الیاسري، ایاد الیاسري و قاسم الگیلاني) و لەپاشان چووم بۆ باڵیۆزخانەی عێراقی و خۆم بە باڵیۆز (دکتۆر حمد دلی الکربولي) و تەواوی ستافە عێراقییەکان و کارمەندە نەمساوییەکانی باڵیۆزخانە ناساند. دکتۆر حەمەد یادی بەخێر، پیاوێکی رەشتاڵەی باڵابەرزی ئاکار جوان بوو، دکتۆرای بیرم نەماوە لە چی لە زانکۆیەکی ئەمەریکا وەرگرتبوو. لە بیروباوەڕی سیاسیدا زیاتر مەیلی ناسیۆنالیزمی عەرەبی هەبوو، بەڵام بێ توندڕەوی و بە گشتی پیاوێکی باشی بێ وەی بوو. ژنەکەیشی (أم وفاء) ئەویش ژنێکی خانمی زۆر جوانی هەمیشە دەم بە پێکەنین بوو. وەزیر مفەوەزێکیشمان هەبوو (عبدالملک الزیبک) ئەویش یادی بەخێر، پیاوێکی زۆر لیبراڵ و قسە خۆش بوو، نە بەعسی و نە قەومیی عەرەبی بوو، دیار بوو لەژێرەوە کوردیشی زۆر خۆش دەویست. بەداخەوە هیچ کارمەندێکی کوردی لێ نەبوو و ئەمن تەنیا کورد بووم لە ناویاندا.

ئیتر بەم جۆرە دەستم بە دەوامی خۆم کرد، بەڵام تا کاتی عەسر دەگەڕامەوە بۆ ماڵ رووناس هەر لە ماڵ دەمایەوە و نەدەوێرا بچێتە دەرەوە، نەوەک ون بێت، چونکە ئاڵمانیشی نەدەزانی. ماوەیەکیش لەو ماڵە ماینەوە، ئینجا ئەپارتمانێکمان لە گەڕەکی کاگران Kagran بە کرێ گرت، کە زۆر رێکوپێک و بە شێوەیەکی مۆدێرن راخرابوو،

بەڵام زۆر دوور بوو لە باڵیۆزخانە و تا من لە دەوام دەبوومەوە و دەگەیشتمەماڵەوە، ڕۆژ لەسەر زەردەی دەبوو. لەبەر دووریی شوێنەکە و مانەوەی ڕووناس بەدرێژایی ڕۆژگار بە تەنیایی لە ماڵەوە، دوای ماوەیەک دیسان گواستمانەوە، باش بوو ئەمجارەیان بۆ گەڕەکی یەکەم لە ناوەڕاستی شار و بەیانییان هەر بە پێ بە دە دوازدە دەقیقە دەگەیشتمە باڵیۆزخانە. ناونیشانی ئەو ماڵەم ئەمە بوو:Wien 1.Wallnerstrasse 2\3. ڕووناس چەند کۆرسێکی زمانی ئاڵمانی وەرگرت، سەرەتا لە ئەنستیتوی بێرلیتز Berlitz و لەپاشان لەقوتابخانەی زانکۆ بۆ زمان.

تا ساڵی 1974 لەم ماڵەماینەوە و ناوە ناوە سەردانی کاک موحسینی برامان دەکرد لە پراگ و دەچووینە بوداپێستیش. کە کاک شێرکۆ دزەیی ئامۆزامی لێ بوو. کاک موحسینی برام و کاک شێرکۆ و کاک مەحمود کانەبیی ئامۆزایانم، کە ئەمەی دواییان لە شاری میونیخ بوو لە ئەڵمانیا و کاک عزەددین دزەیی ئامۆزام، ئەویش لە ئینسبروک دەیخوێند، ئەوانیش زوو زوو سەردانی ئێمەیان دەکرد لە ڤیەننا. لەپاشان دوو خزمی تریشم سەربەست دزەیی و ئاوات دزەییش بۆ خوێندن هاتن بۆ بوداپێست و ئەوانیش بە سەردان دەهاتن بۆ ڤیەننا و ئیتر فەرامۆشییەک بوو بۆ هەموومان. شارەکانی بوداپێست، پراگ، میونیخ ئەمانە هەمووی نزیک بوون لە ڤیەننا، بۆیە هاتوچۆمان ئاسان بوو.

ساڵێکم لە ڤیەننا تەواو نەکردبوو کە لە هاوینی 1971 حەوێز ئاغای حاجی جوکل ئاغای ئامۆزام کە نازناوی شیعری (زانا)یە، چەند دێرە شیعرێکی بۆ ناردمە ڤیەننا، کە باسی هەندێ لایەنی بەزم و ڕابواردنی سەردەمانی جارانی کوردەواری تێدا کردبوو. کاک حەوێز بەو هەڵبەستەی، کۆنە برینی کولاندمەوە و لە وەراما منیش ئەم هەڵبەستەم بۆهات و بۆم ناردەوە بۆ هەولێر.

## دەردی دووری

هۆمەر دزەیی، ڤیەننا، تیرمەهی 1971

شیعرەکەت گەییە ڤیەننا ئەی برا نازدارەکەم
ئاگری بەردامێ باسی دەشت و کێو و شارەکەم
من لە دووریی نیشتمان و میللەت و دۆست و کەسان
دەردمەو جارێ بە (مەی) وا دەردەکەم تیمار ئەکەم
ئەی برای راوچی و تفەنگچیم، شارەزای ئاو و هەوا
پسپۆری (هات و نەهات)م، ئامۆزا شاسوارەکەم1
من لەسەر رووباری دانووب چاو ئەڕێژم وا بە کوڵ
بەڵکوو فرمێسکم بگاتە کەندێناوەی یارەکەم2
من لە قوتکەی کێوی (ئەڵپ)ا پڕ بەدەم بانگت ئەکەم
بەڵکوو دەنگم داتەوە ئەو دارەکەی بزمارەکەم 3
خۆ(گرۆس گلۆکنەر) ئەڵێی بوو کە لە چاو (بێژینگ بەسەر)4
بەس ئەمن هەر حەز لە کیژی سادە وو ساکار ئەکەم
چیم لە ئۆپرا یا لە مۆزارت، چیم لە گرینسینگ و لە مەی5
من تەمەنناى بەزموڕەزمی یەک شەوی رەشمار ئەکەم6
گەر حەمەسوور لێ بدا حەیران و مەیتەرخانەیێ7
سوارەکەی خۆتم، وەتەن، هەر پێشەبڕکێ و غار ئەکەم
"بەو خودایەی بێ شەریک و لامەکان و واحیدە"8
دوو قسەم پێ یە، بەڵام تۆ پێم نەڵێی فیشار ئەکەم9
کاتێ کە ستێک و شتێڵچە و شاتۆبریانێ ئەخۆم 10
بیر لە کفتەو نیسک و دۆینەو دۆغەوا و ساوار ئەکەم
کوانێ ئاسمانی شەوانی فێنک و ئەستێرەدار؟
کوانێ بەزمی گەوزەگەوزی لاو و کیژوکارەکەم؟
من لەسەر گردی دوگردکان گەر تەماشایێ بکەم11
پاکی دەشتی وەک بەهەشتی هۆزەکەم بەدیار ئەکەم

گردی پیرداودا! هەوارگەی باب و باپیرانی خۆم12
قەت نەڵێی من بێ وەفام و خاکەکەت ئینکار ئەکەم
با بچێ کاروانی جوانیم ئەمڕۆ بۆ هەر لایەکی
ئاخری خۆ هەر لەپای تۆیە دەیێخم بارەکەم
دەردی دووری پەککوو ناخۆشی! کوڕینە گوێ گرن:
من لەمێژە بە جیهاندا گەشتی گوند و شار ئەکەم
بەس کە ناوی کوردو کوردستان ئەبیسم ئەبمەوە
کۆرپە و و بۆ باوەشی دایکم گرین و زار ئەکەم
تەواو بوو

**پەراوێزەکان:**

1. حەوێز ئاغا جگەلە زەوقی شیعر و نووسین، بەم هەموو سیفەتانەشەوە بە ناوبانگە و بەڕاستی وەستایە: راوکردن، نیشان شکاندن، شارەزایی کەش و هەوا و ساڵی بە(هات و نەهات) واتا بۆ کشتوکاڵ، ساڵی بەباران یان کەم باران.

2. کەندێناوە یان (کەندی ناوە) کەندێکی گەورەیە کە بەناو دەشتێکی بە پیت و فەڕدا تێ دەپەڕێت و بەهەمان ناو ناسراوە و کەوتووەتە خوارووی شاری هەولێر. شیاوی باسە کە هاوسەرەکەی خۆشم لەدایکبووی گوندی قەپرانە لە ناوچەی کەندێناوە، بۆیە گوتوومە: کەندێناوەی یارەکەم.

3. دارەبزمارە: کۆلکەدارێکی کەس نازانێ هی کەینێیە لە کلکەی رۆژهەڵاتی چیای قەرەچووغ لە باشووری هەولێر، کە بە بزماری مرازخوازان بزمارڕێژ کراوە. جاران ئەو شوێنە سەیرانگای بەهارانی مەرداران بووە و لە گەلێ حەیرانا نێوی هاتووە. هەر بۆ زانیاری، ئەم دەستوورە لە زۆر کولتووری جیهاندا هەبووە. لە ڤیەننا لە ناوەڕاستی مەیدانی سەرەکیی ناوشار کۆلکە دارێکی ئەوها هەیە، کە هی تەمەنە ناوەندییەکانە و تا ئێستا بە جوانی پارێزراوە (شتۆک ئیم ئایزن Stock im Eisen).

4. گرۆس گلۆکنەر Gross Glockner: بەرزترین لوتکەیە لە زنجیرە

شـاخی ئەلپـی ئەمسـا و (بێزینـگ بەسـەر)یش بەرزتریـن لوتکـەی چیـای قەرەچووغـە.

5. گرینسـینگ Grinzing (بـە ئاڵمانـی گرینتسـینگ بەلێـو دەکرێـت): لـە سـەردەمانی کۆنـدا گوندێکـی نزیـک شـاری ڤیەننـا بـووە. ئێسـتا بووەتـە گەڕەکێکـی ئـەو شـارەو خانووەکانـی بـە تێکـڕای کووچـە و کۆڵانەکانیشـیەوە دەسـکاریی نەکـراون و هێشـتا هـەر سـیمای روسـتیکاڵی لادێـی بـە جوانـی پاراسـتووە. جا ئێسـتا ئـەو گەڕەکـە هەمـووی کـراوە بـە مەیخانـەی فۆلکلـۆری و بانـدی موزیکـی میللـی یـان هـی قەرەجـان، بەسـەر مەیئۆشـەکانا دەگەڕێـن و هـەر ئاوازێکـی بیانـەوێ بۆیـان لـێ دەدەن، یـان هـەر کەسـێ بیـەوێ خـۆی گۆرانـی بڵـێ باندەکـە یاوەریـی دەکات. ئەمـن ئێسـتاش هـەر جارێکـی بچمـە ڤیەننـا، بـێ چەندیـن ئێـوارە رابواردنـی گرینسـینگ ئـەو شـارە بەجـێ نایەڵـم و هـەر خۆیشـم گۆرانـی لەگـەڵ موزیسـیانەکانا دەچـڕم و کۆنـە برینـی هەڕەتـی لاویـم دێتـەوە سـوێ.

6. رەشمار: بە شێوەزاری ناوچەی هەولێر واتا رەشماڵ، دەوار.

7. حەمەسـوور: بەناوبانگتریـن هونەرمەنـدی ئامێرژەنـی میللیـی ناوچـەی هەولێـر بـوو. زوڕنـا و دووزەلە(چووزەلـە) و شمشـاڵ و بلوێـر و نـەی زۆر بـە وەسـتایی دەژەنـی. دۆسـتێکی زۆر نزیکـی خـۆم و بنەماڵەکانـی دزەیـی بـوو. مەیتەرخانـەش ئـەو ئـاوازە موزیکاڵەیـە کـە لـە کاتـی بووکگواسـتنەوەی بەسـواری وڵاخ بـە زوڕنـا لـێ دەدرا و سـوارەکانیش لەپێـش ماینـی بووکـێ لەسـەر ئـەو ئـاوازە هەڵپەڕێتـە بـە شـێوەیەکی هونـەری تەڕادانـێ و نەرمەغاریـان دەکـرد. سـواری چـاک ئەسـپی خـۆی بـەو ئـاوازە رادەهێنـا.

8. ئەم تاکە دێڕە هی فایەق بێکەسی شاعیرە.

9. فیشار: بە شێوەزاری هەولێر واتا فیشاڵ، خۆهەڵکێشان.

10. ئەمانە گشتیان ناوی خواردنی خۆش خۆشی گرانبەهای ئەوروپان.

11. دوگـردکان: گوندێکـە لـە دەشـتی دزەیـی بـە 25 کیلۆمەترێـک کەوتووەتـە باشـووری هەولێـر و شـوێنی لەدایکبوونـی خـۆم و هەمـوو خوشـک و براکانمـە. ئەمـن تـا تەمەنـی هـەژدە سـاڵیم لـەوێ گـەورە بوویمـە.

12. گردی پیرداود: هەر لە کۆنەوە گۆڕستانی بەرەبابی بایزاغای دزەیی بووە، بە 20 کیلۆمەترێک لە باشووری هەولێرەوەیە. ئەمڕۆ شوێنی ناشتن لەسەر ئەو گردە و لە لاپاڵ و دامەنیشی نەماوە، بۆیە زۆرترایەتیی دزەییەکان مردووەکانیان لەناو شاری هەولێر دەنێژن. بەڵام گۆڕستانی بنەماڵەی خودی خۆم هەر لە گوندی دوگردکانە.

هەر بە رێگای دکتۆر وریا رەواندزییەوە چەند خوێندکاری کوردم ناسی کە لە زانکۆی ڤیەننا دەیانخوێند: نەوشیروان مستەفا، فوئادی مەلا مەحمود، کەریم ئاغای پیرۆتی و دکتۆر عەدنان دۆغرەمەچی. نەوشیروان پێم وایە خوێندنی ماستەری لە رۆژنامەوانیدا دەکرد، کەریم ئاغا کە لە بنەماڵەی ئاغاکانی دێبوکریی موکریان بوو لە کۆلێژی پزیشکی بوو و ئێستا دکتۆرێکی زۆر سەرکەوتووە لە شارۆچکەیەکی نەمسا. فوئاد بیرم نەماوە چی دەخوێند و دکتۆر عەدنان دۆغرەمەچی.

دکتۆر ئومێد مەدحەت موبارەکیش بۆ خوێندنی چەند کۆرسێکی تایبەتمەندی هاتبووە ڤیەننا و لەگەڵ ئەویشا بووین بە برادەری نزیکی یەکتری.

## دکتۆر عەدنان دۆغرەمەچی

دکتۆر عەدنان دۆغرەمەچیش کە کوردپەروەرێکی زۆر دلسۆز بوو و ئامۆزای باب برای کەسایەتی ناسراوی تورکیا ئیحسان دۆغرەمەچی بوو ئەویش هاتبوو لە ڤیەننا چەند کۆرسێکی تایبەتمەندی بخوێنێ. شیاوی ئاماژەپێدانە کە ئیحسان دۆغرەمەچی کوڕی عەلی پاشای دۆغرەمەچی هەولێری بوو و ئەوانەش بنەماڵەیەکی کوردی ناسراوی هەولێرن و ئێستاش زۆر ئەندامی ئەم بنەماڵەیە هەر لە هەولێر دادەنیشن. عەلی پاشا لە سەردەمی عوسمانلی شارەوانی هەولێر بووە. ژمارەیەکی بەرچاوی ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە تێکەڵ بە بزووتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردیش بوون و ئەندامی حزبی هیوای ناسیۆنالیست و پارتی

دیموکراتی کوردستان بوون و شاعیری چاکیشیان بە زمانی کوردی و تورکمانی لێ هەڵکەوتووە. هەندێ لە کەسایەتییە تێکۆشەرەکانی ئەو بنەماڵەیە ئەمانەن: جەبار ئاغای کانی (شاعیر)، ئەحمەد کانی نەوەی جەبار ئاغای کانیی شاعیر ئەندامی ئێستای سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان، دکتۆر قەرەنی دۆغرەمەچی (سەدام ئیعدامی کرد)، عبدالرزاق دۆغرەمەچی برای قەرەنی، دکتۆر هاشم دۆغرەمەچی، ئازای کوڕی دکتۆر هاشم دۆغرەمەچی، دکتۆر عەدنانی حەمەد ئاغای دۆغرەمەچی و زۆری دیکەش. لەناویانا ئیحسانی کوڕی عەلی پاشای دۆغرەمەچی لە کۆتایی سییەکان یان سەرایی چلەکانی سەدەی رابردوو بۆ خوێندن دەچێتە تورکیا و لەوێ لە کوردبوونی خۆی هەڵدەگەڕێتەوە و خۆی بە تورک دەناسێنێ. بەڵام وەک کە لێی دەگێڕنەوە لە تورکیاش پیاوێکی زۆر رۆشەنبیر و عالی جەناب و خاوەن قۆناخ بووە و زۆرێک لە سەرانی بزووتنەوەی کوردی باشووری بۆ ماڵی خۆی لە ئانکەرە بانگهێشت دەکرد وەک کاک مەسعود بارزانی و مام جەلال و کاک کۆسرەت رەسول. کاک موحسین دزەیی براشم دەڵی کە دووجار سەردانی کردووە لە ئانکەرە. مام جەلال و کاک موحسینی برام دەیانگێڕایەوە کە هەر جارێکی شاندێکی کوردی سەردانیان بکردایە ئەو بەبیری دەهێنانەوە و لێی دەپرسین " ئەرێ ئێستاش لادێیەکانی ناوچەی هەولێر بە هەولێرییە شارستانییەکان دەڵێن: هەولێری بە مریشکە کورکەکی ناوێری؟". دۆغرەمەچی زانکۆیەکیشی لە تورکیا کردبووەوە بە ناوی (بیلکەنت ئونیڤەرسیتەسی Bilkent Universitesi) و لە شاری هەولێریش کۆلێژێکی بەناوی (بیلکەنت ئەربیل کولێژ Bilkent Erbil College) کردەوە. کۆمپانیاکەشی (Ihsan Dogramaci Foundation) بە رێگای مام جەلالەوە بەشداریی لە بەشێکی پرۆژەی دروستکردنی زانکۆ نوێکەی سلێمانیدا کرد کە کۆمپانیای ئازای دکتۆر هاشم دۆغرەمەچیش پشکی تێدا هەبوو.

جا لە ڤیەننا سەرەڕای جیاوازیی بۆچوونی سیاسیشم لەگەڵ

نەوشیروان و فوئادی مەلا مەحمودا، بەتایبەتی لەگەڵ نەوشیروان کە دوای ساڵی 66 من دڵم لە جەلالییەکان سارد ببوەوە و ببووم بە مەلایی بەڵام هێندەی نەبرد بووین بە برادەری زۆر نزیکی یەکتری و هەمیشە چ لە لۆکاڵێکا چ لە ماڵی من دانیشتنی خۆش خۆشمان دەکرد. لێرەدا بە پێویستی دەزانم هەڵوەستەیەکی کورت لەسەر هەندێ لایەنی کەسایەتی کاک نەوشیروان بکەم کە پێنج دانە ساڵ لە ڤیەننا پێکەوە بووین.

## نەوشیروان مستەفا

ئەو کاک نەوشیروانەی کە من لە ماوەی پێنج ساڵ دۆستایەتییەکی نزیک لە ڤیەننا ناسیبێتم (1970 - 1975) کوردپەروەرێکی لەخۆبوردووی زۆر پەرۆشی پرسی کورد بوو. ئەوسا جەلالییەکی چەپڕەوی زۆر توندڕەو، زۆر زیرەک و سەرنج ورد بوو. نەوشیروان هەرچەندە کە لە شیکردنەوە و لێکدانەوەی کێشە و ڕووداوانی کوردی و نێونەتەوەییدا زۆر زانیار و ئاگادار و ڕۆشەنبیر بوو کەچی لەقسەکردنیا لەگەڵ خەڵکا ئەگەر بیروڕای بەرامبەرەکەی بە دڵ نەبوا زۆر نادیموکرات، زۆر قسە ڕەق و هەندێ جار دەیگەیاندە ڕادەی سووکایەتی پێکردن و ڕک و کینەشی لەدڵی خۆیدا بۆ هەڵدەگرت. ئەو ئەوسا ئەوهابوو کە من لە ڤیەننا برادەری بووم. نەوشیروان شارەزاییەکی چاکیشی لە شیعر و ئەدەبیاتی کوردی و زمانەوانیشا هەبوو. زمانی ئاڵمانی لە نەمسا زۆر زوو فێر بوو. من خۆیشم کە شیعرم دەنووسی جارێکیان یەکێک لە هەڵبەستەکانم بەو پیشان دا کە بۆ گۆرانیم دانابوو و حەزم کرد بەر لە تۆمار کردنی بیروڕای ئەویش بزانم. هەڵبەستەکەم کە تایتلی (یادی جاران)م بۆ دانابوو بە گۆرانی (چەندی گەڕام لە شاران) ناوبانگی دەرکرد. نەوشیروان ئەگەر ڕای لە شیعری شاعیرێک نەبوایە وە نەبێ تێ بینیی خۆی بەنەرمی تێ بگەیەنێت بەڵکو هەر یەکسەر

بە شکاندنەوەی نووسەرەکەی کاردانەوەی دەبوو. ئەو شیعرەی منی زۆر بە دڵ بوو. پێنج ساڵی زۆر خۆشمان لە ڤیەننا بەسەر برد. جارێکیان فازیلی مەلا مەحمودی برای فوئاد بە سەردان هاتە ڤیەننا و ئێوارە موزیکاڵێکی تا درەنگانی شەومان لەماڵەکەی من لە (ڤالنەر شتراسە Wallner Strasse 2) رابوارد. فازیلیش یادی بەخێر کە دواتر لەگەڵ دکتۆر قاسملو هەر لە ڤیەننا شەهید کران ئەویش دەنگێکی زۆر خۆشی هەبوو لە گورانی گوتنا.

ژمارەیەکیش لە کوردانی رۆژئاڤا ئەوانیش لە ڤیەننا دەیانخوێند. هەر لەو چەند ساڵەشدا سێ دکتۆری کورد بە جیاجیا لە هەولێرەوە هاتنە ڤیەنناو بۆ ساڵێک کۆرساتی تایبەتمەندییان وەردەگرت: دکتۆر محەمەد شێخۆ، دکتۆر خالید دزەیی، دکتۆر سەرسۆر دزەیی یادیان بەخێر هەرسێکیان.

مام جەلالیش ساڵی 1973 بۆ چەند رۆژێک سەردانێکی ڤیەننای کرد و لای من لە ماڵەکەی خۆم دابەزی. هەرچەندە کە من بشبووم بە مەلایی بەلام مام جەلال لەگەڵ منا هەرگیز کێشەی مەلایی و جەلالیی نەبوو و سیاسەت پەیوەندیی برایەتیمانی هەرگیز شێلوو نەدەکرد و لەگەڵ مام جەلالا بەراستی یەکتریمان خۆش دەویست. ئاخر پەیوەندیمان دەگەڕایەوە بۆ ساڵی 1948. ماڵەکەم بریتی بوو لە ژوورێکی خەوتن و ژوورێکی دانیشتن کە قەنەفەیەکی لێ دەشکایەوە دەبوو بە تەختی نووستن. هەرچەندی خۆم و روناسی هاوسەرم تکامان لە مام جەلال کرد ژووری نووستنەکەی خۆمانی بدەینی رازی نەبوو و هەر لەسەر لاتەختەکەی ژووری دانیشتن دەنووست. یادت بەخێر مام جەلالی قسەخۆشی ئێسک سووک. لەم مەینەت و تەنگژەی کە ئەمڕۆ کوردی تێ کەوتووە پێویستی زۆرمان بە تۆ هەبوو.

مام رەشید عارفی کۆییش کە هەمیشە مانگەکانی هاوینی لە ڤیەننا بەسەر دەبرد لەگەڵ ئەویشا پەیوەندیم هەر لە کۆنیشەوە زۆر نزیک و توند بوو. پێم وایە لە پێشووتری ئەم نووسینانەم باسی مام رەشیدم

کـردووە و باسـی بەسـەرهاتێکی کورتـی گرژیشـم کـردووە لـە نێـوان مـام رەشـید و کاک نەوشـیروان کـە هەموومـان لـە مەیخانـەی بەناوبانگـی ئۆگوسـتینەر کێلـەر Augustiner Keller لـە گەڕەکـی یەکەمـی ڤیەننـا میوانـی مـام جـەلال بوویـن. هەمـوو ئەوانـەی کـە لـەو دانیشـتنەدا بوویـن مـن نەبێ کەسـیان نەمـاون یادیـان بەخێـر: مـام جـەلال، مام رەشـید عارف، دکتـۆر وریـا رەوانـدزی، نەوشـیروان مسـتەفا، فوئـادی مـەلا مەحمـود.

جارێکیـان کاک دکتـۆر نەجـم قۆجـە قەسـاب کـە جێگـری وەزیـری پیشەسـازیی عیـراق بـوو ئەویـش بـە سـەردانێکی رەسـمی هاتـە ڤیەننـا. دکتـۆر نەجـم کـە لـە بنەماڵەیەکـی ناسـراوی هەولێرە لـە قۆناخـی خوێندنی ناوەنـدی و دوا ناوەنـدی بـرادەری دکتـۆر کاک ئەنـوەری بـرام بـوو لـە هەولێـر یادیـان بەخێـر هەردووکیـان نەمـاون. جـا ئێوارەیـەک مـن و روناسـی هاوسـەرم دکتـۆر نەجممـان بـۆ نانـی ئێـوارە بـرد بـۆ رێسـتۆرانتی هەنـگاری بەناوبانـگ لـە ڤیەننـا (چارداش فیورسـتین Czardas Frstin) کـە باندێکـی موزیکاڵـی زۆر خۆشـی gypsy قەرەجـی هەنـگاری لـێ بـوو. دکتـۆر نەجـم ئـەو شـوێنەی یەکجـار زۆر پێخـۆش بـوو و سوپاسـی زۆری کردیـن. کـە مـن و روونـاس لـە سـەردانێکی دواترمـان گەڕاینـەوە بـۆ بەغـدا دکتـۆر نەجـم و یاسـەمین خانـی هاوسـەری ئێوارەخوانێکـی زۆر خۆشـیان لـە نایـت کلەبـی نـاوداری (عبداللـه) لـە بەغـدا بـۆ سـاز کردیـن.

رووناس هاوسەری هۆمەر لە باخی ئاژەڵان لە ڤیەننا ساڵی 1971

رووناس هاوسەری هۆمەر، سەرەتای هەشتاکان

لە راستەوە: کاکە سەعدی برام ، کاکە ئەحمەدی برا گەورەمان ، خۆم هۆمەر، کەرکوک سەرەتای پەنجاکان.

حەمەی حوسێنی عەلی ئاغای دزەیی
ژنبرای هۆمەر

هۆمەر دزەیی لای داری مرازان (دارە بزمارە) لە
کلکەی رۆژهەڵاتی چیای قەرەچوغ

سەرکۆماری چێکۆسلۆڤاکیا سڤۆبۆدا پێشوازی لە باڵیۆزی عیراق موحسین دزەیی برای هۆمەر
دەکات ، پراگ ، 1970

هۆمەر لەگەڵ راوکەر و نیشانشکێن و کەشناس و شاعیر حەوێزاغای جوکل ئاغای دزەیی ئامۆزای

هۆمەر لە نێوان دوو برادەری دێرینی عیراقی : برایان أیاد الیاسري و طالع الیاسري لە ڤیەننا

هۆمەر دزەیی و قاسم الگیلاني برادەری لەگەڵ دوو کچی دۆستیان کە خوشکن، ڤیەننا 1957

لە چەپەوە: دکتۆر نەجم قۆجە قەساب، ڕووناس دزەیی هاوسەری هۆمەر و هۆمەر دزەیی. ڤیەننا ڕیستۆرانتی هەنگاری بەناوبانگ (چارداش فیوریستین) سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو

هۆمەر دزەیی و برایم دزەیی ئامۆزای لە پێش دارە
ژمارەی ڤیەننا (بە ئاڵمانی شتۆک ئیم ئایزن). هاوینی
2017

هۆمەر دزەیی لەبەردەم مەیخانەی بەناوبانگی
ئۆگوستینەر کێلەر کە مام جەلال لەوێ بانگهێشتی
کردبووین. ڤیەننا 1973

هۆمەر دزەیی و مالک الیاسري برادەری، ڤیەننا 1958

باڵیۆزی عیراق لە ڤیەننا د. حمد الکربولي و (أم وفا')ی هاوسەری پێشوازی لە هۆمەر دزەیی
و روناسی هاوسەری دەکەن لە میوانداری بە بۆنەی ساڵیادی شۆڕشی بەعسی عیراق. ڤیەننا

له راستەوە: عیسمەت شەریف، ڕەشید عارف، هۆمەر دزەیی و وریا ڕواندزی، ڤیەننا 1958

یەکەم ساڵیادی لەدایکبونی نازدار له راستەوە: نەوشیروان مستەفا، هۆمەر نازداری له باوەشایە، رووناسی هاوسەری هۆمەر، وریا رەواندزی، فوئادی مەلا مەحمود. ڤیەننا ماڵی هۆمەر 1974

له چەپەوە: پەخشان خان هاوسەری دکتۆر عومەر، دکتۆر عومەر حەمەد کە وەک خۆم خەڵکی گوندی دووگردکانە و ئێستا دکتۆرێکی زۆر سەرکەوتووە لە ڤیەننا، هۆمەر دزەیی، دکتۆر کەریم پیرۆتی، یوهانای هاوسەری دکتۆر کەریم. راڤنسبورگ ماڵی دکتۆر کەریم هاوینی 2017 .

له چەپەوە: هۆمەر دزەیی، ڕووناس خانی هاوسەری، دکتۆر عەدنان دۆغرەمەچی و کچێکی دۆستی. ڤیەننا سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو.

کۆمپۆزەری گەورەی چێک ئانتۆنین دڤۆرژاک
1904 - 1841

نووسەری گەورەی چێک فرانتس کافکا
1924 - 1883

ماڵەکەی گەڕەکی یەکەمم لە ڤیەننا (ڤالنەر شتراسە) کە مام جەلال لێرە بۆ ماوەیەک میوانم بوو.

کۆمپۆزەری گەورەی چێک بێدریچ شمێتانا
1884 - 1824

## بەشی 27

### مەرگی حوسێنی عەلی ئاغای ئامۆزا و خەزوورم لە دایکبوونی یەکەم منداڵمان، نازدار

بێ ئاگا لە مەرگی لە ناکاوی باوکی رووناس هاوینی 1972 بە سەردان گەڕاینەوە بۆ عیراق بەڵام چیمان بیست و چیمان دی؟ کە گەیشتینە بەغدا عومەری مامم حوسێنی مەلای کە لە هەولێرەوە بە پیرمانەوە هاتبوو لە پەناوە بێ ئەوەی رووناس هەستی پێ بکات پێی راگەیاندم کە کاک حوسێنی عەلی ئاغای ئامۆزا و خەزوورم لەو چەند رۆژانەی دوایی لە ئەنجامی نەخۆشییەکی کورت کۆچی دوایی کردووە. بە تەواوی کۆستم کەوت و نەمزانی چۆن فرمیسکی گورو گەرمم لە روناس بشارمەوە کە دووگیانیش بوو. باش بوو چاویلکەی رەشم پێبوو و بەوە چاوە پڕ لە گریانەکانم لە روناس شاردەوە تا گەیشتینە کەرکوک و لە ماڵی دکتۆر عومەر دزەیی لامان دا و نانی نیوەڕۆمان لەوێ خوارد بەڵام بەوانیشمان گوت کە بە روناس نەڵێن باوکی نەماوە. منیش کە چاوەکانم بە ئەشکی خوێناوی سوور هەڵگەڕابوو گوتم گەرمای عیراق کاری خراپی کردۆتە سەر چاوم بۆیە وا سوور هەڵگەڕاوە. هەرچۆنێکی بێ گەیشتینە هەولێر و روناسمان لە ماڵی باوکی دانا و بوو بە گرین و زارین و منیش چووم بۆ دیوەخانی کاک ئاغای مامم جوکل کە پرسەکە هێشتا مابوو و خزمەکان هەموویان لەوێ بوون. لەوێ تێر تێر بە دەسلەملانەی کاک حەمە و کاک سەعدی کوڕەکانی و لە باوەشی کاک فارس و کاک عومەر و کاک تایەری برایانی و باوەشی کاک ئەحمەدی

کاکم پێکەوە گریاین و دەستم لە ملی مامە عەلیم باوکی کاک حوسێنیش کرد و لەگەڵ ئەویشا کوڵی دڵم زیاتر جۆشی دەسەند. کاک حوسێن هەر لەساڵانی منداڵیمەوە خۆشەویسترین ئامۆزام بوو و ئەو هەوینەم بۆ هونەر کە بە زگماک لە ناخمدا روابوو کاکە حوسێن بە زەوقی هونەرمەندانەی خۆی بۆ حەیران و گۆرانی هێندەی تریشی خستبووە سەر. هەرگیز بە خەیاڵمدا نەدەهات مەرگی رەش تۆماری ژیانی ئەو پیاوە هەم بە روخسار هەم بە بەژنوباڵا جوان هەم بە دەنگو سەدای هەستبزوێنی حەیرانەکانی ئەوها لەپڕ بپێچێتەوە. جارێ زوو چووم سەعاتەکەی دەستی و ئەنگوستیلە زێڕەکەی کە کەسوکاری بەخێر دابوویانە مەلای قورئانخوێن ئەمن لەباتیان پارەم دایێ و شتەکانم لێ وەرگرتەوە کە تا ئێستاش هەڵمگرتوون. ئەو چەند پسوولە کاغەزەی کە لە گیرفانی مرادخانییەکەیدا بوون دیاربوو یەکێکیان وەسڵی شارەوانی هی پارەی کارەبا بووە ئەوانەشم لای خۆم هەڵگرت کە تا ئێستا بۆ مێژوویەکی وەک ئەمڕۆ پاراستوومن.

هەزار رەحمەت لە گۆڕت بێ کا حوسێنی شۆڕەسوار، جوان رووخسار، دەنگوسەدا خۆشی هونەریار.

بە تەلەفۆن لەگەڵ باڵیۆزخانەی عیراقی لە ڤیەننا مۆڵەتەکەم بۆ مانگێک درێژ کردەوە ئینجا دوای سەردانی خزمەکانی ترم بە دڵشکاوی گەڕاینەوە بۆ ڤیەننا.

## نازدارمان بوو

لەدایکبوونی منداڵی یەکەممانم تا ماوەیەک رۆژ بە رۆژ لە دەفتەرێکا تۆمار کردووە. بەڵام لەبارەی لەدایکبوونی منالەکانی دواترێم زۆر کەمترم یادداشت کردووە چونکە لەدایکبوونی منداڵی یەکەم رووداوێکی زۆر نویێ یە بۆ هەموو باوانان. جا فەرموون لەگەڵ یادداشتە رۆژانەکەی لە دایکبوونی یەکەم منداڵم، نازدار، وەک خۆی کە 44 ساڵ لەمەوبەر رۆژانە بەدەستی خۆم لە دەفتەرێکا تۆمارم کرووە و لەتەکیشیا بە تایپ کردن دووبارەم کردۆتەوە. بەڵام زۆر لەگوینە کە خوێنەری بەرێز ئەم وردەکارییە رۆژانەی لەدایکبوونی منالەکانمی ئەوەندە لا گرنگ نەبێت ئەوسا زۆر ئاساییە لەسەری باز بدات. ئەم وردەکارییە بۆ خۆم و بە تایبەتی بۆ منالەکانم گرینگە چونکە ئاوێتەی ساڵانێکی گرینگی ژیانیانە کە دوور نییە لە پاشەرۆژا سوودئاوەر بێ بۆیان.

نازدار بوو

28/1/1973

ئەمرۆ بەیانی سەعات 7 لە خەو هەستاین و من تەلەفۆنم بۆ پرۆفیسۆر گیک کرد و تێم گەیاند. گوتی برۆن بۆ خەستەخانە، ئێمەش بەکاوەخۆ نانمان خوارد و خۆمان خرر کردەوە و سەعات 9 چووینە خوارێ تاکسیمان گرت. دنیا لەبن بەفر بزر بوو. درجەی حرارە - 2 بوو. چووین بۆ خەستەخانە روناکیان نواند. منیش تا دەوری سەعات 11/30 لەوێ بووم. لەپاشان گەرامەوە ماڵەوە. بە تەنها بووم زۆر بێ تاقەت بووم وە غەریبیم هەستا. نەختێ گوێم دا گۆرانی کوردی. لەپاشان سەعات 2 دووبارە چوومەوە بۆ خەستەخانە، بەفر نم نم دەهاتە خوارێ. لەبەر دەمی خەستەخانە چەند رەسمێکی ئەو

جێگایەم گرت روناکی تیا نووستبوو. لەپاشان چوومە لای روناک، لای دانیشتم چەند رەسمێکم بۆ گرت. ئینجا دووبارە گەڕامەوە ماڵەوە بنووم چونکە شەوی پێشتر شتاقمان نەنووستبووین. دەوری سەعات 5/30 دکتۆر کوند تەلەفۆنی بۆ کردم کە کچێکی تەندروستم بووە، وە بە دایکەوە هەردوک سحەتیان زۆر باشە. ئیتر زۆر دڵخۆش بووم کە بە سەلامەتی بوو. لە دەرەوە بەفروباران بە تێکەڵاوی بەڵام زۆر ورد ورد ئەباریـن درجە 2 + بوو. ئیتر تەلەفۆنم بۆ دکتۆر وریا و برادەرە کوردەکان و عیراقیەکان کرد. لەپاشان برهان تەلەفۆنی بۆ کردم و سەعات 15/8 چووین بۆ خەستەخانە و نازدارمان دیت و چەند رەسمێکمان پێکەوە گرت. نازدار بۆ منالێکی تازە لەدایک بوو کە عادە زۆر ناشیرین ئەبن وا نەبوو، راستە رەنگی هێشتا شین و مۆر هەڵگەڕابوو بەڵام ئەندامی زۆر جوان بوون تەنها کەپووی نەختێ گەورە بوو ئەگینا پرچێکی پرر و رەش، چاوی درێژ و باویانی، هەرچەندە کە هێشتا بەڕاستی رەنگی چاوی ساغ نەبوبۆوە، دەموچاوی درێژۆکانی و چەناگەی چاڵ و دەمیشی ناشیرین نەبوو، رومەتی زۆری مووی رەشی پێوە بوو. بەڵام بە کوردی ئەڵێن کەپوو درۆزنە، وە من شلێرم دێتەوە بیر کە تازە بوبو بەتەواوی هەمان شت بوو، لەبەر ئەوە دڵنیا بووم کە نازداریش جوان ئەبێ. چاوی کردبۆوە بە هەموو دەورێکا ئەیگێڕا و جارێکیش زەردەخەنەیەکی لا ارادی بەسەر دەما هات وەکو بڵێی دالغەی لێ دا بێ لەبەر خۆیەوە وا بوو. هەڵبەتا دەمیشی هەر ئەجولاندەوە و مرچە مرچی ئەهات. لە کات 5/15 پاش نیوەڕۆ بوبوو. قورسایی 3 کغم و درێژی 5/48سم بو.

29/1/

ئەمڕۆ لەبەر ئیش زۆر درەنگ چووم بۆ خەستەخانە 5/30، لەگەڵ فوئاد و نەوشیروان و عەدنان پێکەوە چووین، فوئاد و نەوشیروان سەر و لیرەی فرانس جۆزیف و هەروەها فوئاد گوڵیشی هێنابوو. سیلڤیای دۆستی فوئادیش جانتەی پارەی بۆ ناردبوو. ئەمڕۆ نازدارم

تەنها لەپشت جامخانە بۆ ماوەی دەقیقەیەک دی. جگەلەوە ئەمڕۆ ڕۆژێکی تا بڵێی خۆش بوو، هەر لە بەیانییەوە هەتاو لە دەرەوە بوو، بەفرەکەی دوێنێ و پێرێ تەنی پێ هەڵچنرا بوو و لە بەزینا بوو.

30/1/1973

لە دوێنێ شەوێوە هەر باران بوو، ئەمڕۆش بێ ڕاوەستان. یەک پارچە بەفر نەما نە لەسەر جادان، نە لەسەر بانان. دەرەجەی حەرارەتیش سەرکەوت گەیشتە 6 +، ئەمە دووەم جارە بەم زستانە باران بباری.

31/1/1973

ئەمڕۆ ئیتر باران ڕاوەستاو دنیا وشک بۆوە، دەرەجەی حەرارە دیسان 6 + بوو، دیارە بە هاتنی نازدار لەشکری زستان لەتەشکی خۆی داو باری کرد چونکە هەوای بەهارێ دەهات. ئێوارە چووم بۆ خەستەخانە بەڵام نازدارم هەر دوور بە دووری دی چونکە کۆخەو پەسیوم بوو.

(ڕۆژەکانی تر هەموو زۆر خۆش بوون و هەتاو بوو.)

5/2/73

ئەمڕۆ ڕۆژێکی لە هەموو ڕۆژان خۆشتر، درجە 6 - 10 هەتاو. سەعات 11 ڕوناک و نازدارم لە خەستەخانە دەرهێنا. کە سیستەر جلی نازداری دەگۆڕی وە گەمانی لەگەڵ دەکرد دەستی بە پێکەنین کرد لەگەڵ سیستەر. لەپاشان تاکسیەکمان گرت کە ئەوە ئەوەڵ ترومبێل بوو لە ژیانی خۆی سواری بێ ئۆپڵ - ریکۆرد ڕەنگی ڕەش مۆدێل 1970. ئیتر لەماڵەوە ڕوناک شیری بۆ ئامادە کرد بەڵام زۆر بەباشی نەیدەخوارد و هەر دەگریا دیار بوو موحیتی ماڵەوە بۆ ئەو تازە بوو وە لە ڕێگا لەناو ترومبێل ماندوو بوو. بەڵام لەپاش سەعات 6 ئیتر نووست هەتا 10ی شەو لەپاشان چاوی زەق کردەوە ئیتر ڕوناک شیری دایێ وە باشی خوارد لەپاشان دەستی بە پێکەنین کرد لەبەر خۆیەوە، دیار بوو ڕازی بوو لە وەزعەکە.

8/2/73

ئەمڕۆ بۆ یەکەمجار هەستی بە ئازار کرد، دەستی لە دەمی خۆی نا پەنجەی لە مەراژووی گیر بوو، دەموچاوی زۆر سەیر گۆڕا و لێوی تەترەی کرد بەڵام گریانەکەی زوو گیراوە دیار بوو ئێشەکە زوو بەسەر چوو.

بۆ ئێوارە بۆ سەعاتێک بەجێمان هێشت بەتەنها لەماڵەوە چووین شتی بۆ بکڕین. کە هاتینەوە هەر نووستبوو. لەپاشان ام انمار هات لەگەڵ روناک شووشتیان بۆ یەکەمجار بەڵام هیچ نەگریا دیار بوو حەزی لە ئاو بوو.

بەرلەوەی بێمەوە سەر گێڕانەوە نیمچە رۆژانەییەکانی ساڵی یەکەمی هاتنە جیهانی منداڵی یەکەمم، نازدار، با ئەو چەند نوێهاتە فەرامۆش نەکەم، کە هەر لەو ماوەیەدا روویان دابوو، بەڵام یاداشتم نەکردبوون. ئەمانە یاداوەریی هەیێکەن کە ئێستا وا بەسەریان دەکەمەوە و پەیوەندیان بە یاداشتە رۆژانەییەکەی لەبارەی نازداری کچمەوە نییە.

ئەو ماوەیەی کە کاک موحسینی برام باڵوێزی عێراق بوو لە پراگ و منیش کارمەندێکی لۆکاڵ بووم لە باڵوێزخانەی عێراق لە ڤیەننا، ئەوە بۆ من و رووناس دەرفەتێکی باش بوو زوو زوو سەردانی پراگ بکەین، کە بە ئۆتۆمۆبیل تەنیا چوار سەعاتێک لە ڤیەنناوە دوور بوو. زۆرێک لە ویکئێندەکان دەچووین بۆ لای کاک موحسین و بۆ ئێمە گۆڕانێکی باش بوو. لەو سەردانانەماندا هەمیشە (دکتۆر قاسملۆ) و هەروەها هونەرمەندی موزیک و گۆرانی (قادر دیلان) یشمان دەدی.

قادر دیلان کە ئەوسا لە چێکۆسلۆڤاکیا دەژیا و ژنێکی چێکیی هێنابوو، چەندین جار دەهاتە لامان، جارێکیان هەر لە ماڵی کاکە موحسین بەدەم گۆرانی و موزیکەوە ئێوارەیەکی هەرگیز لەبیرنەکراومان گوزەراند. یادیان بەخێر دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملۆ و قادر دیلان.

ئەوەی کە هەر لە پراگیش لە یادم دەرناچێ، کابانەکەی ماڵی

بالۆیز کاک موحسین بوو، (پانی ماریا) بە چێکی واتا خانم ماریا. ئەو خانمە کە ژنێکی چێک نەژادی کەمێک تێکسمڕاوی شەست ساڵییەک دەبوو، کابانێکی زۆر شارەزا بوو لە سازکردنی چێشت و سەلاتەی هەمەجۆر. ئەو چەند رۆژەی لەوێ بواین پانی ماریا هەموو هونەری چێشتسازی لە سازکردنی خواردنی رۆژئاوایی بەکار دەهێنا، بەلام برنج و شلەی کوردەواریی خۆمانیشی زۆر بە رێکوپێکی لێ دەنا.

پراگ لە لایەکی تریشەوە بۆ ئێمە زۆر سوودمەند بوو، چونکە لەوێ هەموو شتێک لەچاو ڤیەننا زۆر هەرزان بوو، کە دەگەڕاینەوە بۆ ڤیەننا کاک موحسین هەگبەی بۆ پڕ دەکردین لە گۆشت و پەنیر و خواردەمەنیی هەمەجۆر، کە لەگەڵ خۆمانا دەمانبردەوە. لە یەکێک لەو سەفەرانەمان (مالک الیاسري) برادەری عێراقیم و (مەها) ی هاوسەری و (حجیە)ی خەسووشی لە ڤیەنناوە لەگەڵماندا هاتن و چەند رۆژێکی پشوومان لەوێ لەگەڵ کاک موحسیندا زۆر بە خۆشی رابوارد. داخی گرانم ئەوڕۆ نە مالک نە ژنەکەی نە خەسووەکەی کەسیان نەماون، هەزار رەحمەت لە گۆڕیان بێ. سەری ساڵی 71 بۆ 72 کاک موحسین داوای لێ کردین بچین بۆ لای تا ئاهەنگی سەری ساڵەکە پێکەوە بکەینەوە. کاکە دکتۆر ئەنوەری براشمان یادی بەخێر، کە پار لە ئاڵمانیا کۆچی دوایی کرد، ئەویش لە ئاڵمانیاوە هاتبوو. دکتۆر سەرسۆر دزەیی ئامۆزاشم کە لە ڤیەننا چەند کۆرسێکی وەردەگرت، ئەویش لەگەڵ ئێمە پێکەوە چووین بۆ پراگ. بۆ شەوی سەری ساڵ کاک موحسین ئوتێلێکی زۆر خۆشی لە شاری کارلۆڤیڤاری بەناوبانگ بۆ هەموومان حیجز کردبوو (گراند ئوتێل مۆسکڤا - Grand Hotel Moskva) و هەموومان پێکەوە ساڵی نوێمان تا کاتی بەیانی لەو ئوتێلە بە دانس و گۆرانی کردەوە. خۆزگەم بەو شەوە کە هەرگیز لەبیر ناکرێت.

ساڵی 1973ش باڵوێزەکەی من، دکتۆر (حمد دلي الكربولي) گواسترایەوە بۆ بەغدا و باڵوێزی نوێ (جاسم العزاوي) شوێنەکەی لە ڤیەننا گرتەوە.

ئینجا با بگەڕێمەوە بۆ چیرۆکی یەکەم ساڵی هاتنە دونیای نازداری کچم، کە بە شێوەیەکی نیمچە رۆژانە دەمخستە سەر کاغەزەوە.

10/2/73

ئەمڕۆ ئێوارە نازدار سیحەتی تەواو نەبوو. مالک و مەها و ئەیاد هاتبوون دیارییان بۆ هێنا (لەپکەی شین) بەڵام زۆر دانیشتن تا 2ی نیوەشەو. مالک جغارەی دەخوارد دیار بوو سیحەتی نازدار تێک چوو.

11/2/73

ئەمڕۆش هەر نەخۆش بوو، بۆ یەکەمجار چامان دایێ (چای بەیبوون - کامیلیا).

12/2/73

سیحەتی باشتر بوو، بۆ یەکەم جار لە وەختی نووستندا نینۆکمان کرد.

14/2/73

ئەمڕۆ نووستن و خواردنی زۆر باش بوو، یەکەم جار ئاومان دایێ (چەند کەوچکێکی چا).

15/2/73

کات 30/5ی بەیانی گریانمان تۆمار کرد.

21/2/73

ئەمڕۆ بۆ یەکەم جار بردمانە دەرێ لە ماڵەوە، چووین بۆ لای دکتۆر، 300 گرامی زیاد کردبوو. لەپاشان پیاسەمان پێ کرد لە فۆلکس گارتن.

24/2/73

ئەمڕۆ پاش ئەوەی هەرچی دەیخوارد دەیهێناوە، چەند رۆژێک

بوو (5 رۆژ) قەبز بوو، ناچار بردمانە خەستەخانە و نواندیان. گوتیان ڕەنگە عەمەلیات بکرێ. رووناک زۆر گریا.

25/2

ئەمڕۆ چووین بۆ لای لە خەستەخانە سیحەتی باش بوو و بە (infusion) خواردنیان دەدایێ، بەلام ڕەنگی خۆش بوو، دکتۆر گوتی بەیانی عەمەلیات ئەکرێ.

26/2/72

ئەمڕۆ 30/8 ی بەیانی دکتۆر کایزەر Kaiser جەراحی منالان عەمەلیاتی کرد، زۆر باش بوو. ئیتر بەرە بەرە تەندروستیی بەرەو باشی ڕۆیی.

28/2

ئەمڕۆ تەمەنی گەیشتە مانگێک، چووین وێنەمان گرت. ئیتر سیحەتی باش بوو، دکتۆر گوتی ئەتوانن چەند ڕۆژێکی تر بیبەنە ماڵەوە، بەلام ئێمە گوتمان با تا 10 ڕۆژی تر بمێنێ.

6/3/73

ئەمڕۆ هێنامانە ماڵەوە. ڕۆژێکی هەتاو و زۆر خۆش بوو، پلە 10 بوو.

8/3/73

ئەمڕۆ بردمانە لای دکتۆر کایزەر زۆر بە ئاسانی داوەکانی دەرهێنا. لەپاشان چووینە شتات پارک پیاسەمان کرد، دکتۆر عەدنانیشمان لەگەڵ بوو.

11/3/73

ئەمڕۆ لەگەڵ ماڵک وان بردمانە مەتعەمی سابوونچی و لەبەر هەتاومان دانا. لەپاشان پیاسەمان کرد، زۆر دڵی خۆش بوو. بۆ یەکەم جار بوو سواری ترومبێلی ماڵک بێ. ئەمڕۆ لە هەموو ڕۆژان زیاتر شیری خوارد.

12/3/73

ئەمرۆ نازدارمان بردە لای دکتۆر لۆتالەر، کێشی3/600کگم بوو. تەعلیماتی شیر و ئاوی گێزەر و سێوی بۆ نووسی. نەختێ سووتانەوەی تووش بوبو.

13/3/1973

ئەمرۆ بۆ یەکەم جار ئاوی گێزەرمان دایێ.

14/3/1973

ئەمرۆ کۆخە و پەسیوێکی سووکی گرت. بۆ یەکەم جار حەبێکی ڤیتامین Dمان دایێ.

19/3/73

ئەمرۆ بردمانەوە لای دکتۆر لۆتالەر، کێشی 3/700 کگم بوو و سووتانەوەکانی باشتر بووبوو.

21/3/73

نەورۆز. وێنەکانی نازدارم گرت.

23/3

ئەمرۆ بۆ یەکەم جار سێومان دایێ.

24/3

ئەمرۆ لەبەر ئاهەنگی نەورۆز بردمانە لای دایکی سیلڤیا.

6/4/73

ئەمرۆ موحسن لە عێراق هاتەوە وە مەحمود و هایدیش لە میونیخ هاتن. بۆ یەکەم جار نازدار مامەکانی دی.

26/4/73

ئەمرۆ چووینە لای دکتۆر لۆتالەر، کێشی 5 کیلۆ بوو. یەکەم دەرزی مەناعەی لێدا.

10/5/73

ئەمرۆ تەختمان بۆ نازدار کڕی بە 500 شلن، چونکە ئەوی پێشانی زۆر بچووک بوو و جێگای لێ نەدەبووەوە.

27/5/73

چووینە سەر کاولە هەواری ریشارد شێردڵ.

29/5/73

ئەمڕۆ بردمانە لای دکتۆر دەرزی دووەمی لێدا. کێشی 5/600 کغم بوو.

1/6/73

ئەمڕۆ بۆ یەکەم جار (پرپۆرە)مان دایێ، هی تێکەڵ لەگەڵ شیر و چووینە سیمەرینگ.

9/7/73

ئەمڕۆ چووینەوە لای دکتۆر دەرزی سێیەمی خۆپاراستنی لێدا. کێشی 5/6 کیلۆگرام بوو.

12/7/73

ئەمڕۆ چووین بۆ کەنەدا، بۆ یەکەم جار سواری تەیارە AC بوو. لەم مانگە نازدار ئیتر زۆر قشت بوو و بۆ یەکەم جار نەختێ دانیشت.

{لێرەوە ئیتر باسی سەفەرەکەی کەنەدامان دەکەم، کە ئەوسا تەنیا دوو دێرم لەسەری یاداشت کردووە، بەڵام ئێستا وا بەسەری دەکەمەوە و ئەمەم قسەی ئێستامە نەک هی یاداشتکراوی حەفتاکان. واتا وا بۆ دووەم جار ستۆپێک لە گێرانەوەی چیرۆکی لەدایکبوونی نازداردا دەکەم و دوای سەفەرەکەی کەنەدا ئینجا دەگەڕێمەوە سەری - هۆمەر}.

## باڵیۆز موحسینی دزەیی برام لە پراگ گواسترایەوە بۆ کەنەدا

دوای نزیکەی دووساڵ و نیوێک وەک باڵیۆزی عیراق لە پراگ کاک موحسین گواسترایەوە بۆ ئۆتاوا Ottawa پایتەختی کەنەدا. ئەو ماوەیەی کە ئەو لە پراگ بوو بۆ من و رووناسی دانیشتووی ڤیەننا دەرفەتێکی لەبار بوو چەندین جار سەردانی وڵاتی چێکۆسلۆڤاکیای ئەوسا بکەین.

هەر بۆ یاداوەری جێی خۆیەتی بڵێم کە پراگ نەک هەر یەکێکە لە شارە هەرە جوانەکانی دونیا بەڵکو شارە خنجیلانەکانی دیکەی چێکۆسلۆڤاکیاش وەک کارلۆڤیڤاری Karlovy Vary و ماریانسکی لازنی Marianske Lazne ئەوانەش لە تەواوی جیهاندا بە دەرماناوەکانیان ناسراون و ساڵانە گەشتیارێکی زۆریان دەچێتێ. ئەمن بەتایبەتی هۆگری کارلۆڤیڤاری بووم کە بە ئاڵمانی پێی دەڵێن کارلسباد Karlsbad چونکە (فریدریک شۆپان) ی موزیککار کە لە دواساڵانی تەمەنی کورتیدا بە نەخۆشیی بەرهەنگ (سیل) دەردەدار ببوو بۆ چارەسەری ماوەیەک لەو شارە مابووەوە.

بەڵام بەر لەوەی پراگ بەجێ بێلین حەز دەکەم بۆ مێژوو باسی یەک نموونەی کوردایەتی و مەردایەتی ئەو باڵیۆزە کوردە بکەم کە چۆن پۆستەکەی لەپێناو کوردایەتیەکەی رەتکردبۆوە.

خوێندکارە بەعسییەکان و بەشی حیزبی بەعس لە پراگ هەمیشە دەچوون بڵاوکراوەکانی حیزبییان بە دەزگای رۆنیۆ لە باڵیۆزخانەی عیراقی چاپ دەکرد. جارێکیان بەرپرسی لقی پارتی لە پراگ کە کاک موحسین دەڵێ (عبدالخالق مارف) بووە ئەویش دەچێتە باڵیۆزخانە هەندێ بڵاوکراوەی پارتی لەوێ بە دەزگای رۆنیۆ رابکێشێ.

کارمەندێکی باڵیۆزخانەش کە بەرپرسی حزبی بەعسیش بووە لەوێ ڕێگای پێ نادات ڕۆنیۆی باڵیۆزخانە بۆ چاپکردنی پارتی بەکار بێنێ. کاک موحسین بانگی دەگات پێی دەڵێ "گوێ بگرە، یان نابێ هیچ کەرەستەیەکی خوێندکارانی حزبی بەعس لە باڵیۆزخانە بەچاپ بگەیەنرێت یان پارتیش دەبێ وەک بەعس ئەو ئامێرەی باڵیۆزخانە بەکار بێنێ چونکە بەعس و پارتی بە پێی ڕێکەوتنی 11ی ئازار هاوپەیمانن لەبەڕێوەبردنی حکومەت." دیارە کابرای کارمەند گوێی نەداوەتە باڵیۆزی خۆی هەر سوور بووە لەسەر پێداگریی خۆی. باڵیۆز بەمە زۆر پەست دەبێت و یەکسەر داوا لە وەزارەتی دەرەوەی عیراق دەکات ئەو کارمەندە بگوازێتەوە بۆ شوێنێکی تر. شتەکە گەورە دەبێت و (عبدالكريم الشيخلي) وەزیری دەرەوەی ئەوسای عیراق دێتە سەر خەت و کاک موحسین پێی دەڵێ "جەنابی وەزیر، من کە لێرە سەفیرم دەبێ هەموو کارمەندەکانم گوێڕایەڵی من بن. من ئەم کارمەندەم بە دڵ نییە، ئێوەش بڕیار هی خۆتانە، یان ئەمن دەست لەم پۆستم دەکێشمەوە یان ئەم کارمەندەم دەبێ نەقل بکرێت." وەزیرەکە بە قسەی باڵیۆز دەکات و کارمەندەکە دەگوازێتەوە بۆ باڵیۆزخانەیەکی تر کە پێم وایە تاران بوو. ئەمە بەڕاستی هەڵوێستێکی کوردانەی پیاوانە بووە لەلایەن ئەو باڵیۆزەوە. چەند ساڵێک دواتر سەدام حوسێن (عبدالكريم الشيخلي)شی کوشت کە بە ڕەچەڵەک کورد بوو بەڵام بەعسی بوو.

پێم وایە کاک موحسین لە مانگی نیسانی 1973گەیشتە ئۆتاوا Ottawa ی پایتەختی کەنەدا و متمانەنامەی خۆی وەک باڵیۆزی نوێی عیراق پێشکەش بە دەسەڵاتداری سیاسی، نوێنەری ماشا (مەلیکە)ی بریتانی کرد چونکە کەنەدا ئەندامی (کۆمۆنوێلث)ی بریتانی بوو. کاک موحسین کە هەم لە پراگ و هەم لە کەنەداش بوو ماڵ و منداڵی خۆی لەگەڵ خۆیدا نەدەبرد چونکە هەموویان لە قۆناخی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی بوون و ئەوساکەش ئەم قوتابخانە تایبەتییانەی

وەک ئەمڕۆ هەبوونیان لە کوردستانا نەبوو و هیچ منداڵێکی کوردی ئەو زەمانە ئینگلیزی نەدەزانی. بۆیە سەبارەت بە خوێندنەکەیان منداڵەکانی ئەویش لەگەڵ دایکیانا هەر لە کوردستان دەمانەوە و کاک موحسین ناچار هەر بەتەنیا لە دەرەوە دەبوو و هاوینان دەینارد بەدوایاندا بچن بۆ لای. ئەو هاوینەی 1973کاک موحسین وای پلان دانابوو کە منداڵەکانی لە هەولێر بێن بۆ لای من لە ڤیەننا و لەوێشەوە من و رووناسیش لە گەڵیانا بچین بۆ سەردانی لە کەنەدا. هەر واشمان کرد. لە سەرەتای مانگی حەوتا منداڵەکانی: شێروان، پەیمان، بارزان، رێزان، سەفین و کچێکی کاکەی ئامۆزاشمان (ژوان) هەموویان هاتنە ڤیەننا و چەند شەوێک لە ماڵەکەی خۆمان جێگامان بۆ دابین کردن و شوێنە ناسراوەکانی ڤیەننام پیشاندان. کاک موحسین بلیتی فڕۆکەی بۆ هەموومان (من و رووناس و نازداری پێنج شەش مانگیش) بڕی و رۆژی 7/12 بەڕێ کەوتین بۆ کەنەدا بۆ فڕۆکەخانەی مۆنترێئال و لە وێشەوە چووینە ئۆتاوای پایتەخت. کاک موحسین بەتەلەفۆن لەگەڵ باڵیۆزەکەی من (جاسم العزاوي) مۆڵەتێکی درێژخایەنی بۆ من وەرگرتبوو. بۆ من و بۆ هەموومان ئەوە یەکەم جار بوو کەنەدا ببینین. هەڵبەت لە شوێنە دەگمەنەکانی کەنەداش کە هەر گەشتیارێک ئارەزووی بینینیان دەکات تاڤگەکانی نیاگارا Niagara Falls بوو کە بەڕاستی سەرسوڕمێنە. ئینجا کاک موحسین گوتی کە هەر هاتوون بۆ کەنەدا با سەفەرێکی نیویۆرکی ئەمەریکاشتان پێ بکەم . هەڵبەت ئەمەریکاش هەر نوێ بوو بۆ هەموومان و چونکە زۆر بووین کاک موحسین ئۆتۆمۆبیلێکی ستەیشن واگن Station Wagon ی زۆر پان و پۆڕی بەکرێ گرت و شۆفێرەکەی خۆیشی نەهێنا چونکە جێگامان نەدەبووەوە و بە درێژایی سەفەرەکەمان هەر خۆی دەیئاژۆت. بیرمان کردەوە نازداری کچم کە هێشتا شیرخۆرە بوو و ئەو سەفەرە درێژە بۆ ئەو دەستی نەدەدا بۆیە لای بێبی سیتەرێک Baby Sitter بەجێمان هێشت { ئەمەم ئەوساکە بەم چەند وشەیە لەدەفتەری بیرەوەرییەکانم

تۆمار کردووە: " 29/7/73 ئەمڕۆ چووین بۆ نیویۆرک نازدارمان لای بێبی سیتەر دانا."} ئیتر چەند شەوێکیشمان لەو شارە ناودارە بەسەر برد و هەموو شوێنە گرینگەکانی وەک ئیمپایەر ستەیت Empire State (ئەوسا بە سەت و یەک نهۆمی بەرزترین باڵاخانە بوو لە جیهانا) و پەیکەری ئازادی Statue of Liberty و ناوەوەی باڵاخانەی نەتەوە یەکگرتووەکان UN مان بەسەر کردەوە.

کە گەڕاینەوە بۆ ئۆتاوا هونەرمەندی ناوداری عیراقی لە موزیکا دکتۆر منیر بشیر بە گەشتێکی هونەری هاتبوو بۆ کەنەدا. کاک موحسین شەوارەیەکی زۆر خۆشی لەماڵەکەی خۆی بۆ ئەو هونەرمەندە بە رەچەڵەک کوردە رێک خست کە هەموو باڵیۆزەکانی وڵاتانی عەرەبی و ئی تریشی بانگهێشت کردبوو. لەو ئێوارەیە منیش چەند گۆرانییەکی کوردی خۆشم پێشکەش بە میوانە عەرەبەکان کرد کە مامۆستا منیر بەشیر بە ئامێری عود یاوەریی دەکردم.

شەوێکی تریش چووین بۆ کۆنسێرتێکی گرووپێکی موزیکاڵی ئەمریکی ناودار کە ناوەکەیم لەبیر نەماوە . لە پشووی ناوەندا گرووپەکە داوایان لە هەر میوانێکی دەنگخۆش دەکرد ئەگەر حەز بکات بچێتە سەر ستێگەکە و بە دڵی خۆی گۆرانییەک دووان بڵێت ئەوانیش بە ئامێر یاوەریی دەکەن. ئەمن چووم دوو گۆرانی رووسی کە لە سەفەرەکەی مۆسکۆم ساڵی 57 فێریان ببووم ئەوەم بۆ گوتن (مۆسکۆ ڤێچێرا) و (کالینکا) چەپڵەیەکی زۆرم لە دانشتوانەکانەوە بۆ لێ درا و سەرۆکی گرووپەکە پێی گوتم بۆ نایەیت لەگەڵ ئێمە کار بکەیت زۆر مەشهور دەبیت. زۆر سوپاسم کرد گوتم کاری خۆم هەیە ناتوانم.

هەر کە لە کەنەداش بووین ساڵیادی شۆڕشی14ی تەموز هاتەوە و بەو بۆنەیەوە کاک موحسین ئێوارە کۆکتێلێکی زۆر پڕوچڕی لە باڵیۆزخانەدا بۆ ژمارەیەکی زۆر لە میوانان ئامادە کردبوو.

سەفەری کەنەدا و ئەمەریکامان بە دوایی هات و گەڕاینەوە بۆ

ڤیەننا. منداڵەکانی کاک موحسین چەندرۆژێکی تریش لای من لە ڤیەننا مانەوە ئینجا ئەوان گەڕانەوە بۆ عیراق و منیش دەستم بە دەوامی خۆم کردەوە لە باڵیۆزخانەی عیراق.

لێرەدا دەگەڕێمەوە بۆ دەفتەری بیرەوەرییە رۆژانەییەکانم دەربارەی یەکەم ساڵی تەمەنی نازداری کچم. ئەمانەم دوای سەفەرەکەی کەنەدا و ئەمەریکامان یادداشت کردووە، کە بەم جۆرەیە:

26/8/73 گەڕاینەوە ڤیەننا، نازدار و هەرسێکمان نەخۆش بووین، کۆخەمان بوو.

9/9/73 ئەمڕۆ کاکم هات و نازدار نووستبوو.

10/9/73 بۆ یەکەم جار نازدار مامی ئەحمەدی دی.

19/9/73 کاکم چوو بۆ کەنەدا.

17/10/73 ئەمڕۆ بۆ یەکەم جار سەیرمان کرد سپیاتی جێگای ددانی نازدار دیار بوو، 2 ددانی خوارەوە.

22/12/73 ئەمڕۆ حەمەی مامم حوسێن هات قاپووتێکی سپی و سەرکڵاوی بۆ نازدار هێنابوو، نازدار بۆ یەکەم جار مامی حەمەی بینی.

27/12/73 سپیاتیی چوار ددانی سەرەوەی بەدەر کەوت.

مانگی 1/74 زۆر جار بەبێ دەستگرتن رادەوەستا.

25/1/74 بۆ جاری یەکەم 4، 5 هەنگاو رۆیی.

26/1/74 یەکەم جووت پێڵاومان بۆ کڕی بە 99 شلن لە سالاماندەر، بەڵام پێشتر رەمزییە کڵاشی بۆ ناردبوو.

28/1/74 یەکەم جەژنی لەدایکبوونی نازدار. هەوا زۆر خۆش بوو، دەرەجە 10 + دنیا وشک بەهاری بوو، رووناس کێکی بۆ کرد، جلی کوردیمان لەبەر کرد، وریا و نەوشیروان و فوئاد و ئومێد هاتبوون.

{لێرەوە ئیتر یادداشتی ساڵی یەکەمی نازدارم بە کۆتایی هێنا و دەستم بە یادداشت کردنی لەدایکبوونی منداڵی دووەمم کرد (لارا)،

کە تەنیا 9 رۆژ پاش یەکەم ساڵیادی لەدایکبوونی نازداری خوشکی ئەمیان لە 74/2/6 هاتە جیهانەوە.}

**لارامان بوو**
**6/2/1974**

بەیانیی رۆژی 6 ی شباتی 1974 لە کاتی 1 ی بەیانیدا رووناک بە ئاگای هێنامەوە و گوتی تەلەفۆن بۆ خەستەخانە بکە، منیش کردم، گوتیان وەرن، لەپاشان کات 7 تەلەفۆنم بۆ پرۆفیسۆر گیج کرد، ئەویش گوتی بڕۆن ئەمنیش وا هاتم. ئیتر تەلەفۆنم بۆ ئەیاد کرد، لەبەر نازدار هات، ئێمەش تاکسیمان گرت و چووینە خەستەخانە.

رۆژەکە بە تەم و مژ بوو، سەرلەبەیانی لەپاشان پێش نیوەڕۆ تەم نەما، رووناک نووست، ئەمنیش گەڕامەوە ماڵەوە. نیوەڕۆ باران باری، بەلام دەرەجە 9 بوو، هەوا خۆش بوو و باران راوەستا، بەلام عەرد هێشتا تەڕ بوو. من و ئەیاد چێشتمان لێ ئەنا، تەلەفۆنمان بۆ کرا لە خەستەخانە گوتیان کچێکی جوانکیلەت بووە، لە سەعات 2،20 کێشی (3،150) کغم و درێژی (49سم) بوو.

لارا، کت و مت بە دایکی دەچی، تقاتیعی دەموچاوی لە رۆژی ئەوەلەوە زۆر وازیحە، رەنگی پەمەییە، سیستەرەکانیش لە خەستەخانە، هەروەها ژنی تریش ئەڵێن کە زۆر بە دایکی دەچی و دەم و چاوی سافە، بەلام پرچی لە هی نازدار کەمترە.

ئیتر کە من و ئەیاد نانمان حازر ئەکرد، محمود خالدیش هات و پێکەوە چێشتمان خوارد، لەپاشان من چووم تەبعەن تەلەفۆنم بۆ برادەرە کوردەکان کرد. لەوێ رەسمم گرت.

8/2/74

ڕووناک ڕەسمی لارای گرت لە خەستەخانە.

9/2/74

ئومێد و فوئاد و نەوشیروان چوون دیارییان بۆ لارا برد بۆ خەستەخانە، جل و بەرگ.

12/2/74

ئەمڕۆ لارا و دایکی لە خەستەخانە دەرچوون، ڕۆژێکی هەتا بڵێی خۆش بوو، هەتاو بوو، دەرەجە 10، بە ترومبێلی تارق بریسم ( پۆژۆ 504 سپی مۆدێل 74) هاتینەوە، شوفێری سەفیر لێی دەخوڕی، عاتفی میسری.

12/2/74

ئەمڕۆ ڕووناس و لارا لە خەستەخانە هاتنەوە ماڵ، بەڵام نازدار تای لێ بوو بۆ سێ ڕۆژ.

15/2/74

ئەمڕۆ پاش سێ ڕۆژ (تا)، هەموو لەشی بووە گرمژە، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ وامان زانی سووریکەیە، لەپاشان هەو نەبوو و ڕەش بووەوە.

17/2/74

ئەمڕۆ بۆ یەکەم جار لارا حەمامی وەرگرت و ڕەسممان گرت. ئەو چەند ڕۆژەی قەبز بوو، فەقیرەی دەنا خواردن و نووستنی زۆر باش و لەگەڵ سەعات بووە.

20/2/74

ئەمڕۆ نازدار بۆ یەکەم جار سەربەخۆ دەڕۆیی، بەڵام دەترسا.

21/2

ئەمڕۆ باشتر دەڕۆیی و نەدەترسا، بەڵکوو پێ دەکەنی وە عەنتیکەی پێ دەهات کە ئەویش ئەزانێ بڕوا.

لارا بە 10 مانگی 2 ددانی بنەوەی هات. لارا تەبیعەتی وەکوو هی نازدار ناسک نییە. زۆری دەخوا، هەرچی بیدەیێ و هەر وەختەک

بێ دەخوا، بە عەکسی نازدار. جگە لەوە لارا دەنگیشی ناسک و خۆش نییە وەک نازدار و زۆریش عەسەبییە. وەزنیشی بە سالێک و 2 مانگ 10کغم، هی نازدار 2 ساڵ و 2 مانگ 11کغم، یەعنی فەرق 1کغم. پرچیشی زۆر بە گروازەیە، وەکوو هی نازداری زۆر نییە، بەڵام ڕەنگی لە هی نازداری سپیترە.

ئیتر لێرەدا چیرۆکی لەدایکبوونی هەردوو کچەکانم، نازدار و لارا، کە لە کاتی خۆیدا ڕۆژانە یان نیمچە ڕۆژانە لە دەفتەرێکدا یادداشت دەکرد، وا بە کۆتایی هات. بەڵام یەک دوو ساڵ دواتریش هەندێ شتی بچووک بچووکم لەسەر لارا نووسیوە، کە دواتر دەیانگێڕمەوە، ئەگینا هەرچییەکی لێرەڕا بینووسم ئەوە قسەی ئێستامە لەم بیرەوەرییانەم.

ئێوارەیەکیان لە ماڵەکەی خۆم لە گەڕەکی یەکەمی ڤیەننا لە کۆلانی (ڤالنەر شتراسە Wallner Strasse 2) نهۆمی سێیەم، زەنگی دەرگاکەم زرینگایەوە. کە پرسیارم کرد کێیە (تاریق بریسم)ی بەرپرسی حزبی بەعس لە باڵوێزخانەی عێراق گوتی: "منم کاکا عومەر، ئەرک نەبێ تا خوارەوە نایەیت کەمێک ئیشم پێت هەیە؟ "، منیش داوام لێ کرد بێتە سەرەوە قاوەیەکیش نۆش بکەین، گوتی بەداخەوە ناتوانم تۆ وەرە خوارەوە. کەمێک نیگەران بووم و ڕاستییەکەی ترسێکم لە دڵا نیشت. یەکسەر تەلەفۆنم بۆ (مالک الیاسري) برادەری عێراقیم کرد، کە ئەویش هەر لە باڵوێزخانەی عێراقا دەست بەکار بوو و زۆر دژی بەعسیش بوو و پێم گوت مالک وا دەچمە خوارەوە، بەڵام نازانم مەسەلە چیە، تکایە ئەگەر تا ماوەیەکی درەنگ هیچ دەنگم نەبوو تۆ زوو پۆلیسی نەمسا ئاگادار بکە. چوومە خوارەوە بینیم دوو کەس لەوبەر کۆلانەکەی ماڵی من وەستاون و تاریق یەکسەر بۆم هات تەوقەی لەگەڵما کرد و منی برد بۆ لای کابرای دووەم. کۆڵان کەمێک تاریک بوو، بەڵام تاریق گوتی ئەمە استاد (نعیم حداد)ی ئەندامی سەرکردایەتیی حزبی بەعسە و کارێکمان بە تۆ هەیە، بەڵام

تکایە لە باڵوێزخانەش باسی مەکە. گوتی تۆ ئاڵمانییەکەت لە هەمووان باشترە، تکایە تەلەفۆنێکمان بۆ حزبی شیوعیی نەمساوی بۆ بکە کە بەڕێز (نعیم حداد) دەیەوێ سبەینێ زۆر بە پەلە سکرتێری حزب کە پێم وایە (فرانتس مووری Franz Muhri) بوو ببینێت. گوتی کە مەوعیدەکەت وەرگرت تەلەفۆن بۆ من بکەرەوە. ئۆخەیەکی خۆشیم هاتەوە بەر و بە سەلامەتی گەڕامەوە سەرەوە و بەم شەوە دەستم بە تەلەفۆنات کرد لەگەڵ بارەگای حزبی شیوعی. پێیان گوتم ئێستا شەوە کەسی وا لێرە نەماوە بەیانی پەیوەندی بکەرەوە. کە تێم گەیاندن شتەکە زۆر بە پەلەیە، تەلەفۆنی ماڵەوەی ئەندامێکی مەکتەبی سیاسییان دامێ. کابرا گوتی سکرتێری حزب لە سەفەردایە، بەڵام با بەیانی بێت لێرە یەکێک دەبینێ. منیش ئەوەم بە تەلەفۆن بە تاریق ڕاگەیاند و ئیتر نازانم ئەم دیدارە بەو شێوە زۆر نهێنییە بۆ چی بووە، چونکە بە منیان گوت نابێ خودی سەفیریش پێی بزانێ. ماوەیەک دواتر باڵوێزەکەم (جاسم العزاوي) کە وابزانم ئەندامی بەعس نەبوو، بەڵام قەومی بوو، پێی زانیبوو و گلەیی لە من کرد کە چۆن بەوم نەگوتووە. منیش گوتم جەنابی باڵوێز، من کارمەندێکی بچووکم لێرە، بۆچی گلەیی لە بەرپرسی بەعس ناکەیت (تاریق بریسم) کە هەموو شتەکە ئەو ڕێکی خستبوو؟

سەعات و ئەنگوستیلەی حوسێنی عەلی ئاغا کە هەڵمگرتوون. سەعاتەکە ئێستاش قورمیشی بکەیت یەکسەر دەگەڕێت.

نازداری کچم

لە راستەوە : فارسی عەلی ئاغا، عەلی ئاغای خورشید ئاغا، تایەری عەلی ئاغا، بەیروت 1952

حوسێنی عەلی ئاغا

جەمیلی عەلی ئاغا

عومەری عەلی ئاغا

نازداری کچم و نەوشیروان مستەفا لە یەکەم ساڵیادی لەدایکبوونی نازدار لە ماڵی ئێمە لە ڤیەننا 1974

باڵیۆزی نوێی عیراق لە ڤیەننا جاسم العزاوي متمانەنامەی پێشکەش بە سەرکۆماری نەمسا فرانتس یۆناس دەکات و هۆمەر دزەییش تەرجومەکاری لە نێوانیاندا دەکات.

هونەرمەند قادر دیلان 1999 - 1928

لە چەپەوە: وریا ڕەواندزی، هۆمەر دزەیی، ڕوناس دزەیی، نەورۆزێکی ڤیەننا 72 یان 73

حاکمی سیاسی کەنەدا نوێنەری مەلیکە (ماشا)ی بریتانیا پێشوازی لە باڵیۆزی نوێی عیراق موحسین دزەیی دەکات. ئۆتاوا 1973

له راستەوە: مەحمود کانەبی ئامۆزام، روناسی هاوسەرم، هایدی هاوسەری مەحمود له ڤیەننا.

منالەکانی کاک موحسین دزەیی برام لەگەڵ روناسی هاوسەرم، ڤیەننا 1973

له راستەوە: بارزان دزەیی، هۆمەر دزەیی، سەفین دزەیی، ژوان کاکە دزەیی، روناس دزەیی، پەیمان دزەیی، رێزان دزەیی، بالاخانەی UN له نیویۆرک 1973

موحسین دزەیی و منداڵەکانی لەگەڵ هۆمەر دزەیی و روناسی هاوسەری لە تاڤگەکانی نیاگارا ، کەنەدا 1973

مناڵەکانی کاک موحسین دزەیی برام لەگەڵ روناسی هاوسەرم، ڤیەننا 1973

کچەکانم لە راستەوە : نازدار ، لارا.

هۆمەر و روناس لە نیاگارا. کە بەسواری بەلەم لە تاڤگەکان نزیک دەبیتەوە دەبێ شەمێ مشت لەبەرکەیت ئەگینا هەموو لەشت دەبێتە ئاو.

لە راستەوە: مالک الیاسري ، مازن الیاسري برای ، هۆمەر دزەیی لە ڤیەننا.

کاک ئەحمەدی برام و نازدار ، ڤیەننا 1973

ئەندامانی باڵیۆزخانەی عیراق لە ڤیەننا لە راستەوە: هۆمەر دزەیی، باڵیۆز جاسم العزاوي، برهان ابو انمار، حسان الصفا

لاپەڕەی یەکەمی یادداشتە دەسنووسەکەم ڕۆژی لەدایکبوونی لارای کچم.

وزارة الشؤون البلدية والقروية

تسلسل الجلد

وصل الصندوق رقم ١١٩٤٥٨

خلاصة المبالغ التي تقبض لحساب المؤسسات البلدية

اسم المؤسسة

من

الشخص المسلم

المبلغ

| فلس | دينار | الفصل | المادة | نوع المقبوضات |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ٢٥٠ | | | ٦ | |
| ٢٥٠ | | | | المجموع |

يجب تبقى ... دينارا و ٢٥٠ فلسا

كما محرر اعلاه

١٩٧٢

ئەو پسوولانەی کە لە کاتی مەرگیا لە گیرفانی مرادخانییەکەی حوسێنی عەلی ئاغا دابوون و بۆ مێژوو هەڵمگرتوون.

بلیتی ئاهەنگی سەرەساڵی 72 - 71 کە لە هۆتێلەکەی خۆمان لە کارلۆڤیڤاری ڕێکخرابوو.

التآخي في ٢٢ ١/٨/١٩٧٤

## آل دزەیی یشکرون

یشکر السادة علی خورشید دزەیی واولاده واحمد محمد امین دزەیی واحمد الحاج جکل وجوهر حسین الملا والنقیب محمد حسین دزەیی وملازم الشرطه سعدی حسین دزەیی جمیع الذوات الذین قاموا بتشییع جثمان فقیدهم الغالی حسین علی خورشید دزەیی الذی وافاه الاجل یوم الجمعة الماضی اثر نوبة قلبیه والذین حضروا مجلس الفاتحة او ارسلوا برقیات التعازی سائلین الله تعالی ان یحفظهم وان لایریهم مکروها وانا لله وانا الیه راجعون .

الثورة ٢٢/٨/٧٤

## آل دزەیی یشکرون

یشکر السادة علی خورشید دزەیی واولاده واحمد محمد امین دزەیی واحمد الحاج جکل وجوهر حسین الملا والنقیب محمد حسین دزەیی وملازم الشرطة الحقوقی سعدی حسین دزەیی جمیع الذوات الذین قاموا بتشییع جثمان فقیدهم الغالی حسین علی خورشید دزەیی ـ الذی وافاه الاجل یوم الجمعة الماضی اثر نوبة قلبیة ـ والذین حضروا مجلس الفاتحة او ارسلوا برقیات التعازی سائلین الله تعالی ان یحفظهم وان لا یریهم مکروها وانا لله وانا الیه راجعون .

سوپاسنامەی بنەماڵەی دزەیی بە بۆنەی کۆچی دوایی حوسێنی عەلی ئاغا (رۆژنامەی التاخي والثورة).

دەرگای باڵاخانەی ماڵەکەی من لە ڤیەننا کە شەوێک نعیم حداد لەوێ چاوەڕێی دەکردم.

# بەشی 28

## چوونەوەمان بۆ بەغدا و گیرانمان

ڕۆژی یانزدەی ئازار هاتەوە، یانزدەی ئازاری 1974، کە چوار ساڵ بەسەر ڕێکەوتنەکەی ساڵی حەفتای نێوان شۆڕشی کورد و بەغدا تێپەڕیبوو. لەو ڕێکەوتنە وا داندرابوو کە مۆڵەتی چوار ساڵ بدرێت بە حکومەتی بەغدا بۆ ئەوەی دامودەزگاکانی هەرێمی ئۆتۆنۆمی کوردستان دابمەزرێنێت و کێشەی کەرکوکیش چارەسەر بکرێت. ئەوا چوارساڵەکە تەواو بوو و ڕاستە حکومەتی بەغدا ئۆتۆنۆمی بۆ کورستان بە ناوی (منطقة كردستان للحكم الذاتي) بە دیوانی (ڕەسمی) ڕاگەیاند و لە دەستوری نوێی عیراقیشدا جێگیر کرا بەڵام چۆن ئۆتۆنۆمییەک ! توێکڵێکی بێ ناوەڕۆک کە ئەوە نەبوو سەرکردایەتی کورد لەگەڵ بەعسا لەسەری ڕێک کەوتبوون. دەرکەوت حکومەت پێویستیی بەو چوار ساڵە هەبوو بۆ خۆبەهێزکردن تا وەخۆ کەوێت بۆ پەلامارێکی دیکەی بۆ سەر کوردستان. حیزبی بەعس هەوڵی دەدا لەسەرەوە و لەبەر چاوی ڕای گشتی جیهانی خۆی وەک حیزبێکی دیموکرات و مرۆڤدۆست پیشان بدات بەڵام لەناوەوە پێچەوانەی ئەو دوو پرەنسیپە بوو. لە ماوەی ئەو چوار ساڵە بەعس هەڵستا نەخشەی دیمۆگرافی و ئیداری کوردستانی بە پێی بەرژەوەندی ئابووری خۆی و بەبێ گوێدان بە ناڕەزایی دەربڕین لە لایەن سەرکردایەتی شۆڕشی کوردەوە شەتوپەت کرد و حکومەتێکی ئۆتۆنۆمی لە کوردانی پلەوپایەخواز دامەزراند. بەو پلانە حکوومەت

ناوچەیەکی زۆری کوردنشینی بە کەرکوکیشەوە لە کوردستان دابڕی، دانیشتوە کوردەکانی دەردەکرد و عەرەبی لە شوێنیاندا دادەمەزراند. لەلایەکی تریشەوە هەندێ ناوچەی کوردنشینی پڕنەفتی دەخستە سەر پارێزگا عەرەبییەکانی وەک موسڵ و دیالی و تکریت. حکومەتی بەعس هەوڵێکی سەرنەکەوتووشی دا بۆ کوشتنی رابەری شۆڕشی کورد مەلا مستەفای بارزانی و هەر خەریکی پتەوکردنی پەیوەندی دیپلۆماسی و سیاسی و ئابوریش بوو لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەتا. حکومەتی بەعس بەو کردەوە بێباکانەی وەک دەڵێن پشتی خۆی لێ کردبۆوە و پەیامی بۆ شۆڕشی کورد ئەمە بوو " حوکمی زاتیتان دەویست، فەرموون ئەوە حوکمی زاتی، ئەگەر پێشی نارازین دیارە ئێوە ئەجێندایەکی بێگانەتان لەژێر سەرایە. " خۆی لەلایەکەوە ناشکرێت نکۆڵی لێ بکرێت کە چەسپاندنی سیستەمی حوکمی زاتی بۆ کوردستان لەناو دەستوری عیراقا سەرکەوتن و دەسکەوتێکی مێژوویی گەورە بوو بۆ گەلی کورد لە عیراق و هەر ئەوەش بوو دروشمە هەڵکراوەکەی شۆڕشی کورد ( دیمۆکراسی بۆ عیراق، ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان) بەڵام لەلایەکی ترەوە بە چ شێوەیەک پیادە کرا ئەمەیان بابەتێکی دیکەیە.

حکومەتی بەعس دیار بوو ئەمجارە خۆی بە دۆستایەتی لەگەڵ مۆسکۆ پشتئەستور کردبوو و نێوانی لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کوردا گەیشتبووە پێتکی نائومێدی و لێواری لێکترازان. جا بۆ ساڵیادکردنەوەی ئەم یانزدەی ئازارە مێژووییە وەزارەتی دەرەوەی عیراق داوای لە باڵیۆزی عیراق لەڤیەننا (جاسم العزاوي) کرد من بنێرێتەوە بۆ بەغدا بۆ ئەوەی بە گۆرانی بەشداری لە ئاهەنگەکانی یانزدەی ئازار لە بەغدا بکەم. گەڕامەوە بۆ بەغدا . هەنگی کاک موحسینی برام وەک باڵیۆز لە کەنەدا نەمابوو، گەڕێندرابووەوە بۆ بەغدا و کرابوو بە وەزیری کار و نیشتەجێ کردن لە بەغدا. بەڵام ئەو دەیزانی کە بارودۆخەکە لە تەقینەوە دایە بۆیە مۆڵەتێکی چەند

هەفتەیی لە سەرکۆمار احمد حسن البکر وەرگرتبوو بە بیانۆی ئەوەی کە برایەکی لە ئاڵمانیا دکتۆر ئەنوەر زۆر نەخۆشە و پێویستە سەری لێ بدات - کە واش نەبوو - ئیتر بەم جۆرە کە من چووم بۆ بەغدا کاک موحسین چەند رۆژێک بوو خۆی رزگار کردبوو. زۆر دواتر پێی گوتم ئەگەر بیزانیایە وا خەریکی گەڕانەوەم بۆ بەغدا، نەیدەهێشت بگەڕێمەوە، چونکە دەیزانی بارودۆخ لە تەقینەوە دایە. کاک موحسین هەر ماوەیەکی کورت دوای چوونەدەرەوەی لە عیراق نامەی دەست لەکارکێشانەوەی وەک وەزیری عیراق لە ئەورووپاوە ناردەوە بۆ حکومەتی بەعس. جا کە گەیشتمە بەغدا ئەو لەوێ نەمابوو و من و رووناسی هاوسەرم و کچەکانمان نازداری تەمەن ساڵێک و شتێک و لارای تەمەن دوو مانگێک لە ماڵی کاکە سەعدی برام لە بەغدا لە گەڕەکی (عرصات الهندیة) دابەزین.

لە بەغدا منیان برد بۆ ستۆدیۆی تی ڤی عیراق بۆ ئەوەی چەند گۆرانییەکی نوێ بەبۆنەی ئاهەنگەکانی یانزدەی ئازار تۆمار بکەم. جا لێرەدا با قسەیەکی خۆشتان بۆ بگێڕمەوە. بەڕێوەبەری گشتی رادیۆ و تەلەڤیزیۆنی عیراق بەڕێز محمد سعید الصحاف بوو کە دواتر کرا بە وەزیری راگەیاندنی حکومەتی بەعس و بە "علوج" ناوبانگی دەرکردبوو. دەقی هەر گۆرانییەک پێش بلاوکردنەوەی دەبوایە بەڕێز الصحاف بیدیبایە ئینجا یان چرای سەوزی ئەدایە یان قەبوڵی نەدەکرد ئەگەر لە رووی سیاسی یان ئایینی یان کۆمەڵایەتییەوە شتێکی قەبوڵنەکراوی تێدا بوا. گۆرانییەکانی منیان بۆ تەرجومەی عەرەبی کردبوو کە یەکێکیان (چەندی گەڕام لەشاران) بوو یەکێکیان (ئامینێم تاقانەی دایێ) و چەند گۆرانییەکی تریش. کە خوێندبوویە داوای کردبوو من ببینێ. چووم بۆ لای بەڕاستی رێزێکی زۆری لێ نام و خۆیشی لە قسەکردن و رەفتارا زۆر بەڕێز بوو. قاوەمان خواردەوە ئینجا گوتی ئوستاد عمر، ئەگەر بکرێ هەندێ وشەی هەندێ لە گۆرانییەکانت بگۆڕی باشترە چونکە خۆت ئەزانی کۆمەڵگای ئێمە

هێشتا نەگەیشتوەتە ئەو ئاستە کە شتێ وا قەبوول بکات. گوتی من خۆم هیچ کێشەیەکم لەگەڵ وشەکانی گۆرانییەکانتا نییە بەڵام دەبێ راو زەوقی خەڵک لەبەر چاو بگرین. بەڕێز الصحاف بۆ نموونە چەند کۆپلەیەک لە گۆرانی (ئامینێم تاقانەی دایێ) ی پیشان دام کە دەڵێ:

چەندی دەکەم دڵ پیر نابێ
دەستم لە مەمکان گیر نابێ
یار منداڵە و بۆم ژیر نابێ
ئامینێم تاقانەی دایێ

منیش بە زەردەخەنەیەکەوە پێم گوت "ابو... {ناوی منداڵەکەیم لەبیر نەماوە} خۆت ئەزانی من ئەم گۆرانییانە بەکوردی دەڵێم. لە ئەدەبیاتی گۆرانی کوردیدا بەکارهێنانی ئەم جۆرە وشانە زۆر باوە و زۆر نۆرماڵە. زۆر جار گۆرانیبێژی کورد لەماڵێکا گۆرانی دەڵێت کە دایک و خوشک و ژن و دەر و دراوسێ هەموویان دانشتوون گوێ لەم جۆرە گۆرانییانە رائەگرن و چ عەیبەی تیا نییە. حەسەن زیرەک یەکێکە لەو گۆرانیبێژانەی کە بە دەنگی خۆش و ئەم چەشنە گۆرانییانە ناوبانگی پەیا کردووە. کە ئەم قسانەم بۆ کرد گوتی بەخوا نەمدەزانی کە کۆمەڵگای کورد لەم رووەوە ئەوەندە کراوەیە کەوابوو گوێی مەدەرێ بڕۆ بە ئارەزووی خۆت هەمووی تۆمار بکە. بە پێکەنینیشەوە گوتی منیش گوێبیسیان دەبم. ئەوە بوو کە ئەو کۆمەڵە گۆرانییانەم لەو بەهاری ساڵی 1974 لە ستودیۆی تی ڤی بەغدا تۆمار کرد. دوو گۆرانی کە پێشتریش ساڵانی 69 و 70 لە دوو کۆنسێرتی بە بۆنەی نەورۆزی ئەو ساڵانە لە بەغدا تۆمارم کردبوون، شاکارەکانی عەبدوڵا گۆران (گوڵی خوێناوی) و (جوانی بێ ناو) ئەوانەشم لەگەڵ باندێکی نوێ دووبارە تۆمار کردەوە. گۆرانییە سێنتیمێنتاڵەکەی شیعری ئەحمەد هەردی و ئاوازی یۆنانی (تاقانە غونچەکەی باخی ژیانم) ئەوەشم بە یاوەریی تەنها ئامێری پیانۆ کە هونەرمەندێکی میسری بۆی لێ دەدام

تۆمار کرد. ئەم گۆرانیانەم دران بە تی ڤی کەرکوک کە رۆژانە لێ دەدران و دەنگێکی بێ وێنەیان دایەوە. سەفەرەکەم تا ئێرە زۆر سەرکەوتوو بوو. بەڵام ببینن چۆن هەموویم لە لووت هاتەوە.

## خۆم و ژن و منداڵم و براو برازام هەموومان گیراین

پێشتر گوتم کە من و خێزانم لە ماڵی کاکە سەعدی برام لە بەغدا لە گەڕەکی (عرصات الهندیة) دابەزیبووین کە کاک وریای برازام و نەسرینی هاوسەریشی هەر لەوێ دەژییان. کاک وریا ئەوسا هێشتا خوێندکاری زانکۆ بوو لە بەغدا. چەند رۆژێک بوو ئەم میوانانەشمان لە هەولێرەوە هاتبوون: کاک ئەحمەدی برام باوکی وریا، سەبیحەخانی دایکی نەسرین خەسووی وریا کە بۆ سەر دکتۆر هاتبووە بەغدا و کێخوا سمایلی دووگردکان ناسراو بە (کاکە سمە). ئەمانە هەموومان لە ماڵی کاک سەعدی بووین. دەنگۆش بڵاو ببووەوە کە لە هەندێ بەرەی شەڕا تەقوتۆق دەستی پێ کردبۆوە. شەوێکیان هەموومان لەپرخەی خەوێدا بووین کاتژمێر 2:30ی دوای نیوەشەو زەنگی دەرگاکەمان زرینگایەوە. کە کاک سەعدی پرسیاری کرد کێیە گوتیان بیکەرەوە ئێمە لە دەزگای ئەمنەوە هاتووین. کە دەرگای کردەوە بینی چەکدارێکی زۆر بە ماشینی ئەمنی عیراقی بەردەمی ماڵەکەمان و هەردووسەری کۆڵانەکەمانیان گرتووە و گوتیان کەس لێرە ناچێتە دەرەوە هەموو ئەوانەی لێرەن بە ژن و منداڵانیشەوە لەگەڵ ئێمە سوار دەبن بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی بەغدا.

ئەمنەکان، ئێمە گشتمانیان خستە ناو پاسێکی درێژ و کلیلەکانی ماڵەکەیان لێ وەرگرتین و کلیلیان دا، زنجیرێکی قەف ئەستووریشیان بە تۆپێکی زل بە دەروازەی باخچە چکۆلانەکەی خانووەکەوە کرد و مۆرێکی ئەمنییان لێ دا. ئەوەندەی تکا و رجامان لێ کردن کە منداڵی شیرخۆرەمان هەیە و ژنێکی نەخۆشیشمان لەگەڵدایە (لارای

کچم ئەمەنی دوو مانگی تەواو نەکردبوو و نازداریش ساڵێک و دوو مانگ بوو و سەبیحە خانی خەسووی وریای برازاشم بۆ سەر دکتۆر هاتبووە بەغدا) کەچی دادی نەداین و بەم دوای نیوەشەوە ساماناکە ئێمەیان نازانم بۆ کوێ برد. ئەمنەکان دیار بوو ئەدرێسی ماڵە کوردی تریشیان لابوو، پاسەکە ناوە ناوە لە کۆڵانێک لای دەدا و لەبەردەم ماڵێک دەوەستا کە کورد بوو. ئەوەی بەسەر ئێمەیان هێنابوو، بە هەمان شێوە ئەوەی لەو ماڵە بوایە بە خاوخێزانەوە، بە ژن و منداڵ و پیر و نەخۆشیشەوە هەموویان دەپەستایە ناو پاسەکەوە، خانووەکەی ئەوانیشیان بە زنجیر و تۆپ کلیل دەدا و مۆری ئەمنییان پێوە دەنا. بەم جۆرە پاسەکەیان پڕ کرد لە ماڵە کوردی دانیشتووی بەغدا و (راوە کورد)ەکەی خۆیان لەو گەڕەکە بە ئەنجام گەیاند. دوو ئاسایشی چەکداریش لەتەنیشت شۆفێری پاسەکە وەستابوون، پشتیان لە شۆفێرەکە و روویان لە ئێمە بوو. هەرچەندی لێمان دەپرسین بۆ کوێمان دەبەن، دەیانگوت ئێمە نازانین. پاسەکە کات چوار و پێنجی بەیانی گەیشتە بەردەم بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی بەغدا (الامن العامة) و لەوێ وەستا. دەرگاکانی پاسەکەیان داخستبوو و نەیاندەهێشت کەس دابەزێت و چەکدارەکان چاوەدێرییان دەکردین. تەنیا بۆ ئاودەست ڕێگایان دەداین، ئەوەش دەبوایە ئەمنێک لەگەڵیدا بچێت و بیهێنێتەوە بۆ ناو پاسەکەوە. سەیرمان کرد پاسێکی پڕ لە ماڵەکوردی تریش پێش ئێمە گەیشتبووە ئەوێ و دوای ماوەیەک پاسێکی پڕ ماڵەکوردی دیکەش گەیشت و بووین بە سێ پاس. ماڵی ئێمە لەناو ئەو پاسە ئەمانە بووین: کاک سەعدی برام، کاک ئەحمەدی برام، وریای کاک ئەحمەدی برازام، نەسرینی هاوسەری وریا، سەبیحەخانی خەسووی وریا، کاکەسەمەی دووگردکان، ئینجا خۆم و رووناسی هاوسەرم و نازدار و لارای کچەکانم.

ئەمنەکان کاکەسەمەیان دابەزاند و ئازادیان کرد، دوای ئەوەی تێی گەیاندن کە ئەو میوانی بەڕێز عەبدوڵا ئیسماعیلی وەزیری

دەوڵەتە (ناسراو بە مەلا ماتۆڕ) و بۆ لای ئەو هاتووەتە بەغدا. منیش هەوڵێکی زۆرم لەگەڵ دان کە میوانی بەڕێز (محمد سعيد الصحاف) ی بەڕێوەبەری گشتیی رادیۆ و تی ڤی عێراقم و حکومەت بە رەسمی منی بۆ ئاهەنگەکانی یازدەی ئادار لە نەمساوە بانگهێشت کردووە. کۆڤارێکی (الف باء)ی عێراقیشم پیشان دان کە لە ماڵەوە لەگەڵ خۆما هەڵم گرتبوو و چاوپێکەوتنێکی دوورودرێژی بە وێنەی جوان جوانی لەگەڵ مندا تێدا بوو، کە بەخێرهاتنەوەم دەکەن. گۆڤارەکەیان لێ وەرگرتم و تێیان هەڵدا و گوتیان لە شوێنی خۆت دانیشە ئیتر قسە نەکەیت. ئەوانەی کە لەناو پاسەکەی ئێمەدا بووین ئەمانەم دەناسی، یان دۆستایەتیم لەگەڵ یەکێک لە ئەندامانی خانەوادەکەیاندا هەبوو: گەلاوێژ خانی هاوسەری کاک دارا تۆفیقی برادەری کۆنم، ناهیدەخانی شێخ سەلام، هاوسەری کاک نووری شاوێس، دایکی دکتۆر رۆژ و دکتۆر رەنج و براکانیان، فەوزیەخانی هاوسەری کاک سامی عەبدولڕەحمانی برادەری رۆژانی پێشمەرگایەتیم و هاوکاری رادیۆی دەنگی کوردستانم لە شاخی گردەڕەش. فەوزیەخان منداڵەکانی و وابزانم برایەکی ناتوانای خۆیشی لەگەڵدا بوون، خوشکێکی کاک شەماڵ سائیبی هونەرمەندیش بە خۆ و بە مێردەوە کە پێم وایە لە بنەماڵەی خەفاف بوو، بەداخەوە ناوەکەیم لەبیر نەماوە. ئەوەندە کەسەی ناو پاسەکەمانم دەناسی.

پێش خۆرهەڵات، سەر و سەموونێکی رەقیان پێ داین، کە قاشە پەنیرێکی تێ پەستێنرابوو. هەر سێ پاسی پڕ ماڵە کورد بەڕێ کەوتن، دوو ماشینی پڕ چەکداری ئاسایش لەپێش پاسەکان و دووانیش لەپشتیانەوە دەڕۆیشتن. بۆ کوێ؟ بۆ رێی هاتونەهاتێ. کەسمان نەماندەزانی بۆ کوێمان دەبەن، پاسەوانەکانمان هیچیان پێ نەدەگوتین. ئێمە هەر لەناو خۆماندا کەوتینە مەزەندە و لێکدانەوە، هەندێکمان دەیانگوت بەو خوایە دەمانبەنە چۆڵ و بیابانی لای ئەنبار و لەوێ زیندەبەچاڵمان دەکەن. ئیتر هەر یەکە رەملێکی بۆ دەهات.

منداڵەکانی من شیریان لێ بڕابوو و برسییان بوو هەر دەگریان. دڵمان کەمێک بەوە خۆش بووەوە کە بینیمان کاروانەکەمان رووی کردووەتە باکوور و بەرەو کوردستان کەوتووەتە رێ. بەڵام لێرەشدا هەندێ لەناوماندا دەیانگوت بەو خوایە دەمانبەنە سەرەوە و بەپێش هێزی چەکداری حکوومەتمان دەدەن بۆ هەڵمەت بردنە سەر پێشمەرگە. دەیانگوت حکوومەت بەم شێوەیە دەیەوێ ئەو شوێنانە بگرێتەوە کە لەژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدان و پێشمەرگەیان ئاگادار کردووە تەقە بکەن ماڵ و منداڵی خۆیان دەکوژن، چونکە ئەوان لەپێش هێزەکە دەڕۆن. ئیتر بەم بۆچوون و لێکدانەوانە کەوتبوونە ژێر باری نیگەرانی و خەم و خەفەتەوە. چێشتانگاو بوو کە قافڵەکەمان گەیشتە کەرکووک و لە شوێنێک وەستا، کە هەندێ دوکانی خواردەمەنی و ساردەمەنیی سەرڕێی لێ بوو. لەوێ ماوەیەکی باش گیر بووین و توانیم لەو دوکانانە چەند بوتڵێ شیر بۆ منداڵەکانم پەیدا بکەم و توانیمان هەندێ خواردەمەنیی تریش لە کیۆسکەکانا بکڕین. جا لێرەدا با دیمەنێکی زۆر سەیر و چاوەڕێنەکراوتان بۆ بگێڕمەوە: ناهیدەخان بە بیانووی چوونە توالێت، کە ئەمنەکانیش چاوەدێرییان دەکرد، ماوەیەک لەوێ گیر بوو. کە گەڕایەوە ناومان پێشتر بە جلی مۆدە بوو، کەچی بینیمان وەک جادوباز یەک دەستە جلی کوردیی لەبەردایە و سواری پاسەکە بووەوە. گوتمان ناهیدە خان ئەم جلانەت بەم دەمودەستە لە کوێ بوو؟ چۆن وا بەم خێراییە خۆت گۆڕی؟ گوتی بەخوا هەلێکی باشم بۆ رێک کەوت، باش بوو ژنێکی ناسیاوم بینی و جلەکانی خۆم لەگەڵ هی ئەوا گۆڕییەوە، چونکە جلی مۆدە بۆ ناوشاخ دەست نادات. جا نەمانزانی بە راستی وای کردووە یان هەر لە بەغداوە دەستە جلێکی کوردیی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو و چوو لە توالێتەکە خۆی گۆڕی. پێمان دەگوت ناهیدەخان شاخی چی و حاڵی چی! بۆچی ئێمە بەتەماین بە زیندوویی بگەینە شاخ؟ کەچی سەرەڕای نەهامەتی و نەزانینی سەرئەنجاممان، ناهیدە خان ورەی لە

هەموومان بەرزتر بوو و هەر نوکتەی خۆشی بۆ دەکردین و دەیهێنایە پێکەنین. کاروانەکەمان کەوتەوە رێ و جارێ هێشتا نەماندەزانی رووە و سلێمانی یان هەولێر دەڕوات. رێی هەولێری گرت. لە دەشتی هەولێر نزیک قوشتەپە، گوندی دووگردکانەکەی زاگەی خۆمم لەدوورەوە لێ بەدەر کەوت. سۆزی نۆستالجیام هەڵستا. بەهارێکی تەڕی زۆر سەوز بوو و هەندێ نێرەکەرم بینی زۆر بە دڵخۆشییەوە لەناو مێرگ و مێرغوزارا دەلەوەڕان و ناوە ناوە هەرامەکەیان لەبن زگی خۆیان دەدا و پڕمەیان دەهات. دیمەنەکە ئەوەندە کاری تێ کردم کە لە دڵی خۆما دەمگوت خۆزگەم بەخۆتان نێرەکەرینە. گەیشتینە هەولێر، کاروانەکەمان لەپێش بەرێوەبەرایەتیی ئاسایش وەستا و نەیانهێشت کەسمان بچینە دەرەوە. کاک تاریق نادری برای کاک فایەق نادر و کاک تەڵعەت نادری بنەماڵەی دۆستی دێرینی ئێمەی دزەیی، دیار بوو یەکێک بوو لە شۆفێرەکانی ماشینی ئاسایشی هەولێر. کە کاک تاریق لەدوورەوە چاوی بە ئێمە کەوت، بە سەرسامییەوە یەکسەر هات بۆ لامان. کاک ئەحمەدی برام پەنجەرەی لای خۆی کردەوە و پێی گوت تاریق بەپەلە محەممەد حەسەن تێ بگەیەنە کە ئێمە هەموومان گیراوین چارێکمان بۆ بکات. هەندێ ئەمنی عەرەب ئەوانیش لەدوورەوە کە دییان تاریق لەگەڵ ئێمە قسە دەکات، یەکێکیان هات پشتی ملی تاریقی گرت و بە جنێودان لە ئێمەی دوور خستەوە. ئێمە زۆر نیگەران بووین کە تاریقی بێ گوناە لەسەر ئێمە تووشی بەڵایەک بێت.

کاروانەکەمان کەوتەوە رێ و دیسان نەماندەزانی بۆ رێی کۆیە یان رێی مەسیف دەڕوات. رێی مەسیفی گرت. گەیشتینە پنتکی پشکنینی هەولێر- مەسیف و لەوێ بۆ ماوەیەک وەستا و دیار بوو ئەمنەکانی ئێمە لەگەڵ بەرپرسانی سەیتەرە قسەیان دەکرد. دیمان کاک تەڵعەتی حاجی ئەمینی دزەیی ئامۆزایەکی خۆمان بە تاکی تەنیا بە ئۆتۆمۆبیلەکەی خۆی دەچێتە مەسیف. کە سەیری پاسەکەی

ئێمەی کرد و ئێمەی بەم حاڵە دی وەستا و پەنجەرەکەی خۆی کردەوە و کاک ئەحمەدی براشم پەنجەرەی پاسەکەی کردەوە و بەپەلە پێی گوت تەڵعەت بەخێرایی محەمەد حەسەن ئاگادار بکە کە ئێمە هەموومان گیراوین و نازانین بۆ کوێمان دەبەن. کاک تەڵعەت یەکسەر بای دایەوە بۆ هەولێر و بەخێراییەکی تیژەوە بۆی دەرچوو.

لە پنتکی پشکنینی هەولێر - مەسیف دوای سەین و بەینێکی نێوان خۆیان، چەند ئەفسەرێکی سەربازیشیان رەگەڵ داین و بەرێ کەوتینەوە، مەسیفیشمان بڕی و بەرەو شەقڵاوە دەرچووین. لە ساکەگۆڕێکی ناو ئەو ناوچە شاخاوییە قافڵەکەمان وەستا و ئەمنەکان ئەمجارە ئازادییان پێ داین لە پاسەکان دابەزین هەوایەکی ئازاد بچێژین و لەژێر دار و دەوەنەکانیشا پێداویستییەکانی خۆمان جێبەجێ بکەین. ئێمەش سوارەکانی هەر سێ پاسەکە دابەزین و کەوتینە قسە و لێکدانەوە لەگەڵ یەکتریدا. هەڵمژینی هەوای ئازاد بەتایبەتی لە وڵاتی خۆماندا وەک هەستی منداڵی ساوام دەهاتە بەرچاو، کە لە باوەشی دایکیدا مەمکی دەمژێ. پێمان سەیر بوو بۆ وا لەپڕێکدا هەڵوێستیان گۆڕا. لێمان دەپرسین بۆ کوێمان دەبەن، ئەمجارە وەرامیان دەدایەوە و دەیانگوت دەتانێرینە لای کەسوکارەکانتان لە شاخ، هەوڵ بدەن پێیان بسەلمێنن بگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆیان. دەیانگوت ئەگەر ناشگەڕێنەوە و ئێمەیان ناوێ ئێمەش ئەوانمان ناوێت. ئەم وشە نەرمانە تۆزێ فەرامۆشیی وەبەر هێناینەوە و ترسی ئەوەمان نەما کە بەپێش قافڵەی زرێپۆشی سەربازیمان بدەن بۆ ئەوەی پێشمەرگە تەقەیان لێ نەکات. دوای حەسانەوەیەکی باش، ئینجا سواری پاسەکانیان کردینەوە و بەرەو شەقڵاوە کەوتینەوە رێ.

پێم وایە پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ بوو کە گەیشتینە شەقڵاوە. ئێمەیان بردە باڵاخانەی قوتابخانەیەکی چۆڵکراو، هەموومانیان دابەزاند و ناردیان برنج و شلەمان بۆ هات. بەتانی و سەرینێکی زۆریشیان بۆ هێناین، کە شەوەکە لەوێ بەسەر بەرین، ئینجا بۆ بەیانی بە حیساب

ڕەوانەی لای کەسوکارمان بکەن لەناو شاخەکان. شوێنەکە سەربازێکی زۆری لێ بوو و پاش ماوەیەک ئامیر فەوجێک هات بۆ لامان، ناوی (حميد التكريتي) بوو و هاتبوو قسەمان بۆ بکا. لێرەدا بەویژدانەوە دەڵێم کە ئەو ئەفسەرە وەک باوکێک یان براگەورەیەک هاتە گفت. زۆر بە نەرمی و ڕووخۆشی و هەندێ جار بە دەم بەپێکەنینیشەوە لەگەڵماندا دەدوا و قسە و پرسیاریشی لە ئێمە وەردەگرت. دەیگوت ئێمە دەزانین کە ئێوە هەمووتان یەکێک دووان لە خزم و کەسەکانتان لە شاخایە، بڕۆن بۆ لایان با بگەڕێنەوە بۆ خزمەتکردنی ئەم وەتەنە، وا حوکمی زاتیتان پێ دراوە ئیتر چیتان دەوێ، بۆ نایەنەوە. لێرەشدا ناهیدەخان زۆر بە جورئەتەوە بەجواب هات و پێی گوت: "بەو خوایە مێردەکەی من (نوری شاوێس) ئێستا هەموو منداڵەکانی لێرە سەر ببڕن ناگەڕێتەوە، ئیتر چ پێی ناوێ خۆتان ماندوو بکەن، ئەو ڕێگا سەخت و ناخۆشەش بە ئێمە ببڕن، خۆ ئێمە خۆمان نەمانویستووە بەگەڵ ئەوان کەوین، ئیتر بۆچی ئێوە وا بە داری زۆریی پاڵمان پێوە دەنێن بۆ لای ئەوان؟!". ئێمە بەڕاستی نیگەران بووین کە کابرای ئەفسەر ڕەنگە بە قسەکانی ناهیدەخان تووڕە ببێت و ئیتر ریسەکەمان لێ ببێتەوە بە خوری. بەڵام وا دەرنەچوو و ئەو هەر پێ دەکەنی.

شەو داهات و ئەوەی نووست ئەوەی تا بەیانی خەوی لێ نەکەوت، شەوەکەمان بردە سەر. بۆ بەیانی نان و ماست و چایان بۆ هێناین، دوای ئەوە ئەفسەر (حميد التكريتي) دیسان هاتەوە لامان. ئەمجارە لیستێکی هەندێ ناوی پێ بوو کە بۆمانی خوێندەوە ئەو کەسانە ئازاد دەکرێن و ئەوانی دی وەک بڕیاری پێشوو ڕەوانەی سەرەوە دەکرێن. دیار بوو ماڵی ئێمە بە یارمەتیی وەزیری دەوڵەت مەلا عەولا (مەلا ماتۆڕ) کە کۆنە جەلالی بوو، لە لیستەی ئازادکراوەکاندا بووین. چەند ماڵێکی تریش و گەلاوێژخانی هاوسەری دارا تۆفیق کە دووگیان بوو و وەزعی تەندروستیی زۆر خراپ بوو، ئەوانەیش لەناو لیستی ئازادکراوەکاندا بوون. لێرەدا ماڵاوایەکی تێکەڵەی خۆشی

و ناخۆشیمان لـە خوشـک و براکانـی دیکەمـان کـرد و ئێمەیـان خسـتە نـاو چەنـد ئۆتۆمۆبیلێـک و گوتیـان دەتانگەیەنینـەوە ماڵەکانـی خۆتـان لـە بەغـدا. کـە گەیشـتینە هەولێـر گوتمـان ئێمـە دەمانـەوێ لێـرە دابەزیـن، بۆچـی بچینـەوە بەغـدا، نەیانهێشـت. بـەڵام توانیمـان قەناعەتیـان پـێ بێنیـن کـە هـەر نەبـێ گەلاوێژخـان دووگیانـە و لەسـەر منداڵبوونایـە لەوانەیـە نەگاتـە بەغـدا، پێویسـتە یەکسـەر بیبـەن بـۆ نەخۆشـخانە. بـاش بـوو بـەوە رازی بـوون کـە لـە هەولێـر دابەزێـن. ئێمـەش کەسـوکاری خۆمـان لـە هەولێـر راسـپارد کـە گەلاوێـژ خـان ببـەن بـۆ نەخۆشـخانە و سـەری لـێ نەبـڕن تـا لـە هەولێـرە چـی پێویسـت بـێ لـە یارمەتـی بـۆی بکـەن. ئـەو لـەوێ بەجـێ مـا و ئێمـەش بـۆ بەغـدا کەوتینـەوە رێ. لـە بەغـدا ئێمەیـان بـرد بـۆ (امـن العامـة) بـۆ لای بەڕێوەبـەر. هەنـدێ قسـەی بـۆ کردیـن، ئینجـا کلیلەکانـی ماڵەکانمانیـان داینـەوە و چیرۆکـە ئۆدیسـێکەمان Odessey لێـرەدا کۆتایـی هـات.

جـا لێـرەدا شـایانی گێڕانەوەیـە، کـە ئـەو بەرەبەیانـەی ئێمەیـان لـە بەغـدا گـرت، وا بڕیـار بـوو بـۆ ئێوارەکـەی لەگـەڵ برادەرێکـی عێراقیـی دێرینـم (زهیـر الخضیـري) و هاوسـەرەکەی (منـال الخضیـري) پێکـەوە بچینـە دەرەوە. بـۆ ئێـوارە کاتـی رێککەوتنـی پێشـترمان زهیـر و منـاڵ بـە ئۆتۆمۆبیلـی خۆیـان چووبـوون بـۆ ماڵەکـەی ئێمـە (ماڵـی کاک سـەعدی بـرام) لـە (عرصـات الهندیـة). کـە دابەزیبـوون لـە دەرگا بـدەن بینیبوویـان مـاڵ تاریکـە و قوفـڵ و زنجیرێکـی قەفئەسـتوور و مـۆری ئەمنیـش بـە دەرگاکەوەیـە، تـێ گەیشـتبوون قەومـاوە و زۆر نیگـەران بووبـوون دەبـێ چیمـان بەسـەر هاتبـێ. بـاش بـوو کـە گەڕاینـەوە بـۆ بەغـدا یەکسـەر چووم بـۆ ماڵیـان و سـەربردەی خۆمانـم بـۆ گێڕانـەوە، نەمویسـت بـە تەلەفـۆن ئـەو باسـەیان لەگەڵـدا بکـەم.

هـەر بـۆ زانیاریـش، ئـەو (حمیـد التکریتي)یـە پیـاوە باشـەی کـە لەسـەرەوە باسـم کـرد، دواتـر کـرا بـە ئامیـر فەیلـەق، بـەڵام دیـارە لـە شـەڕێکی نێـوان عێـراق و ئێـران لـە هەشـتاکاندا فەیلەقەکـەی شکسـت

دێتــێ. ســەدام بەدوایــدا دەنێــرێ، ئەویــش کــە خــۆی تکریتــی بــوو و ئەزموونــی لەگــەڵ ســەدامدا هەبــوو، دەیزانــی ســەدام لــە حاڵەتــی وا بەدوای ئەفســەرێکی گــەورە بنێــرێ مانــای کوشــتنیەتی. کــە دەچــن بــۆ ماڵــی بیبــەن بــۆ لای ســەدام لوولــەی دەمانچەکــەی بــە ســەری خــۆی وەدەنێــت و خــۆی دەکــوژێ.

رووناس هاوسەری هۆمەر دووگیانە بە لارای کچیان ، ڤیەننا سەرەتای 1974

ناهیدە شێخ سەلام لە یەکەم کۆنفەرانسی مامۆستایانی کورد لە شەقلاوە ساڵی 1959

هۆمەر دزەیی 1967 بە 30 ساڵی

کچەکانم لە راستەوە : نازدار ، لارا ،
لە شاری رێدینگ ، ئینگلتەرە

ناهیدە شێخ سەلام 1955

وریا ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی
برازای هۆمەر

موحسین دزەیی
برای هۆمەر

سەعدی دزەیی
برای هۆمەر

ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی
برای هۆمەر (1925 - 1976)

دکتۆر ئەنوەر دزەیی
برای هۆمەر (1930 - 2017)

کێخوا سمایلی دووگردکان ناسراو بە (کاکەسمە) یەکێک لە گەورە پیاوانی خێڵی پاڵانی. (1926 - 2003)

محمد سعید الصحاف بەڕێوەبەری رادیۆ و تی ڤی عیراق، دواتر وەزیری راگەیاندن.

# بەشی 29

## گەڕانەوەم بۆ ڤیەننا لە پۆستەکەی باڵیۆزخانەشم لە ڤیەننا دەرکرام

کە گەڕاینەوە بۆ بەغدا، یەکسەر هەڵستام مشووری گەڕانەوەم بخۆم بۆ ڤیەننا. خواخوام بوو زووترین فڕۆکەم دەست کەوێت و بۆی دەرچم. هەر واش بوو و باش بوو بێ کێشە گەیشتینەوە ڤیەننا. لەوێ هەموو شتێکم بۆ باڵیۆزەکەم (جاسم العزاوي) کە بەعسی نەبوو ناسری بوو، گێڕایەوە و زۆری پێ ناخۆش بوو. هەروەها سەربردەکەم بۆ (مالک الیاسري)ی برادریشم گێڕایەوە، کە ئاوەڵزاوای (زهیر الخضیري) بوو.

هێندەی نەبرد دوای گەڕانەوەم بۆ ڤیەننا، کاک موحسینی برام و کاک سامی عەبدولڕەحمان وەک نوێنەری شۆڕش راسپێردرابوون گەشتێک بە ئەوروپادا بکەن، بۆ ئەوەی رای گشتیی و کاربەدەستانی وڵاتانی ئەورووپا لە ستەمکاریی حزبی بەعس بەرامبەر بە گەلی کورد ئاگادار بکەنەوە. لەبەر وەزعی من کە کارمەندی عێراق بووم لە باڵیۆزخانە، زۆر بە نهێنییەوە پەیوەندییان پێوە کردم. منیش کە هەر خۆم لە باڵیۆزخانە کاری تەرجومانی و رۆژنامەوانیم پێ سپێردرابوو و رۆژنامەنووسە گەورەکانی نەمسام دەناسی، هەر بە نهێنی ئەوانم بە هاتنی ئەو دوو نوێنەرەی شۆڕشی کورد ئاگادار کرد. ئەوە بوو کە پەیوەندییان پێوە کردبوون و تەواوی رۆژنامە سەرەکییەکانی نەمسا چاوپێکەوتنی دوورودرێژیان لەگەڵدا کردن. باڵیۆزخانەی عێراق لە ڤیەننا بەمە زۆر تێک چوو و خودی باڵیۆز قسەی لەگەڵمدا کرد

ئەگەر من پەیوەندیم لەگەڵیاندا بووبێ. پێم گوت من نکۆڵیی لێ ناکەم کە برام هاتووە و بینیومە، بەڵام گوتم بۆ پەیوەندیکردن بە میدیاوە چ پێویستییان بە من نییە و خۆیان هەموو ئەورووپا گەڕاون و ئینگلیزییەکی باشیش دەزانن و ڕۆژنامەوانیش خواخوایانە شتێکی وایان دەست کەوێ. هەر چۆنێکی بێ هێندەی نەبرد لە وەزارەتی دەرەوەی عێراق فەرمانی دەرکردنی من و (مالک الیاسري)ی برادەریشم دەرچوو و هەردووکیان فەسڵ کردین. مالکی بەدبەختیش کە برادەری خۆم و هی کاک موحسینی براشم بوو، ئەویش بە ئاگری ئێمەوە سووتا. دواتر بەعسییەکان لە بەغدا باوکی مالک (سید حمید الیاسري)یشیان کوشت.

کە لە پۆستی باڵوێزخانە لە ڤیەننا دەریانکردم، یەکسەر لەلایەن شۆڕشی کوردەوە کرام بە نوێنەری شۆڕش لە نەمسا. باش بوو کە پێشتر بەهۆی پەیوەندیم لەگەڵ میدیای نەمسا ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژنامەوانانی چاپەمەنی و تی ڤیم دەناسی و دەستم کرد بە جۆرێکی تر لە پەیوەندی لەگەڵیاندا.

لەم ماوەی هاوینەشدا کە دەستم بەر بووبوو لە باڵوێزخانە، چاپێکی دەستیم کڕی کە بتوانم ئەدەبییات و بڵاوکراوەکانی شۆڕش تەرجومەی زمانی ئاڵمانی بکەم و تایپیان بکەم و بەسەر میدیاکانا بڵاویان بکەمەوە.

لەپاش ڕێکەوتنە بەدناوەکەی الجزائیریش (شەشی ئاداری 75) لە نێوان سەدام حوسێن و شای ئێرانا کوردانی ناو شۆڕش ڕووبەڕووی سێ بژار بوونەوە:

1 - بگەڕێنەوە بۆ عیراق و حکوومەتی عیراق لێیان خۆش دەبێ.

2 - بمێننەوە لە ئێران و حکومەتی ئێرانێ وەک ولاتیەکی ئێرانی چاوی لێیان دەبێ.

3 - بە ڕێگای یوئێن UN یان هەر ڕاستەوخۆ داوای پەناهەندەیی لە ولاتێکی بیانی بکەن و ڕێگایان پێ دەدرێ بڕۆن.

هەر واش کرا. کوردانی سەر لێ شێواو هەر کۆمەڵێک یەکێک لەو سێ ڕێیەی هەڵبژارد. هەبوو گەڕانەوە، هەبوو مانەوە و هەشبوو ویستیان پەنابەریی لە وڵاتێکی ئەوروپایی یان لە ئەمەریکا و کەنەدا وەرگرن.

ئەوسا دکتۆر شەفیق قەزاز بەرپرسی ئەم کاروبارەی کوردانی عیراقی بوو و لە تارانێ دادەنیشت. کاک شەفیق بە تەلەفۆن پەیوەندی پێوە کردم هەوڵ بدەم ئەگەر بکرێ حکوومەتی نەمسا ژمارەیەک لە پەنابەری کورد وەربگرێ. منیش بە حوکمی پەیوەندی پێشترم لەگەڵ سەرۆکی فراکسیۆنی پارتی سۆسیالیستی نەمساوی (SPOe) لە پارلەمانی نەمسا، دکتۆر هاینتس فیشەر، کە هەر لە ساڵانی خوێندکاریی زانکۆییەوەی جۆرە هاوسۆزییەکی لەگەڵ پرسی کوردا هەبوو، یەکسەر بیرم بۆ ئەو چوو لەم ڕووەوە یارمەتیم بدات. چووم بۆ لای لە ئۆفیسی خۆی لە پارلەمان و حاڵی بێحاڵی کوردانی عیراقیم لە ئێران تێ گەیاند. ئەویش لە نزیکەوە ئاگادار بوو کە لە ئەنجامی ڕێکەوتنی سەدام و شا و بە فیتی هێنری کیسینجەری وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا چیمان بەسەر هاتووە بەڵێنی پێ دام کە ئەم داخوازە بگەیەنێتە پارلەمان و گوتی خۆم پەیوەندیت پێوە دەکەمەوە و ئاگامان لێک دەبێ.

دکتۆر فیشەر، کە چەند ساڵێ دواتر بوو بە سەرکۆماری نەمسا، زۆر پیاوانە ئەو کێشەیەی لە پارلەمانا ورووژاند و داوای کرد نەمسا ژمارەیەک لە کوردی داماوی عیراقی وەک پەنابەر وەربگرێت. هەر خۆیشی کۆپی ئەو داخوازە و وەرامی ئەرێنیی وەزیری ناوخۆی نەمساش بەڕێز ڕۆش Rosch ی بۆ ناردم. دیار بوو لەناو پارلەمانی نەمسا لە ئەنجامی ئاڵوگۆڕی بیروڕا لە نێوان بەڕێزان فیشەر و ڕۆشا لەسەر پرسی وەرگرتنی پەنابەری کورد وەزیری ناوخۆ ڕازی بوو کە ژمارەیەکی سنووردار لەو کوردانە وەک پەنابەر وەربگیرێن.

خۆشبەختانە کە لە دواترین چالاکیم وەک نوێنەری شۆڕشی

کورد لە نەمسا ڕەزامەندی وەرگرتنی یەکەم گرووپی کوردی عیراق بوو کە لە ساڵانی 76 یان 77 وەک پەنابەر گەیشتنە نەمسا. خۆی ئەمن ئەرکەکەی خۆم بەجێ گەیاند، قەبووڵەکەم وەرگرت ئینجا هەر ساڵی 75 بارم کرد بۆ ئینگلتەرا. پەنابەرەکانیش دوای ڕۆیشتنی من گەیشتبوونە نەمسا.

ئێستاش هەر جارێکی کە بچمەوە نەمسا هەندێک لەو گرووپی بەراییە دەبینم کە لەوێ ماون چونکە دوای ئەو گرووپە وابزانم چەندین گرووپی تریش لە کوردانی عیراق لە نەمسا وەک پەنابەر قەبووڵ کران.

***

تێ بینی: ئەم نووسینەی خوارەوەم لە کاتی خۆی لە کۆڤاری خاک، ژمارە 126, 2007/12/10 بڵاو کردۆتەوە.

نامەیەکی ساڵی 1975ی سەرکۆماری ئێستای نەمسا، دکتۆر هاینتس فیشەر، بۆ هۆمەر دزەیی

لە ساڵانی نێوان ڕێکەوتنی 11ی ئاداری 1970 تا دەست پێکردنەوەی شەڕ لە بەهاری ساڵی 1974متیش تەبای ژمارەیەک لە کوردی سەر بە شۆڕشی ئەیلول لە ناوەوە و لە دەرەوەی عیراق وەک کارمەند دامەزرام و کرام بە بەرپرسی کاروباری ڕۆژنامەوانی لە باڵیۆزخانەی عیراق لە ڤیەننا و تەرجومانی تایبەتیی باڵیۆز. کە شەڕ هەڵگیرسایەوە و زۆربەی کارمەندە کوردەکان لە کارەکانی خۆیان دەرکران منیش یەکێک بووم لەو دەرکراوانە.

بەڵام لەپاش دەرکردنم لە باڵیۆزخانەی عیراق لە ڤیەننا سەرکردایەتی شۆڕش یەکسەر کردمی بە نوێنەری شۆڕش لە نەمسا. ئەوە بوو بۆ ماوەی ساڵێک ( 1975 - 1974) واتا تا ڕۆژی شکستی شۆڕش ئەو کارەم دەکرد و پەیوەندییەکی چاکم لەگەڵ سیاسەتکارانی نەمسا و دەزگاکانی ڕاگەیاندن پێک هێنا. یەکێک لەو سیاسەتکارانە دکتۆر هاینتس فیشەر Heinz Fischer کە ئەوسا سەرۆکی فراکسیۆنی پارتی

سۆسیالیستی نەمسا SPO لە پارلەمانی فیدرالیی نەمسا.

چەندین جار چوومە لای لە ئۆفیسی خۆی لەناو بالاخانەی پارلەمان و ئەویش کە هەر لە سەردەمی لاویتیی و خویندکارییەوەی هاوسۆزی بزووتنەوە ئازادیخوازییەکانی جیهان بوو و لەناو حزبەکەی خۆی بە چەپڕەو دادەندرا. دکتۆر فیشەر یارمەتییەکی زۆری دەدام لە چالاکییەکانم وەک نوینەری شۆڕشیک لە دژی ڕەگەزپەرستانی بەعس لە عیراق.

کە شۆڕش لە ئەنجامی ڕیکەوتنی ( الجزائر) لە ئاداری 1975هەرەسی هانی ژمارەیەک لە پیشمەرگەی کورد ئارەزوویان بوو وەک پەنابەر روو لە هەندەران بکەن.

جا دەبوایە هەوڵ بدریت لەگەڵ UN و لەگەڵ حکومەتانی ئەوروپایی و ئەمەریکا ژمارەیەکی دیاریکراو لە پەنابەرانی کورد وەرگرن. ئەوە بوو کە منیش بە پەلە خۆم گەیاندە دکتۆر فیشەر و باسی ئەوەم لەگەڵیا کردەوە کە ئەگەر بکریّ چەند پەناخواز و هەندیّ بریندار و کەمئەندامی کورد وەربگرن.

ئەوەی کە لیرەدا لە ئالمانییەوە تەرجومەم کردووە نامەی بەڕیز فیشەرە بۆم کە پیم ڕادەگەیەنیّ چۆن لە پارلەمان داخوازییەکەی ورووژاندووە و دەقی ئەو پرسیار و وەرامەشی بۆ ناردووم کە لە نیوان خۆی و وەزیری ناوخۆی ئەوسای نەمسادا کراوە.

دکتۆر هاینتس فیشەر ئەوە دوو ساڵە بۆتە سەرکۆماری نەمسا لەلایەن پارتی سۆسیالیستەوە.

ئاڵوگۆڕی نامەیەکی دیکەشم هەیە لەگەڵ بەڕیز فیشەر دا لە پاییزی ساڵی 1986کە لە ئیران پەناهەندە بووم ( ئەوسا ئەو بووبوو بە وەزیری زانست و تویژینەوەی نەمسا).

هۆمەر دزەیی
سلیمانی 2007/11/24

تەرجومە کوردیەکەی دەقە ئەڵمانییەکە:

مەڵبەنــدی پارلەمەنتــاران و ئەندامانــی ئەنجومەنــە فێدراڵیــە سۆسیالیســتەکان

ڤیەننا 1017

پارلەمان

ت /421525

ڤیەننا/1975/4/20

زۆر بەڕێز مامۆستا دزەیی

مـن لـە دانیشـتنی دوێنـێ ی پارلەمانـدا ئـەم پرسـیارەم بـەم دارشـتنەی خـوارەوە ئاراسـتەی بەڕێـز وەزیـری ناوخـۆ کـرد:

" بــەو دەســتووری نەریتییــەی کــە نەمســا هــەر لــە دێــر زەمانــەوە هەڵوێستێکی مـرۆڤ دۆستانەی هەبـووە، ئایا ئێـوە هیـچ ڕێگایـەک بـەدی دەکـەن بـۆ وەرگرتنـی ژمارەیەکـی دیاریکـراو لـە پەنابـەری کـورد لـە نەمسـا؟". جـا لـەو وەرامـەی کـە هاوپێچـی ئـەم نامەیـە بۆتـان دەردەکـەوێ کـە هەڵوێسـتی وەزیـری ناوخـۆ هەڵوێسـتێکی ئەرێنـی یـە. مـن لـەو بـاوەڕە دام کـە هیـچ کۆسـپێک لـە ڕێـگادا نابـێ چ بـە هـۆی کۆمیسـاری بـاڵای پەنابــەران یــان بــە هــەر ڕێگایەکــی دیکــەی گونجــاو داواکارییەکــی پەیوەندیـدار پێشـکەش بکـەن کـە بـە ئیجابـی وەرامـی دەدرێتـەوە.

هەرچــی پەیوەندیــی بــە چالاکییەکــەی خۆتــەوە هەیــە لێرەشــدا پەیوەندیـم بـە سـکرتێری دەرەوە بەڕێـز بیلـکا کـردووە کـە رازی بـووە هەوڵـی بـۆ بـدا.

بە جوانترین سڵاوی

( ئیمزا)

دکتۆر هاینتس فیشەر

Beilage

Herrn Omar Dizey

9/3/Wallnerstrass 2

Wien 1010

تەرجەمــەی دەقــی پرســیارەکانی پارلەمێنتــار هاینتــس فیشــەر و وەرامەکانــی وەزیــری ناوخــۆ، رۆش، لــە دانیشــتنی نــاو پارلەمانــی نەمســا.

پرسیاری پارلەمێنتار فیشەر:

" بــەو دەســتووورە نەریتییــەی کــە نەمســا هــەر لــە دێــر زەمانــەوە هەڵوێستێکی مــرۆڤ دۆســتانەی هەبــووە، ئایــا ئێــوە هیــچ ڕێگایــەک بــەدی دەکــەن بــۆ وەرگرتنــی ژمارەیەکــی دیاریکــراو لــە پەنابــەری کــورد لــە نەمســا؟ "

سەرۆکی پارلەمان:

" فەرموو جەنابی وەزیر."

وەزیری ناوخۆ، رۆش:

" بەڕێــز پارلەمێنتــار، هــەر کــە داخوازێکــی لــەم بابەتــە لــە نەمســا دەکرێــت بــێ گومــان، وەک لــە رابردووشــدا کــراوە، حکومەتــی فێدەڕاڵــی ژمارەیەکــی دیاریکــراو لــەم پەنابەرانــە وەردەگرێــت."

سەرۆک: " تکایە ئەگەر پرسیارێکی دیکە هەبێت."

پارلەمێنتار د. هاینتس فیشەر:

" جەنابــی وەزیــری فێــدڕاڵ، ئایــا بــە واقیعــی دەبینــن ئەگــەر بڵێیــن نزیکــەی (50 تــا 100)

پەنابەرێــک وەربگیرێــن چونکــە بــێ گومــان بڕیــاری وا دەبــێ بــە ژمــارەی پەنابەرەکانیشــەوە بەســترابێتەوە"

سەرۆگ: جەنابی وەزیر

وەزیری فێدڕاڵ، رۆش:

" بەڵــێ ئەمــە نزیکــەی هەمــان ژمارەیــە کــە حکومەتــی فێدڕاڵــی لەکاتی خۆیــدا بــۆ پەنابــەرە ئۆگەندییەکانــی دانابوو."

سەرۆک: هیچ پرسێکی دیکە هەیە، تکایە؟

پارلەمێنتار د. هاینتس فیشەر:

" جەنابــی وەزیــری فێــدڕاڵ، پرۆســەی رەســمی بــۆ جــێ بەجیکردنــی کردەوەیەکــی وەهــا چــی یــە و چۆنــە؟ ئایــا ئەمــە بــە ڕێــگای وەزیــری

ناوخۆ یان بە ڕێگای کۆمیساری باڵای پەنابەرانەوە ئەنجام ئەدرێ ؟، کردەوەیەکی لەم بابەتە لە کوێوە دەست پێ دەکات؟"

سەرۆک: جەنابی وەزیر

وەزیری فیدراڵ، رۆش:

" لە دۆخێکی ئاوادا کە پەناخوازەکان لە دەڤەری دوورەوە دێن بۆ لای ئێمە، تا ئێستا هەمیشە کۆمیساری باڵای پەنابەرانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان بووە کە ئەم بابەتەی لەگەڵ ئێمەدا کردۆتەوە. کاتی خۆی کە بڕیاری وەرگرتنی پەنابەرانی ئۆگەندی درا قسە لەگەڵ باڵیۆزی نەمسا لە نەتەوە یەکگرتووەکان ( کە لەبیرم نەماوە کێ بوو ئەوساکە)کرا. لەپاش ئەوە ئیتر ئێمەش لێرەوە رەزامەندی خۆمان پیشان دا"

تێبینی:

لەپاش وەرگرتنی ئەم رەزامەندییە ئیتر منیش کۆتاییم بە چالاکیەکانم لە نەمسا هێنا و بارم کرد بۆ ئینگلتەرا. جا نازانم یەکەم گرووپی پەناهەندەی کورد کە لە ئێرانەوە چوون بۆ نەمسا کێ بوون و ئایا کێیان ئێستا لەوێ ماوە یان گواستوویانەتەوە بۆ وڵاتانی دیکە.

هۆمەر دزەیی

## عەلی فەتاح دزەیی ئامۆزام هاتە ڤیەننا

هەر ئەو هاوینەش ژمارەیەک خزم و برادەری کورد هەم لە عێراق و هەم لەناو شۆڕشا چ بۆ سەر دکتۆر چ بۆ کاری دیکە دەهاتنە ڤیەننا. یەکێک لەمانە کاک عەلی فەتاح دزەیی شاعیری ئامۆزام بوو. کاک عەلی وەک مامۆستا عەبدولڵا گۆران، کە ئەمیان ساڵی 1959هاتبووە ڤیەننا و منیش بەناو شارەکەدا دەمگێڕا، کاك عەلی ئەویش حەیرانی مێژوو و کولتوور و موزیکی ئەم شارە جوانە بوو. لەو ماوەی مانەوەی لە ڤیەننا چەندین جار چووین بۆ ئۆپێرا و ئێوارانیش زۆری حەز لە مەیخانەیەک بوو بە ناوی (ئاوگوستینەر کیللەر Augustiner Keller). جا کە گەڕایەوە بۆ ناو شۆڕش، هەڵبەستێکی زۆر جوانی لەسەر ئەزموونی خۆی لەو شارەی خەون و خەیاڵیدا بەسەر ناوی (یادێکی ڤیەنا) دانا و هەڵبەستەکەی پێشکەش بە من کرد.

ئەمە تەواوی هەڵبەستەکەی کاک (عەلی) یە بە دەستخەتی خۆی. زۆر درەنگتر کە لە عێراق بوو بە چاپی گەیاند و لەبەر سانسۆری بەعسیان ناوی منی لێ لا بردبوو چونکە من لە چالاکیی سیاسی لە ئەورووپا هێشتا بەردەوام بووم.

## یادێکی ڤیەنا

- بۆ هۆمەر دزەیی -

خۆشە ئینسان گیرفانی گەرم و گوڕ بێ
ئەرکی سەرشانی سووک بێ و تازەکوڕ بێ
ئاشنای چەند زمانی رۆژئاوا بێ
ئەشقی جوانی بەخوێنیدا گەڕابێ
ئای چەند خۆشە لە حاڵێکی وەهادا
بە رێبواری بگەڕێی لە دنیادا

*

ئەگەرچی من لەمانە گشت کەمبەش بووم
بەڵام هێندە بۆ گەڕانێک سەرکەش بووم
ئەوا ئێستا میوانێکم لەم شارە
ماوەم کەم و ئاوات هەزار هەزارە
هێندە مەستم ئەوەندە بۆی پەرۆشم
بێ مەی نۆشین بە شەو و رۆژ سەرخۆشم
وەک سەرگەردان وێڵی شەقامەکانم
هەر جوانییە بۆ هەر لایەک دەڕوانم
هەر مەیدانە، باخە، پەیکەرە، کێلە
هەر دیمەنێ کێشکەری نیگای وێڵە
چاو تێر نابێ لە (کێرتنەر شتراسە)
کە تەرخانە بۆ پیادەڕۆ و پیاسە
(ماری هیلفەر) شەقامێکە شاهانە
بۆ ئەم شارە هێشتا وەکوو شریانە
(بەلڤادێر) ستوونەکەی بەر ئەیوانی

پالەوانێک گرتوویەتە سەر شانی
گەنجینەی پڕ سامانی وێنە و رەسمە
بۆ تێشووی گیان جارەک ببینم بەسمە
(شوێنبرون) هەر ژوور و هەر سالۆنی
تۆمارێکە بۆ یادگاری کۆنی
بە هەر پەنا و پێچێکیا رادەبردم
لەبن لێوان یادێک بانگی دەکردم
ئەم لایە گشت جێی (ماری تێریزا) بوو
ناودارترین فەرمانڕەوای نەمسا بوو
ئەمەش هی (ئەنتوانێت)ی نەفامە
چۆن بزانێ داخوا چی سەرەنجامە
(ناپلیۆن) کە لەم شوێنەدا میوان بوو
تازە (ماری لویزا)ی دەزگیران بوو
هۆڵی گەورە، گۆرەپانی تەئریخە
پڕ لە سەدای کۆنگرە و مەتەرنیخە
ئەی (شوێنبرون) ئەگەرچی بێ هاوتا نیت
بەڵام هەرگیز بۆم ناکرێ وەسفی جوانیت
مەگەر بڵێم تاجی سەری نەمسای تۆ
زەردەخەنەی سەرلێوی ڤیەنای تۆ

*

لە (گرینزینگ) کە مەڵبەندی (باخۆسە)
هەر شۆخێکی دەیبینی وەک (ڤینۆسە)
گەرچی من دڵ گیرۆدەی جەرگەی شارم
دەبێ تێر بۆ ئەم شوێنانە بنوارم:
ئۆپراخانە، بێرگ تیاتەر، پارلەمان
(هۆفبورگ)ی مەند، کاتەدرای سان ئەستێفان
ئەی کاتەدرای کڵاو قووچی (گۆتیک)ی

هێندە باڵای لە پێچکەی عەرش نزیکی
بمبەخشە کە ڕێگام بۆ ئۆپێرایە
ئەمیش بۆ ئایینی هونەر وەک مەزارگایە

*

ئۆپێراخانە کانگەی هونەری بەرزە
لای هونەردۆست زیارەتکردنی فەرزە
نموونەی شێواز و فەنی (بارۆک)ە
وێنەی کەمە لە جیهاندا ئیمڕۆکە
دەری، ژووری، داری، بەردی، دیواری
هەر بستێکی هونەرێک دەکا دیاری
تاقی قوبەی وەک قوبەی ئاسمان جوانە
شاکارێکی دەست و پەنجەی ئینسانە
هۆڵی بەرین، گەلەری سێ قات بەرزی
لێی چۆڵ نەبوو بەقەد سەر نووکی دەرزی
بەرنامەی شەو: (سەرتاشی ئەشبیلیا) بوو
تەلەسمێکی دراما و مۆزیقا بوو
شانۆ لەژێر تیشکی روناکی رەنگاوڕەنگ
زەنگوڵ زەنگوڵ لێی هەڵدەستا نەغمە و دەنگ
ئۆرکێسترا، کۆرس، لەرەی (سۆپرانۆ)
دیمەن و دیکۆری جوانی سەر شانۆ
دنیایەکی ئەوتۆیان هێنا کایە
کە پیاو هەر بەخەیاڵیشیدا نایە
تەماشاکەر ئەوەندە واق وڕ مابوون
بێ هەست و خوست دەتگوت بەس گوێچکە و چاو بوون
کە مۆزیقاش لەگەڵ سەدای ئیتاڵی
بەرز دەبۆوە و دەیدا لە شەقەی باڵی
جۆشیان دەسەند تێکڕا ئەو هەزارانە
رادەهەژا قوبەی ئۆپەراخانە

*

ئەمجا وەختی پشوودانە کات هەشتە
کافیتریاکەی پارچەیەکی بەهەشتە
ئەی ئافرەتی شۆخ و شەنگ و رازاوە
ئەم لافاوەی جوانیت لە کوێ هێناوە
ئەم شەپۆلی عەترە، ئەم سیحر و نازە
ئەم نوارین و زەردەخەنە و نیازە؟!!!
عومرەک دێتێ کاتی پشووی ئۆپێرا
بەرامبەرت رایبوێرم لە کافیتیریا

*

دوای ئۆپێرا (کێلەر)ێک جێگای ژوانە
(ئۆگوستینەر) جوانبووکی مەیخانانە
کە شەو داهات ئیتر گەرمە بازاڕی
لێورێژ دەبێ لە رێبوار و لە شاری
ژن و پیاو و پیر و لاو و سپی و رەش
کۆ دەبنەوە دەستە دەستە پێنج و شەش
لەپشت کاونتەری باڕی مەیخانە
پێڕا ناگا ساقی پڕ کا پەیمانە
ریز لەسەر ریز شووشەی رەنگ سپی و سوورە
بەسەر سنگی باڕدا چەشنی بەرموورە
ئەی (کێلەری ئۆگوستاینەر)، زۆر پەستم
ئیمشەو تەنیام، لەبەر دەرگات دەوەستم
چاو دەگێڕم بەڵکوو شۆخێک پەیدا بێ
وەک من شەیدای جوانیی هەموو دنیا بێ
ببتە یاری سەرمێزی ئەم هێوارەم
یاقووتێکی قوتووی ئەم یادگارەم

*

ڤیەنا چۆن لەخەوما دەمدی وا بووی
زۆر زیاتریش جوان و بەرز و باڵا بووی
ئیلهامدەری بێتهۆڤن و شتراوسی
وەک شەپۆلی ئاوازی خۆشی ڤاڵسی

***

دوای گەشتێکی هەم تەندروستی هەم کولتووری، کاک عەلی فەتاحی شاعیری زۆر هەستیاری ئەڤینداری جوانی، راستە بە جەستە گەڕایەوە ناو شۆڕش، بەڵام دڵە ناسکەکەی لە شاری (مەی و مێ و موزیکا)، لە ڤیەنا بەجێ ما. تۆ ئەگەر سەرنجێکی ورد بدەیتە هەڵبەستەکەی کە لەسەر ڤیەنای داناوە بۆت دەردەکەوێت ئەو پیاوە چەند ئاشقی جوانی بووە و ئەو جوانییەشی چەند بە جوانی و وەستایی و کارامەیی لەناو شیعردا هۆناندووەتەوە.

دوای رۆیشتنەوەی کاک عەلی فەتاحی ئامۆزام بۆ ناو شۆڕش، ئەو واڵاییەی کە لەدوای خۆیدا بۆی بەجێ هێشتم، باش بوو سەرلەنوێ پڕ بووەوە بە هاتنی کۆڵێک لە خزم و برادەرانەوە. لەو گەشتیارانەی کە لەبیرم مابن ئەمانە هەندێکیانن: کاک وریای برازام و نەسرینی هاوسەری، دکتۆر عومەر دزەیی و نازەنین خانی هاوسەری و فاروقە بچکۆلەی کوڕیان. کاک شەفیق ئاغای ناسراو بە شەفیق لاین و کاک حاتەمی هونەرمەند، ئەوانیش بە سەردانێکی کورت هاتبوون و دوای ئەوانیش کاک دکتۆر عزەدین مستەفا رەسووڵ.

کاکە دکتۆر ئەنوەری برام و فائیزەخانی هاوسەری و منداڵەکانیان کە لە ئاڵمانیا دەژیان، ئەوانیش هاتن و چەند شەوێک لە ڤیەنا مانەوە. لەپاشان پێکەوە لەگەڵ ئەواندا من و رووناس و نازدار و لارای کچەکانم گەشتێکی خۆشمان بە یوگۆسلاڤیادا کرد و چەند شەوێک لە دوبرۆڤنیک لە کرواتیا ماینەوە و سەردانێکی

سەرایێڤۆی پایتەختی بۆسنیا هێرچۆگۆڤیناشمان کرد. شاری سەرایێڤۆ بۆ من واتای تایبەتی هەبوو، هەم لە رووی مێژوو و هەم لە رووی زمانەوانییەوە. لەوێ مەبەستم بوو ئەو شوێنە ببینم کە لە 1914/6/28 کابرایەکی ناسیۆنالیستی سیربی بۆسنیا (گاڤریلۆ پرنچیپ Gavrilo Princip) فرانس فێردینادی جێگری ئیمپراتۆری نەمسا - هەنگاریا و سۆفی هاوسەری لەناو ئۆتۆمۆبیلێکی سەرکراوە، کە لەناو کاروانی شاهانەی ئۆتۆمۆبیلان بە شەقامێکی شاری سارایێڤۆدا دەڕۆیشت، دایە بەر گوللان و هەردووکیانی کوشت. ئەو رووداوە بوو بەهۆی راستەوخۆی بەرپابوونی یەکەم جەنگی جیهان. ئەمن ئەم رووداوە مێژووییەم زۆر لا مەبەست بوو و سەردانی ئەو شوێنەم کرد کە کوشتنەکەی لێ قەومابوو. وەک یادگارێکی مێژوویی ئێستاش ماوە، لەسەر شۆستەی شەقامەکە کە پرنچیپ تەقەی لە ئۆتۆمۆبیلی ئارشیدوک کرد، لەسەر تاتەبەردێکی پاندا ناوی پرنچیپ و رۆژی رووداوەکە هەڵکەندراوە. لە رووی زمانەوانیشەوە حەز دەکەم ئەم راستییە بۆ ئەو کەسانە بخەمە روو، کە رەنگە بیریان بۆ ئەوە نەچووبێت وشەی سەرایێڤۆ لە چییەوە هاتووە. وشەکە تێکهەڵکێشراوەی دوو وشانە، یەکەمیان فارسی و کوردییە (سەرا - سەرڕاە) واتا سەرڕێگا، دووەمیان تورکییە (ئێڤ) واتا ماڵ. هەردووکی بە تێکهەڵکێشراوی دەبێتە (ماڵەکەی سەر ڕێ) یان (کاروانسەرا) کە بە ئینگلیزی وشەی inn ی بۆ بەکار دێنن و بە عەرەبیش (حانە). خۆی وابوو لە سەردەمانی کۆندا کاروانسەرا لەسەر رێیە سەرەکییەکاندا بۆ حەسانەوەی کاروانچییان هەبوو. ئەگەر تۆ سەیرێکی فیلمەکانی (کاوبۆی western)ی هۆلیوود بکەیت، دەبینی پڕن لەو کاروان سەرایانە. تەنیا پاشگری (ئۆ)ی هەرە دوایی وشەکە هەر ئەمیان سێربۆکرواتییە.

کە گەڕاینەوە بۆ ڤیەننا، ئامۆزایانم دکتۆر عومەر دزەیی و نازەنین

خانی حەمەدی پاشای هاوسەری و فاروقە چکۆلەی کوڕیان بۆ چەند رۆژێک سەردانیان کردین. بۆ ئەو چەند رۆژە دکتۆر عزەدین دزەیی برای نازەنین خانیش، کە ئەوسا لە شاری ئینسبروک لە ناوچەی تیرۆلی نەمسا هێشتا خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی بوو ئەویش هات بۆ لامان بۆ ڤیەننا.

## چووین بۆ ئێران و کوردستان

لە دوادواییەکەی ساڵی 1974دا ئێمەی نوێنەرانی شۆڕش لە وڵاتانی دەرەوەی کوردستان داوامان لێ کرا بۆ کۆبوونەوەیەکی تایبەتی لەگەڵ بەڕێزان دکتۆر مەحمود عوسمان و سامی عەبدولڕەحمان بچینە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش. من و رووناسی هاوسەرم و هەردوو کچە بچکۆلەکانم نازردار و لارا، خۆمان ئامادە کرد بچین بۆ تاران و لەوێشەوە بۆ لای مەکتەبی سیاسی، کە پێم وایە لەنزیک حاجی ئۆمەران بوو. بەڵام وەک پێشتر باسم کردبوو، کە لە باڵوێزخانەی عێراقی لە ڤیەننا دەریانکردبووم، پاسپۆرتەکانیشیان بۆ نوێ نەکردینەوە و هیچ بەڵگەیەکمان نەبوو سەفەری پێ بکەین. برادەرانی شۆڕشم ئاگادار کرد کە ناتوانم سەفەر بکەم. باش بوو پێیان راگەیاندم بچم بۆ باڵوێزخانەی شاهنشاهی ئێرانی لە ڤیەننا، لەوێ لە حاڵی ئێمە ئاگادارن و پاسپۆرتی ئێرانیمان بۆ دەردەکەن. هەر واشمان کرد و خۆم و ژن و منداڵەکانیشمان پاسپۆرتی ئێرانیمان وەرگرت هەرچەندە کە زۆر بە نابەدڵییەوە ناوی (عمر)یان دەخستە سەر لاپەڕی پاسپۆرتەکەمەوە، بەڵام من بەوە پێنەم کرد کە پێم گوتن بابم لە کاتی خۆیدا شیعرەکانی (عمر خیامی) زۆر پێ خۆش بووە، بۆیە ناوی منی ناوە (عمر) و ناوەکەم هیچ پەیوەندییەکی بە

عومـەری بنـی خەتابـەوە نیـە. کـە واش نەبـوو، بـەڵام بریـا وا بوایـە.

گەیشـتینە تـاران و چەنـد شـەوێک لـەوێ ماینـەوە، ئینجـا بـەرەو ناوچەکانـی ژێـر دەسـەڵاتی شـۆڕش لـە کوردسـتانی عێـراق کەوتینـەوە رێ. ئەوانـەی کـە لەبیـرم مابـن بـۆ کۆبوونەوەکـە لـە ئەورووپـا و ئەمەریـکاوە هاتبـوون، بێجگـە لـە مـن و خێزانـی خـۆم، ئەمانـە بـوون: جەمـاڵ عەلەمـدار، هـاوار کاکەزیـاد، سـیامەند سـەمەد بەننـا، تاریـق عەقـراوی، چـالاک جوانڕۆیـی، کـە ئەمیـان لـە ئەمەریـکاوە هاتبـوو، عەزیـز شـێخ رەزا و...

دوای چەندیـن کۆبوونـەوە لەگـەڵ دکتـۆر مەحمـود و کاک سـامی عەبولڕەحمـان، ئینجـا چووینـە خزمـەت جەنابـی مـەلا مسـتەفای بارزانـی. لـە خزمانـی خۆشـم کـە لەنـاو شۆڕشـدا بـوون بێجگـە لـە ماڵـی کاکـە موحسـینی بـرام و کاکـەی ئامـۆزام، کاک عەلـی فەتـاح و دکتـۆر سەرسـوور و دکتـۆر خورشـید و دکتـۆر خەسـرۆ و کاک خەسـرۆی برایـم ئاغـای حاجـی ئەمینـی کاک جەمیـل سـەبری و زۆری تریـش لـەوێ بـوون. لـە دووگردکانییـە خۆشەویسـتەکانی خۆشـم محەمـەدی مەولـود هەولێـری و سـمایلی حاجـی کەریمـی و حاجـی فەقـێ عـەولاش، ئەوانـەش هەموویـان هاتبوونـە نـاو شـۆڕش و لـەوێ پێـک شـاد بووینـەوە. کاک عەلـی قـازی (ناسـراو بـە کـوڕی رەش) کـوڕی پێشـەوا قـازی محەمـەد، کـە لـە ئاڵمانیـا دەژیـا، بـەڵام لـەو ماوەیـەی کـە ئێمـە لـە ئێـران بوویـن و هاتوچـۆی نێـوان مەهابـاد و نەغـەدە و ورمێمـان دەکـرد، ئەویـش بـە سـەردان گەڕابـووەوە بـۆ ئێـران. رۆژێکیـان لەگـەڵ کاک عەلـی چوویـن بـۆ سـەر شـایی لـە گوندێکـی کـوردان و هونەرمەندانـی شـەعبی رەسـووڵی نـادری و ئیبراهیمـی قـادری بـە گۆرانییـە زۆر خۆشـەکانیان شـاییەکەیان گـەرم کردبـوو. ئێوارەیەکـی تریـش دیسـان کاک عەلـی قـازی دانیشـتنێکی زۆر خۆشـی بـۆ سـاز دایـن، کـە هونەرمەنـدی گـەورەی کـورد عەزیـز شـاڕوخ بـە دەنگـە تیـژە بزوێنەکـەی بەڕاسـتی حەشـری کـرد. لـە ورمێـش ئێوارەیەکیـان

چوویــن بــۆ بارێکــی زۆر خــۆش، کــە هونەرمەنــدی گــەورە خانــم (عهدیــە) گۆرانیــی لــێ دەگــوت. لــە تارانیــش ئێوارەیەکیــان چووینــە بارێــک کــە هونەرمەنــدی گــەورەی ئێرانــی (عــارف) بــە دەنگــە زولاڵەکــەی گوێگرانــی هەمــوو سەرســام دەکــرد. ئەمــن لــەو شــەوەوە ئیتــر بــووم بــە ئاشــقی دەنگــی عــارف و ســاڵەهای ســاڵان دواتــر هاتــە ئەمەریــکا و لــەو شــارەی کــە ئێمــەی لــێ بوویــن کۆنســێرتی هەبــوو. خــۆم و رووناســی هاوســەرم و دکتــۆر نەجمەدیــن کەریــم و زۆزان خانــی هاوســەری، پێکــەوە چوویــن بــۆ ئــەو کۆنســێرتە. ئەمــن ئەوەنــدە مەســتی دەنگــی عــارف بــووم، کــە وشــەی کوردیــم بــۆ یەکێــک لــە گۆرانییــە خۆشــەکانیم (ســلتان قلبهــا) نووســی بــە تایتڵــی (دوو دڵــی: دڵــێ یێــژێ بــڕۆم بــڕۆم دڵــەی دیــم یێــژێ نــەڕۆم نــەڕۆم).

بە گشتی سەردانەکەی ئێران و کوردستانم هەم لە رووی سیاسییەوە و هــەم لــە رووی کولتوورییــەوە و هــەم لــە رووی کۆمەڵایەتییــەوە کــە لەگــەڵ خــزم و دۆســت و برادەرانــا پێــک شــاد بووینــەوە، ســەرکەوتنێکی بــاش بــوو و گۆڕانێکــی باشــی کەشــوهەواش بــوو بــۆ خــۆم و بــۆ خێزانەکــەم لەپــاش دەرکردنــم لــە باڵوێزخانــەی عێراقــی لــە ڤیەننــا. دەســکەوتێکی تــری ئــەو سەفەرەشــم پاســپۆرتە ئێرانییەکــەم بــوو بــۆ خــۆم و خێزانــم، کــە زۆر لــەوەی عێراقــی چاکتــر بــوو، چونکــە هــی زەمانــی شــای ئێرانــێ بــوو و لەوڵاتانــی ئەورووپــا بــە رێــزەوە دەیانڕوانیــێ.

گەڕامــەوە بــۆ ڤیەننــا و خەریکــی کاری خــۆم بــووم وەک نوێنــەری شــۆڕش. هەروەکــوو پێشــتریش باســم کــردووە لەگــەڵ کاک نەوشــیروان مســتەفا، کــە ئەوســا لــە ڤیەننــا دەیخوێنــد وەک بــرادەر زۆر لێــک نزیــک بوویــن، بــەڵام بۆچوونــی سیاســیمان لــە هەنــدێ رووەوە یەکدیــی نەدەگرتــەوە.

لــە ڤیەننــا مایــنەوە تــا ســاڵ ســووڕایەوە بــۆ 1975. دوای رێککەوتنــە بەدناوەکــەی نێــوان ســەدام و شــای ئێــران (رێککەوتنــی الجزائیــر 6 ئــاداری 1975) کــە بــۆ ماوەیــەک کۆتایــی بــە چالاکیــی چەکداریــی

کــورد هێنــا لــە دژی حکوومەتــی بەعــس و لەپاشــان نەخۆشــکەوتنی مــەلا مســتەفای بارزانــی و ڕۆیشــتنی بــۆ ئەمەریــکا بــۆ چارەســەریی نەخۆشــییەکەی، منیــش ئــەو پۆســتەی نوێنەراتیــی شۆڕشــم لــە نەمســا نەمــا و بــە مــاڵ و منداڵــەوە بارمــان کــرد بــۆ ئینگلتــەرە.

لەچەپەوە: روناس دزەیی، عزەدین دزەیی، نازەنین دزەیی و فاروقی کوڕی

هونەرمەندانی دەنگبێژ رەسولی نادری (ئەوەی دەستە راست) و ئیبراهیمی قادری (لە ناوەڕاست)
لەگەڵ هونەرمەندانی ئامێرژەن شاییەکەیان گەرم کردبوو.

الواردة ١٩٧٤

سجل الواردة لعام ١٩٧٤

فەرمانی دەرکردنم لە باڵیۆزخانەی عیراقی لە ڤیەننا. بڕوانە دێڕی سێیەم لە سەرەوەڕا کە بەعەرەبی نووسراوە: الاستغنا، عن السيد عمر دزەئي

کاتی کوشتنی فرانس فێردیناند و سۆفی هاوسەری لە سەرایێڤۆ

وێنەی ئارشیدوک فرانس فێردیناند و سۆفی هاوسەری و بکوژەکەیان
گاڤریلۆ پرنچیپ

شانۆخانەی بورگ تیاتەر لە ڤیەننا

کۆشکی شۆنبرون لە ڤیەننا شوێنی ژیانی ئیمپراتۆر فرانس یۆزێف بوو

کۆشکی هۆفبورگ ئۆفیسی ئیمپراتۆری نەمسا فرانس یۆزێف

کۆشکی بێلڤێدێر لە ڤیەننا کە پێشتر ئارشیدۆک فرانس فێردیناندی جێنشینی ئیمپراتۆر لێی دادەنیشت

# بەشی 30

## بارمان کرد بۆ ئینگلتەرا

ژیانە قەرەج ئاساکەی سەردەمی لاویم دیار بوو لەپاش هاوسەرگیری و دامەزراندنی ماڵ و خێزانیش بەرۆکی هەر بەرنەدەدام. دوای ڕێککەوتنە بەدناوەکەی 6ی ئاداری (الجزایر) لەنێوان سەدام حوسێن و شای ئێرانیێ، خەڵکێکی زۆری ناو شۆڕش بەدڵساردییەوە گەڕانەوە بۆ عێراق و هەندێ پێشمەرگە بە دڵ و چاوی پڕ لە گریانەوە تفەنگ و ڕەختەکانیان فڕێ دەدایە ناو ڕووباران و ئەوانیش تەبای ژمارەیەک لە سەرکردەکانی پارتی و شۆڕش ڕێی عێراقیان دەگرتەوە بەر. لەوانەی کە لەبیرم مابن گەڕابوونەوە بۆ عێراق یان خۆیان گەیاندبووە وڵاتێکی عەرەبی یان ئەورووپایی ئەمانە بوون: حەبیب محەمەد کەریم، سکرتێری پارتی، ساڵح یوسفی، ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی، دارا تۆفیق، ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی، شەوکەت عەقراوی، عومەر دەبابە، عەلی عەسکەری و زۆری تریش. حکوومەتی بەعس سەرەتا ڕێگای بەمانە نەدا بگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆیان لە کوردستان، بەڵکوو بۆ ماوەیەکی کاتەکی هەموویانی ڕەوانەی باشووری عێراق کرد و لە شارە جیاجیاکانی ئەوێ نیشتەجێی کردن. ئەو کوردە ڕاگوێزکراوانە دەیانگێڕایەوە، دانیشتووانی باشووری عێراق کە تێکڕایان شیعە بوون، پێشوازییەکی زۆر گەرمیان لەو کوردە دەربەدەربووانە دەکرد، چونکە دەیانزانی کە گیرۆدەی دەستی ستەمکاریی سەدام حوسێن بوون، کە دوژمنی سەرسەختی ئەوانیش بوو.

ئۆفیسی سەرەکیی شۆڕش لە ئەورووپا لە لەندەن بوو و بەرپرسانی ئۆفیسەکەش کاک هاواری کاکە زیاد و کاک جەمال عەلەمدار بوون. ئەمن کە نوێنەری شۆڕش بووم لە نەمسا، یارمەتیی مانگانەم و خەرجیی چالاکییە سیاسییەکانم لەو ئۆفیسەی لەندەنەوە بۆ دەهات. جا ئێستا کە شۆڕش شکستی هێنا، یارمەتیش بە ئەندازەیەکی زۆر کەم بووەوە. هیچ کارێکیشم لە نەمسا دەست نەدەکەوت و دەبوایە ژن و دوو منداڵیش بەخێو بکەم و نەشمدەویست بگەڕێمەوە بۆ عێراق. ناچار ڕووم کردە ئینگلتەرا، گوتم لەوێ لەگەڵ هاوکارەکانی ئەوێما، حاڵم حاڵی ئەوان.

ئەوەی کە پێمان بردرا لە کەلوپەل خستمانە ناو ئۆتۆمۆبیلەکەمانەوە، کە فیاتێکی 125ی ڕەنگ سەوز بوو و بەناو ئاڵمانیا و بەلژیک و تەنگاوی دۆڤەر پەڕینەوە و گەیشتینە لەندەن.

## نەجدەتی موحسین ئاغای کوڕە پوورزام و نەجاتی برای

(1938 - 2007)

لە لەندەن شیروانی برازام کە چەند مانگێک پێش من چووبوو بۆ ئینگلتەرا بۆ خوێندن، چاوەڕێی دەکردین و ئێمەی بردە ماڵی کاک نەجدەتی موحسین ئاغا کوڕی قەدریە خانی پوورزام لە شارۆچکەی (کۆڵد ئاش cold ash) لە هەرێمی (بارکشەر Berkshire)، کە نزیکەی سەعاتێک لە لەندەنەوە دوور بوو. نەجدەت، یادی بەخێر، کە هێشتا ژنی نەهێنابوو، ڤیلایەکی گەورەی بەکرێ گرتبوو، کە باخچەیەکی پان و بەرینی بە بەروە بوو و خۆیشی وەک ئەندازیار لەو ناوە دەستبەکار بوو. نەجدەت نەک هەر کوڕە پوورزام بوو، بەڵکوو هەر لە قۆناخی خوێندنی سەرەتاییەوە لە هەولێر لەگەڵ نەجاتی برای

برادەری زۆر نزیکی گیانی بەگیانیم بوون. هەرچەندی باسی پیاوەتی و ڕەوشت جوانی و نەزاکەت و سەرڕاستی و ڕاستگۆیی ئەو پیاوە بکەم هەر کەمە. نەجدەت نەیدەزانی تووڕەبوون چییە. ئەگەر شتێکی بەدڵیش نەبوایە بێ دەنگ دەبوو و بیرم نایە تاکە جارێکیش هەستی نارەزایی یان کاردانەوەی بۆ کارێکی نابەجێ لە هەر کەسێکەوە بوا بە گرژی و درودۆنگی لە ڕەنگ و ڕوخساریدا دەرکەوتبێ. نەجدەت ئەوسا دەزگیرانێکی جوانکیلەی ئیرلاندیی هەبوو (Betty) کە دواتر گواستییەوە و کچێک و کوڕێکیان بوو (تارا و دارا). ئێمە تا شوێنێکی باشمان دەست کەوت نزیکەی دوو مانگێک لە ماڵی نەجدەتماینەوە و ئەو ماوەیە کچەکانم دڵیان لەوێ بە دوو شت زۆر خۆش دەبوو، یەکەم: باخچەکە گەورە بوو بۆ یاریکردن، دووەمیش: ماڵەکەی دراوسێی نەجدەت دوو جاشولە کەری جوانکیلەیان هەبوو و ڕۆژانە لە باخچەکەی خۆیاندا لەناو چیمەنەکەدا دەلەوەڕان و یارییان دەکرد. جا کە لەمدیو پەرژینی نێوان هەردوو ماڵاندا چاویان بە منداڵەکانی من دەکەوت کە وەک خۆشیان بچووک بوون، یەکسەر دەهاتن بۆ لای پەرژینە نزمەکە و قەپۆزە چکۆلەکانیان بۆ منداڵەکانی من درێژ دەکرد تا بۆیان بخورێنن، ئەوانیش بە نەرمی دەستیان بە سەروملیاندا دەهێنا، ماچیان دەکردن و لە ئێمەیان خۆشتر دەویستن. دواتر کە ماڵمان گواستەوە، کچەکانم بیری جاشولکەکانیان دەکرد و دەیانگوت بابە با بچین بۆ ماڵی کەرەکان.

دوای مەرگی نەجدەت، نەجاتی برا لە خۆی بچووکترەکەی ئەو بۆشاییەی لێ پڕکردمەوە کە بە کۆچی نەجدەت کەوتبووە ژیانمەوە. ئێستاکە نەجاتی یەکێکە لە نزیکترین هۆگر و هەڤاڵم کە چێژێکی یەکجار زۆر لە ڕەفاقەتی و سەفەر لەگەڵکردنی وەردەگرم.

## پایانی ساڵانی سەرگەردانی

دوای بیست ساڵی خشت گەڕامەوه بۆ خوێندنی بەڕاستی له زانكۆ
ماڵمان گواستەوه بۆ شاری ڕێدینگ Reading
باش بوو خانووێكی باشمان بە باخچەیەكی چكۆلانەی پشتی و پێشی و بە ڕاخراویی تەواوەوه لە شاری زانكۆیی ڕێدینگ Reading بە مانگانەی 100پاوەن دەست كەوت. ڕێدینگ بە ئۆتۆمۆبیل چل خولەكێک لە لەندەنەوه دوور بوو و وێستگەی ترێنیشی لێ بوو، كە دەیگەیاندیە وێستگەی ترێنی پادینگتن Paddington لە لەندەن. ڕێدینگ هەروەها زانكۆیەكی لێبوو كە كامپوسەكەی زۆر مۆدێرن و جوان بوو. ماڵەكەی من لە گەڕەكێكی پەڕگەی شار بوو بە ناوی شینفیلد Shinfield و شەقامەكەشمان ناوی لەیلاند گاردنز Leyland Gardens بوو.
زانكۆكە لەسەر ڕێی هاتوچۆم بوو بۆ ناو شاری ڕێدینگ و لە ماڵەكەمەوه زۆر نزیک بوو. هەر جارێكی بەوێدا ڕەت دەبووم بیری دەستپێكردنەوەی خوێندنی زانكۆ كەلكەلەی ڕادەهەژاندم و هەست و نەستی دادەگرتم و نۆستالجیایەک دەیگەڕاندمەوه بۆ ئەو كەش و ژینگەیەی كە بیست ساڵێک پێشتر لە زانكۆكانی ئانكارا و ڤیەننا و پاریس تامم دەكرد. دەمزانی بیست ساڵێک پێشتر كە تەمەنم بیست ساڵێک دەبوو لەبەر ڕابواردنی ئێم ئێم ئێم (مەی و مێ و موزیک) خوێندنم پشتگوێ خستبوو. بەڵام ئێستا وا تەمەنم خەریكە خۆی لە چل ساڵان بدات و ماڵ خێزانیشم پێكەوه ناوه، ئیتر چ بیانووی نەخوێندنم پێ نەماوه، باری نالەباری داراییم نەبێ.
ئەو بڕه پارەی كە هەمانبوو ورده ورده خەریک بوو تەواو دەبوو. دیار بوو ئۆفیسی پارتیش لە لەندەن ئەو توانایەی نەمابوو یارمەتیم

بـدات، کـە وایـان بـە مـن دەگـوت ئیتـر نازانـم. بـەڵام بـاش بـوو کاک موحسـینی بـرام یارمەتیـی بـۆ دەنـاردم. جارێکیشـیان ئـەو و کاک سـامی عەبدولڕەحمـان هاتنـە لەنـدەن و جگـە لـەوەی کـە بـڕە پارەیەکیـان بـۆ خـۆم بەجـێ هێشـت، ئاگاداریشـم کـردن کـە نوێنـەری شـۆڕش لـە هۆڵانـدە کاک نـەوزاد دزەیـی ئامـۆزام، ئەویـش بـێ دەرامـەت ماوەتـەوە. ئـەوە بـوو کـە یارمەتییـان بـۆ ئەویـش نـارد.

بـەڵام ئـەم یارمەتییانـە وا نەبـوون کـە ژیانـی چـوار سـەر خێزانـی وەک مـن دابیـن بکـەن، بۆیـە چارم نەمـا و لەگـەڵ ڕووناسـا بیرمـان لـەوە کـردەوە کـە ڕوونـاس و منداڵـەکان بگەڕێنـەوە بـۆ عێـراق و منیـش وەک تاکـە کەسـێک بـە هـەر جۆرێکـی بـێ بـەو یارمەتییـە دەتوانـم کاری خـۆم هەڵسـووڕێنم و لەوانەیـە بتوانـم خوێندنەکەشـمی لـە زانکـۆی ڕێدینـگ پـێ تـەواو بکـەم. لەگـەڵ ڕووناسـا کەوتینـە دوودڵییەکـی زۆر ناخۆشـەوە. بیـرم کـردەوە کاک موحسـینی بـرام کـە لەگـەڵ جەنابـی مـەلا مسـتەفا چووبـوون بـۆ ئەمەریـکا ئـاگادار بکەمـەوە کـە لەوانەیـە ڕوونـاس کـە دووگیانیـش بـوو لەگـەڵ منداڵـەکان بنێرمـەوە بـۆ عێـراق. دیـار بـوو کاک موحسـین ئـەوەی بـە مـەلا مسـتەفا گوتبـوو و جەنابـی مـەلا مسـتەفاش نامەیەکـی جوانـی بـە دەسـخەتی خـۆی بـۆ مـن نووسـی، کـە بـە ڕێـگای کاک موحسـینەوە بـۆی ڕەوانـەی ئینگلتـەرا کـردم. نامەکـەم هەڵگرتـووە کـە لـە دەرفەتێکـی تـردا بـڵاوی بکەمـەوە. لـە نامەکەیـدا جەنابـی مـەلا مستەفا دەفەرمـووێ "... سـەبرتان هەبـێ و پێویسـتە منداڵەکانـت هـەر لای خـۆت بـن باشـترە و ئینشـاللە ئێمـەش هـەر ئاگامـان لـە ئێـوە دەبـێ...." ئـەم نامەیـە دڵنیایـی پـێ دام و ئیتـر بڕیـارم دا منداڵەکانـم نەنێرمـەوە بـۆ عێـراق و خۆشـم لـە زانکـۆی ڕێدینـگ ناونـووس بکـەم و ئەمجـارە خولیـای خـۆم بەتـەواوی بخەمـە سـەر خوێندنەکـەم و تـەواوی بکـەم.

## ژیانی زانکۆییم سەر لەنوێ

جەنابی مەلا مستەفای بارزانی یارمەتی دارایی بۆ دەناردم تا زانکۆم تەواو کرد بۆ ئەوەی لە ئینگلتەرە لە زانکۆ وەربگیرێت، پێویستە بڕوانامەی (گی سی ئی GCE)ت هەبێ کە کورتکراوەی (General Certificate of Education)ە، ئەمەشیان بریتییە لە دوو بەش (O- Level و A- Level) بڕوانامەی ئامادەیی عێراقی (بەکالۆریای ئیعدادیە) تەنیا بەرامبەری o - Levelە، بۆیە خوێندکاری بێگانە دەبێ بە لانی کەم چەند A - Level یکیش لە ئینگلتەرا تەواو بکات، تاکوو بڕوانامەکەی یەکسان بێ بە گی سی ئی بەریتانی. مەرجیش نییە هەموو وانەکانی A - Level وەرگریت، بەڵکوو دەمێنێتەوە سەر ئەو لکەی کە دەتەوێت تەواوی بکەیت. ئەوە بوو کە چووم خۆم لە پەیمانگایەکی ئەم بوارە لە شارۆچکەی نیوبێری New Berry تۆمار کرد، کە شیروانی برازاشم لەوێ گی سی ئی تەواو دەکرد، هەردووکمان لە یەک کلاسدا بووین، ئەو بە تەمەنی بیست ساڵی و من بە چل ساڵی. پێم وایە یەک دوو مانگێک لەو پەیمانگەیە دەوامم کرد، لەپاشان بەرپرسەکانی پەیمانگاکە خۆیان پێیان گوتم کە لە سیستەمی پەروەردەیی بەریتانی بەندێک هەیە بە ناوی (ماچوور ستیودینتس Mature Students) واتا خوێندکاری بەتەمەن گەورە، کە پێویست ناکات پێداویستییەکانی کە لە خوێندکارێکی لاو داوا دەکرێت لەویش داوا بکرێت، بۆیە گوتیان تۆ پێویست ناکات لێرە بخوێنیت، بڕۆ بۆ زانکۆ یەکسەر وەردەگیرێیت. دڵم زۆر خۆش بوو کە لەناو ئەو منداڵانە نەمامەوە و چووم بڕوانامەی ئامادەیی عێراقی و ئەو سێمەستەرانەش کە لە زانکۆکانی ڤیەننا و پاریس خوێندبووم، هەموویم خستنە بەردەم و یەکسەر لەو کۆلێژەی کە نیازم بوو (زانستی سیاسەت Department of Politics) وەریان گرتم.

## ساڵی 76 دووبارە شادی و شین: کوڕێکم بوو، برایەکم چوو

دڵم زۆر خۆش بوو و دەستم بە دەوامێکی ڕێکوپێک کرد. ئینگلیزییەکەم زۆر باش نەبوو، ئەوسا ئاڵمانی و فرانسیم باشتر دەزانی. بیست ساڵیش بوو لە خوێندن دابڕابووم و لە چۆنیەتیی دارشتنی گوتاری سیاسی essay و dissertation بە زمانی ئینگلیزی ئەزموونم نەبوو، کە یەکێک بوو لە پێداویستییە حەفتانەکانی بەرنامەی خوێندنەکەم. بەڵام سروشتانە زانیاری و ئەزموونی گشتیم هەم لە سیاسەت و هەم لە مێژوو زۆر لە هی هاوکلاسەکانم زیاتر بوو، کە بە تەمەن بیست ساڵێک لە من بچووکتر بوون.

## کوڕێکمان بوو

لەدوای لەدایکبوونی دوو کچمان، نازدار و لارا لە ڤیەننا، خۆشی و شادییەکی بێ وێنە ماڵ و خێزانەکەمانی داگرتەوە، کە ئەمجارەیان خوا کوڕێکی پێ بەخشین. ئەمن ئەم بۆنەیەم بە دەستخەتی خۆم لە دەفتەرێکی بیرەوەرییەکانی ئەو ساڵانەمدا تۆمار کردووە کە ئەمە دەقەکەیەتی:

کوڕێکمان بوو

ئەمڕۆ 26ی کانونی دووەمی 1976 کات 8ی ڕەبەقی ئێوارە لە نەخۆشخانەی Royal Berks Hospital لە ڕێدینگ، خوا کوڕێکی داینێ، هێشتا ناومان لێ نەناوە. ئەمڕۆ دەوری 10 ڕووناکم برد بۆ نەخۆشخانە، هەتا سەعات 1 لەوێ بووم، پێشتر نازدار و لارام بردبووە لای ماری، لەپاشان گەڕامەوە ماڵەوە و نانم خوارد، چووم

بـۆ دانیشـگە و سـەعات 5 منالەکانـم بـردەوە مالـەوە، ئیتـر سـەعات 7 دووبـارە گەڕامـەوە لای روونـاک، ئـەوە بـوو کـە سـەعات 8 بـوو لـە ژووری بـاوکان چاوەڕێـم ئەکـرد لەگـەڵ پیاوێکـی تـر کـە خێزانەکـەی ئەویـش چاوەڕێـی منالّی ئەکـرد. کابـرا موهنـدس بـوو و 6 مانـگ لـە بەغـداش بووبـوو. ئیتـر دکتـۆر خانـم ( ؟ ) خـۆی هـات بـە پێکەنینـەوە گوتـی حـەزت لێیـە کـوڕ بـێ یـان کـچ، منیـش زانیـم کـوڕە کـە وای گـوت، گوتـم حـەز ئەکـەم کـوڕ بێ، گوتـی دە هـەوە. وەڵلا ئیتـر پـاش ماوەیەکـی کـەم توانیـم بچـم بـۆ لایـان و هەنـدێ رەسـم گـرت، کـە تەمەنـی بەتـەواوی 45 دقیقـە بـوو.

ئەمـڕۆ لـە بەیانییـەوە زۆر سـارد بـوو، بـەلام هەتاوێکـی خـۆش بـوو. پـاش نیـوەڕۆ سـەرمایەکەی نەختـێ شـکاند، بـەلام ئێـوارە دەسـتی کـرد بـە نمەبارانێکـی خەفیـف، کـە وردە بەفرێکـی لەگەڵـدا تێکـەلاو بـوو، هەروەهـا کـە منالەکـە بـوو، وابـوو، بـەلام زۆر سـارد نەبـوو، دەرەجـەی گەرمـا ئەمـڕۆ ( 1 +).

کوڕەکـە زۆر بـە نـازدار ئەچـێ، کـە تـازە بووبـوو، بـەلام رەنگـی وەک لارا پەمبەیـە، پرچـی رەش و زۆرە، چاوی رەش نییـە و بـاش دیـار نییـە، بـەلام وابزانـم کالـە، بـرۆی زۆر کەمـە. کەپـووی باریکـە مەیلـە و بەرانانییـە، زۆر بزێـوە و هـەر ئەمـلا و ئـەولا ئـەکا، تەماشـای شـتیش ئـەکا، هەرچەنـدە کـە هیـچ نابینـی، دەموچـاوی باریکـە، بەتایبەتـی کارێـژ و چەناگـەی. وەزنـی 90، 3 کغـم لـە هـەردوو منالەکانـی ترمـان قورسـترە.

ئیتـر هەتـا سـەعات 30، 9 لـەوێ بـووم، لەپاشـان لەبـەر منالـەکان چوومـەوە مـال. تەلەفۆنـم بـۆ شـیروان و نەجـدەت کـرد، بـۆ ئەنوەریشـم کـرد کـەس لـە مـال نەبوو. هەندێـک رەسـم گـرت کـە تەمەنـی تەنهـا 45 دقیقەیـە. لەپاشـان رۆژی دووەم و سـێیەمیش رەسـم گـرت.

28/1/ ئەمـڕۆ جەژنـی لەدایکبوونـی سـێیەمی بوونـی نـازدار بـوو، چوویـن لـەوێ لەگـەڵ رونـاک و کوڕەکـە رەسـممان گـرت. ئێـوارە نەجـدەت هـات، لەگـەڵ ئەویـش لـە مـال هەنـدە رەسـممان گـرت.

30/1/76 ئەمڕۆ ناومان لە کوڕەکەمان نا (کاروان) و هەر ئەمڕۆ لە خەستەخانە مەسئولی تەسجیلی ویلادات هات و تەسجیلمان کرد.

لەوەتی کاروان بووە، سەرما وەختە خەلاسمان کا، سەرما و بایەکی هەتا بڵێی ناخۆشە، بەڵام ڕۆژەکانیش زۆر وشک و بە هەتاون. ئەوە چەند ڕۆژە هەر وایە و ڕۆژ لە ڕۆژ سەرماتریش ئەبێ.

31/1/76

ئەمڕۆ سەعات 20، 4ی دوای نیوەڕۆ، کاروان و دایکی هاتنەوە ماڵەوە. یەکەمجار سواری ترومبێل بی فیاتەکەی خۆم S 125 .S وا سەبر سەبر بەدیار ئەکەوێ کە ڕەنگی سوور و سپی و چاوکاڵ ئەبێ و مووی زۆر تاریک نابێ. ڕەنگی چاوی هێشتا بەڕاستی بۆمان ساغ نەبوویتەوە یان کاڵە یان شینە.

1/2/76

ئەمڕۆ مامان هات سەیری کاروان و دایکی کرد و هەندێ مەعلوماتی بە ڕووناک گوت. هەتا 10 ڕۆژی تر هەموو ڕۆژ سەرێک ئەداتەوە. سەرما هەر بەردەوامە، دوو جاریش بەفر کەوت.

4/2/76

ئەمڕۆ کاک تایەر تۆفیق هات و 5 ڕۆژمان لەلا بوو

/6/2، ئەمڕۆ جەژنی لەدایکبوونی لارا بوو. لەگەڵ هی نازدار پێکەوە بۆمان کردن. مناڵەکانی دراوسێمان و چەند برادەرێک هاتبوون، زۆرمان ڕەسم گرت و زۆریان دیاری بۆ هات. شێروان جلی بۆ کاروان هێنابوو، لەگەڵ 2 چارەگ لیرەی زێڕی پەهلەوی. ئەوانی تریش نەجدەت زۆر یاری و بووکۆکەی هێنابوو.

/14/2 بۆ یەکەم جار کاروان حەمامی کرد. پاش ئەوە کفت کەوت و هەتا سبەینێ خەوی لێ کەوت و نەگریا.

ئەوندەم لەسەر لەدایکبوونی کاروان نووسیوە، کە لە لاپەڕەیەکی دەفتەری بیرەوەرییەکانمدا پاراستوومە. وەکوو پێشتریش ئاماژەم پێ دابوو، کە زیاترم لەبارەی لەدایکبوونی کچەکانم دەنووسی، چونکە

یەکەم و دووەم منداڵ، بە تایبەتی یەکەم، ڕووداوێکی زۆر نوێیە لە ژیانی خێزانیدا، لەپاشان هەر منداڵێکی ترت بوو ئیتر بە ئاسایی وەری دەگریت، بۆیە هەر ئەوەندەم لەسەر کاروان نووسیوە، هەرچەندە کە یەکەم کوڕیش بوو و بە پەرۆشەوە من و ڕووناک چاوەڕێی کوڕ بووین. جگە لەوە، خۆیشم بووبوومەوە بە خوێندکاری زانکۆ و ئەوەندە کاتی نووسینەوەی بیرەوەریم وەک پێشوو نەمابوو.

## شێروانی برازام کوڕی کاک موحسینی برام

لەو چەند ساڵانەی کە لە ئینگلتەرا ماینەوە (1975-1980) و خوێندنی زانکۆم لەوێ تەواو کرد شێروانی برازام بۆ ئێمە هەم یارمەتی و هەم سەبوورییەکی باشیش بوو بۆ منداڵەکانم. شێروان خۆی لە شاری نیوبێری Newbury دەژییا چونکە خوێندنی (گی سی ئی GCE)یەکەی لەوێ دەخوێند. شارەکەشی هەر بیست خولەکێک بە ترومبێل لە شارەکەی منەوە (ڕێدینگ Reading) دوور بوو. شێروان هەمیشە سەری لێ دەداین و منداڵەکانم دڵیان زۆر خۆش دەبوو کە مامە شێروان دەهاتە لامان. زۆر جاریش ئەگەر ڕووناسی هاوسەرم لەبەر منداڵەکان نەیتوانییا لەگەڵمانا بچێتە دەرەوە ئەوسا هەر خۆم و شێروان دەچووینە لەندەن و ئێوارەیەکی خۆشمان لەوێ لەگەڵ برادەرانی کوردی دیکە بەسەر دەبرد. ئەو چەند ساڵەی کە لە ئینگلتەرا بووین شێروان نەک هەر برازا بەڵکو برادەرێکی زۆر نزیک و یارو یاوەری هەمیشەمان بوو. شێروان کە گەنجێکی قۆزی جوانی لە سەرەتای بیستەکانی ژیانیدا بوو وێڕای خوێندنەکەی لە شارۆچکەی نیوبێری ڕاوچییەکی زۆر بکوژیش بوو لە ڕاوکردنی کیژۆڵەی ناسک و نازداری بریتانی و بیانیش. هەمیشە کچێکی جوانی گێرلفرێندی لەگەڵا بوو کە زوو زووش دەیگۆڕین. بە کورتی، شێروان (پلەی بۆی play boy) یەکی پڕ بە واتای وشە بوو و هەر

جارێکی کە لەگەڵ جوانکیلەیەکا دەهاتە ماڵمان من یەکسەر خۆمی بیست ساڵێک لەوەوپێشم دەهاتەوە بەرچاو و هەناسەیەکی ساردم بۆ ڕۆژانی رابردووی خۆم هەڵدەکێشا. لە دڵی خۆما دەمگوت دەوجا وەرە مەمرە کە من کوڕێتیم دەکرد ئەم مناڵە ورتکانە هێشتا کەسیان لەدایک نەببوون.

چەند مانگی یەکەمی ساڵی 76مان بە خۆشی و بەختەوەری لێ بەسەر چوو. بەتایبەتی دڵم بە لەدایکبوونی یەکەم کوڕمان، کاروان، و بە دەوامکردنی ڕێکوپێکم لە کۆلێژی زانستی سیاسەت لە زانکۆی ڕێدینگ خۆش ببوو. لەم ڕووەوە زۆر منەتباری جەنابی مەلا مستەفای بارزانیم کە تا خوێندنی زانکۆکەم تەواو کرد ئەو یارمەتیی دارایی بۆ دەناردم. بێ ئەوە خوێندنەکەم بۆ تەواو نەدەکرا. لێرەدا ناتوانم چاکەی هاوسەری خۆشەویستم ڕووناس گیان لەبیر بکەم کە کەشێکی ئەوها گونجاوی لە ماڵەکەمانا بۆ دەئافراندم کە بتوانم کەمتر مشووری ئەرکی گرانی ماڵ و منداڵ بم و زیاتر خەریکی خوێندنەکەم بم کە بیست ساڵێک دەبوو لێی دابڕابووم.

## مەرگی کاک ئەحمەدی برا گەورەم

خۆشییەکەم کورتخایەن بوو. لە ڕۆژی رەشی 25/5/1976 هەواڵی مەرگی لەناکاوی کاک ئەحمەدی برا گەورەم لە کوردستانەوە پێ گەیشت. ئەو ڕۆژە کاک ئەحمەد بە هێرشی دڵ ماڵئاوایی لە کەسوکار و دۆست و برادەران و لە کوردستان کرد. هەواڵەکەشم لەلایەن کاکە زەید ئەحمەد عوسمانی پوورزام بە تەلەفۆن پێ گەیشت کە ئەوسا ئەویش لە پەناهەندەیی لە پاریس دەژییا. کاک ئەحمەد کە کەسایەتییەکی ناوداری بواری کوردایەتی و کۆمەڵایەتی و عەشایری بوو لە کوردستان و ئەندامی سەرکردایەتی پارتی دێموکراتی کوردستانی ئەو زەمانە بوو، وەکو دەگێڕنەوە پرسەو ماتەمینێکی

بـێ پێشـینەی لـە هەولێـر و لـە گوندەکـەی خۆمـان دووگـردکان بـۆ گێڕدرابـوو. ئەمـن و شـێروانی برازاشـم لـە ماڵەکـەی مـن لـە ڕیدینـگ پرسـەمان دانـا و ژمارەیەکـی زۆر لـە کوردەکانـی ئینگلتـەرە بـە بانگمانـەوە هاتـن. مـام جەلالیـش کـە بـە سـەردانێک هاتـە لەنـدەن ( بەتـەواوی بیـرم نەمـاوە کـەی بـوو) یەکسـەر لەگـەڵ مامۆسـتا برایـم ئەحمـەد هاتنـە لام لـە ڕیدینـگ. ئەمـن لـە بەشـەکانی پێشـتری ئـەم بیرەوەریانـەم بـە وردی باسـی کەسـایەتی و پیاوەتـی کاک ئەحمـەدم کـردووە لـە جۆرەهـا بـواری ژیانـدا. دۆسـت و برادەرانـی و ڕەمزیـە و ئـاوازی کچانیشـی بـە کۆڵێـک هەڵبەسـتی دڵهەژێـن و بـە گوتـار لاواندوویانـەوە. مـام جـەلال کـە زۆر لـە نزیکـەوە هاوبیـر و دۆسـتێکی گیانـی بـە گیانـی کاک ئەحمـەد بـوو ئەویـش لـە بیرەوەرییەکانیـدا زۆر بـە حەسـرەتەوە باسـی کاک ئەحمـەدی کـردووە. مـەلا عـەوڵای ناسـراو بـە مـەلا ماتـۆڕ کـە ئەویـش هاوبیـرو هاوڕێـی کاک ئەحمـەد بـوو لەنـاو پارتیـا بـە چەندیـن بیـرەوەری جـوان جـوان کاک ئەحمـەدی لاواندووەتـەوە. شـێخ لەتیفـی شـێخ سـادقی بەرزنجـی (1999 - 1937) کـە خـزم و برادەرێکـی زۆر نزیکـی کاک ئەحمـەد بـوو بـەم سـەردولکە پڕ لـە گریـن و زارینـە کوڵـی دڵـی خـۆی بـۆی هەڵڕشـتووە:

**شیوەن بۆ کاک ئەحمەدی جوانەمەرگ**

ئێوارە کاتی خۆرئاوا — بای ئەجەل هات لە ناکاوا
هەڵیوەران لە باخی ژین — پێشێلی کرد گوڵی ڕەنگین
پێکای دڵی ڕۆڵەی دلێر — شیوەنی خستە ناو هەولێر
شیوەن بۆ شۆڕەسواری کورد — جگەرسۆزی نەبەزو ورد
گێژەڵووکەو هەوری ماتەم — ئەبارێنێ بارانی خەم
هەورێکی ڕەش لە دووگردکان — لافاوی خەمی هەڵڕژان
بەسەر گۆڕو گۆڕستانا — بەسەر لاشەی خامۆشانا
بەسەر دەشت و بەسەر شارا — بەسەر مەڵبەندو هەوارا
فرمێسک و گڵ لافاوی ڕەش — قوڕەسوورێک هەوێنی هەش

خەنەو وەسمەی ئافرەتان بێ　　ئەمڕۆکە هەر قوڕپێوان بێ
ماتەم لە جێگەی سەیران بێ　　زەماوەند شین و گریان بێ
بەهار با گەڵاڕێزان بێ　　گوڵی سەرچڵ بۆ خەزان بێ
بنکەی ڕەشپۆش دووگردکان بێ　　مەڵبەند لانەی خامۆشان بێ
لە کۆڕی گریان و شینا　　لەناو دەروونی غەمگینا
لەو سەر گرد و گۆڕستانە　　براڕۆ و دەنگی گریانە
بە دەنگ و بانگەوازەوە　　بە شیوەن و ئاوازەوە
ئەڵێن لاوی تێکۆشەر ڕۆ　　برای ژیر و خەباتکەر ڕۆ
دڵسۆزەکەی نیشتمان ڕۆ　　سەربازەکەی کوردستان ڕۆ
جگەرسۆزی هەژاران ڕۆ　　پشتیوانی جوتیاران ڕۆ
کاکی ئازاو جەنگاوەر ڕۆ　　کاک ئەحمەدی کۆڵنەدەر ڕۆ.

ڕەمزیە خان و ئاوازخانی کچەکانی کاک ئەحمەد کە هەردووکیان دەستی شیعریان هەیە ئەوانیش بە سەردولکەی دڵتەزێن باوکیان لاواندووەتەوە. ئەمەیان چەند کۆپلەیەکە لە شیعرەکەی ڕەمزیە خان:

### ڕۆژی ڕەش

بیست و پێنجی پێنج　　ساڵی حەفتاوشەش
ڕۆژی ڕووناکم　　بوو بە شەوی ڕەش
ڕۆژی سێشەممە　　کاتی ڕۆژئاوا
بابە کۆچت کرد　　زۆر لە ناکاوا
کۆچی لە پڕت　　پشتی شکاندم
وەک مەلی شێواو　　لانەت شێواندم
نەمامی شادیت　　لە ڕەگ پچڕاندم
لە جێگای خۆشی　　خەمت بۆ چاندم
ئەمساڵ بەهارمان　　وا بوو بە خەزان
گوڵم نەماوە　　لە باخچەی ژیان

ئاواز خانی کچیشی بەم هەڵبەستە باوکی لاواندووەتەوە کە ئەمە چەند کۆپلەیەکیەتی:

لەپڕ هاوارێک

هاتە بەر گوێم لەپڕ هاوارێک

بەتاو هاتە لام تاقە سوارێک

گوتی هاوارە باوکت نەخۆشە

دوور لە گیانی گەڵێ بێهۆشە

ڕێگام گرتەبەر بە گریەو زاری

گەیمە بەر دەرگای بێ ئاگاداری

لەو ڕۆژە ڕەشە هەر سینگ کوتانە

لە دایک و خوشکان هەر قوڕپێوانە

پرسیم لەڕێی خوا چیە رووی داوە

گوتیان خاک بەسەر باوکت نەماوە

جا کە هەواڵی مەرگی کاک ئەحمەدم بۆ هات ئێمە لە زانکۆی ڕێدینگ لە گەرمەی خۆئامادەکردنا بووین بۆ تاقی کردنەوەکانی کۆتایی ساڵ. ئەمن کە لەلایەکا ئینگلیزییەکەم هێشتا ئەوها باش نەبوو کە لە کلاسەکانمدا بتوانم موناقەشەی کێشە سیاسییەکانی جیهانی پێ بکەم، لەلایەکی تریشەوە بەم ناوەختە هەواڵی مەرگی لەناکاوی کاک ئەحمەدی براگەورەشم پێ گەیشت ئیتر بەجارێ پەکم کەوت و لە تاقیکردنەوەکانی ساڵی یەکەممدا شکستم هێنا و ئەو ساڵە مامەوە. بەڵام کۆڵم نەدا، ورەم نەرووخا چونکە دەمزانی بۆ. ئیتر قۆڵ و باسکی خۆم لێ هەڵماڵی و خۆم بۆ ساڵی دواتر ئامادە کرد. شەو و ڕۆژم لێک دەدا و زۆرترایەتی کاتەکانم لە کتێبخانەکەی زانکۆی ڕێدینگ بەسەر دەبرد. ئینگلیزییەکەشم بەرەو باشی دەڕۆیشت و لە کتێبخانەش هەمیشە فەرهەنگێکی ئینگلیزی - ئاڵمانی و ئینگلیزی - فرانسی و ئینگلیزی -

عەرەبیم لەسەر مێزەکەم دادەنا. رووناسی هاوسەریشم وەکوو پێشتریش باسم کردووە یار و یاوەری ماندوونەناسی ئەو ساڵانەم بوو. بۆیە هەتا ماوم قەرزار و منەتباری دایکی منداڵەکانم کە سەرەڕای ئەرکی گرانی بەخێوکردنی سێ منالی چکۆلانە کەشێکی گونجاوی بۆ خوێندنەکەی منیش دروست کردبوو. ساڵ سووڕایەوە و لە هەموو گوتارەکانی توێژینەوە و لێکدانەوە کە بە ئینگلیزی پێی دەڵێن essay و دەبوایە هەفتانەو مانگانە پێشکەشیان بکەین لە هەموو وانەکانمدا پلەی بەرزم دەهێنا. سەیریش نەبوو، خۆ هاوکلاسەکانم هەموویان لاو بوون و لە ناوەڕۆکی کتێبەکان بەولاوە ئاگایان لە مێژوو و رووداوە سیاسییەکانی جیهان یان هەر نەبوو یان زۆر کەم بوو بە پێچەوانەی منێک کە مێژوویەکی زیندووی درێژی کاری سیاسیم هەبوو و زمانزانێکی دنیا دیتە بووم.

لە دوای بەسەرچوونی خەم و پەژارەی لەدەستدانی کاک ئەحمەدی برام ئەو چەند ساڵەی زانکۆم لە ریدینگ ساڵانێکی خۆش بوون لە ژیانما. لەناو ئەو هەموو کیژە جوانانە کە بیست ساڵ لەمن بچووکتر بوون گەڕابوومەوە بۆ تەمەنی ئەوان. کچێکی رەشتاڵەی زۆر جوانی هاوکلاسم ناوی (یاسەمین زەمان) بوو کە جگە لە ئینگلیزییە رەوانەکەی زمانی تورکی و بەنگالیشی دەزانی. یاسەمین بە باوک بەنگلادەشی و بە دایک تورک بوو، کچی باڵیۆزی پێشووی بەنگلادەش بوو لە ئانکارا. لەگەڵ یاسەمینا بووین بە هاوڕێ و زۆر جار دەهاتە ماڵمان و هەندێ جاریش ئەو ئاگای لە منداڵەکانمان دەبوو ئەگەر من و روناس بچووباینا دەرەوە. رێکەوتێکی خۆش، یاسەمین خوشکێکی لە خۆی بچووکتری ناو (عەمبەرین)ی هەبوو کە لە سویسرا دەیخوێند و لەپاشان بوو بە رۆژنامەوانێکی زۆر سەرکەوتووی بە زمانی ئینگلیزی و تورکی. من عەمبەرینم نەدیبوو بەڵام یاسەمین باسی بۆ کردبووم. دوای پتر لە 30 ساڵ لە لێکدابڕانم لەگەڵ یاسەمین لە پرێنکا لە هەولێر لە ماڵی سەفین دزەیی برازام رووبەڕووی عەمبەرین بوومەوە.

زانیم کە عەمبەرین هاتوچۆی کوردستان دەکات و راپۆرتی سیاسی لەسەر کورد بۆ سایتی (ئەل مۆنیتەر Al Monitor) دەنیرێ. عەمبەرین ئێستاش ناوە ناوە دێتە کوردستان و میوانی کاک سەفینی برازام دەبێت، منیش هەمیشە دەچمە لای و دەنگوباسی یاسەمینی خوشکی لێ دەپرسم. گوتارەکانی عەمبەرین زەمان زۆر واقیعبینانەن بەڵام بە دڵی کاربەدەستانی تورک نین. لەبەر هەندێ ناوێرێ بچێتە تورکیا و پێم وایە لەگەڵ مێردە ئەمریکییەکەیا لە واشنتن دادەنیشن. مێردەکەی کارمەندە لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا.

زیانی بۆ پەز نابێت - هەر نەبێ بۆ نۆستالجیا - ئەگەر کۆمەڵانی کوردی ئینگلتەرا و ئەو کوردانەش بەسەر بکەمەوە، کە لە چەندساڵی مانەوەم لەو وڵاتە ( 1980 - 1975) بۆ سەردان دەهاتن. جا ئەوانەی کە دەمناسین و لەگەڵ زۆریانا پەیوەندیمان هەبوو، ئەم تاک و خێزانانەم لەبیر ماون:

نەجدەتی موحسین ئاغا، محەمەدی موحسین ئاغا، شێروان دزەیی برازام، نەوزاد دزەیی (لە کاردیف بوو)، خەولە خانەقا (لە کاردیف بوو)، ئاراز کاکەزیادی کوڕە ئامۆزای دایکم (لە کاردیف بوو)، برایم دزەیی، کە لە بێرمینگهام ماستەری تەواو کردبوو و بۆ ماوەیەکی کورت لە لەندەن مایەوە ئینجا گەڕایەوە بۆ کوردستان، ماهیری نورەدین ئاغا، هاواری کاکەزیاد، جەمال عەلەمدار، دکتۆر فریاد حەوێزی و خێزانی، دکتۆر حەمید حەوێزی و خێزانی، پرۆفیسۆر کەمال مەجید، دکتۆر شەفیق قەزاز و چلوورەخانی هاوسەری (لە بێرمینگهام بوون)، سەرداری حەماغا و سایەخانی هاوسەری (لە بێرمینگهام بوون)، دارا عەتار، دکتۆر دلێر عەتاری برای، دکتۆر فوئاد زەکی هەناری و خێزانی (لە باشووری ئینگلتەرا بوون)، غولام خانەقینی. هەڵبەت ماڵی مامۆستا تۆفیق وەهبی و ئاسیاخانی هاوسەری و هەردوو کوڕەکانیان سزا و سروشت ئەوانیش هەر لەمێژ بوو لە لەندەن نیشتەجێ بووبوون. ماڵی بابە عەلی شێخ مەحمود و رەشادەت خانی هاوسەری و مەحمود

بابـان و عەدەویەخانـی هاوسـەری و ماڵـی مامۆسـتا ئیبراهیـم ئەحمـەد و گەلاویژخانـی هاوسـەری و کاک عومـەر دەبابـە و سـورەیاخانی هاوسـەری و میـر تەحسـین بەگـی یەزیـدی، ئەوانـەش وەک پەنابـەر لـە لەنـدەن و دەوروپشـتی لەنـدەن دادەنیشـتن. رزگار نابـی جیـاووک و جـوان خانـی هاوسـەری (لـە باشـووری ئینگلتـەرا بـوون)، ئـازاد نەجمەدیـن و دکتـۆر پشـتیوان و دکتـۆر جەمـال ساڵح و دکتـۆر جەمـال غەفوریـش. درەوشـان و دڵنیـای خوشـکی کچانـی دکتـۆر ئیبراهیـم فەتـاح، گوڵشـەنی جەمـال خورشـید، دانـا و توانـای حاکـم مسـتەفا، کەمالـی سـەید غەریـب. کاک ئیدریـس و کاک مەسـعود و کاک سـابیری مـەلا مسـتەفای بارزانـی و هەروەهـا مـام جەلالیـش بـە سـەردان دەهاتنـە لەنـدەن و دەمدیتـن.

سـاڵی 77 مـاڵ و منداڵەکانـی کاک موحسـینی بـرام، کـە لەپـاش شکسـتی شۆڕشـی ئەیلـوول لـە ئێـران مابوونـەوە، ئەوانیـش هاتـن بـۆ ئینگلتـەرا و لەگـەڵ شـێروانی کوڕیـان لـە نیوبێـری نیشـتەجێ بـوون. سـامانی بـرازام کـوڕی کاک ئەحمـەدی بـرام، ئەویـش هـەر ئـەو سـاڵە لـە کوردسـتانەوە هـات و ئەمانـەش هەموویـان تـا ئێسـتاش هـەر لـە ئینگلتـەرا ماونەتـەوە. هاتنـی ئـەم خزمانـە بـۆ رووناسـی هاوسـەرم و بـۆ منداڵەکانـم شـتێکی نـوێ بـوو و جـۆرە ئاوەدانییەکـی دەخسـتە نێـو ماڵەکەمانـەوە و غەریباتیـی لـێ دەرەواندینـەوە.

بـەدەر لـە شـێروانی موحسـین دزەیـی بـرازام و نەجدەتـی موحسـین ئاغـای کـوڕە پـوورزام، لـەو خزمانـەی ئینگلتـەرا کـە لێمانـەوە نزیـک بـوون و زوو زوو سـەریان لـێ دەدایـن، نـەوزاد دزەیـی یەکێکیـان بـوو کـە لـە شـاری کاردیـف دەیخوێنـد. نـەوزاد هـەر جارێکـی بچووبایـە لەنـدەن، لـە رێـگا لای ئێمـە لـە رێدینـگ لای دەدا و شـەو لامـان دەمایـەوە. نـەوزاد یەکێـک لـە خـزم و بـرادەرە نزیکەکانـی ئەوسـا و ئێستاشـمە و لـە زۆر بـواری ژیـان و بۆچوونمانـا هاوبیـر و هاوڕایـن. هاوینێکیـان کافیـە خانـی خـدری پاشـای دایکـی نـەوزاد، لەگـەڵ پاشـای خـدری پاشـای خاڵـی ئەوانیـش، بـە سـەردان هاتنـە ئینگلتـەرا و میوانـی

ئێمە بوون. سەربەست دزەیی برای نەوزاد کە ئەوسا لە هەنگاریا دەیخوێند، ئەویش سەردانێکی کردین و دواتر ئەویش گواستیەوە بۆ کاردیف و خوێندنەکەی لەوێ تەواو کرد. ئەرجومەندی مەلا سدیقی دۆستی دێرینی سالآنی قوتابخانەم کە لە ئالمانیا دەژیا، ئەویش هاتە لام و میوانی من بوو. تەحسین هەورامی برادەری دێرینم ئەویش لەگەڵ کچە بچکۆلەکەی (پێم وایە ناوی رەنگین بوو) یەکێک بوو لە میوانە ئازیزەکانم. لە خزمانی تریش کە لەو ماوەیە بە سەردان دەهاتنە لەندەن، ئەمانە هەندێکیان بوون: چەتۆی تایەر ئاغای دزەیی و خەسرۆی حاکم رحمانی دزەیی و حاکم جەوهەری عەزیزی پاشای دزەیی، لەگەڵ نەجیەخانی هاوسەری، سالحی عەلی ئاغای ئامۆزام لەگەڵ ناسکەی هاوسەری کە برازامە، برایم ئاغای حاجی ئەمینی دزەیی و دکتۆر خورشیدی کوری، سلێمان ئاغای رەسووڵ ئاغای دزەیی و کاک خەسرۆی برای و کاک ئەحمەدی دارەتوو، کە ئاگرینی کوری بۆ سەر دکتۆر هێنابووە لەندەن و کاک مەلای ئامۆزایان. عزەدین ئەمین دزەیی و نەجیبی ئەحمەد چەلەبی دەباغ و شێخ سمایلی شێ عەبدولکەریم و عومەر ئاغای سوورچیش زوو زوو دەهاتن و مەبەستی ئەمانە زیاتر گازینۆی قومار بوو. کاک سەعدیی برام و حاکم جەوهەری حوسێنی مەلای دزەیی، ئەوانیش چەند جارێ هاتن و دکتۆر کەمال فوئاد و عومەر شێخموسیش لە ئەوروپاوە سەردانیان دەکرد. حەمەی حوسێنی مەلای دزەیی و تەواوی خێزانەکەی ئەوانیش هەر بۆ یەکجاری هاتن بۆ لەندەن خانوویان کری و تا ئێستاش هەر لەوێ ماونەتەوە. دکتۆر ئەنوەری برام کە لە ئالمانیا دەژیا، ئەویش فائیزەخانی هاوسەری و کورەکانی (سامان و سالار) بۆ سالێک ناردە لەندەن بۆ ئەوەی ئینگلیزییەکەیان باشتر بکەن. شاعیری گەورە ئەحمەد هەردی لە کوردستانەوە و دکتۆر جەمال نەبەزیش لە بەرلینەوە هاتبوون سەردانیان کردم و ئێوارەیەکی خۆشمان لە مالەکەی من لە ریدینگ بەدەم گۆرانی و شیعرەوە بردە

سەر، کە دکتۆر شەفیق قەزاز و چلورەخانی هاوسەری کچی ئەحمەد هەردی و شێروانی برازاشم لەگەڵمانا بوون. هونەرمەندی دەنگخۆش تایەر تۆفیق ئەویش هات و چەند شەوێک بە میوانی لای ئێمە مایەوە. هەروەها هەنەرمەندی زۆر دەنگخۆشی هەولێری حەیدەر کە بە ( حەیدەرە کەچەڵ ) دەناسرا و هونەرمەندی حەیرانانیش رەسول گەردی ئەوانیش بە جیا جیا هاتبوونە لەندەن و سەردانم دەکردن

ئیتر وەک دەبینن ئەمن وێڕای خەریکبوونی تەواوم بە خوێندنەکەمەوە، دەبوایە چاوێکیشم لەو خزم و برادەر و ناسیاوانەش بێ، کە لەدەرەوە دەهاتن تەلەفۆنیان بۆ دەکردم و دەبوایە بیانبینم.

کلاسی ساڵی کۆتاییشم سەخت بوو و زیاتر بریتی بوو لە نووسینی ئێسەی بە دوای ئێسەی (گوتاری نووسراو = essay). جا بەڕاستی وەک هەر خوێندکارێکی گەنجی رەبەنی بێ ژن و منداڵ پێویستیم بەتەنیایی هەبوو. بۆیە لەگەڵ رووناس رێک کەوتین کە ئەو ساڵە ئەو و منداڵەکان بگەڕێنەوە بۆ عێراق تا من لە کەشێکی ئارامتردا خوێندنەکەم تەواو دەکەم، ئینجا بێنەوە بۆ ئینگلتەرا. مەبەستیشم بوو کە منداڵەکانم بە مانەوەی ساڵێک لە کوردستان کوردییەکەشیان باشتر بێت، چونکە لەگەڵ یەکتری و لەگەڵ ئێمەشا هەر بە ئینگلیزی قسەیان دەکرد. هەر واشمان کرد. ئەوان گەڕانەوە بۆ هەولێر و منیش بەتەنیا مامەوە، کە بەڕاشکاوی بیڵێم هەر نەچووبانایەوە باشتر بوو، ئەوەندە بیری منداڵەکانم دەکرد و یەک دوو حەیرانیشم لەسەر دانان.

## مەرگی کاك زەیدی پوورزام

ساڵی 78 یش ساڵێکی رەش بوو بۆم، چونکە لەو ساڵە پوورزای خۆشەویستم، کەسایەتیی ناوداری کوردستان و عێراقیش، کاکە زەید ئەحمەد عوسمان، کە لە پەنابەری لە پاریس دەژیا، کۆچی دوایی کرد. من و کاک موحسینی برام چووین بۆ پاریس و دوای چەند رۆژێ من لەبەر خوێندنەکەم گەڕامەوە، بەڵام کاک موحسین لەوێ مایەوە تا تەرمەکەی بەرێ کردەوە بۆ کوردستان. من لە بەشەکانی پێشترما بەوردی باسی کاک زەیدم کردووە.

ساڵی 1979یش ساڵێکی مێژوویی بوو بۆم. ئەمن لەبەر زۆر هۆی کە لە بەشەکانی پێشترا باسم کردووە بۆ ماوەی بیست ساڵ (1975 - 1955) دوچاری سەگەردانی ببووم و لە خوێندن دوور کەوتبوومەوە. دواجار کە ژنم هێنا و قۆناخی تافی لاویم تێپەڕاند، ئینجا گەڕامەوە سەر خوێندن و تەواوم کرد.

لەو ساڵانەی ئینگلتەرام رووداوی هەمە جۆری سیاسیش لە کوردستان و لە ئێرانا سەریان هەڵدابوو. شا نەما و خومەینی هات. یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بە رێبەرایەتی مام جەلال لە 1976/6/1 دامەزرا. پارتی دیموکراتی کوردستان لەسەر بەرپرسیارییەتی شکستی شۆڕشی ئەیلوول لێکترازانێکی تێ کەوت و سامی عەبدولڕەحمان کرا بە سکرتێری سەرکردایەتیی کاتیی پارتی ( قیادەی موەقەتە)، کە لە بەراییا لەگەڵ بنەماڵەی بارزانی زۆر کۆک نەبوو. پارتی لە لایەکا، یەکێتی لەلای خۆیەوە و چەند کۆمەڵێکی دیکەش هەر یەکە بە جیا جیا دەستیان بە بزووتنەوەی چەکداریی سنووردار کردەوە.

بەڵام لە بەدبەختیی کورد، ئەمانە زیاتر دوژمنایەتیی یەکتریان دەکرد و لێکتریان دەکوشت تا شەڕکردنی سەدام. "گەڕی دووەمی"

شەڕی براکوژی سەری هەڵدایەوە. لە هەردوولا پێشمەرگەی دێرینی نەبەز گیانی پاکیان لە ختوخۆڕایی لەدەست دەدا. خۆ ئەو حزب و کۆمەڵانە هەر هەموویان کوردایەتیان دەکرد، بەڵام بەداخەوە سەرکردەکانیان لە کەمزانی و خۆخۆییان هەر یەکە ئەوی تری بە جاش و جاسووس و نۆکەر و خائین دادەنا و ئەو هەموو جگەرگۆشەی دایکوباوکانی کوردیان لەپێناو بە کوشت دەدا.

لەپاش تەواوکردنی خوێندنی زانکۆم، بڕوانامەی BA واتا بەکالۆریۆسی ئادابم بە پلەی شەرەف BA honours لە زانکۆی بەریتانی ریدینگ Reading وەرگرت. ئەمە بەڕاستی وەرچەرخانێکی گرنگ بوو لە ژیانی مندا، چونکە هەر لە سەرەتای چوونە ئەوروپام بۆ خوێندن، لەبەر هەندێ هۆی کە پێشتر باسم کردوون، لە خوێندن دوور کەوتبوومەوە. لە ناخی خۆشمدا دەمزانی کە ئەمن شایەستەی زۆر لەوە زیاترم و زۆر لەوە زیاترم لەباردا هەیە، بەڵام وەک عەرەب دەڵێن: "تجري الرياح بما لا تشتهي السفن".

جا بە بۆنەی دەرچوونم لە زانکۆ، لەگەڵ منداڵەکانی کاک موحسینی برام و لەگەڵ نەجیبە خانی رەحمەتیی دایکیان، رێک کەوتین کە ئێوارەخوانێکی زۆر خۆش بە خواردن و هەڵپەڕکێ و موزیکی کوردی بۆ مامۆستاکان و هەندێ لە هاوکلاسەکانم لە ماڵی ئەوان لە نیوبێری ساز بکەین. ماڵ و منداڵی خۆم هێشتا لە کوردستان بوون و کاک موحسینی براشم لە ئەمەریکا بوو.

هەر بە بۆنەی دەرچوونم لە زانکۆ، کاک حەمەی حوسێنی مەلای ئامۆزام. کە ماڵی لە لەندەن بوو، ئەویش بانگهێشتی سەفەرێکی بۆ پاریسی کردم و پێکەوە چووین چەند رۆژێک لە ئوتێلی بەناوبانگی (جۆرج سانک) واتا جۆرجی پێنجەم ماینەوە. باش بوو لەوێ چاومان بە (درية محمد علي عوني)ش کەوتەوە، کە کۆنە هاوڕێیەکی هەردووکمان بوو و لەمێژ بوو نەماندیبوو.

دوای مانەوەی نزیکەی ساڵێک لە هەولێر، منداڵەکانم و دایکیان

هاتنـەوە. ئیتـر دەسـتم کـرد هـەوڵ بـدەم کارێ بدۆزمـەوە، بـەڵام بـە بڕوانامـەی بەشـی ئەدەبـی دۆزینـەوەی کار ئەوهـا ئاسـان نەبـوو. پزیشـک و ئەندازیـار و ژمێریـار ئاسـانتر کاریـان دەسـت دەکـەوت. کاک مەحمـود بابـان، کـە ماوەیەکـی درێـژ لـە عەرەبسـتانی سـعوودی ژیابـوو و خەڵکێکی زۆری دەناسـی، ئەویـش هەوڵـی بـۆ دام، بـەڵام چـی وەهـای لـێ سـەوز نەبـوو. ڕۆژانـەش خـۆم سـەیری لاپـەڕەی ئیشـوکاری ڕۆژنامەکانـم دەکـرد، ئەگـەر شـتێکی تیـا بـوا. دواجـار کارێکـی باشـم بەرچـاو کـەوت، کـە پێشـتر خۆیشـم ئەزموونـم لێـی هەبـوو. کاری تەرجومـەکاری لـە کـوردی بـۆ ئینگلیـزی. تەرجومـەی بەرنامـە سیاسـیەکانی وێسـتگەی رادیـۆ کوردیەکانـی کوردسـتان، بەتایبەتـی رادیـۆ نهێنیەکانـی شۆڕشـگێڕانی کـورد. ئـەم بەرنامەیـە سـەر بـە رادیـۆی بـی بـی سـی بەریتانـی بـوو BBC Monitoring Service. چووم بـۆ لایـان تێسـتیان کردم و یەکسـەر وەریانگرتـم، بـەڵام مخابـن دەرکـەوت کـە شـوێنی پۆسـتەکەم لـە ئینگلتەرا نیـە، لـە شـاری (مەنامـە)ی پایتەختـی بەحرێنـە. مووچەکـە زۆر بـاش بـوو و پێشـیان گوتـم کـە منداڵەکانیشـم لـە قوتابخانـەی بەریتانـی لـە مەنامـە دادەمەزرێنـن، بـەڵام زۆر دوودڵ بـووم، چونکـە پۆسـتەکەم هەسـتیار بـوو و بیستبووشـم کـە حکوومەتـی بەعسـی بەغـدا دەسـتی کوشـتنی هـەر کەسـێکی نەیـاری بەئاسـانی دەڕوا، بـە تایبەتـی لـە وڵاتـە عەرەبییەکانـدا. دیسـان وەک سـاڵەکانی 66 و 67م بەسـەر هاتـەوە کـە لـە ئاڵمانیـا بـووم و کارێکـی باشـم لەگـەڵ قوتابخانەیەکـی سـەربازیی ئەمەریکـی دەسـکەوت، بـەڵام شـوێنەکە لـە شـاری ناپۆلیـی ئیتالیـا بـوو و منیـش حـەزم نەدەکـرد بچمـە ئـەوێ و گەڕانـەوەم بـۆ عێـراق لا پەسـندتر بـوو. ئـەم جارەش وام بەسـەر هـات و هـەر واشـم کـردەوە.

له چەپەوە: نەجدەتی موحسین ئاغا ، هۆمەر دزەیی ، رووناسی هاوسەری هۆمەر ، بێتی هاوسەری نەجدەت لە شاری برایتن ، ئینگلتەرا

روناسی هاوسەرم و منالەکانمان نازدار و لارا و کاروان لە باخچە چکۆلانەکەی ماڵمان لە رێدینگ ، ئینگلتەرا

جاشولەکەی ماڵە هاوسێکەی نەجدەت لە شارۆچکەی کۆڵد ئاش ، ئینگلتەرا

شێروانی برازام و کاروانی کوڕم

رووناسی هاوسەرم و شێروانی برازام و کاروانە بەبۆکەی کوڕم لەبەردەم ماڵەکەمان لە شاری رێدینگ، ئینگلتەرا

کاروان لە باوەشی مامە سەعدی و نەجیبەخانی رەحمەتیش لە تەنیشتیانە

کاروان لە باوەشی دایکیا

شێروانی برازام و مێری گێرڵ فرێندی و کاروانی بەبۆکە لە ماڵی ئێمە لە رێدینگ

کاروان لە باوەشی سەربەستی ئامۆزای بابی، نازداریش دانیشتووە

کاروان لە باوەشی سامانی ئامۆزای

کاروان لە باوەشی درەوشان دکتۆر ئیبراهیم فەتاح لەگەڵ ژنێکی دراوسێمان لە رێدینگ

کاروان لە باوەشی مامە موحسینی

لەچەپەوە: کاک موحسینی برام لارای کچمی لە باوەشایە ، کاک دکتۆر ئەنوەری برای رەحمەتیم کاروانی کوڕمی لە باوەشایە ، خۆم و نازداری کچم لە ماڵی ئێمە لە ڕێدینگ ، ئینگلتەرا

رزگاری ئەحمەد حەمەدەمین برازای هۆمەر لەگەڵ نازنازخانی هاوسەری لەسەر ئارامگای باوکی لە دووگردکان

نەجدەتی موحسین ئاغای کوڕە پوورزای هۆمەر لەگەڵ بێتی هاوسەری
ڕۆژی مارەیبیان لە لەندەن

ئاواز ئەحمەد حەمەدەمین برازای هۆمەر

ڕەمزیە ئەحمەد حەمەدەمین برازای هۆمەر

له راستەوە: کاک ئەحمەد حەمەد ئەمین و شێخ لەتیفی شێخ سادقی بەرزنجی خزمی و هاوڕێی زۆر نزیکی

شێروانی برازای هۆمەر لەگەڵ میکائیلای دۆستی لە نەورۆزی 76 لە لەندەن

هۆمەر دزەیی و یاسەمین زەمان، خوشکی عەمبەرین زەمان لە رۆژی تەخەرروجیان لە زانکۆ

له راستەوە: تایەر تۆفیقی هونەرمەند ، هۆمەر دزەیی ، نەجدەتی موحسین ئاغا
له ماڵی هۆمەر له ڕێدینگ

له راستەوە: دکتۆر جەمال نەبەز ، ئەحمەد هەردی شاعیر ، هۆمەر دزەیی
و دکتۆر شەفیق قەزاز له ماڵی هۆمەر له ڕێدینگ

هۆمەر دزەیی لەگەڵ مامۆستا تۆفیق وەهبی لەماڵی مامۆستا له لەندەن

له ماڵی من له ڕێدینگ له ڕاستەوە : ئیدریس بارزانی ، هۆمەر دزەیی ،
جەرجیس فتح الله ، موحسین دزەیی ، سابیر بارزانی (76 یان 77)

له چەپەوە : ئیدریس بارزانی ، میر تەحسین بەگی ئێزدی ، هۆمەر دزەیی
(لەندەن 1977)

ڕۆژی بەخشینی بڕوانامە له زانکۆ کە برازاکانم پەیمان و ڕێزانیش هاتبوون

هۆمەر دزەیی لە ڕۆژی بەخشینی بڕوانامە لە زانکۆ

دوای تەخەڕوح مامۆستاکانم بۆ ئێوارەیەکی کوردی لە ماڵی کاک موحسینی برام بانگهێشت کرد.

دوو نموونەی نووسینەکانی هۆمەر دزەیی لە کۆلێژی سیاسەت لە زانکۆی ڕێدینگ، ئینگلتەرا

ڕۆژنامەوانی بە باوک بەنگلادەشی، بە دایک تورک، بە وڵاتنامە ئەمەریکایی، دۆستی کورد و ئەرمەنیان عەمبەرین زەمان

سەرکۆماری پێشووی نەمسا دکتۆر هاینتس فیشەر

KLUB DER SOZIALISTISCHEN
ABGEORDNETEN UND
BUNDESRÄTE
1017 WIEN, PARLAMENT

Herrn
Omar Dizeyee
~~Wallnerstrasse 2/III/9~~

~~1010~~ Wien

1160, Ottakringerstr. 215/5/9/11

زەرفی نامەکەی سەرکۆماری پێشووی نەمسا دکتۆر هاینتس فیشەر بۆ هۆمەر دزەیی

KLUB DER SOZIALISTISCHEN
ABGEORDNETEN UND
BUNDESRÄTE

1017 Wien
Parlament, Tel. 42 15 25 Serie

Wien, 1975-o4-3o
Dr.hfi/ul

Sehr geehrter Herr Dizeyee!

Ich habe in der gestrigen Sitzung des Nationalrates an den Herrn Innenminister eine Anfrage mit folgendem Wortlaut gerichtet:

"Sehen Sie eine Möglichkeit, im Sinne der humanitären Tradition Österreichs eine bestimmte Anzahl kurdischer Flüchtlinge in Österreich aufzunehmen ? "

Aus der beiliegenden Antwort können Sie ersehen, dass die Einstellung des Innenministers positiv ist. Ich glaube ~~sogar~~, dass es kein Hindernis gibt, entweder über den Flüchtlings - hochkommissar oder in einer anderen geeigneten Weise einen diesbezüglichen Antrag zu stellen, der positiv erledigt werden wird

Was Ihre eigene Tätigkeit betrifft, habe ich mit dem Sekretär von Aussenminister Dr. Bielka gesprochen, der mir zugesagt hat, sich in Ihrem Sinne zu bemühen.

Ich bleibe mit den besten Grüssen

Heinz Fischer
Dr.Heinz Fischer

Beilage
Herrn
Omar Dizeyee
Wallnerstr. 2/III/9
1o1o Wien

نامەکەی سەرکۆماری پێشووی نەمسا بۆ هۆمەر دزەیی لەبارەی وەرگرتنی پەنابەرانی کورد لە نەمسا

UNIVERSITY OF READING

*I hereby certify that*

OMAR MOHAMMED AMIN BAIZ DIZEYEE

*having satisfied the Examiners in the Final Examination in*

POLITICS

*and having in the Examination been awarded Honours in the* Third *Class, has this day been duly admitted to the Degree of*

BACHELOR OF ARTS

*of this University*

*Registrar*

7 July 1979

بڕوانامەی زانکۆم بە پلەی شەرەف لە سیاسەت لە زانکۆی ڕێدینگی بریتانی

# بەشی 31

## دیسان گەڕانەوەمان بۆ عێراق

پۆستەکەم ڕەت کردەوە و بڕیارمان دا بگەڕێینەوە بۆ کوردستان و لەوێ خۆم خەریکی چاندنی ئەو زەوی و زارە بکەم کە لە باوکمەوە بۆم مابووەوە. ئەوە بوو کە خێزانەکەم لەپێش خۆم ناردەوە و خۆشم لەگەڵ کاک عزەدینی حاجی ئەمینی خزمم چووینە کوێت و چەند ڕۆژێک لەوێ ماینەوە. بەپێی قانوونێکی عێراقی، هەر خوێندکارێک ئەگەر لەدەرەوە بگەڕابایەوە بۆ عێراق مافی بردنەوەی بێ گومرگدانی کەلوپەلی تەواوی ناوماڵێک و ئۆتۆمۆبیلێکیشی هەبوو. لە کوێت هەندێ شتی ناوماڵم بۆ خۆم کڕی، بەڵام پارەی ئۆتۆمۆبیلم نەبوو. کاک سەعدی برام کە لە بەغدا کارمەند بوو و هەندێ پارەی لەدەرەوە هەبوو داوای لێ کردم بە پارەکەی خۆی ترومبێلێکی ڤۆڵڤۆی بۆ بکڕم. هەر واشم کرد و ڤۆڵڤۆیەکی ڕەنگ زیوینی نوێم لە کوێت بۆ کڕی و بەو ترومبێلە پێم وایە مانگی یەکیساڵی 80 بوو، ڕێی بەغدام گرتەوە بەر. چەند ڕۆژێک لە بەغدا لە ماڵی کاک سەعدی برام مامەوە، ئینجا چوومەوە بۆ هەولێر و لەگەڵ منداڵەکانم و خزم و کەسان شاد بوومەوە.

لە هەولێر لەگەڵ شێ محەمەدی برای کاکەسەمەی دووگردکان، پێک هاتم بە هاوبەشی زەوییەکەی گوندی هێلاوەم بۆ بچێنێت. کۆمپانیایەکی دانیمارکی (گروندفوس Grundfos) بۆ پەمپی ئاو (غەتاس) و ئامێری ڕشێنەر (مەڕەش)ی ئاودانی زەویوزار لە هەولێر دەست بەکار بوو. پەیوەندیم بەوانیشەوە کرد، چونکە لە ئینگلتەرا

گەڕابوومــەوە یەکســەر وەریانگرتــم بــۆ یارمەتیدانیــان لــە کاروبــاری دەوائیـری دەوڵـەت. کولتـووری کردنـەوەی کۆلێتی مریشـکانیش (دواجن) تـازە گەیشـتبووە کوردسـتان و زوو بـووە بـاو. جـا لـە گونـدی قۆڕیتانـی خزمەکانـی خـۆم کـە نزیکەشـار بـوو، کاک دکتـۆر خەسـرۆی ئامـۆزام زەوی لـەوێ هەبـوو و چاکەیەکـی پیاوانـەی لەگەڵـدا کـردم و شـوێنی دەواجینێکـی لەسـەر زەوییەکـەی خـۆی دامـێ.

لـە هەمـان کاتـدا بیرۆکـەی ریسـتۆرانتێکی سـەرپێیم بـۆ هـات (فاسـت فـوود fast food) وەک مریشـکی کەنتاکـی و هامبورگـەر، بـەڵام مۆڵـەت وەرگرتـن بـۆ هاوردەکردنـی ئامێـری سـازکردنی ئـەم جـۆرە خوراکانـە لـەدەرەوەی عێراقـەوە بـۆ عێراقییـان زۆر سـەخت بـوو. جـا لەگـەڵ دانیمارکییـەکان قسـەم کـرد، ئـەوان بـە نـاوی خۆیـان ئـەو ئامێرانـەم لـە دانیمارکـەوە بـۆ بێنـن، کـە بـۆ ئـەوان گومرگیشـی لەسـەر نەبوو، ئەوەشـیان بـۆ کـردم. کاک نەجاتـی کـوڕە پوورزاشـم کـە ریـزە دوکانێکـی لـە شـەقامی سـەرەکیی نـاو شـاری هەولێـر هەبـوو، ئەویـش دوکانێکـی باشـی دامـێ و کەنتاکییەکـەم (بـێ دانیشـتن) لـەوێ کـردەوە بـە نـاوی (سـاڵی 2000). دوو کچـی جوانکیلـەی عەنکاوەییشـم دامەزرانـد، کـە بـە جلـی یونیفۆڕمـەوە هـەر لەسـەر کاونتـەر خـواردن رادەسـتی کڕیـارە سـەرپێیەکان بکـەن. ئەمـە یەکـەم جـار بـوو لـە مێـژووی هەولێـر کـچ لـە رێسـتۆرانتدا خواردنـت پـێ بفرۆشـێت بۆیـە دەنگـی دایـەوە. هەڵبـەت ئەمـە هەمـووی پـارەی پـێ دەویسـت و منیـش ئـەو پارەیـەم نەبوو. ناچـار لەگـەڵ بیـلال عەزیـزی شـوفێری پێشـووی تاکسـی کـە دۆسـتێکی دێرینمـان بـوو و بـەو دواییـە زۆر دەوڵەمەنـد بووبـوو، قسـەم کـرد. حاجـی بیـلال نـەوزادی کـوڕە گـەورەی خـۆی کـردە هاوبەشـم، کـە هەمـوو پـارەی ئامێـرەکان و دیکۆراتـی نـاو دوکانەکـەی دا.

بـەم جـۆرە ئیتـر لـە چـوار لاوە خـۆم خەریـک کـرد: کشـتوکاڵ، دواجـن، ریسـتۆرانتی فاسـت فـوود، کۆمپانیـای گروندفوسـی دانیمارکـی.

ئـەم جـۆرە خـۆ خەریککردنـە لەلایەکـی تریشـەوە بـۆ مـن بـاش

بوو، چونکە هەر کوردێکی سەر بە شۆڕشی کورد کە لەدەرەوە دەگەڕایەوە و لێبووردنی لەلایەن بەغداوە بۆ دەردەکرا، تا ماوەیەک هەر گومانلێکراو بوو و هەمیشە لەژێر چاوەدێریی ئاسایشی بەعسدا دەبوو بزانن بە چییەوە خەریکە.

بە شکستی شۆڕشی ئەیلوول، حکوومەتی بەغدا باری گرانی خەرجیی دارایی و زیانی بەشەریی پێشووی لەکۆڵ بووبووەوە. بزووتنەوە چەکدارییە پچڕپچڕەکانی کوردیش کە لێرە و لەوێ سەرلەنوێ سەریان هەڵدابووەوە، ئەوەندە کاریگەرییان وەک پێشوو لەسەر باری ئابووریی عێراقدا نەدەکرد. بۆیە لەپاش 1975 تا ناوەڕاستی هەشتاکانیش، عێراق گەشبوونەوەیەکی ئابووریی زۆر بەرچاوی بەخۆیەوە دی و گوزەرانی خەڵک بەرەو بووژانەوە دەچوو، بەڵام ئەم بارە لە ئەنجامی درێژبوونەوەی شەڕی ئێران - عێراق وا نەما و بوو بە باری نالەبار.

ئەمن لە کاتێکا گەڕامەوە بۆ عیراق کە بەڵی، سەرەتاکەی بۆ کارو کاسبی باش بوو بەڵام بنەتاکەی تەڕەماش بوو. لە مانگی یەکی 80 گەڕامەوە، شەڕی ئێران - عیراقیش لە پایزی هەر ئەو ساڵە بەرپا بوو. بەڵام وەک پێشتر باسم کردووە شەڕەکە تا نزیکەی نیوەی یەکەمی هەشتاکانیش هێشتا کاریگەریی ئەوەندە خراپی نەکردبووە سەر ئابووری عیراق. عیراق خۆی دەوڵەمەند بوو و لە هەموو لایەکیشەوە ( رۆژئاوا و وڵاتانی عەرەبی ناحەزی ئێران) پشتی دەگیرا و کومەکی دەکرا. جا وەکوو لە سەرەوە گوتم ئابووری عیراق لە چەند ساڵی سەرایی شەڕەکەش هەر لە گەشانەوەدا بوو. بەو پێ یە، ئەو پرۆژانەی کە منیش خەریکیان بووم لە بەراییدا و تا ماوەیەکیش باش دەڕۆیشتن. بەڵام کە شەڕەکە تا دەهات گەرمتر و دژوارتر و ترسناکتر دەبوو، هەردوو وڵاتی ماندوو کردبوو و لە پەلوپۆی خستبوون باری ئابووری عیراقیش ئیتر دەستی پێکرد سەرەولێژ شۆڕ ببێتەوە. ئەو شەڕە خەرجی و مەسرەفێکی یەکجار زۆری تێ دەچوو هەم بۆ عیراق و هەم بۆ

ئێران کە کاریگەرییەکی زۆر خراپی کردبووە سەر بازاڕی هەردوو وڵاتان. بیرمە بۆ ماوەی چەندین کاتژمێر ریزم دەگرت تا تەبەقەیەک هێلکە یان کارتۆنێک مریشکی برازیلیم دەست دەکەوت. زۆر لە دەواجینەکانی خۆماڵی پەکیان کەوتبوو لەبەر نەبوونی دان و داو دەرمان و هێلکەی راوکە. خۆ باسی درێژیی ریزی بەنزینخانەکان و بەرمیلی نەوتی سووتەمەنی و بوتلی گاز هەر ناکرێ. دایکانی منداڵی ساوا بە بەرۆکەوە لەگەڵ مەلابانگدانێ بەرمیلی بەتاڵیان بەپێش خۆیاندا خلۆر دەکردەوە و دەچوون ریزیان دەگرت بۆ سووتەمەنی ئەوجا کاتی چێشتانگاوێ بە پاڵ پێوەنان دەریان دەکردن کە نەوت و گاز تەواو دەبوو. خۆ حاڵی کۆنتراتچییان (بەڵێندەر) حاڵی کسۆکێ بوو تا چەند تەن چەمەنتۆیان بەر دەکەوت، ئەگەر بیاندرابوایە. جا لە بێ چەمەنتۆیی و کەرەستەی تریش ئەگەر واسیتەت نەبوا بینا ناتەواوەکان لە زۆر شوێنا بای لێ دەدا. ئەوە بازاڕ.

بەڵام کارەساتی گەورە لەلایەکی ترەوە بوو. لەدەستچوونی رۆژانەی ژیانی سەدان سەربازی عیراقی بە عەرەب و کورد و هەموو پێکهاتە نەتەوەییەکانی تر و ئایین و ئایینزاکانیەوە ژیانی هەموو خێزانێکی عیراقیانی کردبوو بە دۆزەخ. لە هەموو شارەکانا رۆژانە تەرمی ئەو گەنجە نازدارانە لە بەرەی شەڕ دەهێنرانەوە و رادەستی کەسوکاریان دەکرانەوە. لە ئەنجام، دیاردەی فیراری لەناو سوپای عیراقا بە ئەندازەیەکی زۆر بڵاو بووەوە. ناچار حکومەتی بەعس دەستی بە گرتنی نەوجوانانی تەمەن لە 18ساڵ بچووکتر و کەسانی مەیلەو پیریش کرد و بە پەلکێشان دەیانناردنە بەرەی شەڕ. ساڵ دەسووڕایەوە، شەڕ گەرمتر دەبوو و کوڕەلاوی خەڵکی بێچارە بێ هیچ ئەزموونێکی سەربازی رەوانەی بەرەی شەڕ دەکران، بە کوشت دەدران یان ئیعدام دەکران ئەگەر هەوڵی پاشەکشە و فیراریان بدابا و لەسەر تەرمەکانیشیان دەنووسی (جبان) واتا ترسنۆک و رادەستی کەسوکاریان دەکردنەوە.

وەک ئیشوکاری هەموو خەڵکانی دیکەی عیراق و کوردستان پرۆژەکانی منیش کە خۆمم پێیانەوە خەریک کردبوو رۆژ بە رۆژ زیاتر روو لە سستبوونەوە بوون.

باری داراییم تێک چوو و تووشی قەرز بووم. بانکی کشتوکاڵ تەنگاوی کردم قیستی بدەمەوە، نەمبوو. ناچار دەواجنەکە و ریستۆرانتە کەنتاکیەکە و هەندێ خشڵی دایکی منداڵەکانیشم فرۆشت. تەنها زەوییەکەی کشتوکاڵم لە گوندی هێلاوەی دەشتی شەمامک بۆ مابووەوە ئەویش تەنها ئەگەر ساڵێکی بە باران بووا شتێکم لێ بهاتایە دەست.

## کۆڤاری کاروان

ئەمیندارەتی گشتیی رۆشەنبیریی و لاوانی هەرێمی کوردستان کۆڤارێکی مانگانەی بە زمانی کوردی و عەرەبی بە ناوی (کاروان) دەر دەکرد.

سەرنووسەری کۆڤارەکە خودی ئەمین عامی رۆشەنبیری کاک محەمەد ئەمین محەمەد ئەحمەد بوو کە گەنجێکی بە خشکەیی بەڕاستی کوردپەروەر بوو. جێگری سەر نووسەری کۆڤارەکەش نووسەری کوردی ناسراو بەڕێز حسێن عارف بوو کە خاوەنی قەڵەمێکی بەبڕشت و دڵسۆزێکی کەم وێنەی پرسی کوردایەتی بوو چ لەرووی سیاسییەوە چ لەبواری کولتوور و ئەدەبییاتا. ژمارەیەک لە دۆست و برادەرانی خۆشم وەک سەردار میران و حەمەدەمین پێنجوێنی و عبد الغنی علی یەحیا لە بەرێوەبردنی کۆڤارەکە دەستبەکار بوون. بۆ مێژووش دەمەوێ پشت بە مەتەڵۆکە کوردییە کۆنەکە ببەستمەوە کە دەڵێ (با قسەیێ بۆ دزیش بکەین).

لە مێژووی چاپەمەنی کوردییا، چاپەمەنی ژێر دەسەڵاتی حکومەتانی دژ بە پرسی کورد، ئەوەی من تێی گەیشتبم ئەو

كۆڤـاری كاروانــە بەچەشــنێكی بەرچــاو مۆزاییكێكــی رەنگاورەنگــی جۆرەهـا بـواری كۆمەڵگای كـورد و كوردسـتان بـوو. سروشتانە، یەكـەم گوتـاری كردنـەوەی هـەر ژمارەیـەك دەبوایـە لەسـەر (السـيد الرئيـس) بێـت و وێنەیـەك یـان دووانـی گـەورەی سـەدام حوسـێنی لـە لاپەڕەكانـی بـێ. ئەمـە " واجـب" بـوو و وەك قانوونـی لـێ هاتبـوو كـە هەمـوو دەزگا چاپەمەنـی و میدیاكانـی عیـراق بـە عـەرەب و كـوردەوە دەبوایـە پیـادەی بكـەن. تـا ئێـرە ئۆكـەی ! تـۆ لـە وڵاتێـكا دەژیـت كـە ئەمـە ڕێنمایـی حكومەتەكەیەتـی، چـارت نییـە. بـەڵام بـەدەر لـەوە، ئـەرك نەبـێ، بـا خوێنـەری بەڕێـز چـاوێ بـە هەنـدێ لـە ژمارەكانــی ئـەو كۆڤـارەدا بخشـێنێتەوە كـە لـە كتێبخانـەی گشـتی وەك موجەلـەد زۆر بـە جوانـی پارێـزراون هەنگـی دەبینـێ كۆڤـاری كاروان چـی تیایـە. مێـژووی كۆمەڵایەتـی كـورد، مێـژووی سیاسـی كـورد و میرنشـینە كوردییـەكان، جۆگرافیـای كوردسـتان بـە هەرچـوار پارچەكەیـەوە، مێژووی بنـج و بنەوان و رەچەڵەكـی كـورد، زمانـی كـوردی، ئەدەبیـات و شـیعری شـاعیرانی رۆمانتیـك و كوردپـەروەر، كولتـور و هونـەرە جوانـەكان، فۆلكلـۆر و توێژینـەوە و لێكۆڵینـەوەی هەمەجـۆر، وەرگێڕانـی بابەتـی جـوان جوانـی بیانـی، كاروبـاری كۆمەڵایەتـی و ژنـان و منـداڵان و مێـژووی ئایینـی كـورد بـەر لـە ئیسـلام وەك زەردەشـتی و داسـنی ( ئێزدیاتـی) و ئیتـر نازانـم چـی تریـش. هەمـوو ئەدیبـان و هونەرمەنـدان و رۆشـەنبیرانی كـورد بەگشــتی، چ نـاودار چ گەنجـە تـازە پێگەیشـتووەكانیش، بـە نووسـین بەشـداریيان لـە رازاندنـەوەی كۆڤـاری كاروانـدا دەكـرد. هەندێـك لـەو بەشـداربووانەم لـە بیـر مـاوە: مەسـعود محەمـەد، كەمـال مەزهـەر، عزەدیـن مسـتەفا رەسـوڵ، مـارف خەزنـەدار، عەبدلڕەحمانـی مـەلا مـارف، كەریـم شـارەزا، مـەلا جەمیـل رۆژبەیانـی، شـوكر مسـتەفا، شـێركۆ بێكـەس، عەلـی فەتـاح دزەیـی، ئیحسـان فوئـاد، كاوس قەفتـان، ئۆرخانـی غالـب، كەمـال رەوف محەمـەد، شـوكریە رەسـوڵ، مومتـاز حەیـدەری، عەزیـزی مـەلای رەش، عزەدیـن فەیـزی، حوسـێن رەشـوانی، میدحـەت بێخـەو، حەسـیب

قەرەداخی، دڵشاد مەریوانی، قوبادی جەلیزادە، حەمەدەمین پێنجوینی، شێخ لەتیف بەرزنجی، کەریم فندی، رەشید فندی، عەبدولڕەحمان مزووری، تیلی ئەمین، بنەماڵەی یەحیا ( عەبدول فەتاح و عەبدول غەنی و سەعید ) و ژمارەیەکی زۆری تریش کە داوای لێ بووردنیان لێ دەکەم ئەگەر لەبیرم نەمابن. کۆڤارەکە بە دیزاین و خۆشنووسییەکی زۆر بەرچاویش لەلایەن ستافێکی تەکنیکی لێهاتووەوە لەچاپ دەدرا لە ناویانا جەعفەر بەرزنجی و محەمەد زادە و عەلی خورشید هەندێکیانن.

زووتر باسم کرد، کە من لە پرۆژەکانی کاروکاسبیم شکستم هێنابوو، ئەوەش هەم لەبەر ئابووریی داتەپیوی ساڵانی شەڕی ئێران-عێراق و هەم لەبەر ئەوەش بوو کە ئەم کاسبییە بەڕاستی ئیشی من نەبوو و لێم نەدەزانی. هەستام ئەمجارە رووم کردە کولتوور و ئەدەبیات، کە ئەمەیان زیاتر بواری خۆم بوو، هەرچەندە کە ئەم بوارە چاوی حکوومەتی بەعسی زیاتر لەسەر بوو.

دەستم کرد بە نووسینی گوتاری زمانەوانی و ئەدەبییات و تەرجومەی شیعری شاعیرانی فرانسی و ئاڵمانی و ئینگلیزی و بابەتی تریش. ئەمانەم هەموو لە کۆڤاری کاروان بڵاو دەکرانەوە. دواجار لە تەک کاک حەمەدەمین پێنجوینیدا هەدووکمان کراین بە دەستەی هەڵسەنگێنەر. ئێمە پێکەوە لەگەڵ جێگری سەرنووسەر کاک حسێن عارف، بڕیارمان لەسەر هەموو ئەو گوتارانە دەدا کە بۆ بڵاوکردنەوە دەنێردران، ئایا چ بابەتێک لە رووی ئەدەبی و رێزمانی و کۆمەڵایەتی و هەڵبەت سیاسیشەوە، کە ئەمەی دواییان زیاتر بواری جێگری سەرنووسەر بوو، بۆ بڵاوکردنەوە دەشێ و کامەیان ناشێ.

هێندەی نەبرد ئەندامەتیی سێ سەندیکای عێراقیشم پێ بە رەوا بینرا و پێم درا: سەندیکای هونەرە جوانەکانی عێراق - بەشی کوردی، سەندیکای ئەدیبان و نووسەرانی عێراقی، سەندیکای رۆژنامەوانانی عێراقی. ئەمە بۆ من زۆر خۆشتر بوو لە تەپوتۆز و بۆنی ناخۆشی ناو دەواجن و رێستۆرانتان.

کەش و ژینگەی کارکردنیشم لە دەزگایەکی پڕ لە کەسانی ڕۆشنبیر و هەڵسان و دانیشتنم لەگەڵ شاعیران و نووسەران و هونەرمەندانی ناوداری کورد پڕ بە پێستی حەز و ئارەزووەکەی خۆم بوو، هەرچەندە کە گوزەرانیی دارایی تەنیا بەو کارە دابین نەدەکرا، بە تایبەتی بۆ خێزانێکی بە ماڵ و منداڵی وەک خۆم.

ڕۆژانەش لەگەڵ ستافە ڕێکوپێکەکەی کۆڤارەکە، چ نووسەر و چ تەکنیکار ئەو ڕۆژگارەمان بە ئاڵوگۆڕی بیروڕای ئەدەبی بەڕێ دەکرد و - لەژێر لێوانیشەوە - بە تاوتوێکردنی باری سیاسی لە عێراق و دەنگوباسی پێشمەرگە، کە بەنهێنی پێمان دەگەیشت و هەروەها بە قسەی خۆش و گاڵتەوگەپیش. هەندێک لە یار و یاوەرانی ئێوارانی ئەو چەند ساڵەی هەولێریشم ئەمانە بوون: عەلی فەتاح دزەیی، حەمەدەمین پێنجوێنی، کاکە دزەیی، شەهیر نورەدین ئاغا، سەردار میران، دکتۆر عەبدوڵا دەباغ، بیلال غولام، دکتۆر عزەدین دزەیی، یادیان بەخێر ئەوانەی لەناوماندا نەماون.

## حەمەدەمین پێنجوێنی

پێشتر باسی کۆڤاری کاروانم کرد، کە لەوێ لە تەک حەمەدەمین پێنجوێنیدا دەستەی هەڵسەنگاندنی ئەو گوتارانەمان پێک هێنابوو، کە بۆ کۆڤارەکە دەنێردران. ئا لەوێدا بوو کە ئاشنایەتیم لەگەڵ گەنجێکی قۆزی ئێسک سووک پەیدا کرد، کە شیعری زۆر ناسکی خۆشەویستی و بە هێماییش سیاسی لە کۆڤارەکەدا بڵاو دەکردەوە، حەمەدەمین پێنجوێنی.

زۆر زوو بۆم دەرکەوت کاک حەمەدەمین نەک هەر لە بواری شیعر و ئەدەبیاتدا فیکر و قەڵەمێکی ڕەنگینی هەیە، بەڵکوو لە سیاسەتیشدا بۆچوون و لێکدانەوەی زۆر سەرنجکێشی هەبوو، کە قسەکانی بە ئاسانی خۆیان دەکرد بەناو هەست و بیرتدا و پێتی دەسەلماند. لە

بـواری شـیعردا ئەمـن خـۆم ئەوەنـدە چێـژ لـە شـیعری مۆدێرنـی ئـازاد، شـیعری بـێ دوادەنـگ وەرناگـرم، چونکـە لـە خوێندنەوەیانـدا هەسـت بـە موزیـک ناکـەم. بـە تێگەیشـتنی مـن شـیعر مارەییەکـە لەنێوان وشـە و ریتم. هەڵبەسـتەکانی پێنجوێنـی هەرچەنـدە کـە مۆدێرنیـش بـوون، بـەڵام زۆر بـە وەسـتایی و زیرەکانـە لایەنـە موزیکالییەکـەی تێـدا فەرامـۆش نەدەکـرد، بۆیـە وەک ئاوازێکـی خـۆش یەکسـەر خـۆی دەکـرد بەنـاو دڵتـدا و هەسـت و هەناوتـی وەک ژێیەکانـی ئامێرێکـی موزیـک دەلەرانـدەوە.

هەستم دەکـرد کۆڵێـک لایەنـی تـری ژیانیـش منیـان بـە حەمەدەمینـەوە گـرێ دەدا. وەک خـۆم، ئەویـش حـەزی زۆری لـە هونـەری موزیـک و گۆرانـی بـوو، وەک خـۆم، ئەویـش حـەزی زۆری لـە شـیعر و خوێندنـەوەی ئەدەبیـات بـوو، وەک خـۆم، ئەویـش حـەزی لـە شـەرابی لەعلـی روممانـی بـوو، وەک خـۆم، ئەویـش چێژێکـی زۆری لـە جوانـی وەردەگـرت، جوانیـی سروشـت و جوانیـی ژن، وەک خـۆم، ئەویـش کۆنـە شـیوعی بـوو و وەک خۆیشـم کوردپـەروەر و نیشـتمانپەروەرێکی بـێ دەمارگیـری زۆر دڵسـۆز بـوو، بـۆ پرسـی کـورد بـە تایبەتـی و پرسـە مرۆڤایەتیەکانیـش بـە گشـتی. ئەمانـە هەمـووی وایـان کـرد کـە لەگـەڵ حەمەدەمیـن پێنجوێنیـدا لەوسـاوە و تـا ئێسـتاش ببیـن بـە بـرادەری زۆر نزیکـی یەکتـری و هەدوکمـان چێژێکـی زۆر لـە دانیشـتنی بەیەکەوەمـان وەردەگریـن.

## بیلال غولام

بیلالی وەستا غولامی، یادی بەخێر، ئەندازیارێکی گەنجی ئێسک سووکی قسە خۆش و کۆڕ گەرم بوو. کوڕێکی زۆر زیرەک و وریا و خوێندەوار و ڕۆشنبیر و لیبڕاڵ بوو. زۆر جار حەزی دەکرد لە سنووری لیبڕالیزمەکەی باز بدات بۆ existentialismیش وجوودیەت. ئاشقی کتاب و خوێندنەوەی شیعر و ئەدەبیات بوو و زۆرێک لە شیعرەکانی نزار قەبانیی ئەزبەر کردبوو. یەکێک لە (مەیخانە) پەسندەکانی من لەو چەند ساڵانەی هەولێرم، ئێوارانی ئۆفیسەکەی بیلال غولام بوو. ئێواران بیلال کە ئیشوکاری ئەندازیاریی خۆی تەواو دەکرد، ئیتر دەچووم بۆ لای و نەدەچووین بۆ نادییەک، بەڵکوو هەر لەوێ دەستمان بە خواردنەوە و گۆرانی و ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕا لەسەر جۆرەها بابەتی ڕۆشنبیری و کولتووری و سیاسی دەکرد. لە تەک مەی نۆشیندا هەر لەوێ گۆشتیشمان بۆ مەزە دەبرژاند. جاروبار برادەری دیکەشمان دەهاتنە لا و ئۆفیسەکەی بیلال دەبووە مەیخانەیەکی چکۆلانەی گەرموگوڕمان. بیلال کە هێشتا هەر ڕەبەن بوو، بەداخەوە لە هەڕەتی لاوی لە لیبیا کۆچی دوایی کرد. یادی بەخێر، کە بیروڕای جوانی لەسەر فەلسەفەی ژیان و مردندا هەبوو.

## کوڕی دووەممان بوو، کۆچەر 1982

پاش لەدایکبوونی بوونی دوو کچ و کوڕێکمان ئەمجارەیان خوا کوڕێکی جوانکیلەی تریشی پێ بەخشین. ئەمیان رۆژی 82/11/22 لە نەخۆشخانەی جمهوری لە هەولێر لەدایک بوو و ناومان نا کۆچەر. ناوەکەیشی بەڕاستی کاڵای پڕ بە باڵای ژیانی هەمیشە بەرێوەی خودی خۆم بوو، کە هەرگیز سرەوتنم لە هەوارێکدا بە خۆمەوە نەدەدی. هەردوو کچەکانم لە ڤیەننا لەدایک ببوون و کاروانی کوڕیشم لە رێدینگ لە ئینگلتەرا. تەنیا کۆچەر لە هەولێر، لە کوردستان هاتووەتە دنیا.

پێشر باسی ئەوەم کردبوو، کە بوونی منداڵی یەکەم گۆڕانکارییەکی زۆر گرنگە لە ژیانی هەر خێزانێکدا. لەپاشان هەر منداڵێکی ترت ببێ هەرچەندە زۆر خۆشیش بێ، بەلام ئەو گۆڕانە لەگەڵ خۆیدا ناهێنێ بۆ ناو خێزان، وەک کە منداڵی یەکەم دەیهێنێ. بۆیە ئەوەی کە رۆژانە لەبارەی لەدایکبوونی منداڵی یەکەممان، نازدار، لە دەفتەرێکدا یادداشت دەکرد، بۆ منالی دوەممان، لارا، کەمتر بوو، بۆ منداڵی سێیەم، کاروان، هێشتا کەمتریش بوو و کە منداڵی چوارەممان بوو، کۆچەر، هەر هیچم نەنووسیوە. بەلام بۆ دڵدانەوەی کۆچەر دەتوانم هەمیشە بیری خەمەوە، کە بوونی ئەو بەڕاستی دڵخۆشکەرەوەیەکی زۆر تایبەت بوو بۆ من و دایکی، چونکە کوڕ بوو و بازنەی خێزانێکی وەک ئینگلیز دەڵێن پێرفێکتی بۆ تەواو کردین: دوو کچ و دوو کوڕ.

## عه‌بدول خالقیان كوشت

عه‌بدولخالیقی مه‌لامارفی هاوڕێیه‌كی كۆنی سه‌رده‌می پێشمه‌رگایه‌تیم بوو. له ساڵانی 63 و 64 پێكه‌وه‌مان له‌گه‌ڵ براده‌رانی تری پێشمه‌رگه وێستگه نهێنییه‌كه‌ی رادیۆی ده‌نگی كوردستانمان له شاخا دامه‌زراند. پێشتر به دووروودرێژی باسی ئه‌م بابه‌ته‌م كردووه.

له‌و ماوه‌یه‌ی كه گه‌ڕابووینه‌وه بۆ هه‌ولێریش، عه‌بدولخالیق له شاخه‌وه، من له ئه‌وروپاوه، په‌یوه‌ندییه‌كه‌مان مشتوماڵ كرده‌وه و توندتریش كرد. عه‌بدولخالیق كوڕه مه‌لا بوو و خۆیشی له بنه‌ڕه‌تدا پۆستی ئیمام تابووری هه‌بوو. به‌ڵام دیاره هه‌ر له هه‌ڕه‌تی لاوییدا جۆره بۆچوونێكی سێكولار secular له كه‌ڵكه‌ڵه‌یدا گه‌لاڵه‌ی كردبوو و له سێ بواریشا شاره‌زاییه‌كی به‌رچاوی لێ ده‌تكایه‌وه: بواری ئایینی، بواری ته‌كنۆلۆژیای رادیۆ و ئه‌له‌تریك و بواری نووسین و شیعر و ئه‌ده‌بیاتیش.

عه‌بدولخالیق له خواپه‌رستییه‌وه بووبوو به كوردپه‌رستێكی زۆر ناسیۆنالیست تا راده‌ی ده‌مارگیری و گاڵته به ئه‌قڵی تورك و عه‌ره‌ب كردن كه زۆر جار من و ئه‌و له‌سه‌ر ئه‌م كێشه‌یه لێمان ده‌بوو به حه‌فتوهه‌شتی گه‌رم. منێك كه ماوه‌یه‌كی زۆر له ئه‌وروپا ژیابووم پێم راست نه‌بوو و پێم باشیش نه‌بوو كورد به شێوه‌ی ئه‌و ره‌گه‌زپه‌رست بێت هه‌رچه‌نده كه خۆیشم له ساڵانی هه‌رزه‌كاریما بۆ ماوه‌یه‌كی كورت به‌و قۆناخه‌دا ره‌ت ببووم. هه‌میشه پێم ده‌گوت ئاخر خالیق گیان، ئێمه ده‌بێ جیاوازیمان هه‌بێ له‌گه‌ڵ تورك و عه‌ره‌به شۆڤینییه‌كان، كورد ده‌بێ ئینسانی بێت و نابێ رك وكینه له دژی ئه‌و میلله‌تانه هه‌ڵگرێ، ئێمه شه‌ڕی سیسته‌مه‌كانیان ده‌كه‌ین نه‌ك خۆیان. ده‌مگوت خالیق تۆ هه‌میشه گاڵته به عه‌قڵی دواكه‌وتووی

ئەوان دەکەیت، ئیێ باشە بۆچی ئێمە لاسای دواکەوتووان بکەینەوە؟ بۆچی لاسای ولاتە پێشکەوتووەکانی وەک ئەورووپا نەکەینەوە کە قۆناخی ئەو دەمارگیرییە نامرۆڤانەیان تێپەڕاندووە؟.

لە هەولێر عەبدولخالیق دوکانێکی بچووکی لەناوشارا بەرامبەر قەڵا کردبووەوە بۆ فرۆشتنی کەرەستەی ئەلەتریک و چاکردنەوەی رادیۆی ترانسیستەر و شتی لەو بابەتە. بەڵام دەستێکی جوانیشی لە نووسینا هەبوو. دوو کتێبی بە چاپ گەیاندبوو ( ئەنتێنا) و ئەوەی دووەمیان پێم وایە تایتلێکی لەم بابەتە بوو (ئادەمزاد لە کۆمەڵی کوردەواریدا) یان (ژن لە کۆمەڵی کوردەواریدا) چاکم لەبیر نەماوە. هەندێ لایەن ئەم کتێبەی دواییان بە سووککردنی ئیسلام دادەنا و وابزانم هەر ئەوەش بوو کە بوو بە بیانوو بۆ کوشتنی. رۆژێکیان کاتی نیوەڕۆ لەگەڵ کاک عەلی فەتاح دزەیی و رەئیس یوسف میران، یادیان بەخێر هەردووکیان، بە ترومبێلی کاک یوسف چووین پیاڵە چایەک لای عەبدولخالیق لە دوکانەکەیا نۆش بکەین کە هەر خۆی بە کتلی سازی دەکرد و گوێشمان لە هەندێ لە قسە خۆشەکانی بێ. هەر کە لەوێ بووین کاک کەریم هەورامانیش بە ژوور کەوت و هەر بە پێوە پێی گوت عەبدلخالیق ئاگات لە خۆت بێ لە مزگەوتان زۆر بە خراپی باست دەکرێت و خوتبەی رۆژی جومعەی مەلاکان جۆرە هەڕەشەیەکیشی پێوە دیارە. دوای ماوەیەک دانیشتن ئیتر کاتی داخستنی دوکان هات بۆ حەسانەوەی نیوەڕۆ و هەمووشمان ماڵمان لە ئازادی بوو. هەر چوارمان سوار بووین کە کاک یوسف یەکە یەکە دامان بنێ. یەکەم کەس عەبدولخالیقمان دانا و بە پێکەنینیشەوە پێمان گوت ئاگات لەخۆت بێ، وا ئەمڕۆ ئێمە تۆمان بە سەلامەتی گەیاند خۆ هەموو رۆژێ لای تۆ نین، رۆژەکانی دی دەبێ خۆت وریای خۆت بی. لەپاشان کاک یوسف ئێمەشی دانا. من و کاک یوسف دیواری ماڵەکانمان یەک بوون. ماڵی عەبدولخالقیش رەنگە هەر دوو سەت مەترێک لە هی ئێمەوە دوور بووبێ. دوای سانەوەیەکی دوو

سـەعاتیی پـاش نانـی نیـوەڕۆ ئەمـن گوێـم لـە چەنـد تەقەیـەک بـوو. بەلامـەوە سـەیر نەبـوو، راهاتبوویـن رۆژانـە گوێمـان لـە تەقوتۆقـی ناوشـار دەبـوو. ماوەیـەک دواتـر کاکـەی ئامـۆزام کـە ماڵـی ئەویـش هـەر لـە ئازادی بـوو تەلەفۆنـی بـۆ کـردم گوتـی کـورە عەبدولخالیقیـان کوشـت. وە دەرکـەوت عەبدولخالیـق کـە لەماڵـەوە دەردەچێـت برواتـەوە بـۆ دوکانەکـەی چەنـد چەکدارێکـی سـوار ئۆتۆمۆبیـل کـە لـە چاوەڕێیـدا بوونـە دەسـترێژی لـێ دەکـەن و دەیکـوژن. دەرکـەوت حکومەتـی بەعـس لەمێـژ بـوو لـە عەبدولخالیـق بـە گومـان کەوتبـوو و گوایـا بیسـتبووی کـە بـە نهێنـی چووبـوو بـۆ لای پێشـمەرگەی یەکیەتـی نیشـتمانی کوردسـتان و وێسـتگەیەکی تێکچـووی رادیـۆی بـۆ چاککردبوونـەوە. ئینجـا رەنگـە حکومـەت کتێبەکـەی دوایـی کـە بە قسـەی ناحەزانـی گوایا سـووککردنی ئیسـلامی تیـا بـووە کردبێتـە بیانۆیـەک و رێـی بـۆ ئیسـلامیەکان خـۆش کردبێ بیکـوژن. ئـەم بۆچوونـە رێـی تێ دەچێ چونکـە چەنـد رۆژێـک بـوو لـە وەعـزی رۆژانـی هەینـی هەنـدێ مزگەوتـا باسـی عەبدولخالیـق و کتێبەکـەی زۆر بـە خراپـی و بەجـۆرە هەرەشەیەکیشـەوە دەکـرا.

عەبدولخالیقـی مەلامارفـی (باوکـی پشـکۆ و شـکۆفە) لەدەسـتچوونێکی گـەورە بـوو بـۆ مـاڵ و منداڵـی خـۆی و بـۆ کـورد و بـۆ خـودیٚ خۆیشـم. لـەو رۆژەوەی قرچـەی گەرمـای هاوینـی 1963کـە لـە ئەشـکەوتی گـردەڕەش بەرامبـەر گونـدی عیسـاوێی نزیـک شـارۆچکەی مـاوەت پێکـەوە لەگـەڵ هەڤالانـی پێشـمەرگەی تـر یەکـەم وێسـتگەی رادیـۆی دەنگـی کوردسـتانمان دامەزرانـد لـەو رۆژەوە لەگـەڵ عەبدولخالیقـا ببووین بـە هەڤـاڵ و هۆگـری یەکتـری. ئـەو وێسـتگەیەش بەڕاسـتی مێژوویەکـی دروسـت کـرد لـە بزووتنـەوەی ئازادیخـوازی گەلـی کـوردا. یـادت بەخێـر عەبدولخالیقـی هەمیشـە دەم بـە تریقـەی پێکەنینـی ئێسـک سـووک.

## دیسان گیرام

هەر وەک کە پێشتر باسم کرد ژیان لە عیراق لە هەموو رووێکەوە لێک ترازابوو. رەشبگیرییەکی بێ پێشینە هەژموونی خستبووە سەر سەرانسەری ولات. بازار بەتەواوی پەکی کەوتبوو و گەنجێکی زۆر لە شەڕی ئێران - عیراقا دەکوژران یان دیل دەکران و خەلکێکی زۆریش دەگیران و هەندێکیان لە سێدارەش دەدران لەسەر یەک وشەی ناڕەزایی لە دژی شەڕ یان رەخنەیەکی بچووکیش لە رژێمی بەعس یان لە خودی سەدام حوسێن. هیچ مالێک کوڕی گەنجی نەمابوو نەبردرابێ بۆ بەرەی شەڕ یان خۆی نەشاردبێتەوە.

بۆ پڕکردنەوەی شوێنی سەربازانی کوژراو و بە دیل گیراو و ئەوانەی فیراریشیان دەکرد حکومەت ناچار دەستی کرد بە گرتنی خەلکی بە تەمەنیش و دەیناردن بۆ شەڕ. لە شارو شارۆچکەکانا جەیشی شەعبی ناوە ناوە لەپڕێکا دەچوون ئەم سەرو ئەو سەری شەقامێکیان دەگرت نەیاندەهێشت کەس ئەو شەقامە بەجێ بێلێ. ئیتر بەردەبوونە گیانی هەر نێرینەیەکی جەوان و پیر و دەیانهاوێشتنە ناو لۆری سەربازیی خۆیان، چەند لۆرییەکیان پڕ دەکرد و بازۆ بۆ بارەگای جەیشی شەعبی.

مانگ سەرەتای ئۆگوستی 1986 بوو. نیوەڕۆیەکیان بازاڕم کردبوو و بە سواری پیکەپەکەم لە گەڕەکی سەیداوا لە هەولێر دەگەڕامەوە بۆ مالەوە لە ئازادی. هەر هەندە بینیم غەلبەغەلب و شپرزەییەک کەوتە ناو خەلکی سەر شەقامەکەوە، شەقام گیرا و سەربازانی جەیشی شەعبی بە چەکی قورسەوە دابەزین و کۆنترۆلی سەری هەموو کووچە و کۆلانەکانی شەقامەکەیان کرد. ئەوەی پیادە بوا وەک ئاژەل بەپێش خۆیانیان دەدان و ئەوەی چەرخدار vehicle

سواریش بوا رایاندەگرتن و یەک یەک دەچوونە لایان. گەیشتنە من و یەکێکیان بە زمانی عەرەبی گوتی: دابەزە و سویچەکەتم بدێ. لێم پرسی چییە چی بووە؟ گوتی: ئێستا دەتانبەین بۆ بارەگای جەیشی شەعبی و بەیانی سەر لە زوو هەموومان دەڕۆین بۆ بەرەی شەڕ. گوتم: (اخي) برام ئەمن تەمەنم پەنجا ساڵە، گوتی پارێزگاریکردن لە وەتەن تەمەن ناناسێ، وەرە خوارەوە و سویچەکەم بدێ. کارتی رۆژنامەوانیم بۆ دەرهێنا کە من کار بۆ کۆڤارێکی وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان دەکەم گوتی: "بعد احسن" واتا باشتریش، ئێمە لەبەرەی شەڕا پێویستی زۆرمان بە رۆژنامەوانانیش هەیە، کە رووماڵی شەڕ بکەن و راپۆرت بۆ رۆژنامە و کۆڤارەکان بنێرنەوە. هەرچەندی هەوڵم لەگەڵی دا کەرەستەی خواردەمەنیم کڕیوە و گۆشتیشی تیایە لەوانەیە تێک بچێت و ماڵ و منداڵیشم لە چاوەڕێمدان، گوتی: ئێمە هەموو شتەکانیان بۆ دەبەینەوە و ئاگاداریشیان دەکەینەوە کە تۆ لای ئێمەیت. لاحەولە وەلا! خولاسە، دایانبەزاندم، سویچەکەیان لێ وەرگرتم و ئێمە ژمارەیەکی زۆریان سواری لۆری عەسکەریی خۆیان کرد و بردنیانین بۆ قوتابخانەیەک هەر لە گەڕەکی سەیداوا، کە کردبوویانە بارەگای جەیشی شەعبی. هەر چەند کەسێک و لە ژووری کلاسێکیان دانایین. پێیان گوتین کە ئەمشەو لێرە دەمێننەوە و بۆ بەیانی پێش خۆرهەڵات دەڕۆین بۆ بەرەی شەڕ.

لە پەنجەرەیەک کە دەیڕوانییە حەوشی قوتابخانەکە، دەمدی جەیشی شەعبی بە بەرگی تایبەتیی خۆیان لەوێ هاتوچۆیان دەکرد، دوو کەسم لەناویاندا ناسینەوە، تورکمانێک و کوردێک. هەمزە عوسمان ناسراو بە (هەمزە کەردز) و محێدینی نافیز بەگ، لە بنەماڵەی میرەکانی خۆشناوان. ئەوانە هەردووکیان لە کاتی خۆی هاوکلاسی برا لەخۆم گەورەترەکانم بوون لە قوتابخانەی ناوەندی و دواناوەندی لە هەولێر و ئەوانیش منیان دەناسی. هەمزە کەردز تورکمان و بەعسی بوو، محێدینیش کوردێکی پاک بوو بەڵام دیارە ئەوسا هەموو بەڕێوەبەری

قوتابخانەکان دەبوایە بەرگی جەیشی شەعبی لەبەر کەن.

جیاجیا هەردووکیان کە لە پەنجەرەوە منیان بەدی کرد، هاتنە لام لەمدیو ئەودیوی پەنجەرەکەوە چاکوچۆنییان لەگەڵدا کردم و خوا هەڵناگری نەک هەر کاک محێدین، بەڵکوو کاک هەمزەش لەگەڵمدا زۆر دۆستانە بوو. تکام لە کاک محێدین کرد ئەگەر بکری بتوانم تەلەفۆنێک بۆ ماڵەوەم بکەم و تێیان بگەیەنم کە گیراوم. پیاوانە گوتی بوەستە تۆزێکی کە دێمەوە لات دەتبەم بۆ ژوورێک تەلەفۆنی لێیە دەتوانی پەیوەندی بکەیت. دوای ماوەیەک هاتەوە و منی برد بۆ ئەو ژوورە. تەلەفۆنێکی بە کورتیم لەگەڵ رووناسی هاوسەرم کرد و تێم گەیاند کە گیراوم و بەتەمان بەیانی سەر لە زوو بمانێرن بۆ بەرەی شەڕ. پێم گوت هەر ئێستا تەلەفۆنێک بۆ شێخ لەتیف بکات (شێخ لەتیفی شێخ سادقی بەرزنجی هەشەزینی) کە برادەر و خزمیشم بوو و تێی بگەیەنێ کە گیراوم.

شێخ لەتیف دۆستایەتییەکی نزیکی لەگەڵ پارێزەری کوردی ئەوسای هەولێر (یەحیا جاف) هەبوو. پاش ئەوەی رووناس تەلەفۆن بۆ شێخ لەتیف دەکات، دیارە ئەویش یەکسەر پەیوەندی بە پارێزەرەوە دەکات و وەزعی منی تێ دەگەیەنێ. جا کاک یەحیا جافیش کە خۆیشم شەخسی چەند جارێک لەگەڵ شێخ لەتیفدا بینیبووم و ئەویش منی دەناسی، دیارە تەلەفۆن بۆ بەرپرسی ئەو شوعبەیەی جەیشی شەعبی دەکات و رێک دەکەون کە بۆ ماوەی دوو هەفتە وچانم بدەنێ تا کاروباری تایبەتیی خۆم و هی ماڵ و منداڵم رێک دەخەم، ئینجا لەپاشان خۆم بچمەوە لایان و بمنێرن بۆ بەرەی شەڕ. ئەوە بوو کە دوای دوو سەعاتێک لە گرتنەکەم، بەرپرسی ئەو شوعبەیەی کە لە قوتابخانەکە منی لابوو، ناردی بەدواما. منیان برد بۆ لای و بەراستی رێزی لێ گرتم، کە زانیبووی پارێزەر دەمناسێ، داوای لێ کردم دانیشم و چای بۆ داوا کردم. دوای چەند قسەیەکی ئاسایی سویچی پیکەپەکەی منی لە چەکمەجەی مێزەکەی بەردەمی دەرهێنا

و رادەستی کردمەوە و گوتی "نشوفک بعد اسبوعین انشالله" واتا "ئینشالّا دوای دوو هەفتەی تر دەتبینینەوە."

گەڕامەوە بۆ ماڵ و شێخ لەتیف هاتە لام. دوای سوپاسی زۆر تێم گەیاند، کە منیان تەنها بۆ دوو هەفتە مۆڵەت داوە، بەڵام من بەتەما نیم جارێکی تر خۆم رادەستیان بکەمەوە و هیچ چارم نییە بەدەر لەوەی کە رابکەم بۆ ئێرانێ. پێشم گوت نازانم ئەگەر بڕۆم ئایا ئەوە ئەنجامی خراپی بۆ ئەو نابێ، چونکە واسیتەی بەردانەکەم ئەو خۆی بووە. کاک لەتیف گوتی منیش هەر بە راستی دەزانم بڕۆیت باشترە، چونکە جارێکی دیکە تۆمان پێ رزگار ناکرێ. گوتیشی هیچ خەمی منت نەبێ، من لەگەڵ کاک یەحیا جافا رێکی دەخەین.

مایەوە چۆن بڕۆین، چۆن بگەینە ئێران! بە کاک لەتیفم گوت بیرۆکەیەکم بۆ هاتووە بچمە لای هەمزەی باپیراغای پشدەر لە قەڵادزێ، کە دۆستێکی نزیکی کاک ئەحمەد و کاک موحسینی برام و هی خۆیشم بوو و جێی متمانە بوو، گوتم ئەو پیاوەکانی خۆیمان رەگەڵ دەدا تا ئێران. هەر واشم کرد و بۆ بەیانی بەتەنیا بە پیکەپەکەم چوومە قەڵادزێ بۆ دیوەخانی هەمزاغا. کوڕەکانی و خزم و کەسانی پێشوازییەکی زۆر گەرمیان لێ کردم، بەڵام بەداخەوە هەمزاغا خۆی سەفەری کردبوو و گوتیان تا دوو رۆژی دیکە نایەتەوە. منیش پێم نەگوتن بۆ چی هاتووم و گوتم زۆر سڵاو و رێزم هەیە بۆی، هەر هاتبووم سەردانێکی بکەم، لەمێژە یەکتریمان نەدیوە. نانی نیوەڕۆم لەگەڵیاندا خوارد و بەدڵساردییەوە گەڕامەوە بۆ هەولێر.

بە کاک لەتیفم گوت کە هیچم بە هیچ نەکرد. بەڵام هەزار رەحمەت لە گۆڕی بێ، گوتی گوێ مەدەرێ ئەو پیاوێکی زۆر باشی دیکە دەناسێ خەڵکی سەنگەسەرە و قسەی لەگەڵدا دەکات بە رێگای قاچاخچییان بمانگەیەنێتە ئێران.

کێخوا ئەحمەدی حەسەنە رەشی، گەورەی خێڵی شیلانە بوو و لە سەنگەسەر دادەنیشت. لەسەرەوە (فورسان) بوو، بەڵام لەژێرەوە

پەیوەندیی لەگەڵ پێشمەرگەشدا هەبوو. ئەوە بوو کە هەر بۆ بەیانی شێخ لەتیف ناردی بەدوایدا بێتە گوندی قەتەویی نزیک هەولێر، کە شێخ لەتیف خۆی لەوێ دادەنیشت و منیش بانگ بکات بڕۆم بۆ لایان تەگبیری ڕۆیشتنەکەم بکەین. هەر واش کرا.

کێخوا ئەحمەد پیاوێکی لە ناوەڕاستی تەمەنیدا بوو و زۆر بەڕێز بوو. ڕێک کەوتین کە لە ڕۆژێکی دیاریکراودا لەگەڵ ژن و منداڵەکانم بچینە سەنگەسەر بۆ ماڵی ئەوان و کاتێ کە تاریکی شەو دادێ ئینجا رادەستی ئەو قاچاخچییانەمان دەکات، کە خۆی دەیناسین و جێی متمانەن، ئەوانیش بە سواری وڵاخ بمانگەیەننە ناو خاکی ئێرانێ.

گەڕامەوە بۆ ماڵ رووناسم تێ گەیاند، بێ ئەوەی بە کەس بڵێین و لە منداڵەکانیشمان دەشاردەوە و زۆر بەنهێنی دەستمان کرد بە فرۆشتنی فەرش و ئەو کەلوپەلانەی کە پارەیان دەکرد. لەو چەند ڕۆژەدا چەند خزمێک سەردانیان دەکردین دەیاندی ماڵەکەمان مەیلە و چۆڵ بووە، پێمان دەگوتن بەتەماین ناو خانووەکەمان بۆیاخ بکەینەوە، بۆیە شڕوپڕەکانمان بە کاتەکی لای ماڵە خەزوورم داناوە.

تەنیا دۆستی لەمێژینی بنەماڵەکەمان کاک عەونی یوسفم تێ گەیاندبوو کە بەتەمای ڕۆیشتنین. باش بوو کاک عەونیش کێخوا ئەحمەدی حەسەنە ڕەشی باش دەناسی و گوتی من خۆم بە ئۆتۆمۆبیلی خۆم دەتانبەم بۆ ماڵی ئەو لە سەنگەسەر و بەڕێتان دەکەم.

## ڕێی هات و نەهاتێ

بۆ ئەوەی لە پنتکەکانی پشکنینی سەر ڕێگامان تا سەنگەسەر بەو خاوخێزان و جانتایانە و پاسەپۆرتیشەوە گومانمان نەکەوێتە سەر کە بە تەمای ڕاکردنین بۆ ئێرانێ، پێشتر لەگەڵ کاک عەونی یوسف بە جۆرێکی تر ڕێککەوتین. بڕیارمان دا من و منداڵەکانم بە جیا تاکسیەک بگرین و بڕۆین بۆ ماڵی کێخوا ئەحمەی لە سەنگەسەر کاک عەونیش دواتر بە هەموو جانتاکانمان و پاسەپۆرتەکانیشمانەوە بە ئۆتۆمۆبیلی خۆی بێتە ئەوێ. بەو حیسابەش کە ئەو کۆنە وەزیر بووە، ناسنامەی وەزیری هەبوو و ئۆتۆمۆبیلی ئەو ناپشکێندرێ.

ئەوە بوو کە لە ڕۆژی دیاریکراوا وامان کرد. ئێمە تاکسیەکمان گرت بۆ سەنگەسەر و بە منداڵەکانمان گوت بۆ چەند ڕۆژێک دەچینە ناوچە شاخاوییەکان بۆ ڕابواردن. کەلوپەل و ئەساسێکی زۆریشمان لە ماڵەکەدا بەجێ هێشت، دەرگامان کلیل دا و ماڵ ئاوا. بەو دراوسێیانەی کە چاویان لێبوو سەفەر دەکەین بەوانیشمان گوت بۆ چەند ڕۆژێک دەچینە شەقلاوە و گەلی عەلی بەگ.

دوای ڕۆیشتنمان کە حکومەتی بەعس پێی زانی گۆرانیەکانی منیان لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن قەدەغە کرد و کاسێتەکانیش لە هەموو دوکانەکانی میوزیک.

## لە ماڵی کێخوا ئەحمەدی حەسەنە ڕەشی شیلانەیی لە سەنگەسەر

ڕۆژ ڕێک 20 ی ئۆگوستی ساڵی 1986بوو. بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە سەنگەسەر بەڵام چون لەو سەردەمەی بەعسا کەس لە کەس ئەمین نەبوو بۆیە بۆ وریایی نەمانویست شۆفێری تاکسیەکەمان پێ بزانێ لە چ ماڵێک دادەبەزین و هەر لەو شوێنەی کە گەیشتینە شار پێم گوت تا لێرە دامانبەزێنە بۆ خۆمان تۆزێ بەناو شارا دەگەڕێین. کرێکەیم دایێ و سوپاسم کرد. کە لێمان دوورکەوتەوە ئینجا پرسیار بە پرسیار ماڵی کێخوا ئەحمەدمان دۆزییەوە. ڕووناس و منداڵەکان چوونە دیوی ناوماڵێ و منیش لەگەڵ کێخوا ئەحمەد و کوڕەکانی لە دیوەخانەکەی دانیشتین. هێندەی نەبرد کاک عەونیش بە بار و بارگەی ئێمەوە گەیشت. کاوڕێکیان بۆ سەر بڕیبووین و چێشتێکی زۆر خۆشمەزەیان بۆ ساز کردبووین. کێخوا ئەحمەد، یادی بەخێر، کە جوامێرێکی باڵا بەرزی بەکەلەش تێکسمراوی قۆزی گفتار نەرم و لەسەرەخۆ بوو گوتی تا تاریکی دادێ دوای نوێژی عیشایێ لێرە دەبن ئینجا هاواری کورم بە لاندرۆڤەرەکەی دەتانباتە ناو تووتن و تووتنەوانان. گوتی لەوێ چاوەڕێی قاچاخچییەکان دەبن چوار وڵاختان بۆ دێنن هەر وڵاخی بە سەت دۆلار (یان سەت دیناری عیراقیی ئەوسا بوو چاکم لەبیر نەماوە) و لەگەڵتان دەبن تا گوندی (کونە مشک) کە یەکەم گوندی ئێرانە لەسەر سنووری ئەو ناوچەی عیراق - ئێرانا و لەوێ ئیتر ماشینی ئێرانی هەیە بە کرێ بۆ هەر کوێیەکی بتانەوێ دەتانبەن.

کاتی عەسر کاک ئەحمەد بە کاک عەونی گوت خەمی ئێمەی نەبێ با ئەو بگەڕێتەوە بۆ هەولێر نەوەکو شەوی بەسەردا بێت. ئیتر بە سوپاسێکی زۆرەوە لەگەڵ کاک عەونی ماڵاواییمان لێک کرد و ئەو گەڕایەوە بۆ هەولێر.

## لەناو تووتن و تووتنەوانان

ئێمەش وەک بۆمان داندرابوو تا پاش نوێژی عیشایێ چاوەڕێ بووین ئینجا سوپاسێکی زۆری کێخوا ئەحمەد و خێزانە بەڕێزەکەیمان کرد و کاک هاواری کوڕی سواری لاندرۆڤەرەکەی کردین بێ ئەوەی لایەکانی دابگیرسێنێ چونکە دەیگوت رەبیەی حکومەت لەسەر ئەو گردۆلکانە هەن و هەر لایتێکی ببینن لەوانەیە تەقەی لێ بکەن. بە ترس و لەرزێکی زۆرەوە گەیشتینە ناو تووتنان. تووتنەکان زۆر بەرز و گەڵاکانیان هێشتا زۆر سەوز بوون و کۆمەڵێک ژن شوێنێکیان بۆ خۆیان خۆش کردبوو گەڵاکانیان بە داوێ وەدەکرد و لە رستیان دەدان بۆ وشک کردنەوەیان. ماوەیەکی زۆر تا درەنگانی شەو لەگەڵ ئەو ژنانە دانیشتین چایان بۆ لێ نایین و بەدەم لەڕستدانی گەڵا تووتنەکانەوە قسەی خۆش خۆشیشیان بۆ دەکردین. کاک هاواریش بەجێی نەهێشتین تا لە دوورەوە گوێمان لە پرمەپرمی ولاخان بوو و قاچاخچییەکان بە چوار ولاخەوە پەیدا بوون. ئێمەیان کە شەش کەس بووین ( چوار منداڵ و من و دایکیان) دوو دوو سواری ولاخێک کرد و جانتاکانیشیان لە ولاخی چوارەم بار کرد. بە سوپاسێکی زۆرەوە ماڵاواییمان کرد لە کاک هاوار و لەو خانمە تووتنەوانانەی کە میوانداریان لێ کردبووین. لەوێوە ئیتر بەڕێ کەوتین بۆ ڕێی هات و نەهاتێ.

لەبەر شەڕی ئێران - عیراق لەلایەکا، شەڕی پێشمەرگەی کوردستانی عیراق لە دژی بەغدا و پێشمەرگەی کوردستانی ئێرانیش دژی تارانێ و بگرە هەندێ وردە شەڕی ناوخۆیی حیزبە کوردییەکانیش لەلایەکی دیکەوە قاچاخچییەکان دەبوایە هەر بەشەو بڕۆن، بەرۆژ لە شوێنێکا دەحەسانەوە تا تاریکایی باڵی بەسەر زەویدا دەکشاندەوە ئینجا بەڕێ دەکەوتنەوە.

هەڵبەت ڕێی قاچاخچییان ڕێ نەبوو. بزنەڕێی نێوان گاشە بەردی هێژا هێژا و لاپاڵ و هەڵدێری وەها ترسناک بوون کە ڕەبیە و دووربینی سەربازان پەی پێ نەدەبردن. سەیرم پێ دەهات کە وڵاخەکان بەو تاریکەسەڵاتە خۆیان شارەزای ڕێچکۆلەکانیان بوون. لە یەکەم شەومان کە تووتنەوانەکانمان جێ هێشت شاخێکمان بڕی کە ناوەکەیم لەبیر نەماوە و لەسەر لووتکەی شاخەکە یەک تاوە بارانی بەگوڕ دایڕژاندێ و بە تەواوی تەڕی کردین . بەڵام چونکە مانگی ئۆگوست بوو ئەوەندە پێی سەخڵەت نەبووین و زوو وشک بووینەوە. لە هەندێ هەورازی زۆر سەخت و ڕکا قاچاخچییەکانمان داوایان لێ دەکردین دەبێ دابەزین چونکە وڵاخەکان نقەنقیان بوو لەبەر باری گران و هەورازی کەرتڕێتی. ناچار دەبوایە ئەمن کۆچەری کوڕیشم کە تەمەنی سێ ساڵ و نیوێک دەبوو دەکۆڵێم کەم و تا هەورازەکەمان دەبڕی لە دوو وڵاخەکانمان بڕۆین. هێندەی نەبرد تووشی دارستانێک بووین کە بە تۆپی ئێران یان عیراق گڕی گرتبووو و ئێمەش دەبوایە بەناو ئەو دارە سووتاوانەدا تێپەڕین. لەسەر حاڵی بێحاڵی خۆمان ئەمن بەزەییم بەو درەختە جوانانەدا دەهاتەوە کە لکە گڕگرتووەکانیان یەک بە دوای یەکا دەکەوتنە خوارەوە و دەبوونە پەنگر و پشکۆ.

بەر لە ڕۆژهەڵاتێ گەیشتینە نزیک گوندێک و لەبەر سێبەری چەند چنارێکی زۆر گەورەدا بارمان لێ خست و دابەزین و منالەکانمان لەسەر ئەرزا خەویان لێ کەوت. قاچاخچییەکان گوتیان دەچن بۆ ناو گوندەکە کە هەموویان یەکتریان دەناسی نان و ماست بۆ هەموومان دەکڕن و شەکر و چاو کتلیشیان هەبوو بۆ چالێنان. پارەم دانێ و دوای نانخواردن ئێمەش خەومان لێ کەوت و ئەوانیش پاسەوانمان بوون.

ئێوارە دیسان بە تاریکی بەڕێ کەوتینەوە. سێ شەو و سێ ڕۆژ بەم شێوەیە بەڕێوە بووین و شەوێکیان نزیک سنووری ئێران تووشی چەند گوللەیەکی ڕووناککەرەوە (طلقة تنویر) بووین لە ڕەبیەکانەوە بەسەر

ئێمەیانـدا دەبارانـد کـە دیـار بـوو هەسـتیان بـە کاروانـی ئێمـە کردبـوو. هەروەهـا لـە نزیـک سـنوور تووشـی پێشـمەرگەی حزبـی دێمۆکـرات بوویـن. لـە قەتارچییەکانیـان پرسـیبوو ئەمانـە کێـن لـە گەڵتانـا گوتبوویـان ئێمـە نایانناسـین و بـە کـرێ دەیانگەیەنینـە ئێـران. شـەو تاریـک بـوو، یەکێکیـان هـات بـۆ لای مـن و لێـی پرسـیم چ کارەن و بـۆ کـوێ دەچـن. پێـم گـوت کاکـە ئێمـە کاسـبین لـە عێـراق هەڵاتوویـن و بـە تەمایـن بـە ڕێگای ئێرانـێ خۆمـان بگەیەنینـە ئەورووپـا. کابـرا کە سـەیرێکی منداڵەکانی کـردم هەمـوو جینزیـان لەبـەرا بـوو گوتـی " ئـەوە لیباسـی کاسـبان نییـە، ئێـوە کێـن. " منیـش یەکێـک لـە قەتارچییەکانـم بانـگ کـرد بـۆ لای خۆم بـە دەنگـی نـزم لێـم پرسـی ئەمانـە پێشـمەرگەی کامـە حیزبـن گوتـی حیزبـی دێمۆکراتـن. لێـرەدا ئیتـر خـۆم ئاشـکرا کـرد و گوتـم کاکـە ئەمـن فڵانـە کەسـم و ڕەفیقێکـی زۆر کۆنـی دکتـۆر ڕەحمانـی قاسـملوم. ئەگـەر خـۆی لـەو نزیکانـە بـێ حـەز دەکـەم چاویشـم پێـی بکـەوێ وەگـەر نـا تکایـە سـڵاوی زۆری منـی پێـڕا بگەیەنـن. بەمجـۆرە ئیتـر بەڕێـزەوە ڕێگایـان پـێ دایـن بڕۆیـن.

کـە نزیکـی سـنوور ببووینـەوە ئیتـر بـە ڕۆژیـش هـەر دەڕۆیشـتین و لـە لاپاڵێکـی زۆر سـەختا زینـی ئەسـپەکەی مـن کـە لارای کچیشـم لەپشـت سـوار ببـوو بـەلادا چـوو و هەردووکمـان بـە زینەکەشـەوە کەوتینـە خـوارەوە و لارا لاسـەری کەمێـک ئـازاری پـێ گەیشـت. هـەر لـە نزیـک سـنوورا ڕێچکۆڵەکەمـان بـە تەنیشـت گۆڕسـتانێکی زۆر مێژوویـیدا دەچوو. کێلـی جـوان جوانـی تێکشـکاو هەمـووی بەئەلفبـای ئارامـی لـە سـەریان هەڵکەندرابـوو و بەمـلاو ئـەولای گۆڕەکانـدا پەرشـوبڵاو ببوونـەوە. ئەمـن کـە خولیـای مێـژووم خەمـی زۆرم خـوارد کامێـرام پـێ نەبـوو هەنـدێ وێنـەی ئـەو گۆڕسـتانە مێژوویـە بگـرم. بـەو دەمودەسـتەش کەسـم دەسـت نەدەکـەوت هەنـدێ زانیاریـم لەسـەر ئـەو گۆڕسـتانە بداتـێ.

له چەپەوە: حەمەدەمین پێنجوێنی، عەزیز محەمەد و هۆمەر دزەیی لە ماڵی کاک عەزیز لە هەولێر

کۆچەر و کاروانی هۆمەر دزەیی

کۆچەری هۆمەر دزەیی

وەستاوەکان لە راستەوە دووەم کەس عەونی یوسف، چوارەمیان دکتۆر هاشم دۆغرەمەچییە باوکی ئازا دۆغرەمەچی (خوا لە هەموویان خۆشبێ)

لە چەپەوە: شێخ لەتیفی شێخ سادق بەرزنجی ، مام جەلال ، نامیق شێرە (هەرسێکیان بە رەحمەت بن).

لە راستەوە: ئەحمەد حەمەدەمینی برای هۆمەر دزەیی، شێخ لەتیفی شێخ سادق بەرزنجی، رەشۆ عومەر (هەرسێکیان بە رەحمەت بن)

کێخوا ئەحمەدی حەسەنە رەشی لە سالآنی جەوانییدا

هاواری ئەحمەدی حەسەنە رەشی

عەونی یوسف

کێخوا ئەحمەدی حەسەنە رەشی بە پیری

1992 - 1908

سەربازانی دیلکراوی عیراقی دەگوازرێنەوە بۆ ناو ئێران

سەربازانی دیلکراوی عیراقی لە ئێران

شەڕی عیراق - ئێران

شەڕی عیراق - ئێران

مەیدانی تێکگیرسانێک لە شەڕە دڕندەییەکەی ئێران - عیراق 1980 - 1988

ئەندامانی حیزبی بەعسی عیراقی

مریشک فرۆشانی کوردستان

حەسانەوە لە چاوەڕوانی بەنزین وەرگرتندا

**ژمارەیەکی گۆڤاری کاروان**

**کارتی ئەندامەتی هۆمەر دزەیی لە سێ سەندیکای عێراقی، هونەرمەندان، ئەدیب و نووسەران و ڕۆژنامەوانان**

**ژیان و هەڵبەستێکی شاعیری ڕۆمانتیکی ئینگلیز جۆن کیتس، هۆمەر دزەیی لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی لە کاروان دا بڵاوکراوەتەوە**

**ژیان و هەڵبەستێکی شاعیری ڕۆمانتیکی ئاڵمان هاینریش هاینێ، هۆمەر دزەیی لە ئاڵمانییەوە کردوویە بە کوردی لە کاروان دا بڵاوکراوەتەوە**

کۆمپانیای گروندفۆسی دانیمارکی بۆ ئاودێریی زەوی و زار.

دروێنەی دانەوێڵە لە گوندی هێلاوە

ڕەوسەی گەنمی درواوە لە گوندی هێلاوە

کێڵگەیەکی تووتنان

# بەشی 32

## ئێران و کوردستانی ئێران
## کونەمشک، ئەڵواتان، نەغەدە، راژان، تاران
## دیسان ڤیەننا

هەرچەنــدە بــە شــەکەتی، بــەڵام ئۆخــەی ســەت ئۆخــەی کــە بــە زیندوویــی گەیشــتینە گونــدی کونەمشــک یەکــەم قۆناخمــان لــە ئێرانــێ. کونــە مشــک گوندێکــی بچووکــی چەنــد ماڵێــک بــوو کەوتبــووە پەنــا شــاخێکەوە. خەڵکــی گوندەکــە پێیــان گوتیــن کــە هــەر ئــەو رۆژەش تۆپێکــی عیراقــی لــە پەنــا شــاخێکی پەرگــەی گونــدی دابــوو بــەڵام زیانــی مرۆڤیــی لــێ نەکەوتبــوەوە. شــەو لــە ماڵێــکا کــە قەتارچییەکانمــان دەیانناســین لەســەر بــان جێیــان بــۆ راخســتین و ئــەوە یەکــەم جــار بــوو لەوەتــی بەرێــوە بوویــن لەنــاو نوێنــی ئاســایی بــە دۆشــەک و ســەرینەوە بخەویــن. بەیانیــش نــان و ماســت و پەنیرێکــی زۆر بــە تامیــان بــۆ دانایــن و گوتیــان ئەمــڕۆ ماشــینەک دێ دەتوانــن بەکــرێ بیگــرن تــا گونــدی ئەڵواتــان کــە بنکەیەکــی پێشــمەرگەی پارتــی لــێ یــە.

هــەر واش بــوو و پــارەی قاچاخچییەکانمــان دا، سوپاســی زۆرم کــردن و ئــەوان گەڕانــەوە بــۆ عیــراق. منیــش هەنــدێ پــارەم دا بــە کابانــی ئــەو ماڵــەی کــە ئــەو شــەوە خزمەتێکــی زۆر جوانیــان کردیــن و بــە کــرێ ســواری ماشــینەکە بوویــن بــۆ بنکــەی پارتــی لــە گونــدی ئەڵواتــان. ئەڵواتان گوندێکــی گەورەتــر و زۆر خۆشــتر بــوو بــە روبــار و دارودرەختێکــی چڕەوە و زۆریــش لــە کونــە مشــکەوە دوور نەبــوو. ئــەو گوندانــە هەمــووی

سـەر بـە شـارى سەردەشـت بـوون.

گەيشـتينە بـارەگاى پارتـى لـە ئەڵواتـان و لـەوێ پێشـوازييەكى گەرميـان لـێ كرديـن. ئـەو بەرپرسـانەى پارتـى كـە لـەوێ بـوون ئەگـەر لێـم تێـك نەچووبـێ وابزانـم قـادر قـادر و دكتـۆر ناسـيح غەفـور بـوون. داوايـان لـێ كـردم بـە نووسـين هەنـدێ هەواڵـى تازەيـان لەسـەر بارودۆخـى كوردسـتان پـێ رابگەيەنـم بـە تايبەتـى هـى ئـەو چەنـد مانگـەى دوايـى. راپۆرتێكـى دوور و درێـژى پـڕ لەدواتريـن دەنگوباسـم بـۆ نووسـين لەناويانـا دواتريـن هەواڵـى شـێخ عوسـمانى شـێخ ئەحمـەدى بارزانـى و تـەواوى بارزانييەكانـى نيشـتەجێى شـارۆچكەى قوشـتەپەى نزيـك هەولێـر كـە كاربەدەسـتانى بەعـس بـێ سەروشـوێنى كردبـوون و هەواڵـە سـامناكەكە بـە پەنهانـى بەسـەر زارى تـەواوى خەڵكـى هەولێـرا دەگوازرايـەوە. شـەوێكيش لـە ئەڵواتـان مابنـەوە كـە لـە شـوێنێكا جـێ و رێيەكـى زۆر پوختەيـان بـۆ دانابوويـن و سـێ ژەمـە خواردنـى باشيشـيان بـۆ دەناردين. ئينجـا پێـم گوتـن كـە دەمانـەوێ بچيـن بـۆ ماڵـى مەحمـود ئاغـاى كاكـە زيـادى لـە شـارى نەغـەدە. ماشـێنێكيان بەكـرێ بـۆ گرتيـن بـۆ ماڵـى مەحمـود ئاغـا لـە نەغـەدە.

ئەڵواتـان و نەغـەدە لێـك دوور بـوون، بەچەنـد سـەعاتێك ئينجـا گەيشـتين. رێگاكـەش زۆر خـۆش بـوو و بەنـاو هـەرد و كێـوى جوانـى لـە دووررا ديـار و پێدەشـتى زۆر رەنگينـدا دەڕۆيشـت. بـاش بـوو شـۆفێرە كوردەكەشـمان مێـژوو و جوگرافيـاى تـەواوى ناوچەكـەى بـۆ روون دەكردينـەوە.

## لە ماڵی مەحمود ئاغای کاکە زیادی لە نەغەدە، دیسان ڤیەننا

با جارێ دوو وشەی وەفاداری لەبارەی کەسایەتییەک بخەمە روو و دوو دڕۆپ فرمێسکی یاداوەریشی بۆ بڕێژم، کەسایەتییەک کە لە هەموو روێکەوە پیاوەتی و رەوشت و رەفتاری خانەدانیی لێ دەتکایەوە: مەحمودی کاکە زیادی حەماغای کۆیە. بەڵام ئەمە خۆ نامۆ نەبوو بۆ ئەم بنەماڵە کەورەیە چونکە حەماغای باپیری هەر لە سەردەمی عوسمانییەکانەوە ناوێکی پرشنگدار بووە لە باشور و رۆژهەڵاتی کوردستانا. تەبای زۆرێک لە کوردپەروەرانی کوردی باشوور مەحمود ئاغاش لەدەست زەبرو زۆری کاربەدەستانی بەعس دەستبەرداری سەروەت و سامان و گوندێکی زۆری وڵاتی کۆیە ببوو و بە خاوخێزانەوە رووی کردبووە ئێرانێ و لە شاری نەغەدە نیشتەجێ ببوو. بنەماڵەی ئێمەی دزەیی هەر لە کۆنەوە پەیوەندیی نزیکی عەشایری و سیاسی و خزمایەتیشمان لەگەڵ بنەماڵەی کاکەزیادی بابی مەحمودداغای هەبووە، پەیوەندییەک کە دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی حەماغای کۆیە و برایمی بایزی مامی من لە زەمانی عوسمانییەکانەوە. کاکەزیاد خۆی یەکێک بوو لە خۆشەویسترین دۆست و خزمی بنەماڵەی ئێمە بەتایبەتی پەیوەندیی زۆر نزیکی لەگەڵ کاک ئەحمەد حەمەدەمینی براگەورەی ئێمەدا. هاوسەری دووەمی کاکەزیادیش (دلارام خانی شێ عەلی شێخ کەریمی بەرزنجی) کە خانمە نۆبڵیکی noblewoman کەم وێنە بوو لە جوانی و ئیتیکێتا و دەکاتە باوەژنی مەحموداغا، ئامۆزای کافیە خانی شێخ مارفی شێخ کەریمی دایکی من بوو کە هەموویان کۆیی بوون و نەوەی شێ حەسەنی گڵەزەردە بوون.

جا کە بە تاکسییەکە لە گوندی ئەڵواتانەوە گەیشتینە ماڵی مەحموداغا لە نەغەدە پێشوازییەکی بێ وێنەمان لەلایەن خودی مەحموداغا و گولیزەر خانی هاوسەرییەوە لێ کرا. رووناسی هاوسەرم و هەر چوار منداڵەکانم لەلایەن گولیزەرخانەوە، شۆڕەژنێک، کە بەڕاستی پرشنگی خانومانیی ئەریستۆکراتیکی لێ ئەدرەوشایەوە و لەلایەن کچ و کوڕە جوانەکانیانەوە بەخێرهاتنێکی زۆر خزمانەیان لێ کرا و منیش لە کۆشکێکی لاتەریکی حەوشە گەورەکەی ماڵەکەیان جێگام بۆ داندرا. هەموومان ماندوو و شەکەت ببووین و هەرچوار منداڵەکانیشم دەموچاو و پەل و پۆیان بە پێوەدانی مێشولە و مەگەز هەمووی سووریژە ئاسا خاڵ خاڵ ببوو. ئەوە بوو کە زوو بە زوو گەرماویان بۆ گەرم کردین خۆمان شت و جلەکانمان گۆڕی. ئینجا هەرچی خواردنی خۆشی کوردەواری و ئێرانی هەبوو هەموویان بەجارێ بۆ ساز کردبووین و منداڵەکان لە دیوی ناوماڵ و منیش لەگەڵ مەحموداغا و هەندێ میوانی تریش لە کۆشکەکەی دیوەخان خواردنمان بۆ دادەندرا. یەکێک لەو کەسانەی کە هەمیشە دەهاتە دیوەخانەکەی مەحموداغا پیاوێکی کۆیی قسە خۆشی ناو (گورەباخ) بوو. یەکێکی تریش ئەویش هەر کۆیی و قسەخۆش بوو ناوەکەیم لەبیر نەماوە.

مەحموداغا کە هەر بە کاک مەحمود بانگم دەکرد کوڕێکی زۆر قۆزی بەژنوباڵا بەخۆوەی و لە قسەکردنیشا هەمیشە دەم بە پێکەنین بوو. بەرگی کوردی زۆر جوان لێ دەوەشایەوە و شاڵێکی رەنگاوڕەنگی بە ریشۆڵەی درێژی گوفکداریشی بە دەستووری کۆیە لەسەری دەنا. یادی بەخێر کاک مەحمودی خزمدۆست کە پیاو لە دانیشتنیا تێر نەدەبوو.

یەک هەفتە لەو ماڵە گەورەیە ماینەوە هەر هەموو رۆژێ سێ ژەمە جۆرەها خواردنی کوردی و ئێرانییان بۆ ساز دەکردین. نانی بەیانیشمان بریتی بوو لە هێلکەورۆن و ماست و چەندەها پەنیری

جۆراو جۆر و خامە و عەسەل و ئەستورکە تەندووریی گەرمی کە هەر ئەمەیان بەتەنیا پێخۆری پێ نەدەویست.

منالەکانیشم ئەو چەند رۆژە لەگەڵ کوڕ و کچەکانیان زۆر راهاتن و کە دواتر رۆیشتین تا ماوەیەکیش پەیوەندیی نامەیان بە یەکترییەوە هەر مابوو.

پلانی ئێمە لە ئەنجامی ئەو راکردنەی عیراقمان ئەوە نەبوو کە بگەینە ئێران و لەوێ بمێنینەوە بەڵکو دامانابوو بگەینەوە ئەوروپا. ئەوەش وا ئاسان نەبوو چونکە ئێمە پاسەپۆرتی عیراقیمان هەبوو دەبووایە داوای ڤیزە بکەین بۆ هەر وڵاتێکی ئەوروپایی و سەبارەت بە باری شەڕی عیراق - ئێرانیش ڤیزە وەرگرتن نیمچە مەحاڵێک بوو چونکە بە هەزاران عیراقی وەک ئێمە رایان کردبوو بۆ ئێران و بە تەمای ئەوروپا بوون.

سوپاسی تایبەتی زۆرم بۆ کاک ئاراسی کاکەزیادی بۆ ئەم وێنانەی بۆی ناردووم کە وا لێرەدا بڵاویان دەکەمەوە.

## لە گوندی راژان میوانی کاک ئیدریس بارزانی بووین

دوای هەفتەیەک مانەوە و سانەوە لە ماڵی مەحموود ئاغا لە نەغەدە، ئینجا بڕیارمان دا بچین بۆ لای کاک ئیدریس بارزانی، لە گوندی راژانی سەر بە شاری ورمێ و تەگبیرێکی چوونمان بۆ ئەوروپا لەگەڵ ئەودا بکەین. هەر واشمان کرد و تاکسیمان گرت بۆ گوندی راژان. کاک ئیدریس یادی بەخێر، پێشوازییەکی زۆر دۆستانەی لێ کردین و سەرەتا بۆ ماوەیەکی کاتی ئێمەیان برد بۆ گوندی سلیڤانە، کە هی سەید مووسای ئامۆزای سەید عەزیز شەمزینی بوو و زۆر لە راژانێ دوور نەبوو. لەوێ دیوەخانێکی کاک ئیدریسیان بۆ تەرخان کردین کە لەتەنیشت ماڵی سەید مووسا بوو. پێم وایە کاک سیهادی مەلا مستەفاش لەوێ دادەنیشت، چونکە زوو زوو دەماندی و سەری

لێ دەدایـن. ئـەوەی کـە لـە سـلێمانە لەبیـرم ناچـێ، خەرمانـی سـێو بـوو. پێشـتر لـە هیـچ شـوێنێکدا باخـی پـڕ دارسـێوی وام نەدیبـوو و سـێوی وا گـەورە و مـزری وا بەتامیشـم نەخواردبـوو. جـا کـە دەچوویتـە نـاو باخـی سـێوان لـە سـلێمانە نـاوە نـاوە لەنێـوان درەختەکانـدا خەرمانـی بڵنـد بڵنـدی سـێوی لێکـراوەی ڕەنـگ مەیلـەو پەمەیـی بـۆ فرۆشـتن هەڵدرابوونـەوە. دیمەنێکـی بەڕاسـتی دڵڕفێـن بـوو.

دوای ئـەوە کاک ئیدریـس رایسـپارد، هـەر لـە ڕاژانـێ لەنزیـک خـۆی خانوویکیـان بـۆ چـۆڵ کردیـن و لەوێیـان دامەزراندیـن. خانووەکـە بـە بـەردی سروشـتی کـوردەواری دروسـت کرابـوو و بـە قوڕەسـوور سـواغ درابـوو، کـە مـن دڵـم پێـی دەکرایـەوە، چونکـە منداڵیـی خۆمـم لـە خانـووە قوڕەکانـی دووگـردکان دەهاتـەوە بیـر. بریتیـش بـوو لـە دوو چـاوە و هەیوانێکیـان لەنێوانـدا بـوو کـە بـۆ نانديـن بەکارمـان دەهێنـا. تـەواوی نوێنـی نووسـتن (هەڵبـەت لەسـەر ئـەرزا) و کەلوپەلـی چێشـت و چـای لێنانیشـیان بـۆ دەسـتەبەر کردیـن.

هـەر لـەو ماوەیەشـدا دیدەوانـی بـرازام لەگـەڵ ئەحمـەدی حاجـی عەدنانـی عەلـی موختـاری بـرادەری، ئەوانیـش لـە دەسـت سـەربازی لـە عێـراق رایـان کردبـوو و هاتنـە لامـان، ئیتـر ژوورێـک بـۆ ئـەوان بـوو و ژوورێکیـش بـۆ مـن و روونـاس و هـەر چـوار منداڵەکانمـان.

گونـدی ڕاژان لـە ناوچـە کوردنشـینەکانی سـەر بـە ئوسـتانی ئازەربایجانـی غەربـی بـوو لـە رۆژئـاوای ئێـران و سـەر بـە شـاری ورمـێ بـوو. چەندیـن بـارەگا و ئۆفیسـی پارتـی دیموکراتـی کوردسـتانی عێـراق لـەدەرەوەی گونـد بنەگەیـان لـێ داکوتابـوو، یەکێـک لەوانە ئۆفیسـی کاک ئیدریـس خـۆی بـوو. ئـەو ئۆفیسـخانانە و ماڵـی هەنـدێ بەرپرسـانی پارتـی لـەدەرەوەی گونـد، وەک گەڕەکێکـی تایبـەت بـە پارتـی وای لـێ هاتبـوو. ئەمـن زوو زوو سـەرم لـە کاک ئیدریـس دەدا، لـە ئۆفیسـەکەی کـە کاک فازیـل میرانییشـی لـە هەمـان ژووردا لەگەڵـدا بـوو. زۆر جاریـش نانـی بەیانـی و نیوەڕۆشـم لەگـەڵ ئەوانـدا دەخوارد. ئەمـن کـە دەڵێـم ئۆفیـس،

مەبەستم لێرەدا مێز و کورسی و قەنەفە نییە، بەڵکوو هەر مافوور و بالیفە کوردەوارییەکەی خۆمان بوو، کە لەسەر ئەرز لێی دادەنیشتن. مەبەستیشم لە نانخواردن مێزی نانخواردنی بە کورسی دەورەدراو ئەوەش نییە، بەڵکوو هەر سینی و سەبەتە کوردییەکەی دەستووری لادێی کوردستانە. هەرچی کاک مەسعود بوو، ئەو ماوەیەی کە ئێمە لە راژان بووین ئەو لەوێ نەبوو، ئەو زیاتر لە بەرەکانی شەڕدا لە سەردانی پێشمەرگەکاندا دەبوو.

هەر وەکوو گوتم، گوندی راژان کەمێک لە بارەگاکانی پارتییەوە دوور بوو و من و منداڵەکان و دێدەوان و ئەحمەدی حاجی عەدنانی بە پیاسە دەچووینە ناو گوند، چونکە چەند دوکانێکی لێ بوو و پێداویستییەکانمان لەوێ دەکڕی. رۆژانەش پاس هەبوو هاتوچۆی نێوان گوندەکانی ئەو ناوچەیە و شاری ورمێی دەکرد. وێستگەیەکی پاسەکە لەسەر رێی گشتی هەبوو و کەمێک دوور بوو لە گوند. جا گوندییەکانی کە سەردانی شاری ورمێیان بکردایە، دەبوایە بەیانییان لە کاتێکی دیاریکراودا پێشتر بچن لە وێستگەکە بوەستن، تا پاسەکە دەگەیشت. لە ورمێش شوێنی تایبەتی هەبوو بۆ گەڕانەوەی پاسی گوندەکان و دەبوایە ئێوارانیش بۆ گەڕانەوە بۆ گوند لە سەعاتێکی دیاریکراودا لەوێ بیت، دەنا پاسەکە بڕۆیشتبا، ئیتر دەبوایە ماوەیەکی باش چاوەڕێی پاسێکی تر بیت، ئەگەر بمابوا. خۆی بەڕاستی دەوڵەتی ئێرانی هەر لە کۆنیشەوە هاتوچۆی نێوان شار و گوندانی زۆر بەجوانی رێک خستبوو.

سروشتانە، رووناسی هاوسەرم لە هەولێرەوە هەرچی خشڵی کە هەیبوو لەگەڵ خۆیدا هێنابووی، بەڵام نەماندەزانی لە کوێ هەڵی بگرین. لێمان بووبوو بە بار و بۆ هەر کوێیەکی بچووباین دەبوایە رووناس لەناو جانتاکەی خۆی بە ملی وەکا، کە سووکیش نەبوو. بیستمان کاک شەوکەت شێخ یەزدین (یادی بەخێر) کە سندوق ئەمینی شۆڕش بوو، قاسەی پۆلایینی لە ئۆفیسەکەی خۆیدا هەیە.

ئەوە بوو کە قسەم لەگەڵدا کرد و گوتی هەرچی شتی گرانبەهای هەتانە بیهێنن بۆ لام، من لە قاسەکە بۆتانی هەڵدەگرم. هەر واشمان کرد و باری خۆمان سووک کرد.

ماوەیەکی باش لە راژان ماینەوە و ناوە ناوەش سەردانی شاری ورمێمان دەکرد، بۆ بازاڕ و دیدەنیش کە بەڕاستی شارێکی خۆش بوو و لەسەر دەریاچەی ورمێش بوو.ماڵی کاک ئەحمەد دەشتیی کۆنە برادەری سەردەمی وێستگەی رادیۆی دەنگی کوردستانی گردەڕەشم، ئەویش بە ماڵ و منداڵەوە لە ورمێ دامەزرابوون و زۆر جار خواردنێکی کوردەواریمان لای ئەوان دەخوارد.

هەڵبەت ئێمە هەر لە خەمی رۆیشتنماندا بووین بۆ ئەورووپا و پرسیار بە پرسیار، هاتینە سەر ئەو قەناعەتە، کە دەبێ من سەفەرێکی تارانی بۆ بکەم، لەوێ هەوڵ بدەم لە باڵوێزخانەی نەمسا ڤیزە بۆ ئەو وڵاتە وەرگرم. ئەمن دڵنیا بووم کە رەنگە بەئاسانی ڤیزەم بدەنێ، چونکە یەک: هەردوو کچەکانم نازدار و لارا لە ڤیەننا لەدایک بووبوون و بڕوانامەی لەدایکبوونیشیانم پێ بوو. دوو: خۆم چەندین ساڵ هەم وەک خوێندکاری زانکۆ و هەم دواتریش وەک کارمەندی باڵوێزخانەی عێراقی لە نەمسا ژیابووم. سێ: پەیوەندیشم بە دکتۆر هاینتس فیشەری پارتی سۆسیالیستی نەمساوە باش بوو، کە لە ساڵی 1975دوای نسکۆی شۆڕش یارمەتیی دابووم، ژمارەیەک پەنابەری کورد لە نەمسا وەربگیرێن (لە بەشەکانی پێشوومدا بەدرێژی باسی ئەم بابەتەم کردووە). دکتۆر فیشەر چەند ساڵێ دواتر بوو بە سەرکۆماری نەمسا. بێجگە لە نەمسا کاروانی کوڕیشم لە ئینگلتەرا لەدایک بووبوو، پسوولەی لەدایکبوونی ئەویشم لابوو و گوتم، رەنگە بە واسیتەی کاروان بەریتانیاش ڤیزە بدات بە هەموومان. رێگایەکی دیکەشم رەچاو کردبوو: دانیمارک. وەک پێشتر لەبەشەکانی پێشوومدا باسم کردووە، کە لە هەولێر بووم لەگەڵ کۆمپانیای گروندفوس Grundfosی دانیمارکی بۆ ئامێری رشێنەر (مەڕەش)ی زەوی و زار

کارم دەکرد و دۆستایەتییەکی باشم لەگەڵ دانیمارکییەکاندا بەستبوو. گوتم رەنگە بۆ بارەگای کۆمپانیاکەیان لە دانیمارک بنووسم، ئەوانیش یارمەتیم بدەن بۆ ڤیزە.

هەر واشم کرد و ئەمن بە تەنیا چوومە تاران.

لە ورمێوە بۆ تاران ئۆتۆبووسی گەورە هەبوو، کە لە ئێران پێیان دەگوت (تعاونی) و ترێتیش هەبوو. بە تعاونی چووم و بەڕاستی جوان رێک خرابوو. شۆفێرەکە نەیدەتوانی بە ئارەزووی خۆی باژوا، چونکە تاخۆمەترێک خێرایی ماشینەکەی تۆمار دەکرد و لە رێگا ناوە ناوە ئۆفیسی پۆلیسی هاتوچۆ هەبوو، کە شۆفێر دەبوایە (پسوولەی خێرایی) تۆمارکراوی ماشینەکەی بۆ ئۆفیسەکە بیات و لەوێ ئیمزای بکەن، کە پابەندی رێنمایی بووە، ئینجا دەیتوانی بەردەوام بێ لە سەفەرەکەیدا. بەم شێوەیە هیچ شۆفێرێک نەیدەتوانی بە کەیفی خۆی لێ خوڕێت و ئەرواحی ئەو سوارانەش دەپارێزرا. نازانم دەبێ هاتوچۆ لە کوردستانەکەی خۆشمان ئەوها رێک خرابێ؟!

دیمەنی سەر رێگای ورمێ و تاران هەتا خوا حەز دەکا جوان بوو. ئەم وڵاتە بەڕاستی کۆنتینێنتێکە (قارە)یەکە بۆ خۆی. شاخی رەنگین و پێدەشتی بەرین پێشەبڕکێیانە لە جوانی و ئاو و هەوای ساف و شیرین. ماوەکەش ئەگەر لێم تێک نەچووبێ، وابزانم شازدە سەعاتێک دەبوو.

## تاران

لە تاران زۆرترایەتی کوردی عیراقی چ ماڵە کاربەدەستانی پارتی چ خەڵکی ئاسایی بەڵام هەر سەر بە پارتی لە شاری کەرەج بە تایبەتی لە گەڕەکی ئەعزەمییە دادەنیشتن کە شارێکی خۆش بوو و نزیکەی سەعاتە ڕێیەک لە دەرەوەی تارانێ بوو. هاتوچۆی نێوان تاران و کەرەج بە پاس و تاکسیش زۆر ئاسان بوو. جا کە گەیشتمە تاران یەکسەر چووم بۆ کەرەج بۆ ماڵی نووسەر و لێکۆڵەری موسڵاوی کاک جەرجیس فەتحوڵلای ڕەبەن کە دۆستایەتی ساڵانی لەندەنم لەگەڵیا هەبوو. پارتی خانوێکی فەرشکراوی گەورە و خۆشی بە هەموو ناوماڵەوە لە ئەعزەمییەی کەرەج بۆ کاک جەرجیس دابین کردبوو بۆ ئەوەی خەریکی کاری نووسین و توێژینەوەکانی خۆی بێ لەبارەی مێژووی سیاسی کورد و کێشە نەتەوایەتییەکەی. جەرجیس فەتحوڵا نووسەرێکی زۆر لێهاتوو بوو بە زمانی عەرەبی و ڕۆشەنبیرێکی مارکسیی دۆستی کورد بوو. ئینگلیزییەکی زۆر باشیشی دەزانی لەگەڵ هەندێ فرانسی و فارسیش و کتێبخانەیەکی بەو زمانانە لە ماڵەکەی خۆی پێک وەنا بوو و ئامێری چاپی دەستیشی بەکار دەهێنا. بۆیە کە ڕۆژنامەنووسانی بیانی بۆ سەردانی شۆڕش بە کەرەج دا ڕەت دەبوون زۆر جار لای جەرجیس فەتحوڵا لایان دەدا. چەند شەوێک لای ئەو مامەوە بە ڕۆژ دەچوومە تاران و تەبای ئەو هەموو کورد و عیراقییانە لەبەر دەرگای باڵیۆزخانەکانا دەرۆزەی ڤیزەیەکمان دەکرد بۆ هەر وڵاتێک بوایە و ئێواران دەگەڕامەوە بۆ کەرەج بۆ ماڵەکەی جەرجیس.

چووم بۆ باڵیۆزخانەی نەمسا. بەڵام هەر باڵیۆزخانەیەک بە دەیان خەڵکی پەنابەری لەبەر دەروازە وەستا بوون و نەیاندەهێشت بچنە

ژوورەوە فۆرمـی پەناهەندەیـی پـڕ بکەنـەوە. ئەمـن کـە ئاڵمانییەکـەم ڕەوان بـوو دەرگەوانەکـەم تـێ گەیانـد بـە کۆنسـوڵ بڵـێ ئەمـن ناسیاوی بەڕێـز هاینتـس فیشـەرم لـەو سـاڵانەی کـە ئـەو سـەرۆکی فراکسـیۆنی پارتـی سۆسیالیسـتی نەمسـا بـوو. پێشـم گـوت بـە کۆنسـوڵ بڵێـت دوو کچیشـم لەڤیەننـا لـە دایـک بوونـە. جـا لەسـەر ئـەم قسـانەم کـە بـە کۆنسـوڵیان ڕاگەیاندبـوو و کـە بـە ئاڵمانیەکـی جوانیـش دەدوێـم ڕێگایـان بـە مـن دا بچـم کۆنسـوڵ ببینـم. کارێکـی باشتریشـم کردبـوو کـە چەنـد وێنەیەکـی گەورەکـراوم هەبـوو لەگـەڵ سـەرکۆماری ئەوسـای نەمسـا بەڕێـز فرانتـس یۆنـاس Franz Jonas هـی ئـەو سـاڵانەی کـە کارمەنـدی باڵیۆزخانـەی عیـراق بـووم لـە ڤیەننـا بـۆ کاروبـاری وەرگێـڕان و هەمیشـە یـاوەری باڵیـۆز دەبـووم لـە سـەردانەکانی بـۆ لای کاربەدەسـتانی پایەبـەرزی نەمسـاوی. ئـەو وێنانەشـم لەگـەڵ خۆمـا هەڵگرتبـوو. کۆنسـوڵم دی و وێنەکانیشـم هەمـوو پیشـان دا. بـەڵام ئەوەشـم خسـتە سـەر قسـەکانم کـە لـە نەمسـا بـە تەمـا نیـم لەسـەر حیسـابی دەوڵەتـی نەمسـا بژیـم و خـۆم بـڕێ پـارەم هەیـە لەبانکـی ئـەوێ و تـا کارێ دەدۆزمـەوە نابمـە بـار بەسـەر بودجـەی حکومەتـی نەمسـا. خـۆی کـە لـە هەولێـر لەگـەڵ دانیمارکییـەکان کارم دەکـرد داوام لـێ کردبـوون مانگانەکانـم لـە عیـراق نەدەنـێ بەڵکـو هەموویـم لـە دانیمارکـەوە حەواڵـەی حیسـابی بانکـم بکـەن لـە ڤیەننـا. هـەر واشـیان دەکـرد و بـڕە پارەیەکـی باشـم لـە ڤیەننـا بـۆ هەڵگیرابـوو. کۆنسـوڵی بەڕێـز زۆر دۆسـتانە بـوو لەگەڵمـا و گوتـی بەداخـەوە دەسـەڵاتی ڤیـزە پێدانـی نیـە بـۆ پەنابـەران بـەڵام نامەیـەک لەبـارەی مـن و خێزانەکـەم بـۆ وەزارەتـی دەرەوەی خۆیـان بـۆ ڤیەننـا دەنێرێـت و چاوەڕێـی وەرامـی ئـەوان دەبـێ.

بـە هومێـدی زۆرەوە باڵیۆزخانـەی نەمسـام جـێ هێشـت بـەڵام هـەر بەوەنـدە نەوەسـتام و یەکسـەر چوومـە پۆسـتەخانە نامەیەکیشـم بـۆ بەڕێـز دکتـۆر هاینتـس فیشـەر Heinz Fischer نـارد کـە هەنگـی ببـووە وەزیری پـەروەردە. زۆری نەبـرد سـکرتێری بەڕێـز فیشـەر (دکتـۆر فینگەرنـاگل

Fingernagel) وەرامـی نامەكەمـی دایـەوە كـە وا خەریكـن رێگایـەك بدۆزنـەوە بـۆ بەدەنـگ وەهاتنـم.

بێجگەلـە نەمسـا نامەیەكـم بـۆ بەڕێوەبـەری كۆمپانیـای گروندفۆسـی دانیماركـی بـۆ كۆپنهاگنیـش ناردبـوو كـە لـە هەولێـر كارم لەگەڵیانـا دەكـرد. لـە كۆپنهاگـن وەرامیـان بـۆ نووسـیمەوە كـە ئـەو بەرپرسـە دانیماركییـەی لـە هەولێـر بۆسـی مـن بـوو (پـۆڵ ریسـوم هانسـن Paul Resum Hanson) ئێستا پۆستەكەی گواستراوەتەوە بـۆ وڵاتـی نایجیریـا Nigeria لـە ئافریـكا و نامەكـەی منیـان بـۆ نـاردووە بـۆ ئەوێنـدەرێ و نووسیبوشـیان هـەوڵ دەدەن یارمەتیـم بـدەن.

گەڕامـەوە بـۆ راژان و بیرمـان كـردەوە ئێمـە لـە راژان و باڵیۆزخانـەكان لەتـاران بـەو دوور بـە دوورییـە كارەكانـم بـۆ ناچێتـە سـەر ئیتـر بڕیارمـان دا بچیـن لەتـاران دانیشـین بـۆ ئـەوەی رۆژانـە ئـاگاداری دەنگوباسـی ڤیـزە بین .

بـاش بـوو لـە تـاران كوڕێكـی محەمـەد نـاوی بـرادەری شـێروانی موحسـین دزەیـی بـرازام دەناسـی كـە لـە كاتـی خـۆی لـە ئینگلتـەرا بوویـن ئەویـش لەگـەڵ شـێروانا پێكـەوە دەیانخوێنـد و زۆر جـار لەگـەڵ ئەویشـا دەهاتـەماڵـی ئێمـە لـە ریدینـگ. شـێروان ئـەدرەس و ژمـارەی تەلەفۆنـی محەمـەدی بـۆ ناردبـووم و پەیوەندیـم پێـوە كـرد زۆر پیاوانـە هـەم بـۆ نانخـواردن بانگهێشـتی كردیـن و هـەم ژوورێكـی گـەورەی لـە نهۆمـی سـەرەوەی ماڵێكـی دراوسـێیان بـە كـرێ بـۆ گرتیـن كـە نزیـك خیابانـی سـابالان بـوو. ئیتـر لـەوێ ماینـەوە و سـاڵێكی خشـتی مانەوەمـان لـە ئێرانـێ لـە تـاران تـەواو كـرد تـا ڤیـزەی نەمسـامان بـۆ هـات.

دیدەوانـی بـرازام و ئەحمـەدی حاجـی عەدنانـی رەحمەتیـش ئەوانیـش هاتنـە تـاران و ئـەوان لەگـەڵ چەنـد كـورد و عیراقییەكـی دیكـە ژووری هەرزانیـان لـە نزیـك شـەقامێک بـە نـاوی كووچـەی عەرەبـان دەسـت كـەوت و ئەوانیـش لای خۆیانـەوە خەریكـی هەوڵـی ڤیـزە بـوون. لـەو ماوەیـەی كـە لـە تـاران بوویـن بـە رێـگای كاک جەرجیـس فەتحـوڵا

ئاشنابیمان لەگەڵ برایانی فەیلی عیراقی کە لە تاران دەژییان دکتۆر جەعفەر محەمەد کەریم رەحمانی و کاک هادی برای (یادیان بەخێر هەردووکیان) پەیا کرد. ئەمن برادەری کاک حەبیب کەریمی برایان بووم ( یادی ئەویش بەخێر) کە لە ساڵانی رادیۆکەی دەنگی کوردستانی گردەرەشا بەرپرسی وێستگەکەمان بوو. هەر لە تارانێ ئاشنابیمان لەگەڵ منداڵەکانی کاک جەوهەر هیرانی کۆنە برادەری ساڵانی پەنجاکانی کەرکوکم پەیاکرد. بەداخەوە کاک جەوهەر خۆی نەمابوو بەڵام کاک کوردۆی کوڕی و دایکی و خوشکەکانی سەبوورییەکی باش بوون بۆ منداڵەکانی من. هەر لە تارانێ زۆر دڵشاد بووم بە ناسینی کاک حەمە رەشید هەرەسی هونەرمەند و نووسەر کە ئەو ڤیزەی کەنەدای وەرگرت چوو بۆ ئەوێ. هەر لە تارانێش ئاشنایەتیم لەگەڵ کاک عومەر سەلیم پەیدا کرد کە برای کاک رەقیبی برادەری منداڵیم بوو لە قوتابخانەی سەرەتایی هەولێر و لە بنەماڵەی کوورەچی ناوداری هەولێرن. کاک عومەریش لەوێوە چوو بۆ کەنەدا. پێشتریش لە راژانێ ئاشنای هونەرمەندێکی دەستوپەنجە رەنگینی تر ببووم، نەزیر خەیلانی، کە پەیکەری چکۆلانەی زۆر سەرنجکێشی لە کۆلکە و چیلکە دروست دەکرد.

## کێشەی زێڕەکانی رووناس

کە ڤیزەکەمان ئامادە بوو لەگەڵ دێدەوان و ئەحمەدی حاجی عەدنانی چووینەوە بۆ راژانێ زێڕەکان لای کاک شەوکەتی شێخ یەزدین بێنینەوە. ئەمجارە بە ترێن چووین و دیسان سەفەرێکی زۆر خۆش بوو و پێم وایە شەوێکمان پێ چوو. زێڕەکانم وەرگرتەوە و سوپاسی زۆری کاک شەوکەتی رەحمەتیم کرد.

بەڵام لە ئەنجامی پرسیار کردن زانیمان کە کاربەدەستانی ئێرانی لە فڕۆکەخانە نایەڵن هیچ کەسێ خشڵی زیاتر لە چەند بازنێکی بارێک و ئەنگوستیلە بباتە دەرەوەی ئێران.

چەند جارێ چوومە دەزگاکانی پەیوەندیدار بە کاروباری لەو جۆرەیە و پێم دەگوتن کە من ئیراقیم ئەو زێڕانەم لە ئێران نەکڕیوە بەڵکو لە عیراق لەگەڵ خۆمانا هێناومانە و هەقی خۆشمانە لەگەڵ خۆمانا بیانبەینە دەرەوە. بە هیچ جۆرێ لە قسەی خۆیان نەدەهاتنە خوارێ. بە ئامۆژگاری کاک هادی رەحمانی چووم بۆ لای جەنابی سید (عبدالعزیز محسن الحکیم) بابی بەڕێز عمار الحکیم کە لە تاران پەناهەندە بوو بەڵکو ئەو واسیتەیەکم بۆ بکات. بەڕاستی پێشوازییەکی زۆر دۆستانەی کردم و ماوەیەکی درێژ لەگەڵیا دانیشتم دەنگوباسی وەزعی کوردی لێ دەپرسیم. بەڵام داوای لێ بووردنیشی لێ کردم کە نایەوێت خۆی تێکەڵی کاروباری قانونی ئێران بکات. سوپاسی زۆرم کرد و ماڵئاواییم لێ کرد.

بیرمان کردەوە باشترین رێگا ئەوەیە هەموو زێڕەکەمان بەین بۆ لای حەمایل خانی دایکی کاک مەسعود بارزانی (هەزار رەحمەت لە گۆڕی بێت) و بۆمان هەڵگرێ تا بزانین دنیا چی بەسەر دێتەوە.

هەر واشمان کرد و روناس چوو بۆ لای و ئەویش بەخێر هاتنێکی زۆر گەرمی لێ کرد و ئەمانەتەکەی لێ وەرگرت. باش بوو دیسان سەری خۆمان سووک کردو خۆمان ئامادە کرد بۆ سەفەر بۆ نەمسا.

## کێشەی پاسپۆرتمان

ئێمە هەموومان پاسپۆرتی عیراقیمان هەبوو بەڵام ماوەیان ئێکسپایەری کردبوو و ئێمە بە قاچاخ گەیشتبووینە ئێران. کە پاسپۆرتەکانم بە کۆنسوڵی نەمساوی پیشان دا گوتی ئێمە بە هیچ جۆرێک ناتوانین ڤیزە بخەینە سەر پاسپۆرتی ئێکسپایەر بووی. بەڵام هەر خۆیشی پێشنیاری کرد (لێسێ پاسێ) یەکی ئێرانی وەرگرین و لەسەر ئەوە ڤیزەمان بۆ لێ دەدەن. ئیتر لەم ئۆفیس بۆ ئەو ئۆفیسانەی ئێرانی سێ چوار هەفتەی پێ چوو تا ئەو بەڵگەیەمان پێ دراو ڤیزەکەی نەمساویشمان وەرگرت.

هەر لە ماوەی مانەوەی تارانمان کۆنفەرانسێکی ئۆپۆزیسیۆنی عیراقی بە کورد و عەرەبەوە لە تاران گیرا. ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتی عەرەب و کوردی عیراقی لە دەرەوەی عیراق و ئێرانەوە هاتبوون کە هەندێکیانم دەناسی و لە ئێرانیش کاک ئیدریسی رەحمەتی نوێنەری کورد بوو. منیش رۆژانە بەشداریی دانیشتنەکانی کۆنفەرانسەکەم دەکرد.

زۆر مخابن و مایەی داخی گران بوو کە ماوەیەک دوای کۆنفەرانسەکە هێرشێکی دڵ کتوپڕ لە کاک ئیدریسی دا و کۆچی دوایی، کۆچێکی بەڕاستی ناوادەی پێ کرد. ئەمن کە لە تارانێ بووم یەکسەر چووم بۆ بانگێ کە چاکم لەبیر نەماوە لە راژانێ بوو یان لە سلیڤانە. هەزار رەحمەت لە گۆڕی بێ. کورد پێویستی بە ئیدریس و مام جەلال مابوو.

پێویست بە من ناکات بە وردەکاری باسی شارێکی گەورەی وەک تارانێ بکەم، زۆری لەسەر گوتراوە و نووسراوە. ئەو ماوەیەی کە لەوێ بووین، لە درەنگانی پایزی 86 تا سەرەتای هاوینی87 منداڵەکانم فارسییەکی باش فێر بوون و خۆیشم شرە فارسییە کۆنەکەی کە دەمزانی مشتومالْ کردەوە.

باکوورەکەی تاران لە مەیدانی موحسنی یەوە بەرەو ژوورو گەڕەکی دانیشتووە خواپێداوەکانی شار بوو و خانوو و بەرە و ریستۆران و کافێی جوان و خۆشی لێ بوو. لەناو شاریشا چایخانەیەکی زۆر ترادیشناڵی سەیر هەبوو کە کرابوو بە موزە. سەماوەرێکی لێ داندرابوو ئەوەندە گەورە بوو کە جاران چوار کەس بە دەوریا دادەنیشتن و هەر یەکە شێرەی خۆی لەبەر دەما بوو چایان تێ دەکرد. چەند جارێکیش چووین بۆ ناوچەی ئاب عەلی لە دەرەوەی تاران کە شوێنی سکی (بەفرەخلیسکێ) بوو. لەوێ پیاو لەلایەک و ژنانیش لەولاتر سکیيان دەکرد و تێکەڵ بە یەکتری نەدەبوون. بەڵام بازاڕی بزرگ بەڕاستی دەگمەن بوو تەنها مەگەر ( کاپاڵی چارشی) ئەستەمبۆڵ بارتەقای بێ. لەو بازاڕە کۆنە کە ستوونێکی سەرەکیی ئابووری و پێوەری بارودۆخی سیاسیی ئێرانێ بوو لە ئەنتیکەمەنیی رۆژگارانی کۆنەوە بگرە تا شتی مۆدێرن هەرچییەکی دڵ ئارەزووی بکردایە بە مامڵەت کردنێکی درێژ دەست دەکەوت. موزەخانەی فەرش شایەستەی سەردانێکی تایبەتە. بێجگەلەو هەموو خاڵیە دەگمەنانەی ناوچە جۆراوجۆرەکانی ئێرانی وەک نائین و کاشان کۆمەڵێک کیژۆڵەی جوان جوانیش لەبەر تەونی مافوور دانیشتبوون و لەبەر چاوی بینەران تەونی خۆیان دەکرد. لە هەمووی سەرنجکێشتر هۆڵێکی زۆر گەورە بوو بە رووبەری رەنگە دەیان مەتری چارگۆشە کە یەک دانە فەرشی نایابی زۆر جوان سەرتاپای ئەرزەکەی داپۆشیبوو. باوەڕ ناکەم فەرشی بەو پێوەرە پان لە هیچ شوێنێکی تری دونیادا هەبێ.

کۆشـکەکانی شـا و ئەوانـەی ئەندامانـی بنەماڵـەی شاهنشـاهی لـە خوشـک و براکانییـەوە ئەوانەیـش زۆر بـە جوانـی پارێـزراون هەرچەنـدە کـە ئێمـە لەمـلا و لـەولا دەمانبیسـت گۆیـا لەکاتـی شۆڕشـی ئیسـلامی و بەرەڵلایـی ڕۆژانـی هەوەڵێـدا شـتی زۆر دەگمـەن و گرانبەهـا لـەو پالاسـانە بەتـالان بردرابـوون. کۆشـکی شـازادە ئەشـرەفی خۆشـکە دووانەکـەی حەمـە ڕەزا شـا بەڕاسـتی شـتێکی جـوان بـوو. ئـەو پلیکانـەی کـە لـە نهۆمـی ئـەرزی دەیبـردی بـۆ سـەرەوە هەمـووی لـە بلـووری دوودیودیـار (شـەفاف) دروسـت کرابـوو و شـتێکی سـەرنجکێش بـوو.

سـەرەڕای ئیسـلامە توندڕەوییەکـەی ڕژێمـی جمهـوری ئێرانـی، کەمترایەتییـە ئایینیەکانـی دیکـەی ئێـران، بەهائـی لـێ بتـرازێ، بـە بەپێـی تەعالیمـی دیانەتـی خۆیـان ئـازادی خواپەرسـتیی خۆیان هەبـوو. باخچەکانی شـار لـە ڕۆژانـی شـەممە پـڕ دەبـوون لـە ئیماندارانـی ئایینـی کلیمـی (جـوو) کـە بـە بسـک و کەزییـە درێژەکان و کلاو و پاڵتـۆ ڕەشـەکانیان ئـەو ڕۆژە پشـووەی ئایینـی خۆیـان بـە دیدەنـی یەکتـری دەبـردە سـەر. زەردەشـتیەکانیش ئـازاد بـوون لـە پەیڕەوکردنـی دیانەتـی خۆیـان و ئەمـن چەندیـن جـار سـەردانی ئۆفیسـی نووسـەرێکی بەناوبانگـی زەردەشـتیم دەکـرد (ئاقایـی دکتـر فریـدون جونەیـدی). دکتـۆر جونەیـدی زانیاریـی زۆر نوێـی دەدامـی لەسـەر ئایینـی زەردەشـتی ک پێشـتر نەمدەزانـی و کۆلێـک کتێبیشـی بـە زمانـی فارسـی بـە دیـاری دامـی لەسـەر مێـژووی ئاییـن و زمـان و کولتـور و جەژنەکانـی زەردەشـتیان. ئەمـن کـە خـۆم خولیـای زمانەوانیـم و لەگـەڵ دکتـۆر جونەیدیـا دەکەوتینـە گۆڕینـەوەی بیـر و بۆچـوون لەسـەر زمانـا شـتێکی نوێـم لـێ بیسـت. دەیگـوت " ئاغایـی دزەئـی، خـۆ وشـەی (بەهدینـان)ی ئێـوە لـە نێـوی (بهـا الدیـن) ی عەرەبییـەوە نەهاتـووە بەڵکـو لـە دوو وشـەی زەردەشـتییەوە تێکهەڵکێشـراوە (بـە ە) واتـا بـاش و (دیـن) کـە ئەمەشـیان هـەر زەردەشـتییە عەرەبـی نییـە و هەردووکـی پێکـەوە دەبێتـە ( بـەە دینـان) واتـا (دیـن باشـان) " چونکـە

دەیگوت جاران خەڵکی ئەو هەرێمە هەمووی زەردەشتی بوونە واتا پەیڕەوانی ( دینە باشەکە) بوونە.

خواردنەوەی کحولیش لەناو ماڵی خۆتا چاوپۆشی لێ دەکرا بەڵام لە دەرەوە نا.

بەرلەوەی ئێران بەجێ بێڵم مەحاڵە بتوانم باپاسی جوانیی ژنە ئێرانییان بکەم. ئەمن کە:

"چەندی گەڕام لە شاران نەمدی کەس وەک تۆ جوان بێ" ئەوە کتومت بەسەر ژنە ئێرانییاندا پیادە دەکرێت:

تیرێژی چاو و برۆی رەشی گەشی ژنە ئێرانی یەکسەر دڵت دەپێکێت و رایدەهەژێنێ، لچ و لێو و لووتی سێکسی و رەنگی زەردەسمەری پێستی ساف و لووسی ئارەزوو و حەزت دەبزوێنێ،

بەژنوباڵای لاولاوی و رەفتوڕۆینی بە لەنجەولاری نیگات دەدوێنێ،

لە قسەکردنا بە زمانە فارسییە شیرینەکەی لەرینەوەی دەنگە ژێیەکانی پڕ لە مێیاتی ئاوازی موزیکاڵ و هارمۆنیت بە ناخا دەپرژێنێ،

چێژی بەرز لە هەڵبژاردنی مۆدەی جلوبەرگا مەگەر فریشتە و پەری خۆیان نەخشەی دارشتنی جوانیی ژنە ئێرانیانیان کێشابێ. ئەمن لە دنیادا ژنی زۆر جوانم لەناو زۆر میللەتانی جیاجیادا دیوە بەڵام بە راشکاوی دەیڵێم کە لە روانگەی هونەرمەندی و شاعیریمەوە دڵم لای ژنە ئێرانییان بەجێ ماوە. کورت و کرمانجی ژنە ئێرانی خوێنی شیرینە و وەک مۆگناتیس بۆ خۆیت جەزب دەکا.

## دیوانەکانی عومەر خەیام

جـا بـا بگەڕێمـەوە بـۆ خۆئامادەکردنمـان بـۆ ڤیەنـا. بیـرم کـردەوە دەبێ دیارییەکی شایەستە بۆ دکتۆر هاینتس فیشەر بیەم کە ببوو بە دوو جار دەستی یارمەتـی وەک کوردێـک بـۆ درێـژ کردبـووم. سـاڵی 1975لـە ئەنجامـی هەرەسـەکە بەدەنگمـەوە هـات و ژمارەیـەک کوردی بە پەنابـەر لـە نەمسـا بـۆ وەرگرتـم. ئێسـتاش دیسـان وا ئاسـانکاریی وەرگرتنـی ڤیـزەی نەمسـای بـۆ کـردووم. بیـرم بـۆ دیوانێکـی رباعییاتـی عومـەر خەیـام (بـە چـوار زمـان) چـوو کـە خـۆم دانەیەکـم هـەر لـە مێژبـوو هەبـوو. ئـەو کتێبـە کـە لەزەمانـی شـا لەچـاپ درابـوو لاپـەڕەی هـەر چوارینێکـی بـە هەرچـوار زمانەکانـەوە بـە نیـگاری مینیاتـووری ڕەنگاوڕەنگـی بەڕاسـتی نایـاب نەخشـێندرابوو کـە چیرۆکـی ئـەو چوارینـەی دەگێڕایـەوە. چـووم بـۆ کتێبخانەیـەک بـۆ کڕینـی ئـەو دیوانـە. کابـرای کتێبفـرۆش چەنـد دانەیەکـی جیاجیـای بـۆ هێنـام ئەوهـا نەبـوون کـە مـن پێشـتر دیبوومـن. پێـم گـوت مـن ئـەم دیوانـەم بـە شـێوەیەکی دیکـەی زۆر جوانتـر دیـوە، مـن ئەمانـەم نـاوێ. ئینجـا منـی تـی کـردەوە و پێـی گوتـم دەزانـم تـۆ باسـی چاپـی سـەردەمی شـا دەکەیـت، گوتـی " ئێمـە ئێسـتا قەدەغەمـان لـە سـەرە ئـەو جـۆرە کتێبانـە نمایـش بکەیـن و بیانفرۆشـین چونکـە نیـگاری مینیاتـووری ژنـی سـینگ و مەمـک رووتیـان تێدایـە." گوتـی خۆشـت دەزانـی هەمـوو دیوانەکانـی شـاعیرانی کلاسـیکی ئێرانیـش وەک حافـز و سـەعدی و خەیـام و بابـە تاهیـر و خانـای قوبـادی هەمـووی پـڕن لـەو جـۆرە مینیاتوورانـە. گوتـی ئێسـتاکە حکومـەت خـۆی سـەر لـە نـوێ دیوانەکانیـان لـە چـاپ دەداتـەوە بێ ئـەوەی هیـچ نیگارێکـی مینیاتـووری ژنـی بەروباخـەڵ رووتیـان تیـا بێ. بـەڵام کـە زانـی مـن بێگانـەم و لەسـەر

سەفەرم گوتی بوەستە با شتێکی کەت پێ بڵێم، گوتی "من لە ماڵی خۆم ئەو جۆرە دیوانانەی چاپی سەردەمی شا هەموویم هەڵگرتووە بەیانی وەرەوە دانەیەکت بۆ دێنم بەڵام دەبێ زۆر ئاگادار بیت چاک بیشاریتەوە چونکە لە فڕۆکەخانە لێت بگرن لێت دەگێرنەوە و لەوانەیە لێشت بپرسن لە کوێت کڕیون." بۆ بەیانی دانەیەکی بۆ هێنام بە قەبارەی گەورە (A4) و بەم چوار زمانانە: فارسی، ئینگلیزی، فرانسی، ئاڵمانی. کە چاوم پێ کەوت بەڕاستی حەیرانی بووم لە هەموو رووێکەوە. یەکسەر گوتم دانەیەکی دیکەشم بۆ بێنە چونکە بیرم کردەوە یەکێک بۆ دکتۆر فیشەر و یەکێکیش بۆ خۆم. هەر واشمان کرد. هەڵبەت زانی کە من زۆر پەرۆشی ئەم دیوانەم داوای نرخێکی بەرزی کرد کە هەر یەکسەر قەبووڵم کرد چونکە بۆ من کە دۆلارم پێ بوو هێشتا گران نەبوو.

زۆر بە دڵخۆشییەوە ئەو دوو دانە دیوانەی خەیامم کڕی و لەناو جلوبەرگا زۆر بە چاکی شاردمنەوە. تەلەفۆنیشم بۆ برادەری دێرینی عیراقیم لە ڤیەننا مالک الیاسري کرد جێگایەکمان بۆ بگرێت. ئەویش کە خۆی زاوای خزێرییەکان بوو ئەپارتمانێکی (زەینەب الخضیری) بۆ بە کرێ گرتین لە گەڕەکی دەیەمی ڤیەننا و گوتیشی کە شۆفێرەکەی خۆی دەنێرێ بۆ فڕۆکەخانەی ڤیەننا تا بمانبا بۆ ماڵەکە.

## دیسان کۆنە ڤیەننا

لێسێ پاسێی ئێرانیمان وەرگرت، کە یەک تاکە لاپەڕە کاغەز بوو و وێنەی ئێمە هەر شەشمان پێکەوەی پێوە بوو، هەڵبەتە رووناس و هەردوو کچەکانیشم نازدار و لارا بە حیجاب و جوببەوە.

مانگی شەشی ساڵی 1987 بوو کە دەرچووین و باش بوو لە فڕۆکەخانەش زۆر بەوردی نەپشکێنراین و دیوانەکانی عومەر خەیامم بەسەلامەتی بۆ دەرچوو. لەناو فڕۆکە خێزانێکی تیدابوو، ژن و مێرد و چەند منداڵی وردیش، کە بەکوردی قسەیان دەکرد، بەڵام نەمدەناسین. کە گەیشتینە فڕۆکەخانەی شڤێخات (Schwechat) لە ڤیەننا بینیم فازیلی مەلا مەحمودی رەحمەتی - کە دواتر لەگەڵ دکتۆر قاسملۆ هەر لە ڤیەننا شەهید کران و کۆنە برادەری پێشتریێ ساڵانی ڤیەننام بوو - بەپیر ئەو خێزانە کوردەوە هاتبوو. دەرکەوت پیاوەکە کاک فەوزی برای فازیل بوو و ئیتر لەوێ چاک و چۆنیم لەگەڵ کاک فازیلدا کرد و ئەویش لەگەڵ فەوزیی کاکی و خێزانەکەی بە یەکتریی ناساندین.

شۆفێرەکەی (مالک الیاسري)ی برادەرم هاتبوو و ئێمەی برد بۆ ماڵەکەی، کە مالک لە گەڕەکی دەیەمی ڤیەننا بۆی بەکرێ گرتبووین.

جارێ زوو بە زوو هەرچی پێویست بوو بۆ باری نوێی ژیانمان کە پەناهەندەیی بوو، هەموویمان جێبەجێ کرد و منداڵەکان هەر چواریان لە قوتابخانە دامەزران. بێجگە لەوە، نازدارم بۆ کۆرسی فێربوونی کەمان و لاراش پیانۆ تۆمار کرد، کە هەفتانە چەند جارێک دەمبردن بۆ ئەو کۆرسانە. ناوە ناوەش دەمبردن بۆ ئۆپێرا و کۆنسێرت و بە

تایبەتیش بۆ کۆنسێرتی گرووپی بەناوبانگی منداڵانی ڤیەننا (ڤینەر سێنگەر کنابن Wiener Saenger knaben). جارێکیش هونەرمەندی ناسراوی کوردی باکوور ئیبراهیم تاتلیساز، ئەویش کۆنسێرتی هەبوو لە هۆلی (شتات هالە Stadt Halle) و چووین بۆ ئەو کۆنسێرتە و کۆنسێرتێکی تری زۆر قەرەباڵغی هەوای کراوەش بۆ مایکل جاکسن، کە منداڵەکانی مالک الیاسري (یاسر و طلال) ئەوانیشمان لەگەڵ خۆماندا برد. چووم بۆ پەرلەمانی نەمسا بۆ ئۆفیسی دکتۆر هاینتس فیشەر، بەڵام خۆی لەوێ نەبوو و دیوانەکەی عومەر خەیامم کە وێڕای دیاریکردنی سوپاس و منەتبارییەکی جوانیشم لەسەریدا نووسی، رادەستی بگێڕی ئۆفیسەکەی، دکتۆر فینگەرناگل، کرد.

لە برادەرانی کوردی کۆنی ڤیەننام بەس دکتۆر وریا رواندزی (یادی بەخێر) و دکتۆر کەریم ئاغای پیرۆتی و فازیلی مەلا مەحموودی و ژمارەیەک کوردی سووریا لەوێ مابوون. کاک فوئادی مەلا مەحموودی برای فازیل، کە ئەویش برادەری ساڵانی حەفتاکانی ڤیەننام بوو، بەداخەوە کۆچی دوایی کردبوو و کاک نەوشیروان مستەفای هەر برادەری حەفتاکانی ڤیەننام گەڕابووەوە بۆ ناو خەباتی پێشمەرگایەتی لە کوردستان. شێرزاد ئەمین نەجاریش، کە دکتۆرای لە زانستی سیاسەت تەواو کردبوو، پێم وایە ئەویش کارێکی لە عەرەبستانی سعوودیە دەست کەوتبوو و چووبووە ئەوێ. لە برادەرە عەرەبە عێراقییەکانی ساڵانی پەنجاکانم ژمارەیەکی زۆر هەر لەوێ مابوون، لەناویاندا (مالک الیاسري، ایاد الیاسري، قاسم الگیلاني، باري الشیخ علي، دکتور اسامه حمید، صباح کرندی، عزت عزیز، حمید سعید،..) هەندێکی سووری و ئوردنی و زۆری تریش.

بەڵام زۆر کوردی نوێ هاتبوونە ڤیەننا، کە هەندێکیان هەر خۆم لە ئەنجامی هەرەسەکەی ساڵی 1975 بە ڕێگای دکتۆر هاینتس فیشەرەوە رەزامەندیی پەناهەندەییم بۆ وەرگرتبوون و پێش ئەوەی

ئەوان لە ئێرانەوە بگەنە ڤیەننا، ئەمن بارم کردبوو بۆ لەندەن. هەڵبەت نەمدەزانی کێن ئەوانەی کە ئەو پەناهەندەییەیان بەر کەوتبوو، تا دواتر خۆیان پێیان گوتم. (لە بەشەکانی پێشوومدا بەدرێژی باسی ئەم بابەتەم کردووە).

شارە حەیاتەکەی خۆم ڤیەننا بۆ من نەک نامۆ نەبوو، بەڵکوو وەختە بڵێم لە کوردستان باشتر شارەزای کووچە و کۆڵانەکانی بووم. دوو ریستۆرانتی کوردان لە ڤیەننا کرابوونەوە، یەکێکیان هی کاک نووری دەروێش و ناسکەخانی هاوسەری بوو لە گەڕەکی یەکەمی ڤیەننا لە شەقامی (دۆمینیکانەر باستای Dominikaner Bastei) بە ناوی هێرۆ. ئەمەیان زیاتر کوردانی سەر بە پارتی دێموکراتی کوردستان لێی دادەنیشتن، ئەوی تریان هی شێخ ئەحمەدی سەرگەڵوو بوو، کە داخی گرانم بەم دواییانە کۆچی دوایی کرد. ئەمەشیان کوردانی سەر بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ئاموشۆیان دەکرد و ئاهەنگی نەورۆز و بۆنە و کۆبوونەوەی تایبەتیشیان لەوێ دەکرد. ئەمن وەک ئەندام نە یەکێتی نە پارتی بووم، بەڵام وەک برادەر زۆر زووتر لەگەڵ جەلالییەکاندا دەگونجام، بەو حیسابەی کە هەر لە منداڵیمەوە برادەر و هاوبیری مام جەلال بوویم. لەناو پارتییەکانیشدا لەگەڵ نوێنەری پارتی کاک پیرۆت، کە ئەوسا خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی بوو، بووین بە برادەر. کاک پیرۆت بۆ تەواوکردنی کاروباری پەنابەریمان یارمەتییەکی زۆری دام. ئاشناییمان لەگەڵ کاک کامەران موفتی و کاک سەلام بەرواری و کەسوکاری و زۆری تریش لە کوردانی عێراقی پەیدا کرد. لە کوردانی رۆژهەڵاتیش بێجگە لە کەریماغای پیرۆتیی دۆستی جارانم بووین بە دۆستی کاک میرۆ عەلی یار و جەمیلەخان و کاک قاسمی براکەی و کاک خوسرەوی هەورامیش. لە کوردانی رۆژئاواش کاک هەژاری بنەماڵەی حاجۆ ئاغا و حەنیفەخانی هاوسەری خوشکی کاک سەعید بارزانی.

## شێخ ئەحمەد سەرگەڵوو و ڕێستۆرانەکەی

ڕێستۆرانەکەی شێخ ئەحمەد لە گەڕەکی چواری ڤیەننا بوو، گەڕەکێک کە خۆیشم لە ساڵانی پەنجاکاندا لێی ژیابووم. ئەمن هەرچەندی باسی ئێسک سووکی و قسەخۆشیی شێخ ئەحمەد بکەم هەر کەمە. هەموو گیانی ئەو پیاوە باشە هەمووی نوکتە بوو و زمانێکی زۆر پاراویشی هەبوو لە قسەکردندا. قسەی ئاساییشی بکردایە لەدواییدا هەر بە نوکتە تەواوی دەکرد و لە گێڕانەوەی نوکتەکانیشیدا شەرمی لە کەس نەدەکرد، نە ژن نە پیاو.

ئێواران لای شێخ ئەحمەد تا درەنگانی شەو دەمانکردە گۆرانی و خواردنەوە. ڕووناس و منداڵەکانم دڵیان بە تایبەتی بە ناسینی هەر سێ کچەکانی شێخ حوسێنی خانەقا گێلاس و فاتمە و چراخان خۆش بوو کە لەگەڵ کاک ئەحمەدی برایان و کاکە قالەی ئامۆزایان وەک ئێمە میوانی هەمیشەی شێخ ئەحمەد بوون. کاک خەبات مارف و کاک ئامانجی برای و کاک سەعدی پیرە و کاک عومەر حەمەدی دووگردکانی، ئەمانەش هەموو مریدی خانەقاکەی شێخ ئەحمەدی بوون. ئەمانە و زۆری دیکەش کە وێنەیان وا لەگەڵ ئەم بەشەدا بڵاو دەکەمەوە. جارێکیان دکتۆر کەمال فوئادیش بە سەردان هات و ئێوارە موزیکاڵێکی زۆر خۆشمان لای شێخ ئەحمەد بۆ ساز کرد. بەڵام ئێوارانی هەرگیز لەبیرنەکراوم لە ریستۆرانەکەی شێخ ئەحمەد لەگەڵ شاعیری گەورە شێرکۆ بێکەس دەبوو کە بە سەردان هات و ماوەیەک مایەوە. ئەو بە شیعر خوێندنەوە، من بە گۆرانی گوتن.

چاکم لەبیر نەماوە، ئایا هەر لەگەڵ ئێمە یان دوای ئێمە بە ماوەیەک بوو کە دێدەوانی برازام و ئەحمەد عەدنان عەلی موختاریش کە

پێکەوە لە تارانێ بووین، ئەوانیش گەیشتنە ڤیەننا. ئەمن دوای ئەوەی کە منداڵەکانم لەبەر خوێندن دامەزراند ئینجا دەستم کرد بۆ خۆم بە دوای کارێکدا بگەڕێم. هیچ کارێکی وا بۆ من کە بەکالۆریۆسی زانستی سیاسەتم هەبوو دەس نەدەکەوت. ئەوەی پزیشک، ئەندازیار، کرێکار یان هەر سەنعەتێکی بزانیبا ئەو کاری زووتر دەست دەکەوت لە هەڵگری بڕوانامەی سیاسی. بۆ نموونە کاک عەدنانی ڕەحمەتی کە ئەزموونی لە ئەلەمنیۆمتاشی و دارتاشی هەبوو، زوو کاری دەست کەوت و هەر لەوێ مایەوە، کەچی دێدەوانی برازام کە ئەویش وەک من شارەزاییەکی تەکنیکیی نەبوو ڕۆیشت بۆ ئینگلتەرە و منیش یەک ساڵ مامەوە و چووین بۆ ئەمەریکا.

## هێشتا ڤیەننا

وەک کە ساڵێکی تەواو لە ئێران مابووینەوە یەک ساڵی تەواویش لە نەمساماینەوە. لە ماوەی ئەو ساڵە سێ بۆنەی تایبەت ئێستاش لە کەللەی سەرما وەک نەخشی سەر بەرد هەڵکەنراون. یەکێکیان کۆنفەرانسێکی فیکری گەورەی مافی مرۆڤ لە وڵاتانی عەرەبی کە من هەڵبژێردرام بە سەرۆکی یەکێک لەدانیشتنەکانی بە تایتلی (حقوق الجماعات القومية والدينية في الوتن العربي = مافی کۆمەڵانی نەتەوەیی و ئایینی لە وڵاتی عەرەبیدا). دووەمیان هاتنی مام جەلال بۆ ڤیەننا کە ساڵانێک بوو یەکتریمان نەدیبوو. سێیەمیشیان گوتارێکی درێژم بۆ هەفتەنامەی عەرەبی زمان (التيار الجديد) ی لەندەن نارد کە خاوەن و سەرنووسەری سەعد ساڵح جەبر، کوڕی ساڵح جەبری سیاسەتکاری ناودار و سەرەک وەزیرانی سەردەمی پاشایەتی عیراق بوو، یادیان بەخێر کوڕ و باوک. گوتارەکەم ڕەخنەی توندی لە عەرەب و سەرکردایەتی فەلەستینیی ئەوسای تێدا بوو بەڵام بەڕێز

سەعد کە ساڵی پێشتر لە کۆنفەرانسەکەی ئۆپۆزیسیۆنی عیراقی لە تاراني ببووین بە ئاشنا بەبێ سێ و دوو لێکردن یەک لاپەڕە و نیوی بۆ تەرخان کرد و بۆی بڵاو کردمەوە. بەڵام با جارێ بە کۆنفەرانسەکەی نەمسا دەست پێ بکەم.

کۆنفەرانسی (الندوة الفكرية عن الاعلان العالمي لحقوق الانسان و احوال الوطن العربي)

کۆنفەرانسەکە بە سەرناوی عەرەبی (الندوة الفكرية عن الاعلان العالمي لحقوق الانسان و احوال الوطن العربي) بوو و لە ڕۆژانی 27 - 29 ی مایسی 1988 لە (ئۆتێل کراینەرهوتە Hotel Krainerhuette) ناوچەی (هێلێنن تال Helenental) لە باشووری ڤیەننا بەڕێوە چوو. ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتی فیکری و سیاسی و ڕۆشەنبیری وڵاتانی عەرەبی بەشداریيان تێدا کردبوو. وێڕای نامەیەکی هیواخوازی سەرکەوتن بۆ کۆنفەرانسەکە لەلایەن راوێژکاری پێشووی نەمسا (دکتۆر برونۆ کرایسکی)یەوە {تایبەتی راوێژکار لە نەمسا و ئاڵمانیا بۆ سەرەک وەزیران بەکاردێ} لە میوانانی نەمساویش وەزیری دەرەوی پێشووی نەمسا دکتۆر لانچ Dr Lanc، پرۆفیسۆری پەیوەندییە نێونەتەوییەکان لە زانکۆی ڤیەننا خانم شارلۆت تۆیبەر Charlotte Teuber، پرۆفیسۆری بەراوردکاری سیستەمانی حکومی لە زانکۆی ڤیەننا گیۆرگ هاینریش Georg Heinrich و ئەندامی پارلەمان و سەرۆکی فراکسیۆنی پارتی سەوز لە پارلەمانی نەمسا پێتەر پیلتس Peter Pilz لەوێ بوون.

دانیشتنی پێنجەمی کۆنفەرانسەکە کە تەرخان بوو بۆ بابەتەکەی کە من سەرۆکایەتیم دەکرد کەوتە ڕۆژی یەکشەمەی 1988/5/29. لە هەر دانیشتنێکا چەند شارەزایەکی بابەتی ئەو دانیشتنە بۆیان داندرابوو وتە پێشکەش بکەن ئینجا داوا لە دانیشتووان دەکرا پرسیار و کۆمێنتی خۆیان بکەن و جاروبار دەبووە کێشمەکێشی توندیش لەنێوان بیروباوەڕی جیاجیادا. ئەمن دانیشتنەکەم بە وتەیەک کردەوە

ئینجا داوام لە دوو گوتاربێژەکان کرد بەڕێزان (دکتۆر بورهان غلیون) ی سووری کە ئەمڕۆ پرۆفیسۆری سۆسیۆلۆژی یە لە زانکۆی پاریس 3 و زانکۆی سۆربۆن لە پاریس و دکتۆر فازیل رەسوڵ (فازیلی مەلا مەحمود) وتەکانی خۆیان لەسەر بابەتەکە پێشکەش بکەن. ئەمەی خوارەوە لەلایەن خۆمەوە بۆ کوردی وەرگێڕدراوی وتەی کردنەوە عەرەبییەکەی خۆمە لەو کۆنفەرانسە.

خوشک و برایانی خۆشەویست

بەختەوەرم بە سەرۆکایەتیکردنی ئەم دانیشتنە کە تایبەتە بە پرسی کۆمەڵانی نەتەوەیی و ئایینی لە جیهانی عەرەبدا کە هەر یەک لە برایان دکتۆر بورهان غلیون و دکتۆر فازیل رەسوڵ لەسەری دەدوێن. خۆی بڕیار بوو وتەی سێیەم لەسەر ئەم بابەتە هی بەڕێز سعد الدین ابراهیم بێ بەڵام بەداخەوە ئەو نەیتوانی ئامادە بێ. لەبەر ئەوە ڕێگام بە خۆم دا بەشێکی ئەو والآیە پڕ بکەمەوە کە مامۆستا ئیبراهیم بەجێی هێشتووە و ئەم وشە سادەیە پێشکەش بکەم. داوا لە ئێوەی برایان دەکەم رێدان و تێگەیشتنتان بێ.

لە هیچ یەکێک لە ئێمە شاراوە نییە کە دارشتنی نەخشەی سنوورە سیاسیەکانی ولاتی عەرەبی لەلایەن ئیمپریالیزمی بریتانی و فرانسیەوە لەپاش یەکەم جەنگی جیهانا بەبێ پرسکردن بە عەرەب ئەنجام درا. ئەو نەخشەیە دڵی عەرەبانی سارد کردەوە و پێچەوانەی هیوا و دڵەخوازەی نەتەوەیان بوو بۆ دامەزراندنی نەتەوەیەکی یەکگرتووی عەرەب لەسەر خاکی نیشتمانێکی یەکگرتوو کە لە پرۆسەی جەنگی جیهانا بەڵێنیان پێ درابوو. دیار بوو نەخشەی ئەو سنوورانە بەو مەبەستە کێشرابوو کە سیاسەتی (فرق تسد = دابەشی کە و حوکمی کە) ی ئیمپریالیستی پێ پیادە بکرێت. جا هەڵستان - بە پێچەوانەی بەڵێنەکەیان - لەلایەکەوە چەندین دەوڵەتی عەرەبی جیاجیایان دامەزراند و لەلایەکی دیکەشەوە هەندێ خاکی نیشتمانی نەتەوەیی گەلانی

ناعەرەبیشیان بەو دەوڵەتە ساوایانەوە لکاند کە ئەوانەیش پێشتر وەک عەرەب ویلایەت بوون لەو کۆمەڵە ویلایەتانەی کە ئیمپراتۆراتی عوسمانییان پێک دەهێنا.

بەمجۆرە وای لێ هات کە هەندێ لەو دەوڵەتە عەرەبە نوێیانە نەتەوەیەکی تری ناعەرەبیشیان بە خاکی نیشتمانیی خۆیانەوە لەپاڵ نەتەوە سەرەکیەکە - کە نەتەوەی عەرەب بوو ـ تێ پەسترا. ئەوەی لە خاکی نیشتمانیی ئەو نەتەوە ناعەرەبیانەش مابووەوە ئەوەشیان بەسەر چەند دەوڵەتی دیکەی ناعەرەبیدا دابەش کرد.

لە راستیدا ناوچەی عەرەبی تاکە نموونە نیە بۆ ئەو پلانەی تێکپەستان و تێکهەڵکێشانی چەند نەتەوەی جیاجیا لە ناو یەک چوارچێوەی سیاسیدا. با هەر سەیرێکی سەرپێ یی نەخشەی سیاسی قارەی ئافریکا بکەین دەبینین کە کێشانی سنووری دەوڵەتە نەتەوەییەکانی، بەتایبەتی لەپاش نەمانی فەرمانڕەوایی راستەوخۆی ئیمپریالیزم لە بەرەبەری شەستەکانا، هەر دەڵێی شەکڵی ئەندازەییە وەک چوارگۆشە و لاکێشە و فرەلا (موزەڵلەع) و شتی وا. جا ئەمە تەنها یەک تاکە لێکدانەوەی بۆ هەیە ئەویش کاتێ کە ئیمپریالیستەکان ئەو سنوورانەیان دادەنا بەمەبەست لایەنی ئێتنۆگرافیان پشتگوێ دەخست. لە ئەنجام بینیمان کە گەلان و عەشرەت و تەنانەت بنەماڵەش لێک دابڕێندران و بەسەر دەوڵەتی جیاجیادا دابەش کران. وای لێ هات کە برایەک بە خێزانەوە لەم وڵاتەدا دەژیا کەچی براکەی دی هەر چەند مەترێک بەولا لەودیو سنوور لە وڵاتێکی ترا.

نموونەی دیکەی سیاسەتی (فرق تسد) ی ئیمپریالیست زۆرە وەک نایجیریا، سودان، ئیثیۆپیا، سۆماڵ، عیراق، سوریا، کپرس، کەشمیر، سری لانکا و ئی تریش.

بیجگەلەو نەتەوانەی کە باسمان کردن دەبینین کە هەندێ کەمترایەتی نەتەوەییش هەن کە لە قۆناخی جیاجیای مێژوودا، بە

هۆی جیاجیا کە لێرەدا پێویست بە باسکردنیان ناکات، لە نیشتمانی بنەڕەتیی خۆیان هەڵکەندراون و کەوتنە سەر خاکی عەرەب و لەتەک گەلی عەرەبا دەژین. بۆیە مایەی سەرسوڕمان نیە کە ئەمڕۆ لە هەندێ وڵاتانی عەرەبدا دەبینین تێکقژان و تێکەڵبوونێکی نەتەوە و کەمترایەتی نەتەوەیی و ئایینی جیاجیا لەکەڵ نەتەوە سەرەکییەکە کە نەتەوەی عەرەبە هەیە. جا لێرەدا ئەوەی کە سەرنج رادەکێشێ ئەوەیە کە ڕێژیمی وڵاتە عەرەبییەکان لەکاتێکدا کە نەخشە سیاسییەکەی ئیمپریالیستی بریتانی بۆی داڕشتبوون بە ناڕەوایی و زوڵم و ستەمێکی گەورە دەرهەق بە عەرەب دەزانن کەچی کە پرسی ئەو نەتەوە ناعەرەبانە کە لەگەڵ عەرەبا لە ناو سنوورێکی سیاسی دا دەژین دێتە ئارا ئەوسا هەر هەمان نەخشەی ئیمپریالیستەکان بە ڕەوا و بێ عەیب و زۆر سروشتی دادەنێن.

خانمان، مامۆستایان

لە دوو ڕۆژی بەسەرچوویی، بە تێر و تەسەلی باسمان لە مافی گەلی فەلەستینی کرد. بەڵام زێدەڕۆیی ناکەم ئەگەر بڵێم، کە حاڵی برایانی فەلەستینی لە خاکە داگیرکراوەکانیاندا مایەی بەخیلی پێ بردنە لەلایەن گەلی کورد لە کوردستانی عێراق بەتایبەتی و گەلی عێراق بەگشتی.

لە مێژوودا بۆ یەکەم جار ئەوە کورد بوون کە بە دەستی سەلاحەدینی ئەیووبی فەلەستینیان ئازاد کرد. ئەوە کورد بوون کە دوای دەرکەوتنی ئیسلام گەورەترین دیاریان پێشکەش بە ئومەتی ئیسلامی و نەتەوەی عەرەب کرد.

کورد فەلەستینیان ئازاد کرد و چ حوکمی کوردیشیان بەسەر عەرەباندا نەسەپاند. چ وەک تورکەکانیشیان نەکرد، کە پاشی کوردان هاتن عەرەبیان کردبێتە کۆیلەی خۆیان، هەرچەندە کە حکوومەتەکەی سەلاحەدین بە وەزیر و والی و سەرلەشکرانی سوپاکەی خۆ هەر

هەموویان کورد بوون. سەلاحەدین خیلافەتی ئیسلامیشی لە عەرەبان زەوت نەکرد، وەک کە تورکەکانی پاش خۆی کردیان. تورکەکان خیلافەتی ئیسلامیان لە نەژادی عەرەبی داپچڕاند و بە نەژادی تورکیانەوە لکاند و (دار الخلافة)ی ئیسلامیشیان لە بەغداوە گواستەوە بۆ ئیستانە. سەلاحەدین ئەمانە هیچیانی نەکرد، هەرچەندە کە ئەمە بۆ ئەو پرۆسەیەکی زۆر ئاسانیش دەبوو بیکات، چونکە بووبوو بە سولتانێک کە رۆژهەلات و رۆژئاوا پێناسەیان بە فەرمانڕەوایی ئەو کردبوو. هەروەها زۆر ئاسان دەبوو بۆی ئەوە بکات، چونکە تەختی خیلافەتی عەبباسی لە بەغدایێ لەرزە لەرزی بوو و دەکرا بە خەلیفەی عەبباسی بگوترێ: "پیاوە نەخۆشەکەی سەر گوێ ئاوی دیجلە".

سەلاحەدین لەمانە هیچیانی نەکرد، چونکە ئیمانی بەوە هەبوو کە دەبێ هەر ئومەتی عەرەب گەورەی موسلمانان بن، چونکە ئیمانی بە فەرموودەیەکیش هەبوو کە لە پێغەمبەریان دەگێڕایەوە، گۆیا گوتبووی"الأئمة من قریش".

ئینجا دوای ئەمە هەمووی، سەرکردەیەکی عەرەب لە عێراق هەلدەستێ لەنێوان شەو و رۆژێکدا پتر لە دە هەزار کورد لەناو دەبات، کە هەموویان منداڵ و ژن و پیری بێ دەسەلاتی نەوەی سەلاحەدینی ئەیووبی بوون، ئەو سەلاحەدینەی کە قودسی ئازاد کردبوو. سەرکردەکەی عەرەب ئەم کوشتارە بەشەرییەی بە چەکی کیمیایی کرد، کە گەورەترین تاوان بوو لە مێژووی مۆدێرندا.

ئینجا دوای ئەمە هەمووی، سەرکردەیەکی عەرەب لە عێراق هەلدەستێ لەگەل تورکان - بەزمەکە لێرەدایە لەگەل تورکان - رێک دەکەوێت و رێگایان پێ دەدات بچنە ناو خاکی عێراق و لەوێ لەناو مالی عێراقدا بەدوای کورددا بگەڕێن بۆ نەهێشتنیان، کوردی نەوەی سەلاحەدینی ئەیووبی رزگارکەری قودس.

بەلام هێشتا لە هەمووی سەیرتر لێرەدایە، کە ناوە ناوە

سەرکردەیەکی فەلەستینی - بەڵێ بەڵێ فەلەستینی - دەچێ دەست لە ملی جەلادی کورد و جەلادی عێراقییان دەکات و ئەملا و ئەولای ماچ دەکات، ئەمەش تەنانەت دوای قەسابخانەکەی هەڵەبجە، بێ ئەوەی نقەی رەخنەیەک یان نارەزاییەک لە دەمیدا دەربچێ.

گەلی کوردان لە سەدەی بیستەمیشدا هێشتا وا باجی سەلاحەدین دەدەنەوە، لەسەر ئەوەی کە کورد ئەو خزمەتەی بۆ ئیسلام و بۆ عەرەب کردبوو. دیارە رۆژئاوا هەرگیز ئەوەی لەبیر نەکردووە، کە کورد هەلێکی زێرینی لەدەست دان، کە ئەگەر سەلاحەدین نەبوایە ئەوان لە شەرەکانی خاچداران دەیانتوانی فەلەستین داگیر بکەن و لەوێشەوە تەواوی رۆژهەلاتی عەرەبان بگرن.

خۆ ئەگەر سەلاحەدین نەبوایە، ئەمەی کە پێی دەڵێن (الجزیرة العربیة) ئەمرۆ ناوێکی تری دەبوو، چونکە هەنگی ئەقوامی ئەورووپیی لێ دەژییان، نەک عەرەب.

ئەمرۆ لە سەدەی بیستەمیشدا کورد هێشتا وا باجی ئازادکردنی فەلەستین دەدەنەوە و بۆ ئەوەش ئیمپریالیستەکان - لە تۆڵە - کوردستانی نیشتمانە نەتەوەییەکەیان لێ پارچە پارچە کردوون و گەلەکەشیان لێک ترازاندووە و بەسەر چەند وڵاتێکدا دابەشیان کردوون. عەرەبیش ئەم حاڵەتەی ئەمرۆی کوردان زۆر بە سروشتی و رەوا دەزانن، بە حیسابی خۆیان کە ئەو خاکەی کورد ئێستا لەسەری دەژین، خاکی عەرەبە و کورد لە شوێنێکی دیکەوە بۆی هاتوون.

جا برایانی بەشداربووی ئەم کۆڕە، ئایا هیچ یەکێک لە ئێوە بیستوویەتی، کە لە قۆناغێکی مێژوودا کورد هاتبن و عەرەبیان لە کەرکووک، لە سلێمانی، لە هەولێر، لە دهۆک، لە زاخۆ، لە ئاکرێ، لە رواندز، لە خانەقین، لە هەڵەبجە، لە کۆیە و لە شاری دیکەی کوردان دەرکردبێ؟ ئایا سەرچاوەیەک یان بەڵگەیەکی مێژوویی لەم بارەیەوە لە تەواوی کتێبخانە عەرەبییەکاندا پەیدا دەبێ؟ ئایا کورد

عەرەبی یان عەرەب کوردی لە هەوارگەی خۆیان دەرکردووە؟

ئەمن چاکم لەبیرە، هاوینی ساڵی 1963 بوو، مەفرەزەیەکی حەرەس قەومیی بەعسی بەناو شاری کوردی عێراقی سلێمانیدا دەگەڕا و نەفەرەکان رەشاشەکانیان بەرز کردبووەوە و بە دەنگی بەرز هاواریان دەکرد:

احنا العرب اهل الغيرة

ما نخلي كراد ابهة الديرة

{کوردییەکەی بەم جۆرەیە:

ئێمەی عەرەب غیرەتدارین

کوردان لێرە رادەمارین}

خۆشبەختانە مەفرەزەکە کە لە شار دەرکەوت، یەکسەر کەوتە بۆسەیەکی پێشمەرگە و هەر هەموویان لەناو بردران.

خوشک و براینە،

ئایا ئێوە دەزانن کە بەعس میردمنداڵی کورد ئیعدام دەکەن، پێشتر ناسنامەکانیان لە کەسوکاریان وەردەگرن و دەچن "تەمەنیان بۆ 18 ساڵی درێژ دەکەن" بۆ ئەوەی ئیعدامکردنەکە شێوەی قانوونی وەربگرێت. لەوەش زیاتر تەرمی مێردمنداڵە ئیعدامکراوەکە رادەستی کەسوکاری ناکەنەوە، ئەگەر 15 دیناری عێراقی "تێچووی ئیعدام" نەدەن، ئەگەر ئیعدامکردنەکە بە سێدارە بوو، 300 دیناریش "هەقی گوللەکان" ئەگەر بە (رمي= گوللەباران) ئیعدام کرابێ.

لەکۆتاییدا حەز دەکەم ئەمە بخەمە سەر قسەکانم، کە گەلی کورد لە عێراقی ئەمڕۆدا چاوەڕێی هیچ جۆرێک لە جۆرەکانی مافی مرۆڤ نییە، بەڵکوو تەنیا خوازیاری مانەوەیەتی survival.

بە سوپاسەوە.

ئینجا دوای وتەی کردنەوەکەم، دکتۆر بورهان غلیونم پێشکەش

کرد و دوای ئەویش دکتۆر فازیلی مەلا مەحموودی رەحمەتی. لەناو دانیشتووانی کە تێبینییان لەسەر بابەتەکە هەبوو، وەرامباری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە نەمسا کاک سەعدی ئەحمەد پیرە، هاتە سەر مایکرۆفۆن و بە تێر و تەسەلی باسی پێشێلکردنی مافی مرۆڤی لە عێراق و کوردستان کرد لەلایەن رێژێمی سەدام حوسێنەوە. کاک سەعدی بەیاننامەیەکی (بەرەی کوردستانیی عێراقی)شی بە زمانی عەرەبی هێنابوو، کە تازە دامەزرابوو و بەسەر بەشداربووانی کۆنفەرانسەکەیدا دابەش کرد. بەیاننامەکە بەم سەرناوە بوو (بیان حول انبثاق الجبهة الكردستانية العراقية).

## مام جەلال هاتە ڤیەننا

لە رۆژێکی کۆنفەرانسەکەی هێلێنن تال، لە ماوەی پشووی نیوەڕۆدا، ئەمن لەگەڵ (نوري عبدالرزاق) سەرۆکی (التضامن الاسيوي الافريقي) بارەگا لە قاهیرە وەستابووین، کە مام جەلال لە لەندەنەوە تەلەفۆنی بۆ کرد. بەرێز نوری کە قسەی لەگەڵدا دەکرد، پێشی گوت کەوا منی بەتەکەوەیە، ئینجا مامە تەلەفۆنەکەی لێ وەرگرت و چاکوچۆنیی وەک هەمیشە زۆر گەرمی لەگەڵمدا کرد و باسی کۆنفەرانسەکەیشی لێ پرسیم. ئەمن لەگەڵ بەرێز نوری عەبدالرزاق و لەمیس خانی هاوسەری، لە رۆژانی فێستڤاڵەکەی مۆسکۆ هاوینی 1957بیووین بە ئاشنا و لەوساوە دوای پتر لە 30 ساڵ، ئەوە یەکەم جار بوو لەو کۆنفەرانسە یەکتر ببینینەوە.

جا مام جەلال لەو گەڕانەی بە ئەورووپایدا، کە سەردانێکی ڤیەنناشی کرد، ساڵانێک دەبوو یەکتریمان نەدیبوو و لە برادەرانی یەکیەتیی نەمسای بیستبوو کە من بە خاوخێزانەوە لە ڤیەننایـن. مام جەلالی بەوەفا بۆ برادەرانی ئارەزووی دیدەنیی من و منداڵەکانمی کردبوو.

ڕۆژێکیان کاک سەعدی پیرە و کاک محەمەد تۆفیق و کاکە قالەی خانەقای بەگەڵ خۆی دابوو و هاتن بۆ ماڵەکەی ئێمە لە گەڕەکی دەیەمی ڤیەننا. وەک هەموو جارێ کە لەگەڵ مام جەلالدا یەکتریمان ئەدی، ماوەیەکی خۆشمان بە قسەی کۆن و نوێ و پێکەنین بردە سەر و هەندێ وێنەی یادگاریشمان پێکەوە گرت. لەمیانەی قسەکانمان لێم پرسی: "ئەرێ مام جەلال، ئێستا ئەتۆ جەلالیی یان مەلایی؟" زۆر پێکەنی و گوتی ڕاوەستن با قسەیەکی خۆشتان هەر لەسەر ئەم بابەتە بۆ بگێڕمەوە.

گوتی، نێوانمان لەگەڵ پارتی لەوپەڕی خراپیدا بوو. جارێکیان لەگەڵ هێرۆ خان لە قبرس بووین لە ڕێستۆرانتێکدا نانمان دەخوارد. کابرای گارسۆن هەر هەستی خۆی دەداینێ نەیدەزانی بە چ زمانێک دەدوێین. دواجار خۆی پێ نەگیرا و گوتی ببوورن دەتوانم لێتان بپرسم ئەوە چ زمانێکە ئێوە قسەی پێ دەکەن؟ گوتم کوردی. کابرا یەکسەر گوتی: " ئـــــــــــــــا، بارزانی، بارزانی!".

مام جەلال گوتی هێرۆ زۆری پێ ناخۆش بوو، بەڵام من پێم گوت: "بەخوای هێرۆ، بمانەوێ نەمانەوێ دنیا کورد و شۆڕشەکەی هەر بە بارزانی دەناسێتەوە"، یادیان بەخێر مام جەلال و مەلامستەفا. ئەوەی من پێی بزانم سەرەڕای دووبەرەکی و ناخۆشی و شەڕ و پێکدادانیش لەنێوان هێزەکانیاندا، مەلا مستەفا و مام جەلال مەیلی یەکتریان تا ئەندازەیەک هەر مابوو.

لەو ساڵەی ڤیەننامان 1987-1988 کارەساتەکەی کیمیابارانی هەڵەبجە ڕووی دا. ژمارەیەک لە ژەهراویبووانی هێرشە کیمیاوییەکەیان بۆ چارەسەری هێنابوو بۆ ڤیەننا. ئێمە و کوردانی ڤیەننا زوو زوو سەرمان لێ دەدان و دڵمان دەدانەوە، ئەوانەی کەسوکاریان بووبوون بە قوربانیی هێرشەکە. زۆریان کچ و کوڕی جەوان و جوان بوون، کە ژەهرەکە کاری کردبووە سەر هەناسە و چاویان، بەڵام قسەکردنیان ئاسایی بوو، ئەگەر هەناسەبڕکێ و کۆکە پێی نەبڕیبوان.

ئەمن کە سەرم لێ دەدان و بەو دۆخەم دەبینین دڵم لێورێژ دەبوو لە گریانی بێ دەنگ. شەوێکیان لە ماڵەکەی خۆم دانیشتبووم، خەموخەفەت بۆ هەڵبجە دایگرتبووم و وای لێ کردم بادە بەسەر بادە شەرابی لەعلی رومانی بنۆشم. خەیاڵ فڕی، هەڵی گرتم خستمیە سەر شاپەڕی باڵی خۆی و وەک تایم مەشینەکەی نووسەری بریتانی ئێچ. گی. ویڵز (H.G,Wells,The Time Machine) گەڕاندمیەوە بۆ دواوە، بۆ مێژووی دێرینی کورد و لە خزمەت سەلاحەدینی ئەیوبی دایبەزاندم. بیرم بۆ سوارچاکی و چاکە و پیاوەتیی ئەو شۆڕەسوارە کوردە چوو، کە دەرهەق بە عەرەب و موسڵمانان کردوویەتی و عەرەبیش لە پاداشت وا هەرچی خراپە بە نەوەی ئەوی دەکەن. سیناریۆیەکی شانۆگەریانەم بە خەیاڵدا هات، کە جەنابی سەلاحەدین نامەیەکی کراوەی بۆ عەرەبان بە من سپاردووە بۆی بگەیەنم.

## نامەیەکی کراوەی سەلاحەدینی ئەیووبی بۆ عەرەبان

ئەوە بوو کە هەر ئەو شەوە دانیشتم، نامەیەکی دوور و درێژم بە زمانی سەلاحەدین ئاراستەی گەلی عەرەبان کرد و بۆ بەیانی ناردم بۆ بەڕێز سەعد ساڵح جەبر، خاوەن و سەرنووسەری هەفتەنامەی عەرەبی زمان (التیار الجدید) لە لەندەن. لەگەڵ بەڕێز سەعد، ساڵی پێشتر لە کۆنفەرانسێکی ئۆپۆزیسیۆنی عیراقی لە تارانێ بووبووین بە ئاشنا. سەرەڕای ئەوەی کە نووسینەکەم جۆرێک لە سووکایەتیی تیابوو بە عەرەب، بەڵام دیار بوو بەڕێز سەعد خۆیشی زیاتر لە من لە سیاسەتی رژێمە عەرەبییەکان بێزار بوو، بۆیە نووسینەکەی زۆر بەدڵ بوو و یەک لاپەڕە و نیوی لە هەفتەنامەکەی بۆ تەرخان کرد

و لەگەڵ تێبینییەکی نەریتی رۆژنامەگەرییانە، یەکسەر بڵاوی کردەوە.
ئەمن تا ئێستاش ئەو هەفتەنامەیەم هەڵگرتووە و چون ئەوسا خوێنەرێکی زۆری کورد و عیراقی ئۆپۆزیسیۆن بەدڵیان بوو، وا لێرەدا بۆ خوێنەرە خۆشەویستەکانی ئەمڕۆم کە پێشتر عەرەبییەکەیان نەدیوە، دەیکەم بە کوردی و ئەمەتا فەرموون:

## نامەیەکی کراوە لە سەلاحەدینی ئەیوبییەوە بۆ عەرەبان
## بە بۆنەی کوشتارەکەی هەڵەبجە لە کوردستانی عێراق

{پەیوەست بە پرەنسیپی ئازادیی بیر و بڵاوکردنەوە، وا ئەم نامەیە بڵاو دەکەینەوە، کە بیروڕای نووسەرەکەی دەردەبڕێ}.

بسم الله الرحمن الرحيم

دوای ئەمە، هۆ عەرەبینە..
باوەڕ ناکەم نەزانن، بەڵام رەنگە بشزانن و خۆتان لە گێلی بدەن، کە ئەگەر من نەبوام ئێوە نەدەبوون. یان با بە شێوەیەکی دیکە پێتان بڵێم، کە گەر من نەبوام ئێوە ئەمڕۆ خۆتان لەسەر ئەم ئەرزە پان و بەرینە، کە خۆری لە خەلیج بەسەردا هەڵدێت و لە موحیت لێی ئاوا دەبێت، نەدەدییەوە.
گەر من نەبوام ئەمڕۆ ئێوە لە قوژبنێکی بێ بایەخی نیمچە جەزیرەی عەرەبی گیرتان دەخوارد، کە هەر نێوی عەرەبیشی پێوە نەدەبوو، چونکە لۆژیک قەبووڵی ناکات، تەواوی هەرێمێکی جۆگرافیی وا گەورە بە ناوی کەمترایەتییەکی بچووکی نەتەوەیی بکرێت، کە لە

سووچێکی بچووکی باشوورەکەیدا نیشتەجێ بوون. گەر من نەبوام ئەمڕۆ نەوتی جەزایر و نەوتی لیبی و نەوتی عێراق و سەعودی و کەنداو هیچێکیان مولکی ئێوە نەدەبوو و ژمارەی دانیشتووانتان ئەمڕۆ لە چەند کەم ملیۆنێک پتر نەدەبوو، کە بە خۆتان و حوشتر و دەوارەکانتانەوە لمی بیابانی (الربع الخالي)تان رادەخست. هەنگی، بە هەموو مەزەندەیەک، ئەو نەژادەی کە ئەمڕۆ لە سەردەمی ئێوە، لە شوێنی ئێوە نیشتەجێ دەبوون، رەنگە رێگای بە هەندێ لە ئێوە بدابوا پۆستی (خادم الحرمين الشريفين) لە مەکە و مەدینە وەرگرن و کاری (کلیدار) و (کشوان)یش لە شوێنە پیرۆزەکانی کەربەلا و نەجەفی ئەشرەفدا بکەن و هیچی تر.

خوا نەتانگرێ عەرەبینە..

ئەمن حەز ناکەم ئەوەندە دەستەواژەی (گەر من نەبوام) بەکار بێنم و دووبارەی بکەمەوە. ئەمن بە رەوشتێکی خاکی و سادەیی ناسراوم و مێژووی نەیاران پێش مێژووی یاران ئەم شایەتیەم بۆ دەدەن، بەڵام چی بکەم ناچارتان کردووم بەکاری بێنم و دووبارە و سێبارەی بکەمەوە.

هۆ عەرەبینە..

ئەمن ئازادم کردن و نەمکردن بە کۆیلەی خۆم. ئەمن پێش پتر لە هەشت سەت ساڵ شوێنە پیرۆزەکانم بۆ ئێوە و بۆ موسڵمانان ئازاد کرد و حوکمێکی کوردیم بەسەرتاندا دانەسەپاند، گەرچی حکوومەتەکەی من بە وەزیر و والی و سەرلەشکرانی سوپاکەی تێکڕا کورد بوون. ئەمن بە ناوی ئیسلام حوکمێکی کوردیم بەسەرتاندا دانەسەپاند، وەک کە تورکەکانی پاش من پێی کردن. ئەمن خیلافەتی ئیسلامیم لە بەغدا هەڵنەوەشاندەوە و لە نەژادی عەرەبیم دانەپچڕاند بیدەم بە نەژادی کوردی، وەک کە تورکەکانی پاش من کردیان. خۆ ئەوە بۆ من لە تورکەکان زۆر ئاسانتر دەبوو بیکەم، چونکە مێژوو

گەواهیم بۆ دەدا کە من سوڵتانی بێ ڕکابەر بووم، کە فەرەنگەکان پێناسەیان بە حوکمی من کردبوو و خەلیفەی موسڵمانانیش لە بەغدا پێناسەی بە من کردبوو سەرکردایەتیی موسڵمانان بکەم. خۆ خۆتان باش دەزانن، کە لە زەمانی من خیلافەتی ئیسلامی لە بەغدا مایەی بەغیلی پێ بردن نەبوو و دەکرا بە خەلیفەی موسڵمانان بگوترێ "پیاوە نەخۆشەکەی بەغدا" وەک کە ئێوە لە زەمانی خۆتان نێوی (پیاوە نەخۆشەکەی بۆسفۆر)تان نا پاڵ سوڵتانی عوسمانیی تورک. گەرچی ئەوە کارێکی زۆر ئاسان دەبوو بۆ من بیکەم، بەڵام ئەمن هەرگیز بەبیریشمدا نەدەهات دەست لە خیلافەتی ئیسلامی بدەم لە بەغدایێ، وەک کە تورکەکانی پاش من کردیان، چونکە ئەمن موسڵمانێکی ئیماندار بووم و باوەڕم بە حەدیسی ڕەسول اللە (س) هەبوو کە دەڵێ "الائمة من قریش".

هۆ عەرەبینە:

گەر من نەبوام خۆ ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئافریکای عەرەب و موسڵمان لە زەمانی ئێوەدا بەشێک دەبوو لە ئەورووپای کریستیان و ئێوەش لە سووچێکی (الجزیره العربیه)دا دەپەستێندران و هەنگی ئەو جەزیرەیەش ناوی ئێوەی هەڵنەدەگرت. ئەگەر لێ بگەڕابوام ئەورووپییە کریستیانەکان فەلەستین داگیر بکەن، خۆ ئەوسا تەواوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشیان داگیر دەکرد. وەک خۆشتان دەزانن، ئەوسا دەوڵەتێکی کریستیان لە ناوچەی مووسڵ هەبوو و چاکیش دەزانن، کە تەختی خیلافەتی ئیسلامی لە بەغدا لەرزە لەرزی بوو. بۆیە وا دەبینن کە ئەگەر من نەبواما، ئێوە خۆتان و گەلەکانتان و وڵاتە بە نەوت دەوڵەمەندەکانتان دەبوونە یەک پارووی چەوری فەرەنگان. بەڵام خۆ لێتان شاراوە نییە، کە ئەوە ئەمن بووم ئەو هەلە زێڕینەم لەدەست دان، ئەمن بووم ئەو پاروووە چەورەم لە قوڕگیان دەرهێنا، ئەمن بووم لە دواترین لەحزەدا ئێوەم ڕزگار کرد

و هەر لەپێناو ئێوەشدا بوو پاشەڕۆژی قەومە کوردەکەی خۆم کردە بەلاگیر، چونکە ئەمن باوەڕم بە ئومەتێکی فرەوانتر لە قەومیەتی تەسک هەبوو، کە ئومەتی ئیسلامی بوو.

هۆ عەرەبینە:

ئایا ئێوە دەزانن کە کورد لە سەدەی بیستیشدا هێشتا وا باجی ئەوە دەدەنەوە، کە ئەمن لە سەدەی دوازدەهەمدا بۆ ئێوە و بۆ ئیسلامم کرد؟ ئایا دەزانن کە رک و کینەی جیهانی کریستیان بەرامبەر بە کورد و گوێ پێنەدانیان و چاوپۆشیکردنیان لە مەینەتیی رۆژگارانی ئێوەیاندا رەگوڕیشەی مێژوویی هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی من، کە هەلە زێرینەکەی لەسەرەوە باسم کرد، ئەوەم لەدەست کریستیانەکان دا؟

هۆ عەرەبینە:

ئایا دەزانن ئینگلیزەکان کە لە زەمانی ئێوە ولاتی کوردانیان پچڕ پچڕ کرد و قەومەکەی منیان پەرش و بلاو کردەوە، ئەوە ئەمەیان لە تۆلەسەندنەوە بوو، کە ریچارد شێردلی مەلیکیانم بەزاند Richard the Lionheart و نەمهێشت ولاتی ئێوە داگیر بکات. ئایا دەزانن کە من خاکە پیرۆزەکانم بۆ رزگار کردن و ئێوەش دوای 800 سال هەلستان زۆر پوختە رادەستی جوولەکانتان کرد؟

هۆ عەرەبینە:

ئایا لەبیرتان چوو تورکەکانی پاش من چییان بە ئیسلام و بە ئێوەش کرد؟ ئەوان هەستان خەلیفەی عەباسییان بە کوتەک ناچار کرد دەست لە خەلیفایەتی بۆ سولتان سەلیمی یەکەم هەلگرێت و (دار الخلافة)ی ئیسلامیشیان لە بەغدا گواستەوە بۆ ئیستانە؟ بەم جۆرە عەرەب فەرمانڕەوایی موسلمانانیان لە دەست دەرهات و تورک بوونە گەورەی عەرەبان و تەواوی موسلمانانیش.

عەرەبینە:

بێ گومان لێشتان شاراوە نییە کە ئەو مەینەتەی وا لە سەردەمی خۆتان دەیچێژن، رەگە سەرەکییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی کە ئێلە تورکە دڕە دواکەوتووەکان بۆ ماوەی چەند سەت ساڵ ئێوەیان کردبوو بە کۆیلە و خیلافەتی ئیسلامیشیان لێ زەوت کردبوون.

جا عەرەبینە، دوای ئەمە هەمووی وا دەتانەوێ بەخۆتانی بسەلمێنن، کە ئەو نەخشە جۆگرافییەی ئینگلیز بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی کێشاوە نەخشەیەکی ناسروشتییە و زوڵمی لە عەرەب کردووە. بەڵام هەر هەمان نەخشە بە سروشتی و رەوا و بێ گەرد دادەنێن، کە باسی نەتەوەی کوردی من دەکرێت، کە هەمان ئینگلیز کوردستانە نیشتمانە نەتەوەییەکەیانی لێ پارچە پارچە کردن و بەسەر تورکیا و عیراق و ئێران و سووریا و رووسیایاندا تەخشان و پەخشان کرد. ئێوە هەوڵ دەدەن بەس بۆ کوردان بەرگێکی شەرعی لەبەر نەخشە ئینگلیزییەکە بکەن، بەو بیانوویە کە کەی کورد لەرابردوودا دەوڵەتی هەبووە؟ وەک بڵێی سەعودییەکان و کوێتی و ئیماراتی و فەلەستینی و ئافریکاییەکان و خەڵکی جزر القمر و ئەمریکا و زۆری تریش هەر لەگەڵ یەکەم رۆژی دانانی دونیا دەوڵەتی قەومی خۆیان هەبووە! ئەی خوا نەتانگرێ.

جا دوای ئەمە هەمووی، عەرەبینە، یەکێک لە سەرکردەکانتان سەدام حوسێن - دەک پیرۆزتان بێ ئەو سەرکردە عەرەبە مەردە - دەچێ پەیمانێک لەگەڵ تورکان- بەڵێ بەڵێ لەگەڵ تورکان - مۆر دەکات، کە بەپێی ئەوەوە تورک و عەرەب پێکەوە لە کوردان بدەن، کوردانی نەوەی ئەو سەلاحەدینەی کە ئێوەی ئازاد کرد. هێشتا لەوەش زیاتر، هەر ئەو سەرکردە "عەرەبە مەردە" هەڵدەستێ هەموو شار و دێهاتی کوردان لەگەڵ زەوی تەخت دەکات و دانیشتووە بێ گوناهەکانی بە گازی ژەهراوی کوشندە دەڕشێنێ. هەر تەنها لە شاری

هەڵەبجە ژمارەی کوژراوان بە گازی ژەهراوی گەیشتە پتر لە پێنج هەزار، کە هەر هەموویان شارستانی بوون، هەر لەبەر ئەوەی کە ئێران شارەکەی داگیر کردبوو. باشە گوناهی ئەهلەکە چییە ئەگەر شارەکەیان گیرا؟! باشە ئەدی چۆن بتوانین قسەکانی سەدام حوسێن لەگەڵ کارەکانی پێکەوە بنێین، کە دەیگوت کورد میللەتی خۆمن و دەیگوت ئەو خۆی هەزار جار بۆ ئەو میللەتە دڵسۆزترە تا ئەو کوردانەی کە خۆیان بە سەرکردەی کورد دەزانن. دەشیگوت کورد بەتەواوی لەگەڵ ئەون ( واتا لەگەڵ سەدام) جگە لە مشتێک لە بەکرێگیراو و خائین!

باشە ئایا پێنج هەزار منداڵ و ژن و پیری کوژراو لە هەڵەبجە و پتر لە دە هەزاری تریش لە بریندارانی کەوتووی نەخۆشخانەکان، ئەمانە هەموویان بەکرێگیراو و خائینن؟ ئایا پتر لە هەشت هەزار کوردی نێرینەی لە تەمەنی دوازدە ساڵی بەژوور لە خێڵی بارزانی نەبەرد بەکرێگیراو و خائینن، کە پێنج ساڵ پێشتر بەزیندوویی زەوی قووتی دان؟

هۆ عەرەبینە، دێر یاسین بەو دڵڕەقییە نەکرا. ئەعوزوبیللا جوو لە ئێوە وەحشیتر بن، چونکە ئەمە فەلەستینییەکان خۆیان پێش خەڵکی دی شایەتی بۆ دەدەن. ئەوەی ئەمڕۆ لە کەناری رۆژئاوا و لە شوێنەکانی تری خاکە داگیرکراوەکاندا ئەنجام دەدرێ، مایەی بەغیلی پێ بردنە لەلایەن رۆڵەکانی قەومی من لە عیراقی عەرەباندا. خۆزیا سەدام حوسێنیش مامەڵەی لەگەڵ کوردی کوردستانی عیراقدا بکردایە بە دوو هێندە دڵڕەقی، کە ئیسرائیلییەکان لەگەڵ عەرەبی خاکە داگیرکراوەکاندا دەیکەن. هەنگی کورد مەمنوونی سەدام دەبوون و منیش پیرۆزباییم لێ دەکرد، بۆ ئەو مامەڵە باشەی لەگەڵ کورددا.

بەزمی زەمانە لێرەدایە، کە سەدام حوسێن هێزی جاشی کوردی دامەزراند و ناوی نان "فرسان سلاح الدین" وەک بڵێی گۆیا من بۆ

خزمەتی عەرەب و موسڵمانان خیانەتم لە قەومی خۆم کردبێت و هەر کوردێکی لە سەردەمی ئێوە خیانەت لە قەومی خۆی بکات سەدام ناوی دەنێ "نەوەی سەلاحەدین"، ئەی خوا نەتانگرێ.

ئەرێ عەرەبینە، ئایا ئێوە شتێکی واتان لەبیرە کە کورد رۆژێک لە رۆژان عەرەبی لە ماڵ و هەواری خۆیان لە کەرکووک و ئاکرێ و دهۆک و زاخۆ و ئامێدی و شنگال و هەولێر و سلێمانی و کۆیە و رواندز و هەڵەبجە و خانەقین و و و دەرپەڕاندبێ؟ ئایا تراژیدیایەکی لەم جۆرە لە کتێبە مێژووییەکانتاندا تۆمار کراوە؟ ئەگەر ئەمە کرابێ، ئەوە بە ڕاستی کارەساتێکی ئینسانی دەبوو و دەبووە ماکێکی شەرمەزاری بە ناوچەوانی کورددا. بەڵام سوێندتان دەدەم بە (الغیرة العربیة) کە شانازیی پێوە دەکەن - ئەگەر بە ڕاستی چ غیرەتێتان هەبێ - کێ کێی لەم هەوارانە دەرکردووە و ئێستاش هەر وا دەریان دەکات، کورد عەرەب، یان عەرەب کورد؟

هۆ عەرەبینە،

ئێوە لە کتێبەکانی قوتابخانە منداڵەکانمانتان فێر کرد، کە دێر یاسین کوشتارێک بوو ناکرێ کەسانێک کردبیان بەشەر بووبن.

هۆ عەرەبینە،

سەبرا و شاتیلا هەمووی کوشتاری گەورە بوون، کە عەرەب و موسڵمان و ناموسڵمانیش ناوبەدیان کرد، بەڵام لە زیندانەکانی عیراق، عیراقی عرووبە، عیراقی قادسیەی سەدام، ئەمرۆ لەو زیندانە سامناکانە بە هەزاران کوردی نەوەی من وا بە وەحشیترین شێوە ئەشکەنجە دەدرێن، بە سەدان منداڵی تەمەن لە هەژدە ساڵ کەمتر ناسنامەکانیان لە کەسوکاریان وەردەگیرێن و " تەمەنیان درێژ دەکرێت" بۆ ئەوەی بە تەمەنی قانوونی ئیعدام بکرێن، ئایا هیچ کەسێک لە ئێوە دەنگی شەرمەزارکردنی هەڵبڕی لە دژی ئەوەی کە لە عیراقی سەدام حوسێندا روو دەدات؟ ئەی خوا نەتانگرێ.

عەرەبینە...

قەومی من لە زەمانی ئێوەشدا هەر پابەندی ڕێچکەکەی من بوون و پشتگیرییان لە هەموو پرسە نەتەوەییەکانی ئێوە کردووە. لە هەموو مەینەتییەکانتاندا هاوبەشتان بووین، لە هەموو خۆپیشاندانەکانتاندا لەگەڵتان بووین. چەند کورد بە گوللەی دوژمنی ئێوە کوژراون؟ چەند لاوی کورد فرێ دراونەتە بنەبانی زیندانان، یان ئاوارە و دەربەدەر بوونە، چونکە داکۆکییان لە پرسە نیشتمانییەکانی ئێوە و لە پرسی فەلەستین کردووە؟ چەند شاعیری کورد هەڵبەستی دڵڕفێنی بە زمانی خۆی لەسەر فەلەستین نووسیوە، لەسەر ئەلجەزائیر و جەمیلە بوحەیرەد، لەسەر سوێس و میسر و جەمال عەبدولناسر؟ دواجار لەسەر لوبنانیش. دواتر هیچ یەکێک لەو شاعیرە کوردانە پەنجەی پەشیمانیی نەکرۆشتووە، لەسەر ئەوەی کە نووسیویەتی، وەک کە شاعیری هەرە گەورەی فەلەستین مەحموود دەروێش کردی. ئایا دەزانن کە ئەو شاعیرە قەومییە فەلەستینییە ئینسانییە ویجدانییە پێشتر قەسیدەیەکی زۆر جوانی لەسەر خەباتی گەلی کورد نووسیبوو، کە حاکمە بەعسییەکانی بەغدای تێدا ناوبەد و شەرمەزار کردبوو، لەبەر هەڵوێستی بێ شەرمانەیان بەرامبەر بە کورد؟ ئایا دەزانن کە هەر خودی ئەو شاعیرە خۆی پاش ماوەیەک و پاش ئەوەی کە لە چەند بۆنەیەکی ئەدەبیاتدا حکوومەتی بەغدا بانگهێشتی دەکرد، هەڵستا دیوانێکی شیعرەکانی لە چاپ دا و لە پێشەکیی دیوانەکەی نووسی، هەر شیعرێکی کە لەم دیوانەدا نەبێ ئەوە شیعری ئەو نییە و ئەو لێی بێ بەرییە! هەڵبەت قەسیدەکەی کە لەسەر کوردی دانابوو، لەو دیوانەیدا نەبوو!

هۆ عەرەبینە، هۆ گەلی فەلەستینی بە شێوەیەکی تایبەت،

هانا وەبەر هەموو دونیا دەبەن، لەناویاندا کوردیش، بۆ پشتیوانیکردن لە پرسەکانتان، بەڵام لاریتان لەوە نییە حاکمەکانی بەغدا لە ئامێز

بگرن و ماچ و مووچیان بکەن، لەپێناو بەرژەوەندیی پرسەکانی خۆتان (وەک خۆتان ئیدیعا دەکەن). باشە ئایا ئەم پرەنسیپە لەسەر میللەتانی تریش پیادە دەکرێ؟ بۆ نموونە، ئایا کوردیش ئەو مافەی هەیە حاکمانی تەل ئەبیب لە باوەش بگرن و ماچ و مووچیان بکەن، ئەگەر بینییان بەرژەوەندیی پرسی میللەتەکەیان لەوەدایە - ئەمە تەنیا گریمانە - و ئایا ئێوە لەو حاڵەتە چ بە کوردان دەڵێن؟

گەلی فەلەستین، دەک شەرمەزار بن !

کورە کەمێک چاکەی ئەوانەتان لەبەرچاو بێ، کە لە رابردوودا ئێوەیان ئازاد کربوو. خۆ کورد هیچی وای لە ئێوە داوا نەکردووە، زیاتر لە دەربڕینی پرۆتێستۆیەک، نارەزاییەک، یان هەر چەشنێک لە چەشنەکانی پشتگیریی مەعنەوییش بێ بەرامبەر بەوەی کە جەلادی بەغدا لەگەڵیان دەکا. ئێمەی کورد، وەک پێشتریش باسم کرد، بە کەم شتیش رازین. یاسر عەرەفاتی (نوێنەری شەرعیتان) لە باوەش پیاکردن و راموسانی سەدام حوسێن تێر نابێ. ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە سیفەتی بێ وەفایی، سیفەتی چاکە لەبەرچاو نەگرتن، سیفەتێکە لە خوێنی عەرەباندایە و بەشێکە لە سروشت و رەوشتیان؟

گەلی فەلەستین، دەک شەرمەزار بن !

کەمێک وەفا بۆ ئەوانەی چاکەیان لەگەڵتانا کردووە. شۆڕشی ئیسلامی ئاڵای ئیسرائیلی کە بەسەر باڵاخانەیەکی ناوداری شاری تاراندا دەشەکایەوە دابەزاند و جینگوڕ بە جینگوڕی کرد و ئاڵای فەلەستینی لە شوێنی داچەقاند. چەند خیابان، مەیدان، چوارڕیان، چەند یەکەی سوپای جمهووری ئیسلامیی ئێران ناوی نەتەوەیی و نیشتمانیی فەلەستینییان لێ نرا. زمانی عەرەبی لەبەر ئەوەی کە زمانی قورئانە لە دەستووری ئیسلامیی نوێدا کرا بە زمانی دیوانی (رەسمی) ی دووەم شان بەشانی زمانی فارسی لە هەموو قۆناخەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی. هەروەها پتر لە چل ملیۆن ئێرانیی

موسڵمان ئامادەیان پیشان دا، بکشێنە سەر قودسی داگیرکراو.

ئەمە هەمووی لە کاتێکدایە کە ئێوە بە رێگای "نوێنەرە شەرعییەکەتان" یاسر عەرەفات تا بناگوێتان نوقمی چاوبازین لەگەڵ سەدام حوسێن، سەدام حوسێنێک کە بەپێی پلانێکی ئیمپریالیستی ئەم رۆڵەی پێ سپێردراوە، بزووتنەوەی کورد لە کوردستان و بزووتنەوەی ئیسلامیش لە ئێران لەناو بەرێت، کە - ئەگەر ئێوە تێی بگەیشتبوان- خۆ ئەو بزووتنەوە ئیسلامییە هەر لە بەرژەوەندیی عەرەبدا دەبوو، بەو حیسابەی کە عەرەب سەرکردەی ئیسلامن، چونکە هەردوو میللەتی کورد و فارس بەوە ناسراون کە لە عەرەبی موسڵمان "کوچک لە ئاگر گەرمترن" بۆ ئیسلام و لە عەرەبی موسڵمان زیاتر داکۆکی لە ئیسلام دەکەن.

ئەمە هەمووی و " نوێنەرە شەرعییەکەتان" یاسر عەرەفات دەڵێ کە رفاندنی فڕۆکە کوێتییەکە بەم دواییانە بە فیتی ئێران بووە. خۆ چاکیش دەزانێ کە پیاوەکانی سەدامی برای، بە ئامۆژگاریی ئیمپریالیستە ئاغاکانی ئەم رووداوەیان لە کاتێکی وەها دیاریکراوا ئەنجام داوە، تا سەرنجی رای گشتیی جیهان لە کوشتارە بەشەرییە سامناکەکەی هەڵەبجە و هەوڵی قەلاچۆکردنی شاری هەڵەبجەی کوردان و جینۆسایدکردنی کورد لە کوردستان لەلایەن قارەمانی عرووبە و نەوەی ئال ئەلبەیت سەدام حوسێنەوە (لعنة الله علیە) بگوازنەوە بۆ لایەکی تر.

فخلف الله علیکم یا عرب

و خلف الله علیکم یا شعب فلسطین

و وا محمداه! وا اسلاماه!

یوسف بن ایوب صلاح الدین

ڤیەننا هومر

تەواو بوو

ئەو سـاڵەی ڤیەننامـان ( 88 - 87) لەگەڵ بـرادەرە عیراقییە دێرینەکانم و چەنـد خێزانێکـی کـوردی کـە لـە ناوەڕاسـتی حەفتاکانـدا خـۆم پـردی پەناهەندەیـان بـووم لـە نەمسـا و بـەو بۆنـە مێژوویانـەش کـە پێشـتر باسـم کـردن زۆر بـە خۆشـی وشـادی بردەسـەر. بەڵـی راسـتە کـە ئێمـە خۆشـمان پەناهەندەییمـان لـە نەمسـا وەرگـرت و منداڵەکانمـان لـە قوتابخانەکانیانـدا زۆر دڵخـۆش بـوون ، راستیشـە کـە مـن وەک جـاری جـاران ئاشـقی ئـەم شـارەی موزیـک و شـەراب بـووم بـەڵام بێـکاری تەنـگاوی کردبـووم، ئـەو پـارەی کـە هەمبـوو خەریـک بـوو چکـی دەکرد.ئێمـە شـەش سـەرخێزان بوویـن. هەوڵـی زۆرم دا کارێ بدۆزمـەوە سـەری نەگـرت، تەنانـەت چووم بـۆ کۆمپانیایەکـی توریـزم بەڵکـو بـەو هەمـوو زمانانـەی کـە دەیانزانـم و کـون بـە کونیـش شـارەزای ڤیەننـا بـووم کـە وەک (گایـد guide = رێنـاس) توریسـتەکان بەنـاو شـار و ئاسـەوارە مێژووییەکانـدا بگێـڕم و بـە چەنـد زمانێـک بۆیـان روون بکەمـەوە، ئـەوەش نەبـوو. ناچـار لەگـەڵ منداڵەکانمـان بیرمـان کـردەوە دیسـان سـەری خۆمـان هەڵگریـن ئەمجـارە بارکەیـن بـۆ بنـی دونیـا، بـۆ ئەمەریـکا ، هەرچەنـدە کـە مـن دونیـای کۆنـم زۆر لـە دونیـای نـوێ لا جوانتـر و خۆشـتر بـوو.

ژیـان قـەرەج ئاسـاکەی جارانـم دیسـان لـە دەرگای کەللـەی سـەرمی دا. چـووم بـۆ باڵیۆزخانـەی ئەمریکـی لـە ڤیەننـا هـەر دەرگاشـیان لـێ نەکردمـەوە. بیـرم بـۆ دیپلۆماتێکـی ئەمریکـی ( ولیـەم ئیگلتـن William Eagleton ) چـوو کـە دۆسـتێکی کۆنـی چەنـد ئامۆزایەکـی دزەییـم بـوو لـە سـاڵانی پەنجاکانـدا لـە کەرکـووک. ئەوسـا ئـەو لـەوێ سـەرکاری مەڵبەندێکـی کولتووریـی ئەمەریکـی بـوو و دۆسـتی کاک موحسـینی براشـم بـوو. میسـتەر ئیگلتـن دواتـر بـوو بـە باڵیـۆزی ئەمەریـکا نازانـم لەکـوێ. سـۆراخ بـە سـۆراخ زانیـم کـە ئێسـتا باڵیـۆزی ئەمەریکایـە لـە شـام. پێشـتر ئەمـن خـۆم نـە بینیبـووم نـە دەمناسـی تەنیـا ناوبانگیـم لـە بـرا و خزمەکانـم بیسـتبوو. بیـرم نەمـاوە ئەگـەر لـە پێشـتری ئـەم بیرەوەریانـە

ئەم باسەم گێڕابێتەوە بەڵام بە کورتی: ژمارەی تەلەفۆنی باڵیۆزخانەی ئەمریکیی دیمەشقم پەیدا کرد و ڕۆژێک زەنگێکم بۆ لێدان. کچێک وەرامی دامەوە تێم گەیاند من کوردی عیراقم، دزەییم و خزم و برای فلان و فیسارم و دەمەوێ لەگەڵ جەنابی باڵیۆزا قسە بکەم. پێشم گوت کە ئەو من ناناسێ بەڵام برا و کەسوکار و خزمێکی زۆرم دەناسێ. ماوەیەکی کورت بەبێ دەنگی رایگرتم ئینجا گەڕایەوە لام و گوتی فەرموو جەنابی سەفیر لەگەڵتایە. بەڕاستی چاوەڕێم نەدەکرد ئەوەندە رووخۆش بێ لە گەڵما و باس و خواسی کاک موحسینی برام و هەموو خزمە عەشایرییەکانی دزەیی یەکە یەکە، بە ناو، لێ پرسیم وەک هاوار ئاغا، تەلعەتی مشیر ئاغا، حەمەدەمینی قادری پاشای، عومەری عەلی ئاغا، فارسی عەلی ئاغا و زۆری تریش کە بەڕاستی پێم سەیر بوو ئەو هەمووەی دەناسین و لەبیری نەکردوون. خولاسە، سەر و سەربردەی خۆمم و خێزانم بۆ گێڕایەوە و داوام لێ کرد یارمەتیم بدات ڤیزەی مهاجیریمان بدەنێ بۆ ئەمەریکا. گوتی ئەدرەسی ڤیەننای خۆتم بۆ بەجێ بێڵە هەوڵ دەدەم شتێکت بۆ بکەم.

چەند رۆژێ دواتر نامەیەکی بۆ ناردم داوای لێ کردم بچم بۆ باڵیۆزخانەی ئەمەریکا ناوی ئەو بدەم ئەمجارە دەرگام لێ دەکەنەوە و قسەم لەگەڵدا دەکەن. هەر واشمان کرد و با لە کورتی بیبڕێنمەوە: ئەمجارە لە باڵیۆزخانە هەڵوێستێکی زۆر دۆستانەیان لەگەڵمدا هەبوو. ئێمەیان نارد بۆ ڕێکخراوێکی خێرخوازیی ئەمەریکی لە ڤیەننا و لەوێ هەموو کاروباری ڤیزەیان بۆ تەواو کردین و بلیتی فڕۆکەشیان لەسەر حیسابی خۆیان بۆ بڕین. بەڵام گوتیشیان کەی لە ئەمەریکا کارتان دۆزییەوە هەنگی پارەی بلیتەکانمان بە مانگانەش بێ بدەنەوە. دواتر کە لە ئەمەریکا کاریشم دەست کەوت هەر نەمدەتوانی قەرزەکەیان بدەمەوە چونکە بۆ بەخێوکردنی شەش سەر خێزان چ پارەی وا نەدەما بیاندەمەوە و ئەوانیش ئەمەیان دەزانی بۆیە چاوپۆشییان لێ کرد و

لەبیر کرا. بەڵام لە ڤیەننا داوایان لێ کردین دەبێ سپۆنسەرێکمان لە ئەمەریکا هەبێ تا لە سەرەتای گەیشتنمان یارمەتیمان بدات بۆ تەواوکردنی کاروباری نیشتەجێ بوون و پەنابەری. شێخ مەسعود بەرزنجی خاڵۆزام لە ویلایەتی ڤیرجینیای ئەمەریکا بوو. بەڵام ئەو پێشتر سپۆنسەراتی پەنابەری کوردی تری کردبوو و بۆی نەبوو ئی خەڵکی دیکەش بکات. حەنیفە خانی هاوسەری کاک هەژاری حاجۆ ئاغا کە لەو ماوەیەی ڤیەننامان بیووین بە برادەر گوتی من تەلەفۆن بۆ سەعید بارزانی برام دەکەم لە ڤیرجینیایە با ئەو سپۆنسەریتان بکات. هەر واشی لێ هات و مانگی شەشی ساڵی 1988 گەیشتینە ویلایەتی ڤیرجینییای نزیک واشنتن. بۆ ماوەی مانگ و نیوێک لە ماڵی شێخ مەسعودی خاڵۆزام میوان بووین تا خانوێکمان لە شارۆچکەی ڤێرفاکس Fairfax لە شەقامی Ford Road بە کرێ دۆزییەوە. ئەمن هەمیشە خۆم بە قەرزاری شێخ مەسعود و جەمیلە خانی هاوسەری ( یادیان بە خێر هەردووکیان) و بە هی کاک سەعید بارزانی دەزانم کە لە یەک دوو مانگی هەوەڵی ئەمەریکامان یارمەتیی زۆریان داین. منەتباری حەنیفە خانی خوشکی کاک سەعیدیشم کە هەر لە ڤیەنناوە ڕێگاکەی بۆ خۆش کردین.

مەحموداغای کاکە زیادی کۆیە (چەپ) لەگەڵ
دکتۆر خالید سەعید

کەسایەتی ناوداری کورد کاکە زیادی حەماغای کۆیە
(1914 - 1991)(و دلارام خانی هاوسەری(1927 - 1997)
دلارام خان ئامۆزای کافیە خانی دایکی هۆمەر دزەیی بوو

مەحمودلغای کاکە زیادی کۆیە لەگەڵ کاک
ئیدریس بارزانی

کاکە زیادی حەماغای کۆیە لەگەڵ هوشیاری
کوڕی لە لەندەن

مەحموداغای کاکە زیادی حەماغای کۆیە (چەپ) (1931
- 2012) لەگەڵ شەفیق ئاغای حەوێزی

کەسایەتی ناوداری مێژووی کورد حەماغای کۆیە
1920 - 1840

له چەپەوە: سەمەد بەننا (ناسراو بە سەمەد مەنجەڵ)، کاکە زیادی کۆیە، شێخ ڕەئوف خانەقا، سابیر ئیسماعیل، مەسعود محەمەد (مەسعودی مەلای گەورە) لە بەغدا

لە ڕاستەوە: کاکە زیادی کۆیە، موحسین دزەیی (برای هۆمەر)، ئاراسی کاکە زیادی، شێروانی موحسین دزەیی لە لەندەن

هاوسەری یەکەمی کاکەزیادی ، شازادەی بنەماڵەی خانەدانی حەوێزی و غەفوورییان، خاتو خێریە خانی کەریم ئاغای دایکی مەحموداغای کاکەزیادی (1979 - 1912)

کاکە زیادی کۆیە و دلارام خانی هاوسەری و ئاراسی کوڕیان لە ئینگلتەرا

ئەولادی حەمەدەمیناغای دزەیی، لە چەپەوە: هۆمەر، دکتۆر ئەنوەر، قەدریە خان، موحسین، سەعدی لە کۆڵن 2015

ئاهەنگێکی نەورۆزی 1946 لە هەولێر: دوو منداڵەکەی پێشەوە ئەوەی دەستە راست هۆمەرە و منداڵەکەیدیش جەمال خەزنەدارە و پیاوەکەی هەرە دەستەڕاستیش کاک ئەنوەری کاکیەتی کە سەرپەرشتی تیپەکەی دەکرد

هۆمەر لەسەر گڵکۆی تازەی کاکە ئەنوەری برای لە گۆڕستانی دووگردکان

دکتۆر ئەنوەر دزەیی و فائیزەخانی هاوسەری و سالاری کوڕیان

له راستەوە: دكتۆر ئەنوەر دزەیی، فائیزە خانی هاوسەری، كاک ئەحمەد دزەیی براگەورەمان

دكتۆر ئەنوەر دزەیی و فائیزە خانی هاوسەری

تیپی فوتبۆلی هەولێر 1945 ، دانیشتوانی پێشەوە ئەوەی دەستەچەپ ئەنوەر دزەیی

له ڕاستەوە: دكتۆر ئەنوەر دزەیی، هۆمەر دزەیی برا بچووكی و كاک ئەحمەدی برا گەورەمان، بەغدا 1950

دكتۆر ئەنوەر دزەیی و فائیزەخانی هاوسەری و سالاری كوڕیان

برایان کاک ئیدریس و کاک مەسعود بارزانی

هاوکار و برادەری دێرینم لە سالآنی رادیۆی دەنگی کوردستان لە ئەشکەوتی گردەڕەش ئەحمەد دەشتی

لە چەپەوە: دێدەوان دزەیی برازای هۆمەر، هەردی هەڵۆ دزەیی برازای دێدەوان، ناسک دزەیی هاوسەری دێدەوان

لە ماڵی دکتۆر جەعفەر لەتاران لە راستەوە: هۆمەر دزەیی مینا کچی هادی رەحمانی، دکتۆر جەعفەر رەحمانی، کۆچەر کوڕی هۆمەر، روناس هاوسەری هۆمەر ، شەهرەزاد هاوسەری هادی ، نایناسم. ساڵی 86 یان 87

جوانەمەرگ ئەحمەد عەدنان عەلی موختار (یادی بە خێر)

دێدەوان دزەیی برازای هۆمەر

لە چەپەوە: دکتۆر جەعفەر کەریم رەحمانی، هۆمەر دزەیی، هادی کەریم رەحمانی، لە ماڵی دکتۆر جەعفەر لە تاران 86 یان 87

هۆمەر دزەیی لەنێوان دوو برادەری دێرینی عیراقی لە ڤیەننا، دکتور باري الشيخ علي لە راستا و مالک الیاسري لە چەپا

نووسەر و وەرگێڕ و لێکۆڵەر جەرجیس فەتحوڵا

هۆمەر دزەیی و برادەری دێرینی ڤیەننای دکتۆر أياد الياسري

وێنەیەکی گشتی شێرکۆ بێکەس و هۆمەر دزەیی لەگەڵ کۆمەڵێک لە کوردانی ڤیەننا

لە ریستۆرانەکەی شێخ ئەحمەد لە راستەوە: فازیل رەسول (فازیلی مەلا مەحمودی) هۆمەر دزەیی ، شێرکۆ بێکەس، ڤیەننا 1987 یان 88

له ریستۆرانەکەی شێخ ئەحمەد لە چەپەوە: شێرکۆ بێکەس، هۆمەر دزەیی، خەبات مارف، وریا سەعاتچی

Ort und Datum der Geburt / Place and date of birth: Arbil, 11. November
Beruf / Occupation: Journalist
Derzeitiger Wohnort / Present residence: Wien
Mädchenname und Vorname(n) der Ehegattin * / * Maiden name and forename(s) of wife
Name und Vorname(n) des Ehegatten * / * Name and forename(s) of husband
Personsbeschreibung
Körpergröße / Height: 170 cm
Haare / Hair: grau
Farbe der Augen / Colour of eyes: braun
Nase / Nose: gerade
Gesichtsform / Shape of face: rund
Gesichtsfarbe / Complexion: weiß
Besondere Kennzeichen / Special peculiarities: keine
Kinder in Begleitung des Dokumenteninhabers / Children accompanying holder

Lichtbild des Dokumenteninhabers und Stempel der ausstellenden Behörde
Photograph of holder and stamp of issuing authority

پاسپۆرتی پەنابەریم لە نەمسا

لە چەپەوە: نایناسم، شێرکۆ بێکەس، هۆمەر دزەیی، فازیل مەلا مەحمود، شێخ ئەحمەد سەرگەڵو

پرۆفیَسۆر دکتۆر بورهان غلیون

یەکەم سەرۆکی ئەنجومەنی نەتەوەیی ئۆپۆزیسیۆنی سوریا دکتۆر بورهان غلیون لە نێوان عبد الباسط سەیدۆ (لە چەپا) و محمد فاروق طیفور(لە راستا).

یاسر عەرەفات و سەدام حوسێن

سەعدی ئەحمەد پیرە

دکتۆر فازیل رەسوڵ (فازیلی مەلا مەحمود)

لە چەپەوە: لەمیس هاوسەری نوری ، نوری عبدالرزاق ، دارا تۆفیق ، عیراقییەک ، نەجیب خەفاف ، عیراقییەک ، دانیشتووەکە هۆمەر دزەیی ،مۆسکۆ تەمووزی 1957

لەچەپەوە: سەعدی پیرە، دێدەوان دزەیی ، مام جەلال ، هۆمەر دزەیی ، عبد القادر خانەقا ، حەمە تۆفیق لە خوار ماڵەکەی من لە ڤیەننا 1988

لە پێشەوە: هۆمەر دزەیی، مالک الیاسري، طارق عباس لەسەر دیوارێکی داڕماوی کاولەزیندانەکەی ڕیچارد شێردڵ لە شارۆچکەی دورنشتاین لە نەمسا ساڵی 1957

ویلیەم ئیگڵتن لەنێوان دوو برا: عومەری عەلی ئاغای دزەیی (ڕاست) و فارسی برای (چەپ)، لە گوندی قەیران دەشتی کەندێناوا سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو

ویلیەم ئیگڵتن و دوو کوڕی لەگەڵ هۆمەر دزەیی و ڕوناسی هاوسەری لە ئەمریکا لە سەرەتایی نەوەتەکانی سەدەی ڕابردوو

ماڵەکەی هۆمەر دزەیی لە شارۆچکەی فێرفاکس ویلایەتی ڤیرجینیا نزیک واشنتون، ئەوەی ناو ئۆتۆمۆبیلە سپۆرتەکەشە لارای کچی هۆمەرە

هۆمەر دزەیی و شێخ مەسعود بەرزنجی خاڵۆزای لە ئەمەریکا

شای ئینگلیز ڕیچارد شێردڵ کە بە چل و یەک ساڵی کۆچی دوایی کرد

لە لوتکەی شاخەکە کاولە زیندانی شارۆچکەی دورنشتاین لە نەمسا کە ڕیچاردی لێ دەستگیر کرابوو دوای گەڕانەوەی شکست خواردووی لە شەڕی سەلاحەدین بۆ گرتنی قودس

ئارامگای شای ئینگلیز ریچارد شێردڵ لە شاری رووان هەرێمی نۆرماندی لە فەرەنسا

سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی

ئارامگای سەلاحەدینی ئەیوبی لە شام کە
مێزەرەکەی لەسەر گۆڕەکەی دانراوە

سەلاحەدین گەیشتە ئۆرشەلیم (قودس)

کۆڤاری (تایم) گوتارێکی لەسەر
سەلاحەدین نووسیبو بە
سەرناوی: سەلاحەدینی ئینسانی
و دڵباش. ئەم وێنەشی دانابوو کە
سەلاحەدین بە یەکچاو تەماشای
دیان و موسڵمانی کردووە

شای ئینگلیز ریچارد شێردڵ ، موزەخانەی
مەدام تیسۆ لە لەندەن

کتێبێک بە ئینگلیزی بە ناوی: سەلاحەدین و
کەوتنی ئۆرشەلیم (قودس)

کتێبێک بۆ منداڵان لەسەر سەلاحەدین بەم سەرناوە: سەلاحەدین، میرە خانەدانەکەی ئیسلام

کتێبێک لەسەر سەلاحەدین بەم سەرناوە: سەلاحەدین ، ژیان، ئەفسانە، ئیمپراتۆراتی ئیسلامی

Mr. Omar Dizeyee
c/o Mr. Shawkat
57135 Oroumieh, Postbox 435
W. Azerbaidjan
The Islamic Rep. of IRAN

PRI/vb 23.10.1986

Dear Mr. Omar Dizeyee,

On behalf of Mr. Poul Risum Hansen I have promised to write to you to tell you that your letter has reached Poul Risum Hansen.

Mr. Poul Risum Hansen is now stationed in Nigeria but got your letter during a short stay in Denmark in September. Mr. Hansen has now returned to Nigeria and has the following address

Mr. Poul Risum Hansen
GRUNDFOS PUMPS (NIG) Ltd.
6 B Ahman Pategi Road
Kaduna
Nigeria
Phone no. 62-21 75 32
Telex no 71363 gfos ng

Mr. Hansen has asked us to try to help you and we shall contact the various organizations in Denmark to know which possibilities we have.

We hope to be able to revert very soon with news.

Yours sincerely,

On behalf of Mr. Poul Risum Hansen

نامەی کۆمپانیای گروندفوسی دانیمارکی لە کۆپنهاگنەوە بۆ هۆمەر لە ئێران
لەبارەی ڤیزە بۆ دانیمارک 23\10\1986

دیوانی عومەر خەیام
کە لە تاران بە نهێنی
بردمە دەرەوە

حەمە رەزا شا و شازادە ئەشرەفی خوشکە دووانەکەی

لێکۆڵەر و نووسەری زەردەشتی دکتۆر فەرەیدون جونەیدی

موزەی فەرش لە تاران، ئەوەی ڕاخراوە یەک مافوورە

کۆشکی گولستان لە تاران

هۆتێل کراینەرهوتە لە ناوچەی هێلێننتال لە باشووری ڤیەننا شوێنی کۆنفەرانسەکە بوو

واحوال الوطـــن العربي

٢٧-٢٩ مايو/مايس ١٩٨٨
(Helenental - Krainerhütte)

قائمة بأسماء المشاركين في الندوة

لیستەی بەشێک لە بەشداربووانی
کۆنفەرانسەکە، ژمارە 20 هۆمەرە (عمر دزي).

الندوة الفكرية عن :

الاعلان العالمي لحقـوق الانسان
واحوال الوطـــن العربي

٢٧-٢٩ مايو/مايس ١٩٨٨
(Helenental - Krainerhütte)

تحية من السيد برونو كرايسكي
المستشار النمساوي السـابق

الدكتـور

برونو كرايسكي

نامەی راوێژکاری پێشووی نەمسا دکتۆر برونۆ
کرایسکی بۆ ۆنفەرانسەکە

# بيان

# حول انبثاق الجبهة الكردستانية العراقية

ياجماهيرنا المناضلة !

شعورا بالمسؤولية التاريخية تجاه مصير شعبنا الكردي وقضيته العادلة ، وادراكا لمستلزمات النضال الظافر لتحشيد اوسع طاقات وامكانات شعبنا ، اجتمعت الاحزاب المناضلة على الساحة الكردستانية : الحزب الاشتراكي الكردي (پاسوك) ، الاتحاد الوطني الكردستاني ، الحزب الشيوعي العراقي ، حزب الشعب الديمقراطي الكردستاني ، الحزب الاشتراكي الكردستاني-العراق والحزب الديمقراطي الكردستاني-العراق في اواخر نيسان-اوائل ايار/١٩٨٨ وتدارست سبل العمل لتوحيد الكفاح ضد الفاشية والحرب . وتوصلت الى قرارها التاريخي بتاسيس (الجبهة الكردستانية العراقية) المناضلة كاداة مجربة لقيادة الحركة التحررية الكردية بتوحيد قوى ومؤسسات ثورتها ومن اجل مجابهة النظام الدكتاتوري وارهابه الشامل ضد الشعب العراقي عامة وضد الشعب الكردي خاصة ، حيث يلجأ الى مختلف وسائل القتل والتدمير وهدم معظم القرى والقصبات الكردية ، ولم يتورع عن تصعيد حرب الابادة ضد الشعب الكردي الى درجة بالغة الخطورة في عمليات التعريب والترحيل والاعدام الجماعي واستعمال الاسلحة الكيمياوية المحرمة دوليا ، كما جرى في مناطق وادي جافتي وباليسان وسهل كركوك وقرى العمادية في العام الماضي متوجة حربها العنصرية بتاج الجرائم في مدينة حلبجة الشهيدة التي

١٨,٠٠ - ٢٠,٠٠ **الجلسة الرابعة**

رئيس الجلسة : د. طارق الخضيري

تقديم : الاستاذ احمد حمروش والاستاذ نبيل بسطاطي ،

**الحقوق الوطنية غير القابلة للتصرف للشعب الفلسطيني**

نظرة مستقبلية في ضوء التطورات الجديدة في الأرض المحتلة .

عشاء ولقاءات حرة

---

٩,٠٠ - ١٠,٤٥ **الجلسة الخامسة**

رئيس الجلسة : الاستاذ عمر دزي

تقديم : د. برهان غليون و د. فاضل رسول

**حقوق الجماعات القومية (الاثنية) والدينية في الوطن العربي :**

نظرة اجمالية عن طبيعة وابعاد المسألة وتناول اسس وآليات التعايش الوطيد والمواطنة المتكافئة .

١٠,٤٥ - ١١,٠٠ استراحة

١١,٠٠ - ١٢,٠٠ **الجلسة السادسة**

رئيس الجلسة : د. عبدالغني الماني

تقديم : د. ابراهيم سعدالدين و د. جعفر عبدالغني

أ - ظاهرة التفاوت في الوضع الاقتصادي والاجتماعي للأفراد وكيفية تحقيق المساواة وتكافؤ الفرص في المجتمع .

ب - الخلل القائم في علاقات الاقطار العربية مع العالم الخارجي (التبعية الاقتصادية) وكيفية معالجة .

**دانیشتنی پێنجەم: بە سەرۆکایەتی عمر دزي (هۆمەر دزەیی).**

THE UNITED STATES OF AMERICA

OFFICIAL BUSINESS

Ambassador William L. Eagleton
American Embassy
P. O. Box 29
Damascus, Syria

PAR AVION

US AIR MAIL

Mr. Omar Dizeyee
P. O. Box 158
1015 Wien

AUSTRIA

**نامەکەی باڵیۆز ویلیەم ئیگڵتن بۆ هۆمەر دزەیی لە شامەوە بۆ ڤیەننا**

بمناسبة مجزرة حلبجة بكردستان العراقية

لاپەڕەی یەکەمی نامەکەی من لەسەر هەڵەبجە لە هەفتەنامەی (التیار الجدید)

مقدات..!

تستنجدون العالم ويضعفه الاكراد من اجل قضاياكم. ولكنكم لا تمانعون من معانقة وتقبيل حكام بغداد (من اجل مصلحة قضيتكم حسب ادعاءكم) فهل يسري هذا المبدأ على غيركم ايضا

ذلك افتراضا فسنعدها مسئولون عنهم في تلك الحالة؟

ياشعب فلسطين.. عار عليكم

بالنتيجة لصالح العرب باعتبارهم رواد الإسلام. فالمعروف عن هؤلاء المسلمين (الاكراد والفرس) انهم اكثر حماسا للاسلام واكثر استماتة للدفاع عنه من المسلمين العرب.

كل هذا و(ممثلكم الشرعي) باسر عرفات يصرح بان ...

بان عملاء اخيه صدام وبنصيحة من اسياده المستعمرين قد قاموا بها وفي هذه الفترة بالذات ذلك لصرف انظار الراي العام العالمي عن المجزرة البشرية الرهيبة وحملة الابادة الجماعية التي قام ويقوم بها «بطل العروبة» وسليل آل البيت، صدام حسين (لعنه الله) في مدينة حلبجة الكردية وفي كردستان العراقية عامة

فخلف الله عليكم ياعرب.

وخلف الله عليكم ياشعب فلسطين.

و وا محمداه.. وا اسلاماه!

يوسف بن ايوب
صلاح الدين
فيينا. عوض

المجلس الاعلى العراقي في العمليات العسكرية

لاپەڕەی دوایی نامەکەی من لەسەر هەڵەبجە لە هەفتەنامەی (التیار الجدید)

التيار الجديد

أسبوعية . سياسية . ثقافية

حرب التدمير والتصفية والاذابة

هەفتەنامەی (التیار الجدید)ی لەندەن، کە سەعد ساڵح جەبر دەریدەکرد

دەریاچەی ورمێ بەداخەوە وا بەرەو نەمان دەڕوات. ئەو جێ پێیانەی دەیانبینی جاران ئاو بوو

گوندی ڕاژان له دامەنی کێوێکی دژوار و پێدەشتێکی جوانا

# بەشی 33

## ئەمەریکا و دەنگی ئەمەریکا بە کوردی VOA

ئەمەریکا وەک ئەوروپا نەبوو بۆ دۆزینەوەی کار. لە ئەمەریکا هەرچییەکی بووا کارێک هەر دەست دەکەوت بیکەیت. ئەمن چونکە شارەزاییەکی باشم هەبوو لە چەندین زمانی باوی دونیا وەک ئینگلیزی، فرانسی، ئەڵمانی، عەرەبی، فارسی، تورکی، ئیسپانییەکی تێکشکاو جگە لە کوردییەکەی خۆم، یەکسەر کاری مامۆستای زمانم لە چەند قوتابخانەیەکی زمانا دەست کەوت. چوار ساڵ بەم شێوەیە بردمانە سەری. زانکۆی ( جۆرج مەیسن Geore Mason University ) هەر مەودای پیادەڕۆیەک لە ماڵەکەی منەوە دوور بوو. سەرەتای نەوەتەکان بوو بیرم کردەوە کە کاری مامۆستایەتیی زمانم خۆ هەر پۆستێکی کاتەکییە ( پارت تایم part time job) و دەچمە قوتابخانەکە وانەی خۆم دەڵێمەوە و دەڕۆم. واتا کاتی بەتاڵیم زۆرە بۆچی خۆم لەو زانکۆیە بۆ ماستەر لە زمانەوانی تۆمار نەکەم ؟ هەر واشم کرد. ساڵی یەکەمم بە پلەی هەرە بەرز تەواو کرد کە سەیریش نەبوو چونکە من بە تەمەن نەک هەر لە هەموو خوێندکارەکانی هاوکلاسم گەورەتر بووم بەڵکو لە زۆر لە مامۆستاکانیشم بە ژن و پیاویانەوە. یەکێک لە مامۆستاکانم (دکتۆر جۆن کێلی Dr. john Kelly)، کە زۆر قسە خۆش بوو، ڕۆژێکیان پێی گوتم " ئۆمەر، کە یەکەمجار چاوم بە ( CV = ژیننامە) کەی تۆ کەوت کە ئەو هەموو زمانانە دەزانی زراوم چوو، لەدڵی خۆما دەمگوت بەوخوایە ناوێرم هەڵەیەک

بکەم ئەم خوێندکارە نوێ یە لێم ئاشکرا دەکات. هەڵبەت وانەبوو و وا بزانم هەر بۆ گاڵتە ئەم قسانەی دەکرد.

بەڵام بە راستیش سوودێکی زۆریان لە زانیاریی من لەو زمانانە وەردەگرت بە تایبەتی لە وانەی ( زمانەوانیی بەراوردکاری comparative linguistics). مامۆستاکانم خۆیان جگە لە ئینگلیزی تەنیا یەک دوو زمانی دیکەیان دەزانی و کەسیان وەک من بەو شێوەیە ( فرە زمان polyglot) نەبوو. بۆیە لە کلاسی بەراوردکاریی زمانانـدا زۆر جار لە منیان دەپرسی بۆ نموونە ئەم رستە ئینگلیزییە کە بە فرەنسی و ئەڵمانی یان ئیسپانی بەم جۆرە دادەڕێژرێت، ئەدی بە عەرەبی یان تورکی یان فارسی یان کوردی چۆن دادەڕێژرێ؟ جا من دەچوومە بەر تەختە رەشەکە و بۆ ماوەیەکی کورت دەبوومە مامۆستایان لەو بوارە. ئینجا لێرەدا بە جوانی بۆیان دەردەکەوت جیاوازیی دارشتنی رستە لە نێوان زمانە هیندۆ - ئەورووپییەکان و زمانە سامییەکان و زمانە تورانییەکان (Turkic languages)، کە من لە هەرسێکیانم دەزانی، چۆن چۆنی یە. خۆیشم بەراستی چێژێکی یەکجار زۆرم لە خوێندنی زمانەوانی وەردەگرت.

## مەرگی محەمەد سەعید دۆسکی

بەڕێز کاک محەمەد سەعید دۆسکی، دیپلۆماتێکی رۆشنبیری کورد بوو لە حکوومەتی عێراقدا و کوردپەروەرێکی زۆر لەخۆبوردووش بوو، هەم لە کاتی پۆستی دیپلۆماسی و هەم لەپاش خانەنشینی، کە لەلایەن جەنابی مەلا مستەفای بارزانییەوە کرا بە نوێنەری شۆڕش لە ئەمەریکا. کاک دۆسکی، زۆر بە شێنەیی چالاکیی کوردایەتیی خۆی دەکرد و پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ کاربەدەستانی ئەمەریکیدا بەستبوو، بێ ئەوەی پەرۆشی دەرخستنی ناوی خۆی بێ. من پێشتر یەک جار کاک محەمەد سەعید دۆسکیم دیبوو، ئەویش لە بەغدا

لە ماڵی کاک زەید ئەحمەد عوسمانی پووررزام. جا کە بە خێزانەوە گەیشتمە ئەمەریکا و لە هەمان ویلایەتی ڤیرجینیا وەک کاک دۆسکی نیشتەجێ بووین، یارمەتیی زۆری دام و هەمیشە لەگەڵ کوردەکانی دی بۆ دانیشتنی کوردانە لە ماڵی خۆی بانگی دەکردین. کە زانیشی بەکالۆریۆسم لە زانستی سیاسەت لە زانکۆیەکی بەریتانی وەرگرتووە و چەندین زمانی بێگانە دەزانم و وا خەریکی ماستەریشم لە زمانەوانی، داوای لێ کردم ئەگەر رازی بم، ئەو بۆ مەکتەبی سیاسیی پارتی دەنووسێ، لە شوێنی کاک محێدین رەحیم، بمکەن بە نوێنەری پارتی لە ئەمەریکا. زۆر سوپاسم کرد و پێم گوت کە من هەر ئەندامی پارتیش نیم و بڕیاریشم داوە نەبم بە ئەندامی هیچ پارتییەکی کوردی، بەڵکوو دەوام بە چالاکیی کوردایەتیی خۆم بدەم، بە سەربەخۆیی لە حزبایەتی.

زۆر بەداخەوە و سەت حەیف و مخابن و چاوەڕوان نەکراو، کە کاک محەمەد سەعید شەوێکیان کتوپڕ هێرشێکی دڵ لێی دا و سەری نایەوە و ماڵاوایی لێ کردین. تەرمەکەمان لە فڕۆکەخانەی واشنتن بەڕێ کرد بۆ کوردستان و بیستمان کە لە گوندەکەی خۆیان، گوندی (گەرماڤا)ی نزیک دهۆک بە خاک دەسپێردرێ.

ئەمن شیعرێکی کۆنی لاواندنەوەی خاوەن نادیارم لەبیر بوو، کە لە ساڵی 1943بۆ فەیسەلی ئەحمەد عوسمانی پوورزامی دانابوو، کە خۆی کوشتبوو. ئەو شیعرە لە کاتی خۆی لە کۆڤاری گەلاوێژدا بڵاو کرابووەوە، بەڵام شاعیرەکە لەبەر هەر هۆیەک بووبێ تەنیا دوو پیتی ناوی خۆی دانابوو و تا ئێستاش کەس نازانێ ئەو شاعیرە کێ بووە. بەڵام من وای بۆ دەچم، کە رەنگە فایەق هوشیار بووبێ، کە هاوکلاس و برادەرێکی زۆر نزیکی کاک فەیسەل بووە و لە گەلاوێژدا گوتارێکی لاواندنەوەشی لەسەر نووسیبوو. جا من ئەو شیعرەم دەستکاری کرد، هەندێکم بۆ زیاد کرد، کە بۆ مەرگی کاک محەمەد سەعید بگونجێت و دامە دەست کاک حیکمەت

بامەڕنیـی زاوای کاک دۆسـکی، کـه لەگـەڵ تەرمەکـە گەڕایـەوە بـۆ کوردسـتان. وەکـوو بیسـتم کـە (دیـار)ی کـوڕی کاک دۆسـکی، یـان یەکێکـی تـر لەسـەر گۆڕەکـەی خوێندبوویـەوە. جـا ئەمـە شـیعرەکەیە بـە دەسـتکاریکراوی:

**شینی کاک محەمەد سەعید دۆسکی**

**هۆمەر دزەیی**

**ئەمەریکا 1992/2/14**

ئەی میللەتی کورد ئەی سیارێت عەگید
بگرین بنالن بۆ محەمەد سەعید
بۆچی بەجێت هێشت ڕۆژ لە هەڵات بوو
دڵی میللەتت پڕ لە ئاوات بوو
ئومێدی پێت بوو کوردی ژوور و دەر
لەم کاتی ناوەخت بۆچ کردت سەفەر
ڕەوشتی بەرز و تەبعی پیاوانەت
مێژووی درێژی هەستی کوردانەت
لەلای تۆ با کورد شت وەدەست بێنیّ
گرنگ نەبوو لات کەس ناوت بێنیّ
دەبا بگریێن تێر بکەین شینە
دیار چاوەڕێیە باوکی شیرینە [1]
ئاخا کوردستان دهۆک، گەرماڤا[2]
ئیشەڤ دۆسکییە مێڤانێ چاڤا

## دەنگی ئەمەریکا بە کوردی VOA Kurdish

پێش ئەوەی لە 1992/4/26 بەشی کوردی لە وێستگەی رادیۆی دەنگی ئەمەریکا Voice of America (VOA) بکرێتەوە، من کە بەدوای کاردا دەگەڕام، بیرم بۆ بەشی عەرەبیی (صوت امریکا)ش چووبوو و سەرێکی ئەو بەشەشم دابوو بۆ کار. ئەوسا بەڕێوەبەری گشتیی کۆبەشی زمانەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست division director بەڕێز (سەلمان حلمي) بوو. کە ئەمەریکییەکی بە بنەچە عێراقی بوو. لە سەردانێکم بۆ لای بەڕێز حلمی خۆم پێ ناساند، کە کوردێکی عێراقم و عەرەبییەکەشم وەک کوردییەکەی زمانی دایکم باشە. هەنگی پێی گوتم کە جارێ پێویستیان بە کارمەند بۆ بەشی عەرەبی نییە، بەڵام گوتی ژیننامەکەت بەجێ بێڵە، کاتی پێویست پەیوەندیت پێوە دەکەم. منیش هەر لە خۆمەوە بە پێکەنینیشەوە پێم گوت، ئوستاد سەلمان بەڵکوو رۆژێک لە رۆژان بەشێکیش بە زمانی کوردی دەکرێتەوە، ئەوسا حەز دەکەم من لەبەر چاو بگریت چونکە ئەزموونێکی باشم لە میدیاکاریی رادیۆدا هەیە و وەک کە لە ژیننامەکەشما دامناوە، لە کاتی خۆیدا بێژەر و نووسەر بوویمە لە رادیۆی نهێنیی (دەنگی کوردستان VOK)ی شۆڕشی کورد لە شاخەکانی کوردستان.

دواتر بە ماوەیەک شەڕی 1990ی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکان دژی عێراقی سەدام حوسێن لەسەر کوێت هەڵگیرسا. بەمە هەلێکی گونجاو رەخسا بۆ کورد داوای کردنەوەی بەشێکی کوردی بکەن لە وێستگەی دەنگی ئەمەریکا VOA. ئەوەش دەبوایە بە بڕیاری کۆنگرێسی ئەمەریکا بکرێت. وەکوو بیستبوومان، دوو چالاکوانی کورد لە ئەمەریکا کە زۆر پێش ئێمە لەو وڵاتە بوون، دکتۆر

نەجمەدیـن کەریـم و دکتـۆر ئەسـعەد خەیلانـی، بـۆ ئـەم مەبەسـتە هەوڵیـان دەدا. ئـەوەی مـن پێـی بزانـم، دکتـۆر نەجمەدیـن کەریـم پەیوەندییەکـی نزیکـی لەگـەڵ بەڕێـز پیتـەر گاڵبریـث Peter Galbraith هەبـوو، کـە ئەمەیان یاوەرێکـی پلـە بـەرز بـوو لـە ئۆفیسـی کۆنگرێسمانی دیموکـرات لـی هامیلتـن Lee Hamilton. جـا پێـم وایـە داگیرکردنـی کوێـت لـە لایـەن عێراقـەوە و هەڵگیرسـانی شـەڕ، هـۆی سـەرەکی بـوو کـە بەڕێـز هامیلتـن ئـەو بیرۆکەیـە بقوازێتـەوە و پێشـنیارەکە لـە کۆنگرێسـی ئەمەریـکا بورووژێنـێ. هـەر واش کـرا و کۆنگرێـس بڕیـاری ئەرێنیـی لەسـەر دا، کـە بـە زمانـی کوردیـش بەشـێک لـە دەنگـی ئەمەریـکا بکرێتـەوە VOA Kurdish Service.

ڕۆژنامەوانێکـی کـوردی لوبنـان، کاک سـاڵح نەجیـم حەسـەن، ئەویـش وەک ئێمـە بـە خـاو و خێزانـەوە بـە پەنابـەری گەیشـتبووە ئەمەریـکا و سروشـتانە ئەویـش بـەدوای کارێکـدا دەگـەڕا کـە لەگـەڵ شـارەزاییەکەی بگونجێ. وەکـوو بیسـتم کاک سـاڵح کە پێشـتر لـە بەیرووت نووسـەرێکی بـاش بـووە بـە زمانـی عەرەبـی و نووسـینەکانی لـە ڕۆژنامـە لوبنانییەکانـدا بـڵاو دەکـردەوە، لێـرە لـە واشـنتنیش بـە ئومێـدی کارێـک، هەمیشـە سـەردانی بەشـی عەرەبیـی دەنگـی ئەمەریـکای دەکـرد و دۆسـت و بـرادەری زۆری لـەوێ پەیـدا کردبـوو. وەک خـۆی دواتـر بـۆی گێڕامەوە، عەرەبەکانـی بەشـی عەرەبیـی دەنگـی ئەمەریـکا ئـەوان سـاڵحیان ئـاگادار کردبـوو، کـە بڕیـار دراوە بەشـێک بـە زمانـی کوردیـش بکرێتـەوە. ئیتـر کاک سـاڵح یەکسـەر چووبـوو بـۆ لای بەڕێوەبـەری گشـتیی زمانەکانـی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت بەڕێـز سـەلمان حلمـی و ئەمـەی دواییـان کـە بنیبـووی کـوردە و لـە بەیرووتیـش ڕۆژنامـەوان بـووە، یەکسـەر وەری گرتبـوو و ڕاشیسـپاردبوو چەنـد کوردێکـی لێوەشـاوەی تریـش بدۆزێتـەوە، پێکـەوە بەشـی زمانـی کـوردی بکەنـەوە. پێـم وایـە دەبـێ سـەلمان حلمـی نـاوی منیشـی پـێ دابـێ، یـان باسـی منـی بـۆ کردبـێ، چونکـە مـن پێشـتر ژیننامـەی خـۆم لـەلای بەجـێ هێشـتبوو.

من لەگەڵ کاک ساڵحدا یەکتریمان نەدەناسی. برادەرە کوردەکانی واشنتن ناوی کاک خەلەف زێبارییان بۆ پێشنیار کردبوو، کە پێشتر ئەویش وەک من لە رادیۆی دەنگی کوردستان لە شاخدا، بەڵام لە ساڵانی دوای من کاری کردبوو و هەردووکمان ئەزموونمان لە رادیۆکارییدا هەبوو. کاک خەلەف (یادی بەخێر) دانیشتووی شاری ناشڤیل Nashville بوو و بۆ ئەم مەبەستە هاتە واشنتن. رۆژێکیان لەگەڵ کاک ساڵحدا پەیوەندییان بە منەوە کرد و هاتنە لام. لە ماڵی من لە شارۆچکەی فێرفاکس نزیک واشنتن کۆ بووینەوە و پلان و تەگبیرمان بۆ بەڕێوەبردنی رادیۆکە تاوتوێ کرد.

پەلەمان بوو، بۆیە سەرەتا هەر لە ناوچەی واشنتن چەند کچ و کوڕێکی کوردمان دەست کەوت و دامانمەزراندن.

ئەوانەی کە لە سەرەتای کردنەوەی رادیۆکە، یان ماوەیەک درەنگتر دامەزران، جگە لە (ساڵح و خەلەف و خۆم) سەربەست میران و فاتمە میرانی هاوسەری، لارا هۆمەر دزەیی، حەیدەر کەریم، عیرفان (وریا) جاف، فەخرییە دۆسکی، موعتەبەر شێروانی، بەکر ئیبراهیمی و چەند هاوکارێکی تر.

لەبەراییدا ماوەی رادیۆکە تەنیا 15 خولەک بوو، کە بە دەنگوباس و کۆمێنتێکی سیاسی پڕمان دەکردەوە، بەڵام دوای شەش مانگێک ماوەکەمان درێژ کرایەوە بۆ نیو سەعات و کە شەڕی دووەمی هاوپەیمانان و عێراق ئەمجارەیان لەسەر گوایا ئەمبارکردنی چەکی کیمیایی لەلایەن سەدامەوە دەستی پێ کرد، ماوەی پەخشەکانمان زیاد بوو بۆ چوار دانە سەعات. هەڵبەت لەگەڵ زیادبوونی ماوەی پەخشی رادیۆکە، بەشەکەمان پێویستیی بە کارمەندی زیاتریش بوو و ئەمجارە ژمارەیەکی زۆری دیکەی کورد دامەزرێندران وەک: شایان پاشا، بەڵێن ساڵح، عومەر شێخموس، دەخیل شەمۆ، قادر رەشان، نەشوان کالێ، هێرۆ زەنگەنە، چێرین بەرواری، نازێ گەمۆ، فەرهاد بارزانی، سەفەر بارزانی، شایان رەشید، چیمەن زێباری، فاتمە سندی، زیبا

سندی، بێریڤان دۆسکی، بروسک توغان، سەلاح پیرۆتی.. بمبەخشن ئەوانەی کە ناویان یان ناوی تەواویانم لەبیر نەماوە. بەشەکەمان هەروەها پەیامنێری لە شارە گەورەکانی کوردستان و لە هەندێ شاری ئەورووپا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا دامەزراند، وەک: عومەر فەرهادی لە هەولێر، لەتیف نێروەیی لە سلێمانی، سەلام باڵایی لە دهۆک، یەحیا بەرزنجی لە کەرکووک، کەریم بەختیاری لە ئێران، شەپۆل مێرگەسۆری لە ستۆکهۆلم، سروە عەبدول واحید لە بەغدا و ئی تریش، کە رۆژانە یان بەپێی رووداو پەیامی خۆیان بۆ دەناردین.

هەر بەشێک لە بەشەکانی دەنگی ئەمەریکا، سەرۆک بەشێکی هەبوو ( service chief) کە مەرج نەبوو بە ڕەگەز خەڵکی وڵاتی زمانەکە بێ. سەرەتا بەشی کوردی کەسێکی نەبوو بە ناوی سەرۆک بەش. ساڵح نەجیم حەسەن وەکوو سەرنووسەر (editor) بە بەرپرسی بەشی کوردی دامەزرێندرابوو.

ئەمن خۆم بێجگە لە کاری بێژەریی دەنگوباس و راپۆرتی تایبەتی، دوو بەرنامەی هەفتانەشم هەبوو، یەکێکیان بە ناوی (فەرهەنگ و تۆرەی کوردی) کە رۆژێک من بە سۆرانی و رۆژێکی دیکەش خەلەفێ زێباری بە کرمانجی پێشکەشمان دەکرد. بەرنامەیەکی هەفتانەی تریشمان هەبوو بە ناوی (زمانێ مە) کە من لەگەڵ مایکڵ چایەت، جار جار پێکەوە و هەندێ جاریش بە جیا ئەو بە کرمانجی من بە سۆرانی پێشکەشمان دەکرد.

کە بەشەکەمان لە ئەنجامی شەڕی هاوپەیمانان و سەدام فرەوانتر بوو، سەرۆک بەشێکی ئەمەریکیان بۆ دانایەن. ساڵح نەجیمیان وەک سەرنووسەر لابرد، خانمێکی ئەمەریکی (خانم ماری پاتچەر Mary Patzer) کرا بە یەکەم سەرۆکی بەشی کوردیی دەنگی ئەمەریکا و دکتۆر مایکڵ چایەت، ئەویش هەر ئەمەریکی، لە شوێن ساڵح نەجیم کرا بە سەرنووسەر editor. مایکڵ زمانەوانێکی زۆر شارەزا بوو و کوردیی کرمانجی و چەندین زمانی بیانی زۆر بە رێکوپێکی دەزانی

و دکتۆراشی لەسەر داستانی مەم و زین وەرگرتبوو. ماری پاتچەریش چەند ساڵێک مایەوە و خانەنشین بوو، دوای ئەو دیسان هەر سەرۆکێکی دیکەی ئەمەریکییان بۆ دانایەن (خانم رەیچل Rachel ). ئەویش دوای چەند ساڵێک لە سەرۆکایەتیکردنی بەشەکەمان گواسترایەوە و ئەمجارە منیان کرد بە سەرۆک بەش Service Chief. ئەوە یەکەم جار بوو کە کوردێک بکرێ بە سەرۆکی بەشی کوردی. وەک پێشتر باسم کرد، کە بەشی کوردی لە ساڵی 1992 کرایەوە، کاک ساڵح نەجیم بە تایتلی سەرنووسەر editor نەک سەرۆک بەش service chief کرا بە بەرپرسی بەشەکە.

## لەپێناو دەنگی ئەمەریکا دەستم لە خوێندنی ماستەرەکەم هەڵگرت

دەبوایە زووتر ئەم باسە بگێڕمەوە. خۆی هەر لەگەڵ دەسپێکردنی یەکەم رۆژی پەخشی بەرنامە بە زمانی کوردی لە دەنگی ئەمەریکا (1992/4/25) بە کاتی واشنتن، ئەمن دەبوایە رۆژگار و شەوگاری خۆم لەگەڵ سێ جۆر کار بگونجێنم، کە لە هەمان رۆژ و شەودا پێیانەوە خەریک بووم:1 - مامۆستای زمان بووم لە قوتابخانەی Language Inc بۆ گوتنەوەی زمانی ئینگلیزی بە قوتابییانی تازە هاتوو بۆ ئەمەریکا 2 -  خوێندکاری ماستەر بووم لە زمانانی بیانی Foreign Languages لە زانکۆی جۆرج مەیسن لە ڤیرجینیا George Mason University  ئێستاش 3 - وا بەشی کوردیی دەنگی ئەمەریکای هاتە سەر. ماوەیەکی کورت هەوڵم دا هەرسێکیان پێکەوە بە ئەنجام بگەیەنم. شەو و رۆژم لێک دەدا، بەلام بە تەمەنی لە پەنجا تێپەڕیو، پسام. دەستم لە مامۆستایی زمان هەڵگرت، مایەوە ماستەر و دەنگی ئەمەریکا. کاری دەنگی ئەمەریکام بە رۆژ بوو، بەیانییان سەر لە زوو دەبوایە لە ماڵ دەرچم لە ڤیرجینیا بڕۆم بۆ واشنتن بۆ دەنگی

ئەمەریـکا. ئێـواران دەوروبـەری سـەعات 6 دەگەیشـتمەوە مـاڵ، نانێکـم دەخـوارد و پشـوویەکی کورتـم بـۆ دەدا. وانەکانـی ماسـتەرم خسـتبووە درەنگانـی ئێـواران لـە سـەعات 9 تـا هەنـدێ جـار 11ی شـەو. ئەوەشـم تـا ماوەیـەک پـێ کـرا، بەڵام دواجـار هەسـتم بـە ماندووبـوون دەکـرد و بەرگـەی ئەوەشـم تـا سـەر پـێ نەگیـرا. دەبوایـە لـەم دووانـەدا یەکێکیـان هەڵبژێـرم: دەنگـی ئەمەریـکا یـان ماسـتەر. هەردووکیانیشـم وەک یـەک خـۆش دەویسـت، بـەڵام یەکەمیـان گوزەرانییەکـی باشـی بـۆ مـاڵ و منداڵەکانـم دابیـن دەکـرد و بـۆ ئـەوەی دووەمیـش هەرچەندە کـە یارمەتیی دارایـی بـۆ خوێنـدکاران هەبـوو، بەڵام دەبوایـە بـڕێ پـارەش بـدەم. بـە نابەدڵییەکـی زۆرەوە دەسـتم لـە خوێندنـی ماستەرەکەشـم هەڵگـرت و کـە بـە مامۆسـتاکانم راگەیانـد، زۆریـان پـێ ناخـۆش بـوو، گوتیـان تەنیـا ساڵێکی سـکۆلارت مـاوە حەیفـە بەجێـی بێڵـی. بـەڵام عـەرەب گوتەنـی "تجـري الريـاح بمـا لا تشـتهي السـفن". بـەم جـۆرە وەک لەتێـک لـە جەرگـم بووبێتـەوە، ماڵاواییـم لـە بەرنامـەی ماسـتەرەکەم کـرد لـە زمانانـی بیانـی و بەنیوەچڵـی بەجێـم هێشـت. مامـەوە خـۆم و دەنگـی ئەمەریـکا.

## چیرۆکی بوونم بە (سەرۆکی بەشی کوردی)ی دەنگی ئەمەریکا

دوای هێرشەکانی یازدەی سێپتەمبەری 2001 بۆ سەر ولاتە یەکگرتووەکان، یەکێک لە کاردانەوەکانی ئەمەریکا بۆ بەرەنگاربوونەوەی بزووتنەوەی تیرۆریزمی ئیسلامی، بە رەهبەریی رێکخراوی (القاعدة) کردنەوەی وێستگەیەکی رادیۆش بوو بە ناوی (اذاعة العراق الحر) واتا وێستگەی عێراقی ئازاد. رادیۆکە لە شاری پراگ، پایتەختی کۆماری چێک دامەزرا و بەڕێوەبەرەکەیشی بەڕێز (دێڤید نیوتن David Newton)ی ئەمەریکی بوو. بەڵام هەڵسووڕێنەری کاروباری رۆژانەی رادیۆکە و دانانی بەرنامەکان بە دەست سەرنووسەر و جێگری بەڕێوبەرەکە بوو، کە ئەویش کوردێکی برادەری دێرینی خۆم بوو، هی سالانی چلەکانی سەدەی رابردوو، کە پێکەوە لە قوتابخانەی سەرەتایی بووین لە هەولێر، کاک کامەران قەرەداغی. کامەران نووسەرێکی بە بڕشتی رۆژنامە بوو بە زمانی عەرەبی و هەمیشە گوتاری شیکردنەوەی سیاسیی زۆر بابەتیی لە (الحیاة) و لە (الشرق الاوسط) بڵاو دەکردەوە. کامەران هەروەها لە دوا ساڵەکانی شۆڕشی ئەیلوولیشدا وێستگەی رادیۆی (دەنگی کوردستان VOK) ی لە شاخدا بەڕێوە دەبرد و رۆژنامەوانێکی لێهاتووی ئەزموونداری چاپەمەنی و رادیۆ بوو.

وەک تیمەی بەشی کوردیی دەنگی ئەمەریکا، لە دەسپێکی کردنەوەی رادیۆکەمان بەدوای کەسانی خاوەن ئەزموونددا لە رادیۆکاری دەگەڕاین، کامەرانیش تووشی هەمان گرفت ببوو، هەرچەندە کە شارەزایانی رادیۆ بە زمانی عەرەبی زۆر زیاتر بوون لە هی کورد. کامەران پەیوەندیی بە منەوە کرد و داوای لێ کردم

حەز دەکات دەست لە دەنگی ئەمەریکا هەڵگرم و بچم لە پراگ لەگەڵ ئەودا رادیۆی (ازاعة العراق الحر) بەڕێوە بەرین. گوتیشی بۆیە بەتایبەتی تۆم پێویستە، چونکە وا هەوڵ ئەدەم بەشێکی بە زمانی کوردییش لە (اذاعة العراق الحر) بکرێتەوە، جا گوتی ئەوسا لە تۆم باشتر دەست ناکەوێ بۆ بەڕێوەبردنی بەشە کوردییەکە. کامەران بە وردیش باسی مووچە و کرێی خانوو و قوتابخانەی منداڵەکانم لە قوتابخانەی ئەمەریکی لە پراگ و گواستنەوەی تەواوی ناوماڵەکەی ئەمەریکامان بۆ پراگ بە ئەساس و کتێبخانەکەشمەوە لەسەر حیسابی خۆیان، ئەمانە هەمووی بۆ کردم، کە بەڕاستی زۆر زۆر چەورتر بوو لەوەی کە لە دەنگی ئەمەریکا وەرم دەگرت. خۆیشم وەک پێشتر باسم کردووە، دنیای کۆن (ئەورووپا)م زۆر لا خۆشتر بوو تا دنیای نوێ (ئەمەریکا)، بەتایبەتی تا رادەیەک شارەزای شارە جوانەکەی پراگیش بووم، کە لە حەفتاکاندا کاک موحسینی برام لەوێ باڵوێزی عێراق بوو و منیش کارمەند بووم لە باڵوێزخانەی عێراق لە ڤیەننا و هەمیشە سەردانی پراگم دەکرد، کە لە ڤیەنناوە نزیک بوو.

ساڵ 2000 بوو. لەگەڵ دایکی منداڵەکانم بەوردی باسی ئەم ئۆفەرەی کامەرانمان کرد و سەیری بەرژەوەندیی خۆمان و خوێندنی منداڵەکانمان کرد، بڕیارمان دا پۆستەکەی پراگ وەرگرم.

چەند رۆژێک دواتر، داخوازیی خانەنشینیم لە دەنگی ئەمەریکا کرد و هەرچەندە کە لای سەرۆکەکەم بڕیارێکی لەپڕی چاوەڕوان نەکراو و نەخوازراو بوو، بەڵام پەسند کرا، چونکە یەکێک کە خۆی داوای خانەنشین بکات خۆ بەزۆری نایهێڵنەوە.

هەر چەند رۆژێک دواتر تەقییەوە. بەڕێوەبەری گشتیی دەنگی ئەمەریکا، بەڕێز ئۆنگەر Unger زانیبووی کە ئەوە لەبەر پۆستەکەی (اذاعة العراق الحر) بووە کەوا دەنگی ئەمەریکا جێ دێڵم، بۆیە زۆری پێ ناخۆش بوو و گلەیی و گازاندەی خۆی گەیاندبووە بەڕێوەبەری رادیۆی (اذاعة العراق الحر) بەڕێز (دێڤید نیوتن David Newton).

بەڕێز ئونگەر گوتبووی ئەوە نابێ قەبووڵ بکرێت کە (اذاعة العراق الحر) باشترین رادیۆکاری ئێمە بۆ خۆی رابکێشێ. گوتبووی رادیۆکەی پراگ دەتوانێ کارمەند بۆ خۆی بدۆزێتەوە، بەڵام بۆچی لەسەر حیسابی دەنگی ئەمەریکا و زیان بە ئێمە گەیاندن؟ لە هەمان کاتدا سەرنووسەری بەشی کوردیی دەنگی ئەمەریکا مایکڵ چایەت، بە سەرۆکی بەشی کوردی ( رەیچڵ Rachel) و بە بەڕێوەبەری کۆبەشی زمانەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ( ئیسماعیل دەحییات)ی گوتبوو، کە لەدەستدانی هۆمەر دزەیی کەلێنێکی زۆر گەورە لە بەشی کوردی دەکاتەوە، چونکە گوتبووی هۆمەر بە هەردوو زاراوەی سۆرانی و کرمانجی و بە بەرنامە کولتوورییە بەپێزەکانی جێگاکەی پڕ ناکرێتەوە. شتەکە گەورە بوو و دێڤید نیوتنی بەڕێوەبەری رادیۆکەی پراگی تووشی هەڵوێستێکی چاوەڕوان نەکراو کردبوو و بە کامەران قەرەداغیی گوتبوو: "دەمەوێ بزانم ئەو هۆمەر دزەییە کوڕی ... son of the کێیە کە ئێمەی تووشی ئەم بەڵا گەورەیە کردووە لەگەڵ دەنگی ئەمەریکا؟!". خۆی لە ئەمەریکا هەندێ جنێوی زۆر باو هەن، کە زۆر جار لە کاتی تووڕەبووندا دەکەونە سەر زارانەوە. جا دێڤید نیوتن لە تووڕەیی و پەستبوونیدا لای کامەران ئەو جنێوەی حەواڵەی من کردبوو و کامەرانیش بە پێکەنینێکی زۆرەوە، هەڵچوون و جنێوەکەی نیوتنی بۆ دەگێڕامەوە.

لەکاتێکدا کە لە لایەکەوە بەڕێز (ئونگەر)ی بەڕێوەبەری گشتیی دەنگی ئەمەریکا بەو هەواڵە (ناخۆشانە)ی بەشی کوردیی پێی گەیشتبوو، کەوتبووە دڵەڕاوکێ، منیش لە لایەکی دیکەوە کۆمپانیایەکی ماڵ گواستنەوەم راسپاردبوو، هاتن سەیری ناوماڵەکەیان کردین و پێوەر و کێشی شتەکانیان نووسی، تا دواتر بێنەوە هەمووی لەناو سنووقی دار بپێچنەوە و بینێرن بۆ پراگ.

## بەڕێز ئونگەر Unger تەلەفۆنی بۆ کردم

لەم کەین و بەینەدا تەلەفۆنێکم لەلایەن سکرتێری بەڕێز ئونگەری بەڕێوەبەری گشتیی دەنگی ئەمەریکاوە بۆ هات. خانمی سکرتێر گوتی فەرموو لەگەڵ میستر ئونگەردا قسە بکە. لەپاش چاکی و چۆنی، داوای لێ کردم حەز دەکا بمبینێ، ئەگەر لاریم نەبێ سەردانێکی بکەم لە ئۆفیسی دەنگی ئەمەریکای. رازی بووم و بۆ بەیانی چوومە لای. دووقۆڵی بەدەم قاوەوە لە ئۆفیسەکەی کەوتینە قسەو باس. لێی پرسیم کە ئاگادارە خانەنشینییەکەم لە دەنگی ئەمەریکا لەپێناو پۆستێکی تر بووە لە رادیۆی (اذاعة العراق الحر). پرسی: بۆ دەڕۆیت بۆ ئەوێ؟ منیش زۆر بە راشکاوی وەرامم دایەوە، گوتم میستەر ئونگەر ئەمن لە ماڵی خۆمدا شەش سەر خێزانین، مووچەی دەنگی ئەمەریکا بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی کە لە پراگ ئۆفەریان کردووم، وەک ئەرز و ئاسمان لێک دوورن. گوتم راستە بەشی کوردیی دەنگی ئەمەریکا خۆشەویستی منە و خۆم یەکێک بوومە لە دامەزرێنەرانی، بەڵام خۆشت ئەزانی دەبێ حیساب بۆ لایەنی داراییش بۆ خێزانی خۆم بکەم. کەمێک داما، فڕێکی لە قاوەکەی داو گوتی: "باشە ئەگەر شتێکی ترت ئۆفەر بکەم لەوەی پراگ باشتریش بێ، رازی دەبی لامان بمێنیتەوە؟" گوتم: ئەو ئۆفەرە چییە؟ گوتی دەتکەم بە سەرۆکی بەشی کوردی، لە شوێن رەیچڵ Rachel. گوتم ئەدی چی لە رەیچڵ خان دەکەیت، گوتی کێشە نییە، ئەوە ئیشی خۆمە دەیگوازمەوە بۆ پۆستێکی دیکە. منیش فڕێکم لە قاوەکەم دا و بیرێکم لێ کردەوە، گوتم ماوەی دوو رۆژم بدێ با قسە لەگەڵ ماڵ و منداڵەکانم بکەم. بە رووێکی زۆر خۆشەوە دەستی گوشیم و گوتی هیوادارم وەرامی ئەرێنیم بۆ بێنیتەوە.

لەگەڵ دایکی منداڵەکاندا کەوتینە پلان و تەگبیر و بەرژەوەندییەکانمان هەڵسەنگاند، گەیشتینە ئەو دەرئەنجامە کە ئۆفەرەکە قەبووڵ بکەم، چونکە مووچەی سەرۆک بەش لە دەنگی ئەمەریکا مووچەیەکی زۆر باش و پۆستەکەش پۆستێکی بەرێز بوو.

دوابەدوای بڕیاری رازیبوونم بە ئۆفەرەکەی بەڕێوەبەری دەنگی ئەمەریکا تەلەفۆنم بۆ کرد و بڕیارەکەم پێ راگەیاند. بە دڵێکی زۆر خۆشەوە داوای لێ کردم بەیانی بچمەوە بۆ لای. چووم و دانیشتنی ئەمجارەمان زۆر لەوەی پێشترمان گەشتر و ریلاکستر بوو و وێنەیەکی یادیگاریشمان پێکەوە گرت. لە ئەنجامدا، بەڕێز ئونگەر مێمۆراندەم (یاداشت)ێکی دەرکرد، کە ئەمەی خوارەوە وەرگێڕاوە کوردییەکەیەتی:

مێمۆراندەم بۆ: هەموو کارمەند و فەرمانبەرانی بیرۆی بێژەرانی نێونەتەوەیی IBB

لە: سانفۆرد. جەی. ئونگەرەوە

بابەت: هۆمەر دزەیی، سەرۆکی بەشی کوردی، کەرتی رۆژهەڵاتی نزیک و باکووری ئافریکا، دەنگی ئەمەریکا.

خۆم بە بەختەوەر دەزانم پێتان رابگەیەنم، کە بەڕێز دزەیی، وەک سەرۆکی بەشی کوردی لە کەرتی زمانەکانی رۆژهەڵاتی نزیک و باکووری ئافریکا، لە دەنگی ئەمەریکای سەر بە بیرۆی بێژەرانی نێونەتەوەیی هەڵبژێردرا و لە رۆژی 2000/2/24ەوە ئیتر دەستبەکار دەبێت.

وەک سەرۆک بەش، بەڕێز دزەیی بەرپرسیارەتیی بەڕێوەبردن و پێشخستن و دەرهێنان و پەخشکردنی هەموو بەرنامە کوردییەکانی دەنگی ئەمەریکای لەئەستۆ دەبێ.

بەڕێز دزەیی، لەپاش ماوەیەکی کورتی خانەنشینی لە دەنگی ئەمەریکا گەڕاوەتەوە بۆ لامان. پێشتر بۆ ماوەی چەند ساڵێک سینیۆر بێژەری نێونەتەوەیی بوو لە بەشی کوردی. لەوەش پێشتر بەڕێز دزەیی

لـەو دەسـگایانەدا دەسـتبەکار بـووە:

Inlingua, AT&T, Georgetown University, Diplomatic Language Services DLS, Languages INC., Berlitz Language Center, Kurdish Monthly Karwan, The U.S. Special Forces Airborne .

لـەو دەسـگایانە بەڕێـز دزەیـی کاری جۆراوجـۆری کـردووە، لـە بێـژەری رادیـۆوە بگـرە تـا دەگاتـە کاری دەرهێنـان و مامۆسـتای زمـان.

هۆمـەر دزەیـی، نوقمـی کولتـوور و مێـژووی گەلـی کـوردە و نووسـەری کتێبـی چاپکراویشـە لەسـەر ئـەم بابەتانـە. بەڕێـز دزەیـی لـە هـەردوو شـێوەزاری کـوردی (سـۆرانی و کرمانجـی) کـە لـە دەنگـی ئەمەریـکا بـەکار دێـن، زمـان پـاراو و رەوانـە، سـەرباری چەندیـن زمانـی دیکـەی رۆژهەلاتـی نزیـک و ئەوروپاییـش، وەک عەرەبـی، فارسـی، تورکـی، ئـازەری، فرانسـی و ئالْمانـی.

بەڕێـز دزەیـی دەرچـووی زانکـۆی زانکـۆی (ریدینـگ)ی بەریتانـی و زانکـۆی (جـۆرج مەیسـن)ە لـە فێرفاکـس، ڤیرجینیـا و هەروەهـا سـترانبێژ و سترانووسـێکی نـاوداری کـوردە.

نووسـینگەی بەڕێـز دزەیـی، لـە ژووری ژمـارە 1437ە لـە بالاخانـەی کۆهێـن بیلْدینـگ Cohen Building. ئەمـەش ژمـارەی تەلەفۆنەکەیەتـی 2604262

دەقی مێمۆراندەمەکە تەواو بوو.

تـێ بینیـی خـۆم: ئەمـن هێشـتا سـاڵێکم مابـوو ماسـتەرەکەم لـە زانکـۆی (جـۆرج مەیسـن) تـەواو بکـەم، بـەلام ئـەوان نووسـیویانە کـە دەرچـووی ئـەو زانکۆیەشـم. ماڵیـان ئـاوا، بریـا وەبوایـە.

ماوەیەک دوای دەستبەکاربوونم وەک سەرۆکی بەشی کوردیی دەنگی ئەمەریکا، بەڕێز مایکڵ چایەت، کە سەرنووسەری سەرەکیی بوو لامان و شارەزایەکی لێهاتووی شێوەزاری کرمانجی و ئاشنای سۆرانییش بوو، پۆستەکەی خۆی گواستەوە بۆ کتێبخانەی بەناوبانگی کۆنگرێس Library of Congress لە واشنتن. مایکڵ خولیای ناو کتێبان بوو و لە دەنگی ئەمەریکا بێزار بووبوو، چاوی بڕیبووە بەشی کتێبەکانی بە زمانی فارسی و کوردی لە کتێبخانەی کۆنگرێس. کە مایکڵمان لەدەست چوو، دەبوایە بەدوای سەرنووسەرێکی دیکەدا بگەڕێم بۆ بەشی کوردیی دەنگی ئەمەریکا. پۆستەکەمان ڕاگەیاند کە بەشی کوردی پێویستی بە سەرنووسەرێک هەیە، هەر کەسێ ئارەزووی بکات با بفەرموێ بۆ تێست (تاقی کردنەوە) کە لەلایەن بۆردێکی تایبەتی دەنگی ئەمەریکاوە ئەنجام دەدرا و خۆیشم یەکێک بووم لە ئەندامانی بۆردەکە. هەر واش کرا و لە ئەنجام بەڕێز عومەر شێخموس هەڵبژێردرا کە لە هەردوو شێوەزاری کوردی (کرمانجی و سۆرانی) شارەزاییەکی تەواوی هەبوو. بەم جۆرە کاک عومەر شێخموس کرا بە سەرنووسەری سەرەکی لە شوێنی مایکڵ چایەت. کاک عومەر یارمەتیدەرێکی زۆر دەستڕەنگین بوو بۆ خۆم و بۆ بەشەکەمان و جێ پەنجەی لە بواری ئایدیای نوێ بە بەشی کوردیی دەنگی ئەمەریکاوە تا ماوەیەکی دوور هەر دەمێنێ.

لەو ماوەی کە لە دەنگی ئەمەریکادا کارم دەکرد، ڕێبەرانی سیاسی و کولتووری کوردی عێراق و کوردانی بەشەکانی تری کوردستانیش ناوە ناوە سەردانی دەنگی ئەمەریکا و بەشی کوردییان دەکرد. لە ناویاندا: سەرکۆماری عێراق مام جەلال تاڵەبانی، سەرۆکی هەرێمی کوردستان کاک مەسعود بارزانی، دکتۆر فوئاد مەعسوم و دکتۆر بەرهەم ساڵح، کە ئەوانیش دواتر یەک بە دوای یەکدا بوون بە سەرکۆماری عێراق، کاک هوشیار زێباری، وەزیری دەرەوەی عێراق، کاک کامەران قەرەداغی، کە لە ڕادیۆی عێراقی ئازاد لە پراگەوە

هات کۆڕێکی بەپێزی تایبەت بە میدیای پێشکەش کردین، کاک کەریمی حیسامی، نووسەر و سیاسەتکار و ئی تریش. بەشی کوردی و هەندێ لە بەشەکانی تری دەنگی ئەمەریکاش وەک فارسی و عەرەبی و ئینگلیزی سەردانی ئەو بەڕێزە کوردانەیان دەقۆستەوە و چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا دەکردن.

هەر لەمیانەی سێزدە ساڵ کارکردنم لە دەنگی ئەمەریکا، چەندین جار لەلایەن کۆمەڵ و ڕێکخراوانی کوردی ئەورووپاوە بۆ کۆنسێرت و کۆڕی کولتووری و ئەدەبییات بانگهێشت دەکرام. دوو جار کۆنسێرتم لە ستۆکهۆڵم بە ئەنجام گەیاند، جاری یەکەم پێکەوە لەگەڵ لارای کچم لە کۆتایی نەوتەکانی سەدەی رابردوو و جاری دووەمیش چەند ساڵێک دواتر، هەر خۆم بە تەنیا کۆنسێرتێکم پێشکەش کردن.

لە شاری بەرلینی پایتەختی ئاڵمانیاش کونسێرتێک و کۆڕێکم هەبوو، کە پێم وایە یان لەسەر ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی بوو، یان لەسەر مێژووی دەنگی ئەمەریکا.

لە لەندەن دیسان لەگەڵ لارا کۆنسێرتێکمان لە هۆڵی گەورەی هامەرسمیث Hammersmith بۆ ڕێک خرا و جگە لەوەش کۆڕێکیشم لەسەر موزیکی میللیی کوردی لە بارەگای سەنتەرێکی رۆشەنبیری کورد لە لەندەن ئەنجام دا. لە ڤیەننا و لە پاریس کۆڕەکانم لەبارەی مێژووی دەنگی ئەمەریکا بوون. کەناڵی تی ڤی (مێد تی ڤی MED TV) لە برۆکسلی پایتەختی بەلژیک، کۆنسێرتێکی بۆ ساز کردم و لە ئەمستەردامی هۆڵەنداش کۆڕێکم لەسەر، پێم وایە دەنگی ئەمەریکا ئەنجام دا. لە ئەمەریکاش لە شاری فێرفاکس لە ڤیرجینیا کۆڕەشیعرێکم پێشکەش بە دانیشتووە کوردەکانی ئەو ناوچەیە پێشکەش کرد. راستییەکەی کوردانی ئەورووپا بەردەوام داوایان لێ دەکردم بۆ کۆنسێرت، بەڵام لە لایەکەوە کارەکەی رادیۆم لە واشتن ماوەی نەدەدام وا زوو زوو مۆڵەت وەرگرم و لە لایەکی تریشەوە موزیکژەنی بەدڵی خۆمم دەست نەدەکەوتن، خۆیان لەگەڵ ئاوازەکانی مندا

بگونجێنن. زۆر جار لە کاتی راهێنانی بەر لە دەسپێکی کۆنسێرتەکان لەگەڵ موزیکژەنەکان، لێم دەبوو بە جۆرێک تێکنەگەیشتن و لە ئەنجامدا گۆرانی گوتنەکەم بەدڵی خۆم بۆ نەدەهات.

هەر یەک ساڵ دوای بوونم بە سەرۆکی بەشی کوردیی دەنگی ئەمەریکا، بەرێز سانفۆرد ئونگەری بەڕێوەبەریش خۆی گواستەوە بۆ دەسگایەکی دیکە و بەم جۆرە لە ماوەی ساڵێکدا دوو کەسی خەمخۆری باشم لەدەست چوون، مایکڵ چایەتی سەرنووسەری بەشەکەمان و بەرێز ئونگەری بەڕێوەبەری دەنگی ئەمەریکاش.

دوای بەرێز ئونگەر، ئەمجارەیان بەرێز Robert Reilly کرا بە بەڕێوەبەری دەنگی ئەمەریکا، بەڵام ئەویش هێندە نەمایەوە و دوای رووخانی رژێمی سەدام حوسێن لە ساڵی 2003، گواسترایەوە بۆ بەغدا، بۆ سەپەرشتیکردنی میدیا لە عێراقدا.

ماوەی پتر لە سێزدە ساڵ لە بەشی کوردیی دەنگی ئەمەریکا دەستبەکار بووم، هەشت ساڵ وەک بێژەر و نووسەر و پێشکەشکاری بەرنامەی تایبەت بە فەرهەنگ و ئەدەبیات و زمانی کوردی، پێنج ساڵیش وەک سەرۆکی بەشەکە. لەو ماوەیەدا چەندین خەڵاتی دەستخۆشانە و ئافەرینم پێ بەخشرا و کورتەیەکی پرۆفایلیشم لە نامیلکەی ساڵانەی دەنگی ئەمەریکا بە ناوی پرۆفایل profile ی 2005 بۆ بڵاو کرایەوە. ئەمەی خوارەوە وەرگێڕانە کوردییەکەی ئەو پرۆفایلەیە:

**بەشی کوردی**

**هۆمەر دزەیی، سەرۆکی بەش**

ساڵی 1988هۆمەر دزەیی، پێکەوە لەگەڵ ژنەکەی و چوار منداڵەکانیان لە عێراقەوە باریان کرد بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان. چوار ساڵ دواتر هۆمەر لە بەشی کوردیی نوێکراوەی دەنگی ئەمەریکا وەک بێژەر بوو بە کارمەند. ساڵی 1992هۆمەر و هەڤاڵەکانی، بەشی کوردیی رادیۆی دەنگی ئەمەریکایان دامەزراند، کە سەرەتا بە تەنیا

15دەقیقەی رۆژانە دەستی پێ کرد. ساڵی 2000 هۆمەر بوو بە سەرۆکی بەشەکە و ئێستا بەشی کوردی رۆژانە بەرنامەکانی بۆ ماوەی چوار سەعات پەخش دەکات.

هۆمەر و خێزانەکەی بە سواری وڵاخ لە عێراقی سەدام حوسێن رایانکرد و سنووری شاخاویی مینرێژکراوی نێوان هەردوو وڵاتە تێک گیرساوەکان، عێراق و ئێرانیان بڕی. ئەوان وایان پلان دانابوو بگەنە وڵاتە یەکگرتووەکان، بەڵام چونکە ئێران ئەمەریکای بە دوژمن دەزانی، هۆمەر نیاز و نیەتی خۆی لای ئێرانییەکان نەدەدرکاند. بۆیە لەپێشاندا چوون بۆ ڤیەننا، ئینجا لەوێ داوای پەناهەندەیی سیاسییان لە وڵاتە یەکگرتووەکان کرد و وەریانگرت.

ژیانی هونەریی هۆمەر دزەیی وەک سترانبێژ و سترانووس، لە تەمەنی 15ساڵیدا دەستی پێ کردووە. ئەوساکە وشەی کوردی بۆ گۆرانییە ئەمەریکاییە بەناوبانگەکەی ئەو سەردەمە (ئامادۆ میۆ) دانا، کە ریتا هایوارث لە فیلمە کلاسیکەکەی (گیلدا) دەیگوت. لە ساڵی 1954یش لە تەمەنی 17ساڵیدا، یەکەم گۆرانییەکانی بۆ بەشی کوردیی رادیۆی بەغدا تۆمار کرد. لەپاش ئەوە هۆمەر رووی کردە ئەورووپا و پاش ماوەیەک بوو بە یەکێک لە خۆشەویسترین گۆرانیبێژی تی ڤیی کوردی لەناوەوەی عێراق، کە زۆر وەستایانە توانیی ئاوازی میللیی کوردی لەگەڵ موزیکی رۆژئاوایی تێکەڵ بکات. بەم جۆرە هۆمەر تایتلی "باڵوێزی خۆشخوان"ی پێ بەخشرا. هەر بەڕاستیش خۆی حەزی دەکرد ببێ بە دیپلۆمات و بۆ ئەم مەبەستە زانستی سیاسەتی لە زانکۆکانی ڤیەننا و پاریس و ئینگلتەرا خوێند و بڕوانامەی بەکالۆریۆس B.A. بە پلەی نایاب لە زانکۆی ریدینگ Readingی بەریتانی وەرگرت و دواتریش کورسە بنچینەییەکانی ماجستێری لە زمانانی بێگانە Foreign Languages لە زانکۆی جۆرج مەیسن لە ئەمەریکا خوێند.

هۆمەر ماوەیەک وەک میدیاکار لە باڵوێزخانەی عێراقی لە ڤیەننا و

لە پاشانیش وەک رۆژنامەوانێکی ئازاد دەستبەکار بووە.

هۆمەر دزەیی 10زمان دەزانێت و گۆرانییشیان پێ دەڵێت; نووسەریشە و کتێبی چاپکراوی هەیە.

ساڵی 2003 هۆمەر خەلاتی مەدالیای زێڕینی IBB (بۆردی نێونەتەوەیی بێژەران)ی پێ بەخشرا.

***

کورتە پرۆفایلەکەی من لە نامیلکە ساڵانییەکەی دەنگی ئەمەریکا، کەرتی زمانەکانی رۆژهەڵاتی نزیک و ئاسیای ناوەڕاست لێرەدا تەواو بوو.

بەڵام بۆ شانازیی بەشی کوردی و نیشانەی ئافەرین و دەستخۆشانە بۆ تەواوی بەشەکە، بەڕێوەبەرایەتیی دەنگی ئەمەریکا هەر بە پرۆفایلی سەرۆکی بەش هۆمەر دزەیی نەوەستا. رۆڵی کاریگەری عومەر شێخموسی سینیۆر سەرنووسەریش لە پێشخستن و گەشەپێدانی بەرنامەکان لەبەرچاو گیرا و پێکەوە لەگەڵ هی سەرۆکی بەش و هەموو کارمەندە لێهاتووەکانی بەشی کوردی، وەک تیمێکی توکمەی سەرکەوتوو نرخێندرا. بۆیە هەر لە هەمان نامیلکەی دەنگی ئەمەریکا بۆ ساڵی 2005، ئەم پرۆفایلەش لەسەر کاک عومەر شێخموسی سینیۆر سەرنووسەر بڵاو کرایەوە، کە ئەمە وەرگێڕانە کوردییەکەیەتی:

بەشی کوردی

عومەر شێخموس، سینیۆر سەرنووسەر

عومەر شێخموس، کە بە رەچەڵەک سوورییە، دەرچووی زانکۆی لەندەنە بە بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان. هەروەها ماستەریشی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان وەدەست هێناوە/ سیاسەتی نێونەتەوەیی لە زانکۆی ستۆکهۆلم. لە سەردەمی ساڵانی خوێندکارییدا، شێخموس ئەندامی کۆمیتەی بەڕێوەبەر بووە لە کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا و سەرنووسەری گۆڤاری (کوردستان)ی ئۆرگانی کۆمەڵە بە زمانی ئینگلیزی بووە. شێخموس

لەپاش دەرچوونی، لە بواری زانستی سیاسەت لە زانکۆی ستۆکهۆڵم، دەستی بە وانەگوتنەوە کردووە. هەروەها وانەبێژ و توێژەریش بووە لە بواری کۆچباریی نێونەتەوەیی و پەیوەندییە رەگەزییەکان. شێخموس چەند کۆرسێکی تایبەت بە ئایین، کۆمەڵگا و سیاسەت لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی دەگوتەوە و بەشداریشی لە چەند پرۆژەی توێژینەوەدا کردووە وەک وەرگرتنی پەنابەران و تێکەڵکردنیان لەناو کۆمەڵگای سویدیدا، دینداری و گونجاندنی پەنابەران لەگەڵ کۆمەڵانی سویدی، توندڕەوی و جیهانبینییەکی جیاواز.

لە شەستەکان و هەفتاکاندا، شێخموس یارمەتیی بزووتنەوەی بەرگریی کوردیی داوە لە ئێران و لە عێراق، بە رێگای سەرپەرشتیکردنی چەندین رۆژنامە و بلاوکراوەیان بە کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی. بۆ ماوەی چەند ساڵیش پێکەوە لەگەڵ ژنە سویدییەکەی، بوون بە پێشمەرگە لە شەڕی دژی رژێمی سەدام حوسێن بۆ ئۆتۆنۆمیی کورد لە عێراق. ساڵی 2001 عومەر وەک سینیۆر سەرنووسەر لە بەشی کوردیی دەنگی ئەمەریکا دامەزرا هەر یەک مانگ پێش هێرشە تیرۆریستەکەی11سێپتەمبەر بۆ سەر ولاتە یەکگرتووەکان. عومەر بەرنامەکانی بەشی کوردی بە چاوپێکەوتن و مێزگرد لەگەڵ شارەزایانی ناوخۆ و دەرەوەی ولاتە یەکگرتووەکان دەوڵەمەند کرد. کە شەڕی عێراقیش خەریک بوو لە ئاسۆ سەر هەڵبدا، عومەر لەگەڵ سەرۆکی بەشی کوردی کاریان لەسەر ئەوەدا دەکرد، بەرنامەکانی بەشی کوردیی دەنگی ئەمەریکا لە یەک سەعات درێژ بکەنەوە بۆ چوار سەعاتی رۆژانە.

***

پرۆفایلەکەی عومەر شێخموسیش لێرەدا تەواو بوو.

بەم جۆرە بەشی کوردیی دەنگی ئەمەریکامان بەڕێوە دەبرد و خۆمان و کارمەندەکانیشمان ساڵ بە ساڵ زیاتر ئەزموونمان پەیدا دەکرد و دەستخۆشانەی زۆریشمان لە هەر چوار پارچەی

کوردستانەوە بۆ دەهات. ناتوانم بڵێم کە رەخنەمان لێ نەدەگیرا. بەڵێ جاروبار گلەیی و رەخنەمان، بەتایبەتی لەلایەن شارەزایان و خەمخۆرانی زمانەوە پێ دەگەیشت. ئەمەش زۆر ئاسایی بوو بۆ زمانی کوردی، چونکە ئێمە لەناو خۆماندا بە هەردوو شێوەزاری کرمانجی و سۆرانی، فەرهەنگێکی تایبەتمان دانابوو، وەک بڵێیت فەرهەنگی تایبەتی دەنگی ئەمەریکا بوو، کە هەموو بێژەرەکان لەسەری بڕۆین. فەرهەنگێکی تایبەت بە وشەمەنی و دەستەواژە سیاسی و ئابووری و تەکنۆلۆژییەکان و زۆر بواری دیکە، کە لەو هەموو فەرهەنگە ئینگلیزی و کوردییانەی لەبەر دەستماندا بوون دەست نەدەکەوتن، ناچار خۆمان بۆمان دادەڕشت. جا لێرەدا هەندێ جار گلەییمان لەسەر ئەو وشە و دەستەواژانە بۆ دەهات، کە بۆ هەندێ لە گوێگرەکانمان نامۆ بوون، بەڵام بەگشتی و لە ئەنجامی راپۆرتی سالانەی دەنگی ئەمەریکا، کە راپرسییان لە کوردستان دەکرد، دەردەکەوت کە زۆرترایەتیی هەرە زۆری گوێگرەکانمان بە زمان و بەرنامەکانمان رازین. نابێ لەبیریشمان بچێ، کە هەر جارێکی ماوەی پەخشی بەشی کوردی لە دەنگی ئەمەریکا زیاد دەکرا، دەبوایە بەو پێیە ئێمەش کارمەندی زیاتر پەیدا بکەین و ناچاریش دەبووین هەر لەناو ئەمەریکا ئەو کارمەندە نوێیانە بدۆزینەوە، چونکە نەماندەتوانی شارەزایانی زمانی کوردی لەدەرەوەی ئەمەریکا بێنین، لەبەر کێشەی کاروباری ڤیزە و شتی وا. ئەوانەی لە ئەمەریکاش بوون، خۆ کەس ناڵێ هەموویان لە زمانی کوردی پسپۆڕ بوونە. بۆیە ئێمە لە بەرایی دامەزراندنی بەشی کوردی دەنگی ئەمەریکا، بەڕاستی ئەرکێکی گرانمان لەسەر بوو و رێیەکی سەختمان لەبەر بوو.

## مام جەلال داوای لێ کردم بمکا بە باڵوێزی عیراق

لـە یەکێـک لـە سـەردانەکانی بـۆ واشـنتن، جەنابـی مـام جـەلال تاڵەبانـی، کـە هێشتا نەشـکرابوو بـە سـەرکۆماری عێراق، پێـی راگەیانـدم کـە پێویسـتی بـە باڵوێـزی کـورد هەیـە و چەنـد کەسێکی بـۆ ئـەم پۆستە لەبەرچـاو گرتـووە. گوتـی چـون تـۆ زانسـتی سیاسـەتت تـەواو کـردووە، نزیکـەی بـە دە زمـان قسـە دەکەیـت و ماوەیەکـی زۆریـش لـە ئەوروپـا و ئەمەریـکا ژیاویـت، بۆیـە لـە تـۆم باشـتر بـۆ ئـەم پۆستە دەسـت ناکەوێـت، وەرە بگەڕێـوە بـۆ عێـراق دەتکـەم بـە باڵوێـز.

منیـش کـە هـەر لـە کۆنـەوە حـەزم لـە دوو پیشـە بـووە ( موزیـک و دیپلۆماسـی) و هـەر سـەبارەت بـەوەش بـوو کـە لـە کاتـی خـۆی دەستم لـە کۆلێـژی پزیشـکی لـە زانکـۆی ئانکـەرە هەڵگرتبـوو و سـەرەتا بـە نیـازی خوێندنـی موزیـک بـووم لـە ڤیەننـا، بـەڵام دواتـر کـە ئـەوەش سـەری نەگـرت بـۆم، یەکسـەر خـۆم لـە کۆلێـژی زانسـتی سیاسـەت لـە زانکـۆی ڤیەننـا ناونـووس کردبـوو. بۆیـە پێـم خـۆش بـوو و بڕیـارم دا خـۆم لـە دەنگـی ئەمەریـکا خانەنشـین بکـەم و بـە نیـازی بـوون بـە باڵوێزی عێـراق بگەڕێمـەوە بـۆ بەغـدا.

ئەوە بـوو کـە بـۆ جـاری دووەم داوای خانەنشـینیم لـە دەنگـی ئەمەریکا کـرد و وەرمگرت.

بـۆ دواتریـن رۆژی کارمەندیـم لـە دەنگـی ئەمەریـکا، گردبوونەوەیەکی زۆر بەسـۆزیان بـۆ کـردم. بەڕێوەبـەری دەنگـی ئەمەریـکا و بەڕێوەبـەری کەرتـی زمانەکانـی رۆژهەڵاتـی نزیـک و ژمارەیەکـی تریـش لـە سـەرۆک بەشـە زمانەکانـی تـر و بەڕێوەبـەری ژمارەیـەک دەسـگا و دەرهێنـەر و ئەندازیـاری دەنـگ و دۆسـت و ئاشـنایانی، کـە لـەو ماوەیـەی نزیکـەی چـواردە سـاڵ کارکردنـم لـە گەڵیانـدا بووبوویـن بـە هەڤـاڵ و هۆگـری

یەکتری، ئەمە سەرباری هاوکارانی خۆم لە بەشی کوردی، هەموو پێکەوە گرد بووبووینەوە. ئەمانە بە وتە و دیاری ماڵئاواییەکی بەڕاستی پڕ لە جۆش و خرۆشیان لێ کردم و خۆشم لە وتەی سوپاسگوزاریمدا فرمێسک لە چاومدا گیری خواردبوو.

هۆمەر کە مامۆستای زمان بوو لە گوندێکی بچووکی ویلایەتی ڤێرمۆنت لە هەرە سەرووی باکووری ئەمەریکا نزیک سنووری کەنەدا

زمانەوان و نووسەری ئەمەریکی مایکڵ چایەت ، سەرنووسەری پێشووی بەشی کوردی وێستگەی دەنگی ئەمەریکا

یەکەم کارمەندانی بەشی کوردی دەنگی ئەمەریکا لەگەڵ بەڕێز سەلمان حیلمی سەرۆکی زمانەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە دەنگی ئەمەریکا VOA

لە ڕاستەوە: پیتەر گالبریث، ڕوناس هاوسەری هۆمەر دزەیی، هۆمەر، لارای کچی هۆمەر

بەڕێز سانفۆرد جەی ئونگەر، بەڕێوەبەری ئەوسای دەنگی ئەمەریکا

دوای پێکهاتنمان و گەڕانەوەم بۆ دەنگی ئەمەریکا وێنەیەکی یادگاری سەرۆکی بەشی کوردی نوێ دانراو هۆمەر دزەیی و بەڕێوەبەری ئەوسای دەنگی ئەمەریکا سانفۆرد جەی ئونگەر

لە چەپەوە: کامەران قەرەداغی ، ڕووناس هاوسەری هۆمەر ، هۆمەر دزەیی، هیوا مەحمود عوسمان

بەڕێوەبەری رادیۆی العراق الحر لە پراگ دێڤید نیوتن (یادی بەخێر)

لە راستەوە: کامەران قەرەداغی ، نەبیل یاسین ، دێڤید نیوتن لە یەکەم رۆژی پەخشی رادیۆی العراق الحر 1998 / 10 / 30 لە پراگ.

له چەپەوە: محەمەدی مەلا مەعسوم ، کامەران قەرەداغی، هۆمەر دزەیی، (بیرم نەماوە کێ یە) ، حەمید بڵباسی جوانەمەرگ. لەندەن 1996

سەرکۆماری عیراق بەڕێز مام جالال تاڵەبانی لە نێوان هۆمەر دزەیی راوێژکاری و روناس خانی هاوسەری هۆمەر لە کۆشکی کۆماری لە بەغدا

سەرۆکی هەرێمی کوردستان بەڕێز مەسعود بارزانی و وەزیری دەرەوەی عیراق بەڕێز هوشیار زێباری لەگەڵ بەڕێوەبەری کەرتی زمانەکانی رۆژهەڵاتی نزیک بەڕێز ئیسماعیل دەحیات لە دەنگی ئەمەریکا

لە بەشی کوردی دەنگی ئەمەریکا: سەرکۆماری ئەوسای عیراق بەڕێز مام جەلال تاڵەبانی و سەرکۆماری دواتری عیراق دکتۆر بەرهەم ساڵح و سەرۆکی بەشی کوردی هۆمەر دزەیی لەگەڵ بەڕێوەبەری کەرتی زمانەکانی رۆژهەڵاتی نزیک ئیسماعیل دەحیات.

لە فڕۆکەخانەی واشنتن هۆمەر دزەیی لە نێوان مام جەلال دواتر سەرکۆماری عیراق و کاک مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان

سەرکۆماری عیراق دکتۆر بەرهەم ساڵح پێشوازی لە هۆمەر دزەیی برادەری دێرینی دەکات لە کۆشکی سەرۆکایەتی لە بەغدا.

لە بەشی کوردی دەنگی ئەمەریکا لە راستەوە: محەمەد سابیر دواتر باڵیۆزی عیراق لە چین، هۆمەر دزەیی، دکتۆر فوئاد مەعسوم دواتر سەرکۆماری عیراق، بەڵێن ساڵح.

وتەی بەڕێوەبەری دەنگی ئەمەریکا بەڕێز رۆبێرت رایلی لە یادەوەری دە ساڵەی کردنەوەی بەشی کوردی.

وتەی سەرۆکی بەشی کوردی دەنگی ئەمەریکا هۆمەر دزەیی لە یادەوەری دە ساڵەی کردنەوەی بەشی کوردی.

وتەی بەڕێوەبەری کەرتی زمانەکانی رۆژهەڵاتی نزیک لە دەنگی ئەمەریکا بەڕێز ئیسماعیل دەحیات لە یادەوەری دە ساڵەی کردنەوەی بەشی کوردی.

**Subject:** Homer Dizeyee, Chief of Kurdish Service
**Resent-From:** voa-notices@VOA.GOV
**Date:** Wed, 29 Mar 2000 12:34:42 -0500
**From:** IBB Notices Administration <notices@IBB.GOV>
**Reply-To:** do-not-reply-to-this-message@IBB.GOV
**Organization:** U.S. International Broadcasting Bureau
**To:** IBB Staff <notices@IBB.GOV>

MEMORANDUM FOR: All IBB Employees

FROM: VOA - Sanford J. Ungar

SUBJECT: Homer Dizeyee, Chief of the Kurdish Service of the Near East and North Africa Division, Voice of America

I am pleased to announce that Mr. Dizeyee has been selected to serve as Chief of the Kurdish Service within the Near East and North Africa Division, Voice of America, International Broadcasting Bureau, effective February 24, 2000.

As Chief, Mr. Dizeyee will be responsible for directing the development, production and broadcast of all Kurdish programming for the Voice of America.

Mr. Dizeyee returns to us following a brief retirement from the VOA.

یادداشتی بەڕێوەبەری دەنگی ئەمەریکا بۆ ڕاگەیاندنی دانانی هۆمەر دزەیی بە سەرۆکی بەشی کوردی دەنگی ئەمەریکا

ناسنامەی زانکۆی هۆمەر دزەیی کە خوێندکاری ماستەر بوو لە زمانەوانی لە زانکۆی جۆرج مەیسن

No. **8856**

Expires **03/11/2008**

Journalistic Identification

**VOICE OF AMERICA**
**Washington, D.C.**

Signature

ناسنامەی هۆمەر دزەیی هی دەنگی ئەمەریکا VOA

AN OFFICIAL TRANSCRIPT HAS HEAT-SENSITIVE I

**George Mason Unive**

Fairfax, Virginia 22030

**OFFICIAL TRANSCRIP**

**Student Name:** Omar M Dizeyee
**Student ID:** G00175020
**Date Issued:** 29-JAN-2013
**Level:** Graduate

**Issued To:** OMAR DIZEYEE
4191 LOCHLEVEN TRAIL, UNIT 404
FAIRFAX, VA 22030-8703

Course Level: Graduate
Only Admit: Spring 1991

Current Program
Master of Arts
College : College of Arts and Sciences
Major : Foreign Languages

| SUBJ NO. | COURSE TITLE | CRED | GRD | PTS R |
|---|---|---|---|---|
| INSTITUTION CREDIT: | | | | |
| Term: Spring 1991 | | | | |
| College of Arts and Sciences | | | | |
| Foreign Languages | | | | |
| FRLN 565 | Thery of Translation | 3.00 | W | 0.00 |
| GERM 560 | Hist of German Lang | 3.00 | A | 12.00 |
| Term: Ehrs: 3.00 GPA-Hrs: 3.00 | QPts: | 12.00 | GPA: | 4.00 |
| Good Standing | | | | |
| Term: Fall 1991 | | | | |
| College of Arts and Sciences | | | | |
| Foreign Languages | | | | |
| ENGL 592 | History of English Lang | 3.00 | B | 9.00 |
| GERM 525 | The Young Vienna Cilcle | 3.00 | | 0.00 |
| Term: Ehrs: 3.00 GPA-Hrs: 3.00 | QPts: | 9.00 | GPA: | 3.00 |
| Good Standing | | | | |

************************ TRANSCRIPT TOTALS ************************

| | Earned Hrs | GPA Hrs | Points | GPA |
|---|---|---|---|---|
| TOTAL INSTITUTION | 6.00 | 6.00 | 21.00 | 3.50 |
| TOTAL TRANSFER | 0.00 | 0.00 | 0.00 | 0.00 |
| OVERALL | 6.00 | 6.00 | 21.00 | 3.50 |

************************ END OF TRANSCRIPT ************************

ITY NAME APPEARS IN WHITE PRINT ACROSS THE FACE OF THIS 8.5 X 11 INCH RECORD

تۆماری ماستەرم لە سیمستەری بەهاری 91 لە زانکۆی جۆرج مەیسن

# بەشی 34

## بای بای VOA دەنگی ئەمەریکا، لەبیرتان ناکەم، لەبیرم مەکەن

### بە ئومێدی باڵیۆزی گەڕامەوە بۆ بەغدا

بە ئومێدی باڵیۆزیی گەڕامەوە بۆ بەغدا لە 31/3/2005 کارتی خانەنشینیم لە دەنگی ئەمەریکا وەرگرت و بۆ مانگی پێم وایە پێنجی هەر ئەو ساڵە گەڕامەوە بۆ بەغدا. لە بەغدا لەگەڵ کاک رزگاری برازام چووینە لای جەنابی مام جەلال کە تازە لە 6/4/2005 ببوو بە سەرکۆماری عیراق و پیرۆزباییمان لێ کرد. مام جەلال بە تایبەتی بە بینینی رزگاری کوڕی کاک ئەحمەدی یەکێک لە دۆستە دێرینە هەرە خۆشەویستەکانی تێکەڵەیەکی خەم و خۆشی یەکسەر خۆی بە ئاکاری روویەوە نواند. خۆشەویستیی مام جەلال بۆ کاک ئەحمەد بێ سنوور بوو.

دواتر دوای ماوەیەک مام جەلال پێی راگەیاندم کە یەکەم گرووپی کورد بۆ باڵیۆزی لە یەکیەتی و پارتییەوە ناویان دەرچووە و گوتی وا خەریکین گرووپی دووەم ئامادە دەکەین و ناوی تۆ لە لیستی ئەو گرووپی دووەمەدا دەبێ چاوەڕێ بن تا لە وەزارەتی دەرەوە بانگتان دەکەن. منیش گەڕامەوە بۆ کوردستان و لە سلێمانی لە ئوتێل سلێمانی پالاس دانیشتم چاوەڕێی دەرچوونی گرووپی دووەم و بانگکردنم بووم لەگەڵ ئەو برادەرانەی دیکە کە ئەوانیش وەک

مـن ناویـان لەنـاو لیسـتەی گرووپـی دووەمـدا بـوون. ئەوانـەی کـە زوو زوو دەمدیـن و وەک خـۆم لـە چاوەڕوانیـدا بـوون کاک بەکـر فەتـاح و کاک حوسـێن سـنجاری بـوون. دەگوتـرا کـە لـەم گرووپـەش هـەر یـەک لـە پارتـی و یەکیەتـی چـوار باڵیـۆزی بەردەکـەوێ. راسـتە مـن ئەنـدام نەبووم نـە لـە یەکیەتـی نـە لـە هیـچ حزبێکـی دیکـە، ئەمـن تەنهـا دەسنیشـانکراوی جەنابـی مـام جـەلال بـووم. جـا مـن و بەکـر و حوسـێن و ئـەوی چـوارەم کـە نازانـم کـێ بـوو چاوەڕوانـی بانگکردنمـان بوویـن بچینـە بەغـدا بـۆ چاوپێکەوتـن لـە وەزارەتـی دەرەوە.

ئەوسـا هەفتەنامەیەکـی بـە زمانـی ئینگلیـزی بـە نـاوی سـۆما Soma لـە سـلێمانی دەردەچـوو کـە هێرۆخانـی هاوسـەری مـام جـەلال سپۆنسـەریی دەکـرد و سەرنووسـەری هەفتەنامەکـەش کچێکـی کەنـەدی بـە رەچەڵـەک ئەرمەنـی بـوو. جـا لـەو ماوەیـەی کـە مـن لـە سـلێمانی لـە چاوەڕوانـی بوونـە باڵیۆزیـم بـووم سـۆما پەیوەندیـی پێـوە کـردم بـۆ چاوپێکەوتنێـک. ئەمـەی خـوارەوە وەرگێـردراوە کوردییەکـەی دەقـە ئینگلیزییەکـەی چاوپێکەوتنەکەیـە کـە بەڕێـز لارا فەتـاح لەگەڵیـا کـردم و لـە ژمـارە 13 ی 2006/9/28 15-ی سـۆما بـڵاو کرایـەوە.

## ئۆدیسەی موزیکاڵی هۆمەر
## لارا فەتاح سلێمانی

لە کاتێکدا کە چاوەڕوانی پۆستی باڵیۆزیی دەکات، هۆمەر دزەیی سترانبێژ دەڵێ دیپلۆماتان پێویستە بە شێوەیەک پەروەردە کرابن کە بتوانن پەیوەندییەکی چاک بە وڵاتە میواندارەکەیانەوە ببەستن.
کۆفی شۆپەکەی ئۆتێل سلێمانی پالاس، بووەتە شوێنی هەمیشەی دانیشتنی کەسانی ناسراو، شوێنێکی گونجاویشە بۆ ئەوانەی بۆ باسکردن لە کار و کارداری لەوێ گرد دەبنەوە
هۆمەر دزەیی یەکێکە لە سترانبێژە کوردە هەرە ناودارەکان و گەلێک جار لە شوێنە جوانەکانی ئەم ئۆتێلە دەبیندرێ خەریکی کۆبوونەوەیە، بەر لەوەی ناوی بۆ پۆستی باڵیۆزی دەربچێ.
دزەیی سەرەڕای ئەوەی کە ژیانی دوای منداڵیی هەر لە ئەوروپا و ئەمەریکا بەسەر بردووە، کەچی بە چەند دەرکەوتنێکی لە تی ڤی و رادیۆی عێراق لە دوادواییەکەی شەستەکان و بەرایی حەفتاکاندا توانی بناغەیەکی زۆر پتەوی یار و ئاشقانی زۆر وەفادار لە سەرانسەری عێراقدا بۆ خۆی دابکوتێ
دزەیی دەڵێ: "ئەمن لە ساڵی 1969 لە تی ڤیی عێراقدا دەرکەوتم و ئەوەش سەرەتای ناوبانگیم بوو. هەڵبەت ئەوسا زۆر جیاواز بوو لەوەی کە ئەمڕۆ سترانبێژە لاوەکان بە کلیپ دەیکەن"، بەلام دزەیی هەر ئەوها بە شەو و رۆژێک ناوبانگی دەرنەکرد. خۆی لەپاش شکستی سەرهەڵدانە کوردییەکەی ساڵی 1975 لە گەلێک بۆنەی کوردە ئاوارەکانی ئەوروپا دەردەکەوت. دزەیی دەڵێ: "تەنیا لەپاش 1975 بوو کە دەتوانی بڵێیت کەشێکی کولتووری کوردی لە ئەوروپا سەری هەڵدا. جا لەو کەشەدا بوو، کە توانیم زەمینەی ئاشقانی دەنگ و موزیکم فرەوانتر بکەم".

بـۆ سـەردەمی خـۆی موزیکـی دزەیـی شۆڕشـێک بـوو، هـەر وەک کـە نـەوەی کەمێـک جوامێـری ئەمـڕۆ حـەز لـە تێکەڵکردنـی موزیکـی کـوردی بـە موزیکـی پەپـی ڕۆژئاوایـی ناکـەن، ئەوهـاش نـەوەی کۆنـی سـەردەمی دزەییـش حەزیـان لـە ڕەنگکردنـی موزیکـی میللـی کـوردی و موزیـک و گۆرانییەکانـی خۆیشـی بـە بۆیـەی موزیکـی مۆدیـرن نەدەکـرد.

بەناوبانگتریـن گۆرانیـی دزەیـی "یـادی جـاران"ە، کـە بـاس لـە یادگارەکانـی خـۆی دەکات و ئەمـە تەرجومەیکـەی نزیکـی هەنـدێ لـە وشـەکانیەتی { ئـەم گوتـارە بـە ئینگلیـزی یـە نووسەرەکەشـی چەنـد دێڕێکـی شـیعرەکەی منـی بـەم شـێوەیە لـە کوردییـەوە گۆڕیوەتـە سـەر ئینگلیـزی کـە زۆر نزیکـە لـە شـیعرە بنەڕەتییەکـەوە - هۆمـەر }.

ئێواران لە پیاسەکانا
بە ڕێ و بانە چۆڵەکانا
کە توند دەمگرتی دە ئامێز
بە دڵی خۆم وەدەنای بەهێز

دزەیـی خـۆی هەڵبەسـتەکەی نووسـیوە و ئاوازەکەشـی بەدەسـتکارییەوە لـە هەوایەکـی کۆنـی کافکاسـییەوە وەرگرتـووە. خـۆی گەلێـک لـە گۆرانییەکانـی دزەیـی بـەم شـێوەیەن، ئـەو هەڵبەسـتەکان بـە فۆرمێـک دادەڕێژێـت، کـە بەدەسـتکارییەوە لەگـەڵ ئـاوازەکان بگونجێـن، یانیـش پێچەوانەکـەی.

دزەیـی بـە خەندەیەکـەوە دەگێڕێتـەوە و دەڵـێ: "پیـرەکان دەیانگـوت راسـتە مـن گۆرانـی بـە کـوردی دەڵێـم، بـەڵام دەیانگـوت ئـاوازەکان ئینگلیزیـن". هەروەهـا دەڵـێ: "گۆڕانـی کولتـوور شـتێکی باشـە. ئەگـەر لـە ئەوروپـا ئـەو گۆڕانانـە ڕوویـان نەدابـوا، ئەوسـا ئـەو هەمـوو سـتایلە موزیکاڵـەی کـە بۆمـان ماونەتـەوە وەک بـارۆک، کلاسـیک یـان ڕۆمانتیکمـان لەکـوێ دەبـوو؟ خەڵـک هەمیشـە چاوی بڕیوەتـە گۆڕانکاری لـە بـواری موزیکـدا، بـەڵام ڕاسـتییەکەی ئـەم گۆڕانـە لـە هەمـوو بوارێکـی هونـەردا ڕوو دەدات و خـۆی هـەر دەبـێ واش بـێ".

لە دەوروبەری 1992دا دزەیی لە ولاتە یەکگرتووەکان گیرسایەوە و لەگەڵ چەند کەسێکی تردا داوایان لێ کرا بەشی کوردیی دەنگی ئەمەریکا VOA دابمەزرێنن، کە وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا لە واشنتن خەرجییەکەی گرتبووە ئەستۆ.

لەم رووەوە دزەیی دەڵێ: "ئەگەر راستیت دەوێ، ئەمن کەمێک لام سەیر بوو، کە (دەنگی ئەمەریکا VOA) نەک (بی بی سی BBC) ئەم بەشە کوردییەی کردەوە". گوتی: "ساڵانێک بوو و ئێستەشی لەگەڵدا بێ، خەڵک چاوەڕوانی ئەوە بوون کە (بی بی سی) بەشێک بە زمانی کوردی بکاتەوە، چونکە ئەوە بەریتانیایە کە مێژوویەکی درێژی لەگەڵ کورددا هەیە. جا کوردێکی زۆر وا بیر دەکەنەوە کە (UK) ئیلتیزامێکی ئەخلاقیی بەرامبەر بە کورد هەیە".

لەو سێزدە ساڵەی کە دزەیی لە دەنگی ئەمەریکا کاری دەکرد، پەخشەکانی بەشی کوردی بە 15خولەکی رۆژانە دەستی پێ کرد و گەیشتە چوار سەعاتی جیاجیای رۆژانە. لەم ماوەیەدا دزەیی لە کاری بێژەری و سەرنووسەری بەرنامەکانەوە، بوو بە سەرۆکی بەشی کوردی و ژمارەی کارمەندەکانیشی لە پێنج کەسەوە گەیاندە نزیکەی بیست.

ساڵی 2005، دزەیی خۆی لە دەنگی ئەمەریکا خانەنشین کرد، چونکە سەرکۆماری عێراق، جەلال تاڵەبانی، داوای لێ کرد پۆستی دیپلۆمات وەرگرێ. جا دزەیی هەروا بە ئومێدی ئەو پۆستەیە. لاریی نییە رێچکەی کارکردنی لە ژیانیدا لە یەکێک لە ولاتانی ناوچەی دەریای ناوەڕاستدا بە کۆتایی بێنێ، کە بە بۆچوونی ئەو تێکەڵەیەکە لە کولتووری رۆژهەلات و رۆژئاوا. دزەیی پشووی درێژە و ئارامیی هەیە، چونکە دەڵێ ئەم ماوەیەی چاوەڕوانیی بۆ چەندین پرۆژەی تری خۆی بەکار دێنێ، کە رەنگە پێشتر کاتی بۆ نەبووبێت. لەم رووەوە، دزەیی بە دەستە جلە رەنگ کاڵە هاوینییەکەی، کە هەر دەڵێی دیپلۆماتە و بە زەردەخەنەیەکەوە دەڵێ: "ساڵانێکە خەڵک داوام لێ

دەکەن، تەواوی گۆرانییەکانم و تەواوی نووسینەکانم لەسەر ئەدەبیاتی زارەکیی کوردی بخەمە سەر سی دی".

دزەیی بەنیازە هەموو گۆرانییەکانی لەگەڵ گرووپی موزیکاڵی سەهەند لە سلێمانی سەرلەنوێ تۆمار بکاتەوە. دەڵێ: "کە لە دەنگی ئەمەریکا بووم، هەموو هەفتەیەک بەرنامەیەکی تایبەتم هەبوو لەسەر ئەدەبیاتی زارەکیی کوردی. ئەمن ئەو کەرەستانەم هەر لە تەمەنی چواردە ساڵیمەوە کۆ کردبووەوە و ئەوە لە دنگی ئەمەریکا بوو، کە بۆ یەکەم جار هەستم کرد پێویستە پێداچوونەوەیەک بەو کەرەستانەدا بکەمەوە، شییان بکەمەوە و بڵاویان بکەمەوە".

جا ئەمە تەنیا دوو پرۆژەیە، کە دزەیی بەتەمایە بە ئەنجامی بگەیەنێت، بەڵام پێشتر کتێبێکی شیعرەکانیشی بە ناوی (چیرۆکی ئەویندارییم) بە چاپ گەیاندووە.

لە چاوەڕوانیی پۆستە دیپلۆماسییەکەی، دزەیی زۆر بە جۆش و پەرۆشەوە دەڵێ، کە دیپلۆماتان پێویستە بە شێوەیەک پەروەردە کرابن، کە بتوانن پەیوەندییەکی چاک بە وڵاتە میواندارەکانیانەوە ببەستن.

***

گوتارەکەی هەفتەنامەی سۆما لێرەدا بە کۆتایی هات.

لەو ماوەیەش جارێکیان مام جەلالی سەرکۆمار زەلمای خەلیلزادی باڵیۆزی ئەمەریکا لە بەغدای بۆ ئێوارەخوانێک لە شارۆچکەی دوکان بانگهێشت کردبوو. میوانێکی زۆری تریش بۆ ئەو ئێوارەیە بانگهێشت کرابوون لە ناویانا کاکە سەعدی برام و خۆم. مام جەلال من و کاروانی کورمی لە تەنیشت خۆی دانابوو و خەلیلزادیش لەوبەر خوانەکە بەرامبەر مام جەلال شوێنی بۆ داندرابوو. بۆ ناساندن مام جەلال بەم چەند وشەیە منی پێشکەش بە خەلیلزاد کرد:

Mr. Dizeyee is one of my next ambassadors who "
speaks many languages and is also a famous Kurdish
singer

واتا بەڕێز دزەیی یەکێکە لە باڵیۆزەکانی داهاتووم کە زمانێکی زۆر دەزانێت و سترانبێژێکی ناوداری کوردیشە" مام جەلال هەر بەوەندە وشانە وازی لە من نەهێنا و وەک نەریتی هەمیشەی قسە خۆشی و نوکتەی لەگەڵ منا بەردەوام بوو و بەپێکەنینەوە بە خەلیلزادی گوت هۆمەر کەسوکاری بۆ خوێندن ناردیانە ئەوروپا بەڵام ئەو تافی لاویی لەجیاتی خوێندن هەر بە رابواردن بەسەر دەبرد. مام جەلال، وەک نەریتی باوی خۆی، باسکی لە ئەستۆم وەرێنا و بەردەوام بوو لە نوکتەکانی بەڵام لێرەدا خەلیلزاد ئاوڕێکی رووخۆشیی لە من دایەوە ئینجا رووی کردەوە مام جەلال و بە پێکەنینێکی زۆرەوە وەک بڵێی لەباتی من هاتبێتە جواب پێی بڕی گوتی stop it ,stop it.

هەرچۆنێکی بێ، ماوەیەکی درێژی چەندین مانگ دانیشتین تا لیستی دووەمی ناوی کاندیدەکانی پارتی و یەکیەتی لە وەزارەتی دەرەوەی عیراق دەرچوو. رۆژێکیان شیروانی موحسین دزەیی برازام کە لە ئۆفیسی کاک هوشیار زێباریی وەزیری دەرەوە دەستبەکار بوو تەلەفۆنی بۆ کردم گوتی مامە هۆمەر چوار ناوی پارتی و چوار ناوی یەکیەتیمان پێ گەیشتوون بەڵام ناوی تۆ لە ناو لیستی یەکیەتییەکاندا نییە. شیروان ئەمەشی خستە سەر گوتی ئەو لیستەی یەکیەتی کە پێشتر لامان بوو ناوی تۆی تیا بوو بەڵام لیستێکی تازەمان لە یەکیەتییەوە پێ گەیشتووە کە ناوەکانی پێشوو وەک خۆی ماون تەنها ناوی تۆی تێدا نەماوە. بە پەلەپڕووزێ و نیگەرانییەکی زۆرەوە خۆم گەیاندەوە لای مام جەلال و گلەیی خۆم دەربڕی گوتم مام جەلال حزبەکەت ناوی منیان دەرهێناوە دیارە یان چونکە حزبی نیم یانیش مەسەلەکە خزم خزمێنی تیایە و یەکێکی خزمی خۆیانیان لە جێی من داناوە. بەڵام ئەمەشم خستە سەر قسەکانم

گوتـم توخـوا مـام جـەلال خـۆ خۆشـت چـاک دەزانـی، لەوانـەی کـە دانـدراون کیهەیـان وەک مـن دەرچـووی کۆلێـژی علومـی سیاسـیە؟ کیهەیـان وەک مـن نزیکـەی دە زمـان دەزانـێ؟ کیهەیـان وەک مـن ئەزموونـی لـە سـیلکی دیپلۆماسـی هەبـووە کـە ئەمـن بـۆ مـاوەی چـوار سـاڵ وەک میدیـاکار لـە باڵیۆزخانـەی عیـراق لـە ڤیەننـا کارم کـردووە و ئەمـن وەرگێـڕی تایبەتـی باڵیۆزیـش بوویمـە لـە پێشکەشـکردنی ( باڵیۆزنامـە = اوراق اعتمـاد)ی و سـەردانەکانی باڵیـۆز بـۆ لای بەرپرسـە باڵاکانـی نەمسـا لەناویانـا دکتـۆر برونـۆ کرایسـکی راوێـژکاری نەمسـا ؟ کیهەیـان وەک مـن نزیکـەی چـواردە سـاڵ لـە دەسـگایەکی میدیـای نێونەتەوەیـی وەک دەنگـی ئەمەریـکا کاری کـردووە تـا ئـاگای لـە هەمـوو کـون و کەلەبـەری سیاسـەتی جیهانـا world politics هەبـێ ؟ گلەیەکـی زۆرم لـە بەرپرسـانی پلـە بـاڵای یەکیەتـی کـرد و دڵسـاردبوونەوەی خـۆم بـە جەنابـی مـام جـەلال راگەیانـد کـە ئەوانـە هـەر یەکـە تەنهـا خـزم و کـەس و نزیکانـی خۆیـان دێننـە پێـش. لێـرەدا مـام جـەلال هەڵچـوو و بـە تووڕەییـەوە گوتـی کـێ دەڵـی نـاوی تـۆی تێـدا نیـە !؟ ئەمـن بەخـۆم نـاوی تـۆم خسـتووەتە نـاو لیسـتی یەکیەتیـەوە، ئـەم قسـەیە چییـە نـاوی تـۆی تێـدا نیـە! گوتـم بەڵـێ مـام جـەلال قسـەی جەنابتـە و شـیروانی بـرازام ئەویـش هـەر قسـەی جەنابتـی کـردووە تکایـە مـاوەم بـدێ بـا قسـەکانم تـەواو بکـەم. شـیروان دەڵـێ راسـتە پێشـتر نـاوت هەبـووە بـەڵام دەڵـێ یەکیەتـی بـەم دواییانـە لیسـتێکی نوێـی نـاردووە کـە نـاوی تـۆی لـێ دەرهێنـراوە. گوتـم دیـارە یەکیەتـی بـێ ئـاگای جەنابـت ئـەو لیسـتە تازەیەیـان نـاردووە، جـا ئاڵۆزییەکـە ئەلێرەدایـە. لێـرەدا مـام جـەلال سـارد بـووەوە و کەمێـک دامـا ئینجـا گوتـی کـە بەدواداچوونێـک دەکات بزانـێ بۆچـی نـاوی مـن لـە لیستەکەی یەکیەتیـدا نەمـاوە. دوای چەنـد رۆژێـک مـام جـەلال ناردیـەوە بـە دوامـا و پێـی گوتـم کـە کێشـەکە تەمەنـە. گوتـی پەرلەمانـی عیـراق سـنووری دانـاوە بـۆ تەمەنـی کارمەندانـی پلـەی تایبـەت (درجـات خاصـة) کـە لـە 63 سـاڵ تـێ نەپەڕێـت و ئـەم پلـەی

تایبەتە باڵیۆزیش دەگریتەوە. ئەوسا ئەمن تەمەنم 67 ساڵ بوو. جا مام جەلال گوتی لەبەر ئەوە ناتوانین هیچ شتێک بەرامبەر بە بڕیاری پارلەمان بکەین. گوتم ئێ باشە خۆ دەیانتوانی ئەوە بە من بڵێن. گوتم مام جەلال کەوابێ ناچارم بگەڕێمەوە بۆ ئەمەریکا و هەوڵ بدەم سەرلەنوێ لە دەنگی ئەمەریکا وەربگیرێمەوە. مام جەلال گوتی نا، نارۆیت من دەتکەم بە راوێژکاری سیاسی خۆم. قسەی مام جەلالم نەشکاند و بە پێشنیازەکەی رازی بووم.

رۆژی دواتر فەرمانی سەرۆکایەتیم بۆ دەرکرا کە هۆمەر دزەیی وەک راوێژکاری سیاسی سەرکۆمار دامەزرا و هەواڵەکە لە کەناڵەکانی تی ڤی و دەسگاکانی میدیادا بڵاو کرایەوە.

بەڵام کە چوومە ئۆفیسی پەیوەندیدار بۆ کاروباری دامەزراندنم پێیان گوتم کە پۆستی راوێژکاری سەرۆکیش پلەی تایبەتە بۆیە تۆ ناتوانیت وەک کارمەند بە هەموو مافەکانی کارمەندی دابمەزرێیت کە خانەنشینی و پشووی ساڵانە و نەخۆشی و هەندێ دەسکەوتی تریش لەخۆیدا دەگرێ. گوتیان بەم تەمەنە تۆ تەنها مافی گرێبەستیت هەیە وەک راوێژکاری سەرکۆمار و گرێبەستیش هیچ کام لەو مافانە نایگرنەوە کە کارمەندی ئاسایی هەیەتی. لاحەولە وەلا... دیسان دەستێک لە پاش دەستێک لە پێش. چوومەوە بۆ لای مام جەلال و کێشەکەم پێ راگەیاند کە تەنها بە گرێبەست دامدەمەزرێنن و هیچ مافێکی فەرمانبەرانەم نابێ. بۆیە دیسان تکام لێ کرد کە بۆ من باشترە بگەڕێمەوە بۆ ئەمەریکا چونکە هەرنەبێ لەوێ خانەنشینییەکی باشم دەبێ. مام جەلال دیسان بە کەمێک تووڕەییەوە پێی گوتم ناچیتەوە، ئەگەر کێشەکەت هەر خانەنشینی یە کەینێ خانەنشین بوویت هەنگی ئەمن ئاگام هەر لێت دەبێت ئەوجا چیدی ئەم باسەم لەگەڵ مەکەوە.

مام جەلال یادی بەخێر پێی سەلماندم بمێنمەوە. راشیسپارد هەر لەتەنیشت ماڵەکەی خۆی لە گەڕەکی جادریە خانوێکی زۆر رێکو

پێکی بە جوانی راخراوم بۆ تەرخان بکەن کە بیستم پێش من وەفیق السامرائی راوێژکاری سەربازیی پێشووی مام جەلال لەوێ دادەنیشت. واش کرا.

تا مام جەلال نەخۆش کەوت و بۆ چارەسەری گواسترایەوە بۆ بەرلین، ئەمن هەر راوێژکاری سیاسی بووم. کە دەردەکە لێی تیر کرد و ئومێد نەما جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ دۆخی جارانی، پێویست بە منیش نەما لە پۆستەکەمدا بەردەوام بم و هەر واشی لێ هات. ئەو پۆستەی من، وەک پێشتر بەوردی باسم لێ کردبوو، بە کۆنتراکت (گرێبەست) بوو.

راستییەکەی دەکرا تەبای زۆرێک لە ستافی مام جەلال، منیش هەر بە گرێبەستەکەم بەردەوام بم و وەک راوێژکاری سیاسیی سەرۆکۆماری دوای مام جەلالیش هەر بمێنمەوە. بەڵێ، بە دڵنیاییەکی زۆرەوە دەمزانی جەنابی دکتۆر فوئاد مەعسووم، ئەویش لاریی نەدەبوو و حەزیشی دەکرد لەگەڵ جەنابیا بەردەوام بم، بەلام، وەک پێشتریش باسم کردووە، خۆی مانەوەی من لە بەغدا وەک راوێژکاری مام جەلال، هەر لە بنەڕەتدا لە ناچاریم بوو، چونکە من بە ئومێدی باڵیۆزیی دەستم لە کارەکەی خۆم لە دەنگی ئەمەریکا هەڵگرتبوو و گەڕابوومەوە بۆ بەغدا. جا کە ئەوە نەبوو، نەمویست دڵی مام جەلال بشکێنم، کە داوای لێ کردم وەک راوێژکاری سیاسی لەگەڵیدا بمێنمەوە. ئەوە بوو.

هەرچۆنێکی بێ، پابەند بە ئەخلاقیاتی کار work ethics بە ئەرکی دەزانم، باز بەسەر ئەو بابەتە هەستیارانەدا بدەم، کە لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی راوێژکاریمدا پێیدا تێپەڕیبووم و هەروەها بەسەر ئەو نووسینە پێشنیازئامێزانە و رادەربڕینانەش، کە دەمخستنە سەر مێزی بیرۆی جەنابی سەرکۆمار و دواتریش لێی دەدوایین. ئێستاش کە ئەو پیاوە گەورەیە ئەم دنیایەی بەجێ هێشتووە، تازە هەر نامۆڕاڵە باسی بابەتی هەستیار بکەم، چونکە خۆی نەماوە پشتڕاستی بکاتەوە، یان دوو قسەی لە سەردا بکات.

بەدەر لەوە، لەو چەند ساڵەدا ژیان و هاتوچۆی ناوشارم لە بەغدا زۆر سنووردار بوو، ئێمە ستافی سەرۆکایەتیی کۆمار لە زۆنی سەوز و لە گەڕەکی جادریە نیشتەجێ بووین و چوونە ناو شارمان زۆر کەم بوو. لەو چەند ساڵەدا هەڤاڵ و هۆگری نوێی زۆر خۆشەویستم دەسکەوتن، وەک دکتۆر موەفەق دەرگەڵە و کاک خدری ژمێریار و کاک وریا رواندزی و ئی تریش. ناوە ناوەش دۆست و برادەرانی کوردمان لە کوردستانەوە بە سەردان دەهاتن و چەند ئێوارەیەکی خۆشمان لەگەڵیاندا رادەبوارد.

مام جەلال، هەزار رەحمەت لە گۆڕی بێ، بەدەر لە کاتەکانی دەوامی رەسمی، وەک هەمیشە کە لە ساڵی 1948ەوە لە کۆیە بیووین بە برادەر، هەر برادەرەکەی جارانم بوو، بەبێ رەسمییات و پرۆتۆکۆل. خۆی مام جەلال بەدرێژایی ژیانی هەر بە سروشت و خوو و رەوشت و رەفتاری خاکی و شەعبی ناسراو بوو و هەر بەوەشەوە شیرین بوو.

مام جەلال کە بینی ماوەی نزیکەی شەست ساڵ بوو لەدەرەوەی وڵات بووم و کە گەڕاومەتەوە جێ و رێیەکی تایبەت بە خۆمم نەماوە - دەڵێم نەماوە - چونکە پێشتر بنەماڵەکەمان خاوەنی پتر لە 30 هەزار دۆنم زەویی کشتوکاڵ، جگە لە مەڕوماڵاتێکی زۆر بوو و مام جەلال باش ئاگادار بوو، کە زۆر لەو موڵک و دەوڵەتەمان لەپێناو کوردایەتی دانابوو، یەکسەر هەستا ئیدارەی گشتیی یەکێتی راسپارد خانووێکیان لە سیتەک بۆ درۆست کردم. پارەی راخستنی تەواوی ناوماڵەکەی بۆ دام، ئۆتۆمۆبیلێکی فۆردی نوێی بۆ کڕیم و شۆفێرێکیشیان بۆ تەرخان کردم. هەروەها دوو پۆلیسیشیان راسپارد لەگەڵمدا بن، کە خۆم ئەمەیانم رەت کردەوە و خولاسە وا رێک کەوتین، کە پۆلیسەکان بە نۆرە پاسەوانیی ماڵەکەی سیتەکم بکەن، لەوە زیاتر نا. تا فەرمانی پۆستی راوێژکاریی سەرکۆماریشم بۆ دەرنەچووبوو، مام جەلال مووچەیەکی بۆ ئەو سەردەمە باشی بۆ بڕیبوومەوە، کە مانگانە لە لایەن ژمێریاری دەباشانەوە بۆم دادەندرا.

سروشـتانە، کـە بـووم بـە راوێـژکاری خـۆی لـە بەغـدا، ئـەو مووچەیـەی دەباشـانم نەمـا.

دوای نەخۆشـکەوتنی مـام جـەلال، منیـش کارێکـی وام وەک راوێژکار لـە بەغـدا نەمـا و گەڕامـەوە بـۆ سـلێمانی و بـۆ ماوەیـەک لـە ماڵەکـەی سـیتەکم بەسـەر بـرد و جاروبـار سـەردانی مـاڵ و منداڵەکانـم دەکـرد لـە ئەمەریـکا. راسـتییەکەی لـەو تاریخـەوە ئیتـر ژیانـی منیـش بـە چ قۆناخـی وا تـێ نەپـەڕی، کـە شایەسـتەی گێڕانـەوە بـێ.

خـۆی لـەو ماوەیـەی کـە وەک راوێـژکاری سـەرکۆمار لـە بەغـدا بـووم، زۆر لـە شـەوان مـاوەم دەبـوو بـۆ خۆمـی تەرخـان بکـەم و دوور لـە سیاسـەت خولیاکانـی خـۆم بەسـەر بکەمـەوە، گوێگرتـن لـە موزیکـی کلاسـیک و دانانـی شـیعری گۆرانـی و خوێندنـەوەی کتێـب لەسـەر مێـژوو و لەبـارەی رۆشـنبیریی گشـتی و دانیشـتنی نـاو بـرادەران. هـەر وەهـا خـۆم خەریکـی نووسـینی کتێـب و گوتـار دەکـرد و چەنـد کۆنسـێرتێکم لـە هەولێـر و لـە سـلێمانی بـە ئەنجـام گەیانـد، کە دەنگوسـەدایەکی بـێ وێنەی دایـەوە، هەچەنـدە کـە خـۆم سیسـتەمی دەنگـی هۆڵەکانـی کۆنسـێرتەکەم زۆر بـەدڵ نەبـوو. یەکێـک لـەو نووسـینانەی ئـەو ماوەیـەم کتێبێـک بـوو لەسـەر موزیکـی کلاسـیک بەتایتلـی (چیرۆکـی موزیکـی کلاسـیک) کـە لەسـەر ئەرکـی حکوومەتـی هەرێمـی کوردسـتان لـە ئەسـتەمبوڵ لەچـاپ درا و بڵاوکرایـەوە. ناوەرۆکـی کتێبکـە مێـژووی موزیکـی کلاسـیکە هـەر لـە دەسـتپێکەوە لـە سـەدە سـەرەتاکانی زاینییـەوە لـە کلیسـای رۆمـان کاتۆلیـک تـا سـەدەی بیسـتەم. ئەمانـە هەمـووی کاتـە تایبەتەکانـی منیـان پـڕ دەکـردەوە

ئەمانـەی خـوارەوە هەندێـک لـەو گۆرانییانـەن، کـە لـەو ماوەیـەی راوێژکاریـم چ لـە بەغـدا بووبـم و چ لـە هـەر شـوێنێکی تـر، نووسـیبووبم و بڵاویـش کراونەتـەوە.

## چاوەڕوانی

**لیریک و ئاواز: هۆمەر دزەیی**
**ئاڕانژ: د. ع.ج. سەگرمە**

من هەتا مابم		هەر چاوەڕێتم
نا ئومێد نابم		هەر چاوەڕێتم
تا دێیتەوە لام		ئەتگرمە باوەش
تێرتێر هەڵئەمژم		لێوی تەڕی گەش
باوەڕت هەبێ		بە هەستی دڵم
من هەنگەزەردە		تۆ سوورەگوڵم
لە هەر کوێیە بی		من بۆنت ئەکەم
خوا وای نووسیوە		حەزت لێ ئەکەم
لە قاسەی دڵما		کلیل دراوی
کلیل ون بووە		لەوێیت تا ماوی
کلیل ون بووە		لێی نایەیتە دەر
هەتا پێکەوە		ئەنێینەوە سەر
دەبا تێپەڕن		ڕۆژگار و شەوگار
مانگ نێنە ئەژمار		ساڵ بینە هەزار
خۆ چاوەڕوانی		هەر ئەبڕێتەوە
خۆ ڕۆژێ هەر دێ		بگەڕێیتەوە
هەنگی ئەبینی		هەر چاوەڕوانم
باسکت وەردێتێ		بە مل و شانم
پەنجەت دادێتێ		بە ناوچەوانم
بە ئاخ و ئۆخەی		ناخم ئەدوێتێ
تا هەتایەش بێ		هەر چاوەڕێتم
دەس لە چەناگە		چاو هەر لە ڕێتم
هەتا دێیتەوە		جووت ئەبینەوە
تا دنیا مابێ		لێک نابینەوە

## هەڵاتن

**لیریک: هۆمەر دزەیی**
**ئاواز: گۆرانییەکی کۆنی ئیتاڵی**
**(پۆرتۆفینۆ love in Portofino)**
**ئەرانژ: گرووپی سەهەند**

دەستم لە کەمەرت وەرێنم
بۆ خۆمت راکێشم بە تین
لێوم لە گەردەنت هەڵسوێنم
ون بین لەناو دنیای ئەڤین
فریشتە و پەریمان بێنە یاری
دامان نێن لە تاقی ئاسمان
ئەستێرەت بۆ راخەن بە دیاری
هەوریش وەکوو جێ و بالینگان
گەر شەماڵ لێی سەندین ئەو نوێنە
سینگم بۆت ئەکەم بە سەرین
گۆنات بە مووی سینگم دابێنە
نم نمیش دەس کا بە بارین
جەستەی تەڕ لە جەستەم بخشێنە
ون بین لەپشت ئاسمانی شین.

## ئایشیلێ

**لیریک: هۆمەر دزەیی**
**ئاواز: گۆرانیی ئازەری (ئایرلق)**
**ئاڕانژ: گرووپی سەهەند**

شەوان کە رائەکشێم
شەو بەسەر ناچێ
بیری ئەو کیژۆڵەم
لەسەر دەرناچێ
نازانم من چۆن ماوم
گیانم دەرناچێ
ئایشیلێ ئایشەی نەوجەوان ئایشیلێ
شێت بووم بۆ چاو و برۆی کەوان ئایشیلێ
دژوارە بەبێ تۆ
شەوی رەشی من
روو لە چ لایە بکا
بەختی رەشی من
ئاخۆ کەی لێم هەڵبێ
ستارەی گەشی من
ئایشیلێ ئایشەی نەوجەوان ئایشیلێ
شێت بووم بۆ چاو و برۆی کەوان ئایشیلێ

***

خەڵاتی مەدالیای زێڕینی بۆردی نێونەتەوەیی بێژەران Ibb بۆ ساڵی 2003 بە چەند کارمەندێک بەخشرا لە ناویانا سەرۆکی بەشی کوردی هۆمەر دزەیی.

هۆمەر دزەیی لەگەڵ هەندێ لە پەیامنێرانی بەشی کوردی، لە چەپەوە: سەلام باڵایی (دهۆک)، هۆمەر دزەیی، عومەر فەرهادی (هەولێر)، لەتیف نێرەوەیی (سلێمانی) لە کۆبوونەوەیەکیان لە هەولێر.

لارا هۆمەر دزەیی بەرنامەی گۆرانی لادێی ئەمەریکی پێشکەش دەکات

هۆمەر دزەیی لە ستودیۆی دەنگی ئەمەریکا

هۆمەر دزەیی لە کاتی کاری ڕۆژانەی لە ئۆفیسی خۆی لە دەنگی ئەمەریکا

سەرکۆماری عیراق بەڕێز مام جەلال تاڵەبانی لە بەشی کوردی دەنگی ئەمەریکا.

له ئێواره خوانێکی شارۆچکەی دوکان سەرکۆمار مام جەلال من و کاروانی کوڕمی له تەنیشت خۆی دانا و خەلیلزادی باڵیۆزی ئەمەریکاش له بەرامبەری دانیشتبوو.

بەغدا: هۆمەر دزەیی و رزگاری برازای له سەردانی پیرۆزباییان بۆ لای سەرکۆماری تازه هەڵبژێردراوی عیراق جەنابی مام جەلال تاڵەبانی

هۆمەر دزەیی و جێگری بەڕێوەبەری رادیۆی عیراقی ئازاد کامەران قەرەداغی له بارەگای رادیۆی ئەوروپای ئازاد/ رادیۆی ئازادی له پراگ.

لە ماڵەکەی بەغدام لە چەپەوە: ملازم عومەر، حەمەدەمین پێنجوێنی، هۆمەر دزەیی، کەمال موفتی، عیدۆ بابەشێخ یەزیدی

کۆشکی سەرکۆماری لە ڤیەننا لە چەپرا: هۆمەر دزەیی تەرجومانی زمان دەکا لە نێوان سەرکۆماری نەمسا فرانتس یۆناس و باڵیۆزی عیراق جاسم العزاوي

کە هێشتا لە دەنگی ئەمەریکا بووم: خەڵاتی ساڵانەی مەدالیای زێڕینی بۆردی نێونەتەوەیی بێژەران lbb بۆ ساڵی 2003 بەم چوار کارمەندە بەخشرا کە یەکێکیان هۆمەر دزەیی سەرۆکی بەشی کوردی بوو.

ڕۆبێرت رایلي بەڕێوەبەری دەنگی ئەمەریکا
ساڵی 2002

لارا فەتاح ئەم گفتوگۆیەی بۆ ڕۆژنامەی سۆما
بە زمانی ئینگلیزی ئەنجام داوە

کە هێشتا لە دەنگی ئەمەریکا بووم: لە کاتی کاری ڕۆژانەم لە ئۆفیسی خۆم .

لەگەڵ ڕووناکی هاوسەرم لە بەردەم ماڵەکەی گوندی سیتەکمان لە باکووری
سلێمانی

کۆنسێرتی سلێمانیم لەگەڵ تەنیای زۆر جوان و دەنگ زۆر خۆش لە هۆڵی تەلاری هونەر 24.10.2012

لە یەکێک لە کۆڕە کولتوورییەکانم کە بیرم نەماوە لە کوێ بوو

کۆنسێرتێکی شاری بەرلینم لە ئەڵمانیا

بەرنامەی یەکێک لە کۆنسێرتەکانم لە هەولێر و لەسلێمانی بە سەرناوی : هەناسە پایزییەکانی هۆمەر دزەیی

روویەکی تری کارتی بەرنامەی کۆنسێرتی هەولێر و سلێمانیم بە سەرناوی: هەناسە پایزییەکانی هۆمەر دزەیی

ناسنامەی خانەنشینیم لە دەنگی ئەمەریکا

**Kurdish Service**
*Homer Dizeyee, Service Chief*

Together with his wife and their four children, Homer Dizeyee immigrated to the United States from Iraq in 1988, joining VOA's newly launched Kurdish Service as a radio announcer four years later. Homer and his colleagues started the Kurdish Service in 1992 (then only 15 minutes of daily broadcasting) as an announcer, he later became the chief of the service in 2000. The Kurdish Service now has four one-hour daily programs.

Homer and his family fled Saddam Hussein's Iraq on horseback, crossing the fully mined, mountainous border between two warring countries, Iraq and Iran. Their destination had been the U.S., but because Iran regarded America as an enemy, Homer could not disclose his intention to the Iranians. Instead, he went to Vienna where he applied for and received political asylum in the U.S.

Homer started his cultural career as a singer and songwriter at the age of 15 when he wrote the Kurdish words for the then popular American song *Amado Mio* sung by Rita Hayworth in the classic movie *Gilda*. And in 1954, at the age of 17, he recorded his first songs for the Iraqi Broadcasting Station in Baghdad. Later, Homer moved to Europe, where he became one of the most popular Kurdish TV singers, who successfully blended Kurdish traditional airs with western music. Homer acquired the title of *The Singing Ambassador* and, indeed, he dreamed of becoming a diplomat. He studied political science at the universities of Vienna, Paris and Reading/UK. He worked as a media assistant at the Iraqi embassy in Vienna and as a freelance journalist. He has a B.A. (Honors) in politics and has taken basic courses for an M.A. in linguistics at George Mason University.

Homer speaks and sings in ten languages, and is a published author. In 2003, Homer Dizeyee won the IBB Gold Medal Award.

**Kurdish Service**
*Omar Sheikhmous, Senior Editor*

A native of Syria, Omar Sheikhmous graduated from the University of London with a B.A. in international relations and from Stockholm University with an M.A. in social sciences/ international politics. During his student years, he was a member of the executive committee of the Kurdish Students' Society in Europe and editor of its English-language magazine, *Kurdistan*. After graduation, he was a university lecturer in political science at Stockholm University and also a lecturer/researcher on international migration and ethnic relations. He also taught special courses on religion, society and politics in the Middle East. He further participated in a number of research projects: *Refugee Reception and Integration into Swedish Society, Religiosity and Social Adaptation of Refugees in Sweden* and *Fundamentalisms: Different Worldviews*.

In the 1960s and 1970s, he assisted Kurdish resistance movements in Iran and Iraq and was editor of several of their newspapers in Kurdish, Arabic and English. For a number of years, together with his Swedish wife, he joined the ranks of the Kurdish Pesh Mergas (partisans) who fought the regime of Saddam Hussein for Kurdish self-government in Iraq.

Omar joined VOA's Kurdish Service as senior editor in 2001, one month before the September 11 terrorist attacks against the United States. He has enriched the service's programs with interviews and roundtables with local and international experts. As the war in Iraq loomed on the horizon, he worked with the service chief on the expansion of VOA Kurdish from one to four hours of daily programming.

پرۆفایلی سەرۆکی بەشی کوردی دەنگی ئەمەریکا هۆمەر دزەیی و پرۆفایلی سینیۆر سەرنووسەری بەشی کوردی عومەر شێخموس لە نامیلکەی ساڵانەی دەنگی ئەمەریکا.

house, and valuable employees often leave for a more appreciative and creative work environment.

Workers must know that they are more than cogs in a wheel, that they are appreciated for their ideas and creative talents and not just for their labors. They want to know they have a substantive input in

agement decisions are going to be received by their employees. They constantly ask, "How would I feel about being on the receiving end of my decisions?" Would you be comfortable with your answer to that question? And what would your employees say?

New Directors and Officers

که هێشتا له دەنگی ئەمەریکا بووم: ڕاگەیاندنی دانانی هۆمەر دزەیی وەک سەرۆکی بەشی کوردی لە دەنگی ئەمەریکا لە مانگی نیسانی ساڵی 2000

THE DIRECTOR OF THE VOICE OF AMERICA
WASHINGTON, D.C.

April 30, 2002

Mr. Homer Dizeyee
Voice of America
330 Independence Avenue, SW
Room 1437
Washington, DC 20237

Dear Homer:

Please accept my thanks and congratulations on the occasion of the tenth anniversary of the Kurdish Service of the Voice of America. You and your colleagues have both won the United States many friends around the world and made all of us here proud of your achievements. I wish you even more success in the future.

Sincerely,

Robert R. Reilly
Director

که هێشتا له دەنگی ئەمەریکا بووم: نامەی پیرۆزبایی بەڕێوەبەری دەنگی ئەمەریکا ڕۆبێرت ڕایلی بۆ هۆمەر دزەیی بە بۆنەی دەیەم ساڵیادی کردنەوەی بەشی کوردی

ناسنامەم وەک ڕاوێژکاری سەرکۆمار

16 soma

## CULTURE & MORE

As he awaits an ambassadorial posting, singer Homer Dizeyee extols the need for diplomats to be cultured so that they can form better links with the host country

### Homer's musical odyssey

چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەی ئینگلیزی زمان سۆما کە لە سلێمانی دەردەچوو لەگەڵ هۆمەر دزەیی

کتێبی چیرۆکی موزیکی کلاسیک کە بە وردی باس لە مێژووی موزیکی کلاسیکی ڕۆژئاوا دەکات.

# بەشی 35

## پاش وشه
##ماڵاوایی

تەمـەن وا خەریکـە لەبـن دێـت و هـەر نەشگەیشـتمە بنـی دونیـا. تەمەنێکـی لێوڕێـژ بـە فرمێسـك: فرمێسـکی دڵشـادی و فرمێسـکی نامـرادی؛ فرمێسـکی جـۆش و خرۆشـی سـاڵانی منداڵـی و فرمێسـکی، پەکـوو، ناخۆشـیی پایانەسـاڵی؛ فرمێسـکی خەنـدە خۆشـی بیـر لـە دوارۆژێکـی گەشـکردنەوە و فرمێسـکی گیانێکـی داتەپیـو و دڵسـاردبوونەوە.

لـە تەمـەن فێربـووم ئـاوی ڕووبـار بـم، نـەك زۆنـگاوی مەنـگ، ئـاوی وەسـتاوی قەوزاویـی پێـرار و بەسـتر پێـرار بـم.

لێـرەوە ئیتـر دەمـەوێ کۆتایـی بـە گێڕانـەوەی ئـەم بیرەوەرییانـەم بێنـم و لـەم بـوارەدا ماڵاوایـی لـە خوێنـەرە خۆشەویسـتەکانم بکـەم بـا لـەوە زیاتـر ڕەزای خـۆم گـران نەکـەم.

بـێ گومـان ئێسـتا دەبـێ بپرسـن بۆچـی کۆتایـی پـێ دێنیـت؟ لـە وەرامـدا، بـا دوو دواقسـەتان بـۆ بکـەم کـە ڕەنگـە خوێنەرانـی بەتایبەتـی هێشـتا لاو بەئاسـانی لێشـمی قەبـووڵ نەکـەن -کـە هەقیشـیانە - چونکـە ئـەوان هێشـتا بـەم قۆناخـەی تەمەنـی منـا تـێ نەپەڕیـون.

تـۆ ئەگـەر بێتـو سـەرنجێ بدەیتـە دوو وشـەی کـە لـە سـەرەوە بـەکارم هێنـاون (گێڕانـەوەی بیـرەوەری) خـۆ بـە ئاشـکرا پێیانـەوە دیـارە کـە تـۆ شـتی بەسـەرچوو دەگێڕیتـەوە. هەمووشـمان دەزانیـن گێڕانـەوەی ڕووداوانی بەسـەر چـوو پەیوەندیـی بـە هێـزی فیکـرەوە هەیـە واتـا تـا چ ڕادەیـەک بیـرت بـڕ دەکات ئـەو شـت و دیمەنـە بەسـەرچووانە بـە گێڕانەوەیەکـی

ورد و دروست بێنێتەوە بەرچاو. دیارە هێزی فیکریش پەیوەندیی بە تەمەنەوە هەیە. مرۆڤی بەتەمەن شتی زۆر کۆنی، شتی سەردەمانی منداڵی و جەوانی زۆر باش لەبیر ماوە کەچی شتی دوێنێ و پێرێی لەبیر نامێنێ. بەتەمەنەکان هەمیشە ئەم گلەییەیان لە خۆیان هەیە: کە دەچم بۆ ناندێن بۆ شتێک کەچی کە دەگەمە ئەوێ نازانم بۆچی هاتووم، خۆ ماوەی نێوان نیاز و قۆناخ تەنها چەند چرکەیەکە!

ئەمن مێشکی ئینسان بە تۆپەڵە قوڕێک دەچووێنم. تا تۆپەڵە قوڕەکە تازە و تەڕ بێ چنگێک دانەوێڵەی تێی بگریت یەکسەر پێیەوە دەنووسێت و دەچەسپێ. کە تۆپەڵە قوڕەکە کزر بووەوە ئەوەی تێی دەگریت هێشتا زۆری پێوە دەنووسێت و هەندێکیش دەکەونە خوارەوە. کە تۆپەڵە قوڕەکە مەیلەو وشک بووەوە کەمی پێوە دەنووسێت زۆری لێ دەکەونە خوارەوە. کە تۆپەڵە قوڕەکە وشک و رەق بووەوە هەر چییەکی تێی بگریت هیچی پێوە نانووسێت و هەمووی بەملاو بەولادا پەرش و بڵاو دەبنەوە.

جا تەمەن ئەوها لە مێشکی بەشەر دەکات. رێڕەوی مێشکی ئینسان بە هەموو قۆناخەکانی تۆپەڵە قوڕەکەدا رەت دەبێت. ئەو شتانەی کە لە تەمەنی منداڵی و مێردمنداڵی و جەوانی لە مێشکتا چەسپاون کە مێشکت هێشتا تۆپەڵەقوڕە تەڕەکە بووە و لە تافی وەرگرتنا بووە ئێستا بە پیریش وەک فیلمی سینەما بەوردی هەموویت دێنەوە بەر چاو. هەر هەندێ قسەی پتر لە هەفتا ساڵ کۆنیشت هێشتا وشە بە وشە بە دەنگ و رەنگەوە هەر ئەزبەرە. ئەمن ئێستاش ئەو سروود و هەڵبەستانەی کە لە قوتابخانەی سەرەتایی فێریان دەکردین کە تەمەنم حەوت هەشت ساڵان بووە ئێستاش هەموویم بە رەوانی ئەزبەرە. کەچی چەند کۆپلە شیعرێک کە تازە فێریان بوویم یان رووداو و شت و کەسانێک کە بەم دواییانە بینیومن کە مێشک قۆناخی تۆپەڵە قوڕە تەڕەکەی جارانی دەرباز کردووە ئەمانە تووشی گرفتی لەبیرچوونم دەکەن و زۆر جار بەرامبەر بە نەناسینەوەی هەندێ کەس

کە هەر چەند رۆژێ پێشتر بینیبوومن شەرمەزاریش دەبم. کەسانی گەنج لەمە ناگەن. هەر بۆ نموونە جارێکیان کە هێشتا ماڵم لە شاری ریدینگ بوو لە ئینگلتەرا، ساڵیش پێم وایە 78 یان 79 بوو مامۆستا ئەحمەد هەردیی شاعیر لەگەڵ دکتۆر جەمال نەبەز (یادیان بەخێر) بە سەردان هاتبوونە لەندەن. منیش ئێوارەیەکی زۆر خۆشم لە ماڵەکەی خۆم بۆ هەدووکیان و دکتۆر شەفیق قەزاز و شیروانی موحسین دزەیی برازاشم رێک خست. ئەو ئێوارەیەمان تا درەنگانی دوای نیوەشەو بە خواردنەوە و گۆرانی و شیعر خوێندنەوە بەسەر برد. هەردی ئێوارەکەی زۆر پێ خۆش بوو و دوای چەند رۆژێکیش بە داواکردنی خۆم شیعرە بەناوبانگەکەی بێخودی (لەو رۆژەوە رۆیشتووە تۆراوە دڵی من) بە دەسنووسی خۆی بۆ ناردم لەگەڵ نامەیەکی زۆر جوانیش کە تا ئێستا هەڵمگرتوون. ساڵ چوون، ساڵ گەڕانەوە، منیش بە سەردان چووبوومەوە بۆ کوردستان و لە سلێمانی بە کاک حەمەدەین پێنجوێنی برادەری دێرینم گوت سەردانێکی مامۆستا ئەحمەد هەردی بکەین. چووین، بەڵام ئەوەندی کردم و کڕاندم هەردی منی نەناسییەوە، لەندەنی لەبیر بوو بەڵام نە من نە ئەو شەوەی ماڵەکەی منی لە ریدینگ لەبیر مابوو. ئەمن کە هێشتا تافی لاویم تیا مابوو زۆر لام سەیر بوو و بەو هەڵوێستەی مامۆستا هەردی لە ناخمەوە کەمێک دڵیشم ئێشا. ئەمن چوزانم ئەوە دەردە تەمەنە. بەڵام دووریش نییە ئەمەیان (دیمێنشا dementia یان ئالزهایمەر alzheimer) بێ کە زۆر کەس زیاتر بە گەورەیی تووشی دەبن و دیاردەیەکی سروشتییە یان راسترە بڵێین نەخۆشییەکی سروشتییە. هەر بۆیەشە کە لە هەموو دونیادا سیستەمی تەمەنیان داناوە بۆ کارکردن و دوای ئەو تەمەنە خانەنشینت دەکەن نەوەکوونێ کارەکەت بە رێکوپێکی پێ هەڵنەسووڕێندرێت و تووشی هەڵە و تێکەڵ و پێکەڵکردنی کاروباری خەڵک بییت. کورد گوتەنی: بە پیری نەچیتە بەر هەویری. ئەم پەیامە زیاتر ئاراستەی رەهبەرانی ئۆتۆکراتی هەندێ وڵاتانە کە بە پیریش

هەر بە کورسییەکەیان وەدەنووسێن و نارۆن. ئاخر ئەوانە پۆستێکی هەستیاریان هەیە و سەرەنجامی میللەتەکەی خۆیانیان بەدەستە. عەرەب چاکی بۆ چووە "العقل السليم فی الجسم السليم".

ئەمن کە ئەم قسانە دەکەم بەلام دەبێ بشگوترێ کە کاریگەریی تەمەن لە هێزی بڕکردنی مێشک لای هەموو کەس وەک یەک نییە. هەندێ کەس پیرە بەلام شتی تازەشی هێشتا لەبیرە. بۆیە وەرزشکردنی مێشک بۆ ئەم شتانە زۆر باشە.

شکور ئەمن هێشتا نە تووشی دیمێنشا نە ئالزهایمەر بوویم بەلام وەک کە لە سەرەوە باسم کرد دانیشی پیا دەنێم کە بە تەمەنی ئێستام توانایی فیکریم بۆ وەبیرهێنانەوەی شتی نوێ لە کورتی داوە.

ئەگەر خوێنەری بەڕێز بەشەکانی زووتری ئەم بیرەوەریانەی لەبیر مابێ دەزانێ کە من زۆر بەوردی کۆلێک لە رووداوانی سەردەمی منداڵیم و جوانیم گێڕاونەتەوە. بێجگە لە گێڕانەوە، بیرو بۆچوون و هەڵسەنگاندنی هەینێکەی خۆشم لەسەر رووداوەکان دەربڕیوە کە بەتێگەیشتنی ئەوسام ئەوهای بۆ دەچووم. گرنگ ئەوەیە کە تۆ لە گێڕانەوەدا راستگۆ بیت بەلام لەسەریشت نییە هەموو شتێک بگێڕیتەوە. لەبارەی بازدان بەسەر گێڕانەوەی هەندێ قسە یان هەندێ رووداو ئەمن سێ هۆم داناوە: دەوڵەت، دین، دونیا، کە کورتکراوەکەیم کردۆتە (دی دی دی). لە کۆمەڵگای کشتوکاڵیی دواکەوتوو و پارێزیارا ئەم سییانە (تابوو taboo)ن واتا بڤە و هێڵی سوورن. تۆ ئەگەر بە نەریتی و رەخنەگرانە و راشکاوانە یان بە بیرێکی لیبەراڵ باسی سیاسەتی (دەوڵەت) و باسی (دیانەت) و باسی (دونیا) و پەیوەندیی نێر و مێت کرد لەناو کۆمەلا لەوانەیە خۆت تووشی کێشە و گرفت بکەیت. بەرئاوەژووی کۆمەلانی پارێزیار دەبینین کە لە کۆمەڵگا پیشەسازییە پێشکەوتووەکانا ئەم سێ (د)یانە هەرسێکیان زۆر نۆرماڵن و لەم بارەیەوە کەس بەرۆکت ناگرێ بۆچی ئەمەت گوتووە یان کردووە.

جـا بـۆ روونکرنــەوەی هــۆی کۆتایــی هێنانــم بــە نووســینەوەی بیرەوەرییەکانـم مەبەسـتی مـن ئەوەیـە لەوانەیـە لێـرە بـەدوا بـەم تەمەنـەم ئیتـر لـە توانایـی هۆشـمدا نەمابـێ هەمـوو شـتێکی نـوێ دابـکات و دواتـر کاوێـژی بکاتـەوە بۆیـە باشـترە خـۆم تووشـی ئاڵـۆزی و شـپرزەیی فیکـر نەکـەم و کـورد واتەنـی بەربەیـار بەنـاو نەکـەوم. بـەدەر لەمـە هەسـتیش دەکـەم بەڕاسـتی ئیتـر شـتێکی بـۆ مێـژوو گرنـگ و سەرنجکێشـم لـە بـاردا نەمـاوە هەڵیرێـژم.

ئـەوە بـوو کـە بڕیـارم دا ئـەم بەشـە دەرەنجامـی بیرەوەرییەکانـم بێـت و بـەم شـێوەیە ماڵاوایـی و بـای بـای لـە خوێنـەرە خۆشەویستەکانم بکـەم.

هەوڵـی زۆرم دا لـە دووگردکانـەوە بگەمـە بنـی دونیـا بـەڵام قۆنـاخ دوور و تەمـەن کـورت. جـا ئەمـە بـوو وەرامـی پرسـیارەکەتان، بۆچـی کۆتایـی؟

ئەمـن بـە ویژدانێکـی ئاسوودەشـەوە حـەز دەکـەم پێتـان بڵێـم کـە چیرۆکەکانــم بــە راســتگۆیی و بابەتــی honestly and objectively دوور لـە خۆهەڵکێشـان، دوور لـە سـۆزی عاتیفـی برایەتـی، برادەراتـی، خزمایەتـی، پارتایەتـی سیاسـیی و دەمارگیریـی ناسـیۆنالیزم گێڕاونەتـەوە. حـەز دەکـەم ئـەوەش بزانـرێ مـن کـە باسـی خـزم و کـەس و عەشیرەتی خـۆم کـردووە تکایـە کـەس بـە خراپـی تـێ نـەگا. ئـەوە هـەر دەبـێ وابـێ چونکـە ئـەوە ژیـن نامـەی خـۆم و بیرەوەرییەکانمـە کـە هـەر دەبـێ بـە خـۆت و بنەماڵەکەتـەوە دەسـتی پـێ بکەیـت. تـۆ کـە چیرۆکـی مێـژوو دەگێڕیتـەوە هـەر کەسـێ رۆڵێکـی بەرچـاوی لـەو مێـژووەدا بووبـێ، بـا هـەر کـێ بووبـێ، یـار و نەیـار، پاشـا و گـەدا، ناکـرێ فەرامۆشـی بکەیـت . بـا لـە بیریشـتان بچەسـپێ مـن کـە چیرۆکـی پیاوەتـی و کوردپەروەریـی خزمێکـی لـە رووی سیاسـی و کۆمەڵاتییـەوە زۆر پایـە بـەرزم گێڕاوەتـەوە چیرۆکــی خەپــەی زبــڵ رێژیشــم گێڕاوەتــەوە، مەبەســتم ئەوەیــە هــەر یەکێکیـان لـە بـواری خۆیـدا رۆڵـی خـۆی گێـڕاوە و خزمەتـی گـەل و وڵاتـی خـۆی بەردەسـت کـردووە. جـا ئەگـەر یەکێـک لـەو چالاکوانانـە

خزمـت یـان بـرات بـوو خـۆ نابـێ بەردێـک بخەیتـه سـەر کردەوەکانـی. کاک کەریـم شـارەزا لـەم رووەوە چاکـی بـۆ چـووە ( بڕوانـه بەشـەکانی سـەرەتایی ئـەم نووسـینانه). ئەگـەر دوێنێـش رووداو یـان کەسـایەتییەکم بـه پێوەرێک هەڵسـەنگاندبێت و له پاشـان، دوای سـاڵەهای سـاڵان، هەڵوێسـتم بەرامبـەر هەمـان رووداو یـان هەمـان کەسـایەتی گۆڕابـێ ئەوەشـم خسـتووەته روو و گوتوومـه: "مـن جـاران بـه تەمەنـی زووتـرم و بـه ئەقڵـی ئـەوێ تەمەنێـم وای تـێ گەیشـتبووم بـەڵام ئەمـڕۆ لـه پـاش ئەزمـوون و زانیاریـی زیاتـر ئێسـتا بـه ئەقڵـی ئەمـڕۆم، بـه ئەقڵـی تەمەنـی ئەمـڕۆم بـه جۆرێکـی تـر هەڵـی دەسـەنگێنم" واتـا هـەردوو بۆچوونـم خسـتوونەته روو و هەرگیـز نکۆڵیـم لـه بۆچـوون و هەڵوێسـتی جارانـم نەکـردووە ئەرێتـی بووبـێ یـان نەرێتـی positive or negative راسـت بووبـێ یـان چـەوت right or wrong. ئـەوەی خـۆم تێـدا ژیـاوم بـه راسـت و دروسـتیم گێڕاوەتـەوە بـەڵام هەمـوو شـتێکیشـم نەگوتـووە. ئەگـەر رووداوێـک یـان شـتێکیش خـۆم نەمدیبـێ و لـه خەڵـک و لـه دەنگوباسـا بیسـتبم ئـەوا باسـی سـەرچاوەکانم کـردووە.

هـەر بـۆ زانیاریشـتان، پێشـتر مـن ئـەم بیرەوەریانـەم هەفتـه بـه هەفتـه لـه هەفتەنامـەی ( بـاس) دا بـڵاو دەکـردەوە بـەو ئومێـدەی کـه لـه پـاش تەواوبوونـی بیکەیـن بـه کتێـب. جـا ئەمـه ئـەو کتێبەیـە کـه لەگـەڵ سـتافی ( بـاس) دا نەخشـەمان بـۆ کێشـابوو.

بـەڵام بـەر لـەوەی ماڵاواییتـان لـێ بکـەم بـا ئـەم هەڵبەسـتەی خۆمتـان پێشـکەش بکـەم کـه پەیوەندیـی بـەم باسـەمەوە هەیـە و کردوومەتـه گۆرانیـش.

## برادەران دوێنێ کە جوان بووم

**لیریک: هۆمەر دزەیی**
**ئاواز: بڕگەی 1، 2 نەزانراو**
**بڕگەی 3، 4 هۆمەر دزەیی**
**ئاڕانژ: د.ع.ج سەگرمە**

برادەران دوێنێ کە جوان بووم — نەمدەزانی غەم چییە
نەمدەزانیماندوبوون و — خەو و واتای دەم چییە
تێپەڕی کاتی جوانی و — ژیانی بێباکی من
دەرپەڕی تیری کەوانی — تەکانی لاوچاکی من
برادەران، برادەران، برادەران

ساڵەهای منداڵی و مێرد — منداڵیم لە گوندەکەمان
رائەبوارد بە پای پەتی و — بە رووی بەگەرد و بە گەمان
گرد و بستی و کەندو جۆم و — کەندەڵان و وەرد و شۆ
بەهاران لە مێرغوزاران — هاوینان پەرێزە جۆ
برادەران، برادەران، برادەران

وەک پەپوولە و هەنگ و بولبول — شیلەم ئەمژی گوڵ بە گوڵ
شەو هەتا سۆزەی بەیانان — دەم لەناو دەم، دەس لە مل
ئێستەش وا ئەستێرەی ژینم — زەرد و کز ئەبێتەوە
رۆیی رۆیی رۆیی ئاخ — جارێکی تر نایێتەوە
برادەران، برادەران، برادەران

***

## لە بری بیبلیۆگرافی

ئەوەنـدەی هەوڵـم دا بـۆم نەکـرا سـەرچاوەکانی ئـەم نووسـینانەم بـە ڕێکوپێکـی ڕیزبەنـد بکـەم، بـەڵام بـۆ زانیاریـی خوێنـەرە بەڕێزەکانـم، دەمـەوێ پێیانـی ڕابگەیەنـم کـە هـەر نووسـینێك یـان گوتەیـەك، لـە لایـەن هـەر کەسـێکەوە کرابـێ، لـە ناوەڕۆکـی ئـەم کتێبـەدا نـاوی سـەرچاوەکەی هاتـووە. داوای لێبـوردن دەکـەم بـۆ دانەنانـی بیبلیۆگرافـی

هۆمەر دزەیی

هەولێر

2020/11/3